# شرح

# شمائل النبي صلى الله عليه وسلم

به كوردى

لأبي عيسى محمد بن عيسى الترمذي

شرحها

عبد الرزاق بن عبد المحسن البدر

وەرگێرانی

سيروان كاكه أحمد

محمد أحمد گردە شێخالی







**نووسینی:** أبو عيسى محمد بن عيسى الترمذي

**وەرگێڕانـــی :** سيروان كاكه أحمد          محمد أحمد گردشێخاڵی

**دیزاینی ناوەوە :** ستافی پیت

**خـەتی بـەرگ :** ستافی پیت

**چاپـی یەکـەم :** ١٤٤٣ك - ٢٠٢١ز

**٦٦٣** لاپــــــەڕە

**٢٤ × ١٧** ســـم

**بابـەت :** ئـاییني

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٨٦٧ ) ی ساڵی ٢٠٢١ پێدراوە




















نووسینی

أبو عيسى محمد بن عيسى الترمذي

شەرح

عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر

وەرگێڕان

سيروان كاكە أحمد

محمد أحمد گردشێخاڵی




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

پاش ستایشی شایستە بۆ خوای بەخشندە، صەڵات و سەلام بڕژێ بەسەر باشترین بەندەی خوا موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی....

لە خزمەت دا بوونی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە هەر شێوازێک شەڕەف و گەورەییەکی زۆرە بۆ خزمەتکارەکەی.

ئێمە وەک ستافی پیت، بە هاوکاری کۆمەڵێک مامۆستای قەدر گران و ئەهلی عیلم و خاوەن توانا و خاوەن عەزم، بڕیارماندا لە ماوەیەکی دیاری کراو بە پشتیوانی خوای پەروەردگار سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە وەربگێڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١)- نەبوونی ئاشنایەتی ئەم نەوە نوێیە بە زمانی عەرەبی، کە ئەمەش دواجار دەبێتە بێ بەشبوونی نەوەی داهاتوو لە گەورەترین زانست کە میراتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢)- هەژاری کتێبخانەی کوردی لە کتێبەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە تا ئێستا وەک پێویست کاریان لەسەر نەکراوە و وەرنەگێڕدراون.

لە ڕاستیدا ئەم پرۆژەیە بە هیچ جۆرێک ئامانجی بازرگانی و قازانجی ماددیی لە نیەتدا نیە.

داوای تەوفیق و هاوکاری لە خوای پەروەردگار دەکەین، لە دووعای خێری خۆتان ئەم ستافە و کارەکەی لە بیر مەکەن.

ســــــتافی پیت

٢٠٢١ / ٦ / ١٧

## پێشەکی:

ژیان لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەردوو شێوازی بە کردار لە خزمەت زاتی خۆیدا بوون، یان بە مەعنەوی و ڕووحی لە خزمەت فەرمایشت و کردارو سوننەتەکانی دابوون، ژیانێکی هێندە تایبەتە، هێندە ئاسوودەو ئارامبەخشە هەر ئەوانە دەتوانن باسی بکەن، کە تێیدا ژیاون.

ئەنەس ﷺ دەڵێ: کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی دەهێنا بۆ لامان، دایکم لە خۆشیان شوێنی دەمی کوندەکەی دەبڕیەوە کە ئاوەکەی پێ دەخواردەوە!

یەکێکی دی لە هاوەڵان، دەڵێ: کە دەستنوێژی هەڵدەگرت، هەر یەکەمان خۆزگەی بەوە دەخواست پاشماوەی ئاوەکەی چنگ بکەوێ.

یەکێکی دی دەڵێ: کە لە cۆڕو مەجلیسی دادەنیشتین، هێندە ئارام و بێدەنگ دەبووین، وەک ئەوەی باڵندە لەسەر سەرمان بێ و هەڵنەفڕێ، بۆ ئەوەی قسەو فەرمایشتەکانی وەک خۆی ببیستین.

یەکێکی دیکە دوای هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ الحجرات. (دەنگتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ). ماوەیەک لە ماڵ نایەتە دەر بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەهۆی گەورەیی و گڕی دەنگییەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی قسەکردنی ئەزیەتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نەدات.

ئەوانەو سەدان وێنەی وا هەن، تەعبیرن لە دەربڕینی هەست و سۆزو خۆشەویستی و هەست کردن بە چاکەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئوممەت لەلایەن هاوەڵانەوە، کە بە کرداریی و حەقیقی لە خزمەتیدا ژیاون.

ئێمەش ئەگەرچی خوا ﷻ بە خزمەتی خودی خۆی ﷺ نەگەیاندووین، بە پێی ئەو یاسا کەونی و حیکمەتەی بوون، بەڵام بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین مسوڵمانانێک کە بە ڕاستی تەمەنناى لە خزمەت دابوونی ئەویان ﷺ کردبێ، هێناونی و خستوونییە سەر هەمان ڕێگاو ڕێبازی هاوەڵان و کردوونی بە ڕێبواری شا کاروان و شا ڕێگای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بە لە خزمەت دابوونی کردارو گوفتارە شیرینەکانی ﷺ.




داواکارم لە پەروەردگاری مەزن، ئێمەومانان ئا لەو کەسانە هەژمار بکات و فەزڵی هاوەڵ بوون، یان برا بوونیان پێ ببەخشێ و شایەن و شایستەی تکاکرانی ببین لە دوارۆژدا.

بەڕێزان گومانی تێدا نییە، باشترین کتێب و نووسراو لە دوای قوڕئان، بریتیە لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە نووسراوەکان و وتراوەکانی پێناسی خاوەنەکانیانن، ئێمەش بۆ ناسینی زیاتری پێغەمبەر ﷺ پەکمان کەوتوە لەسەر خوێندنەوەو شارەزابوونی کتێبەکانی فەرموودەو سیرە.

باشترین و کورت و پوختترین کتێبیش لەوبارەوە نووسرابێ کتێبەکەی پێشەوامان (أبو عیسی الترمذی)یە، بە ناوی (الشَّمَائِل النَّبِيّ ﷺ)، کە لە (١١٥) فەرموودەدا بە جوانترین شێوە وەسفی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات وەک ئەوەی کە بیبینی، ئەوەی ئەم کتێبەی خۆشترو پڕ زانیاریترو ناوازەتر کردوە، بریتیە لە شەرحەکەی (الشیخ عبدالرزاق بن عبدالمحسن البدر) کە بە مانای وشە بە جوانترین شێوە خزمەتی بەرهەمەکەی پێشەوامان (أبو عیسی الترمذي ﷺ) کردوە، لە زۆر شوێنی پێویست درێژەی پێداوەو بەرچاوی خوێنەری تەواو ڕوونکردۆتەوەو بۆ تێگەیشتن لە مەبەستی فەرموودەکان و شیکردنەوەی وشە قورسەکان و بابەتە فیقهی و عەقائیدیەکان.

جا لە سۆنگەی هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی و لەسەر داوای براو دۆستی خۆشەویستم (الشیخ مبارك فرج) کە پێشنیاری وەرگێڕانی ئەم کتێبە موبارەکەی بۆ کردم، هەڵسام بە وەرگێڕانی و بە هاوکاری برای بەڕێزو دڵسۆزم: مامۆستا محمد أحمد گردشیخاڵی و لە ماوەیەکی دیاری کراو ئەم کارەمان بە ئەنجام گەیاند، ئێستا وا لە پێش دەستی خوێنەری بەڕێزە، بە زمانی شیرینی کوردی و دەتوانێ لێی بەهرەمەند بێ.

لە کۆتایی:

بە پێویستی دەزانم لە ناخی دڵمەوە زۆر سوپاس و پێزانین ئاڕاستەی ئەم مامۆستاو خوشک و برا دڵسۆزانەمان بکەم، کە هەر یەکەو بە شێوازێک هاوکارمان بوون بۆ ئەوەی ئەم کتێبە نایابە، چاوی بە دونیای چاپ هەڵبێنێ و، بکەوێتە بەر دیدی خوێنەرانی بەڕێز.




بەڕێز مامۆستا ئاکۆ جلیل، کە هەڵساوە بە پێداچوونەوەی هەموو کتێبەکەو بەراوردی دەقی کوردیەکەی بە عەرەبیەکە کردوە، تێبینی زۆر جوانی پێشکەش کردووین.

خوشکەکانمان: (هاوژین ئەسعەدو سارە عەبدوڵلا) کە هەڵساون بە تایپ کردنی کتێبەکە، لەبەر ئەوەی وەرگێڕانەکەی بەندە بە گرتەی دەنگی تۆمار کرابوو، هی بەڕێز مامۆستا موحەممەد بە دەستنووس بوو.

هەروەها براو خوشکانی دڵسۆزمان کە هەر یەکەو بە شێوازی پێداچوونەوەو هەڵەگیریی تایپ و پێدانی تێبینی بەرهەمەکەیان دەوڵەمەند کرد، بەڕێزان: (کامران شکور، أحمد ئارامی، ساوێن محمد، پڕشنگ خورشید). خوا بە باشترین شێوە پاداشتی هەمووان بداتەوە، گەورەترین توێشووی دوارۆژیان بێ.

شایانی باسە، لە فەرموودەی (١ تاکو ٢٠٣) شەرحی فەرموودەکان وەک خۆی وەرگێڕدراوەو، لەمەو بەدوا تا کۆتایی بەڕێز ماموستا موحەممەد لە زۆر شوێن مەفهومی دەقە عەرەبیەکەی وەرگرتوەو بە کوردی دایڕێژتوە، هەڵبەت دەقی فەرموودەکان وەک خۆی وەرگێڕدراوە.

سیروان کاکە أحمد

٢٠٢١-٦-١٧

هەولێر




## پێشەكی دانەر:

إِنَّ الحَمْدَ للهِ، نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعُوذُ باللَّهِ مِن شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ.

وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهَ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ صل الله عليه وسلم وعلى آله وأصحابه أجمعين.

دوای ئەمە:

بێگومان كتێبی: (الشَّمَائِل) لە نووسینی پێشەوا الترمذي ﷺ كتێبێكی یەكجار مەزن و، بە پیت و پێزە، لە بەڕێزترین و گەورەترین بەشەكانی زانستە، هەموو تایبەتمەندییەكانی و سیفەتە بەرزەكانی و ئاداب و ئاكارە پڕ لە میهرەبانیەكانی و مامەڵەو هەڵسوكەوتەكانی پێغەمبەری ڕێزداری ﷺ لە خۆ گرتووە.

بە ڕاستی ئەوە پەرتووكێكە هەموو تایبەتمەندییەكانی چاكترین و، خۆشەویسترین و، باڵفتەترین (یەكێك لە) بەندەكانی خوای لە خۆ گرتووە، كە تەواوترینی بەندەكانی خوایە لە عیبادەت كردندا، هەروەها خاوەن بەرزترین خوڕەوشت و كردەوەو، خاوێنترین دڵ و دەروون و چاكترین مامەڵە و ڕەفتارە لە نێو بەندەكانی خوادا، وە چاكترینیانە لە خواناسی دا، خوا هەڵیبژاردووەو كردوویەتی بە نوێنەر لە نێوان خۆی و بەندەكانیدا لە ڕێنیشاندان بۆ لای خێرو بانگەوازو بۆ لای هیدایەتی خوا (كە ئیسلامە)، هەروەها خوای گەورە هەڵیبژاردووە لە بەڕێزترین ڕەچەڵەک و نەژادی (نێو مرۆڤایەتی)، وە تایبەتی كردووە بە تەواوترین و كامڵترین سیفەتی مرۆڤایەتی لە ڕووی دروست كردنی و خوڕەوشت و ئاكاری بەرزەوە، وە تایبەتی كردووە بە جوانترینی سیفەتەكان لە ڕووی دیمەن و شێوەو ئاكارە پڕشنگدارەكانی و سیفەتە بەرزو بەها باڵاكانی صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت، وە تایبەتی كردووە بە ئەوپەڕی خۆشەویستی و یەكلابوونەوەی بۆ خۆی، تەواوترینی نێو بەندەكانی خوایە و پاكترین و بەڕەوشت ترینیانە، وە كردوویەتی بە پێشەنگ بۆ جیهانیان و سەرجەم بەندەكانی بە گشتی، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب. (سوێند بەخوا




بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی وپێشەوایەتی چاک بۆ کەسێک بەهیوای خواو -پاداشتی- ڕۆژی دواییە وە زۆر یادی خوا دەکات).

وە ئەم ئایەتە هەر وەکو چۆن (إبن كثير) لە تەفسیرەکەیدا[١] گوتوویەتی: بنەمایەکی گەورەیە لە شوێنکەوتن و پەیڕەوکردنی پێغەمبەر ﷺ لە وتەکانی و کردەوەکانی و بارودۆخەکانی.

بێگومان بەشێک لە شوێنکەوتن و پەیڕەوکردنی پێغەمبەر ﷺ بریتیە لە زانست و زانیاری بە هەموو ئەو شتانەی تایبەتن بە پێغەمبەرەوە ﷺ، وە پەیڕەوکردن و شوێنکەوتنی بەرنامەو مەنهەجەکەی و دەست گرتن بە پەیامەکەی بە دی نایەت مەگەر بە شارەزابوون لە ژیاننامەی و ئاگادار بوون لە سەرجەم وردو درشتی تایبەتمەندییەکانی ﷺ، بۆیە پێویستە هەموو مسوڵمانێک گرنگی بدات بە شارەزا بوون لە ژیانی ئەم پێغەمبەرە ﷺ میهرەبانە، گرنگیەک لە پێشی گرنگیدان بێت بە غەیری ئەو لە هەموو مرۆڤەکان، چونکە پاکترینی ناو مرۆڤەکان و چاکترینی بەندەکانە و پێشەنگی جیهانیانە، هەروەها سەیدو گەورەی نەوەکانی ئادەمە.

جا مەبەست لە (الشَّمَائِل) تایبەتمەندییەکانی مرۆڤە، وە وەسف و ڕەوشت و هەڵسوکەوتەکانیەتی، بۆ نموونە: دەوترێ: (فلان حسن الشمائل) واتە: فڵانکەس خوڕەوشتی جوانە، وە دەگوترێ: (كريم الشمائل) واتە: کەسێکی بەخشندەیە، هەر لەبەر ئەوەیە پێشەوا الترمذي رحمه الله و جگە لە ئەویش لە زانایان وەسف و ڕەوشت و ئاکارەکانی پێغەمبەر ﷺ و ئەوەی پەیوەستە پێیەوە لە تایبەتمەندییەکانی ناو ناوە بە (الشَّمَائِل).

جا لە وردبوونەوەی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ چەندین سوودو وەدەست هاتووی مەزنی تێدایە، لەوانە:

**یەکەم**: بێگومان ئەرک و واجبی بڕوادار بڕوابوونە پێی، ئەوەش بەدی نایەت بە ناسینی نەبێت، جا هەرکات زانیاری پێی زیاد بوو ئیمانیش پێی زیاتر دەبێت، شوێنکەوتنیشی بۆی زیاتر دەبێت، چونکە لە ئەرکاکانی ئیمان بوون پێی زانست و زانیاریە دەربارەی خوڕەوشتە بەرزەکانی و وەسفە تەواوەکانی، چونکە هەرکەس بەڕاستی ناسی گومانی

(١) تفسير القرآن الكريم: (٦/٣٩١).

بۆ دروست نابێت لە ڕاستی ئەوو ڕاستی ئەوەی هێناویەتی لە قورئان و سوننەت و ئاینی حەق، چونکە بەڕاستی سیفاتە ستایشکراوەکانی و تایبەتمەندییە جوانەکانی و وتە ڕاست و بەسوودەکانی و کردەوە ژیرانەکانی گەورەترین پاڵنەرن بۆ بڕوابوون پێی، لەبەر ئەوەیە خوای بەرز جەختی کردۆتەوە لە بیرکردنەوەو ڕامان لە پێغەمبەرو ﷺ سیفاتەکانی کە پاڵنەرن بۆ بڕوابوون پێی، خوا فەرموویەتی: ﴿ ۞ قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ٤٦ ﴾ سبأ. (بڵێ من تەنها بەیەک شت ئامۆژگاریتان دەکەم کە دوو دوو، یەک یەک، لەبەر خوا هەڵسن -وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی بن- پاشان بیر بکەنەوە هاوڕێکەتان -پێغەمبەر ﷺ- شێت نیە ئەو -پێغەمبەر ﷺ- تەنها ترسێنەرە بۆ ئێوە لەپێش هاتنی سزای سەختی -قیامەت-).

**دووەم:** خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ فەرزێکە خوا فەرزی کردووە لەسەر بەندەکانی، بەڵکو پێویستە خۆشەویستی ئەو پێشبخرێت بەسەر خۆشەویستی باوک و منداڵ و هەموو خەڵکی بە گشتی، بەڵکو بەسەر نەفسیشدا، ئەویش پەیوەندیەکە لە پەیوەندیەکانی ئیمان، ئیمان تەواو نابێت بەوە نەبێ، گومانی تێدا نیە ناسینی پێغەمبەر ﷺ، وەناسینی تایبەتمەندی و ئاکارەکانی، دڵ پڕ دەکات لە خۆشەویستی و بەگەوەردانان، هەروەها ناسینی پلە و پایەی مەزن و بەرزیشی، (بێگومان بەندە تا زیاتر باسی خۆشەویستەکەی بکات لەناخیدا، وە تا زیاتر باسی چاکەی خۆشەویستەکەی بکات خۆشەویستی بۆی زیاد دەبێ و تامەزرۆیی بۆ گەیشتن پێی زیاتر دەبێ)[1]، وە تا چەند گرنگی بدرێ بە ژیاننامە مەزنەکەی و تایبەتمەندییە گشتگیرەکانی هەروەها سیفاتە بەرزەکانی و ڕەوشت و ئاداب و سوننەتەکانی خۆشەویستی بۆی لە دڵدا بەهێزتر دەبێ.

**سێیەم:** بێگومان خوای پەروەردگار پێغەمبەری کردووە بە سەرمەشقی بەندەکان و پێشەنگ بۆ خەڵکی، وە فەرمانی کردووە بە شوێنکەوتنی و جێبەجێ کردنی پەیام و بەرنامەکەی، بەڕاستی ئەو پێشەوای مەزن و پێشەنگی ڕاستەقینەیە، خوای گەورە

(١) جلاء الأفهام لإبن القيم: (ص ٥٢٥).

فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب. (سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقی وپێشەوایەتی جا بۆ کەسێک بەهیوای خواو -پاداشتی- ڕۆژی دواییە وە زۆر یادی خوا دەکات). وە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر. (وە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی دان وەریبگرن وە ئەوەی لێتانی قەدەغەکرد وازی لێ بهێنن وە لە خوا بترسن بێگومان خوای گەورە سزای سەختە) وە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆش بوێت وە لە گوناهەکانتان خۆش ببێت وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە). وە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ و پەیڕەوکردنی بەشێکە لەناسینی و ناسینی هەموو تایبەتمەندی و ئاکارەکانی.

**چوارەم:** خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوە بەوەی لە پێشتر و دڵسۆزترە بۆ بڕواداران لە نەفس و دەروونی خۆیان، وەک لە بوخاریدا[1] هاتوە، لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلاَّ وَأَنَا أَوْلَى بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، اقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب}. واتە: هیچ بڕوادارێک نیە حەتمەن من لە پێشترو دڵسۆزترم بۆی (لە خودی خۆی) لە دونیا و دواڕۆژدا، ئەم ئایەتە بخوێننەوە گەر دەتانەوێ ڕاستی ئەم قسەی منتان بۆ دەربکەوێ)، (پێغەمبەر ﷺ لە خودی بڕواداران بۆ خۆیان لە پێشترە). چونکە بەو هۆیەوە منەتی هەیە بەسەر هەموو بەدیهێنراوەکاندا، بە دڵنیاییەوە خێر و چاکەیان پێ نەگەیشتووە بە ئەندازەی تۆسقاڵە گەردیلەیەک، وە شەڕو خراپەشیان لێ دوورنەکەوتۆتەوە بە ئەندازەی تۆسقاڵە گەردیلەیەک، مەگەر لەسەر دەستی ئەو یان بە هۆی ئەوەوە، بۆیە پێویستە لەسەریان پلەو پێگە مەزنەکەی ئەو بزانن، هەروەها تایبەتمەندییەکانی بزانن تا زیاتر خۆشیان بوێ و شوێنی پەیامەکەی بکەون و، وەفایان بە حەق و مافەکەی هەبێت.

---

(١) برقم: ٢٣٩٩.




**پێنجەم:** خوا لە قورئانی پیرۆزدا سوێندی خواردووە لەسەر تەواوی و مەزنی ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: ﴿نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ۝١ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ۝٢ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ۝٣ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ۝٤﴾ القلم. (بە -نوون- دەخوێنرێتەوە، سوێند بە پێنووس وبەو دێڕانەی دەینوسن ۝١ تۆ لە سایەیی بەخششی خواوە شێت نیت ۝٢ وە بێگومان پاداشتی نەبڕانەوە هەیە بۆ تۆ ۝٣ وە بەڕاستی تۆ لەسەر ڕەوشت وخویەکی ئێجگار بەرز و گەورەیت ۝٤) ئەمەش شەرەف و ڕێزێکی گەورەیە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، کە بەو شێوەیە وەسفی کردوە، جا کاتێک پرسیار کرا لە (دایکمان) عائیشە رضي الله عنها دەربارەی خوڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ، گوتی: {كَانَ خُلُقُهُ القُرْآن}[1]. واتە: ڕەوشت و ئاکاری ئەو (وەک) قورئان بوو، ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ لە قورئانەوە سەرچاوەی گرتبوو، وتەکانی پڕاو پڕ درێژەپێدەرو ڕوونکەرەوەی قورئان بوو، زانستەکەشی زانستی قورئان بوو، ئیرادەو کردەوەکانی بەو شێوەیە بوو کە قورئان واجبی کردبوو لەسەری و نەخشەی بۆ کێشابوو، پشت تێکردن و وازهێنانی لە هەر شتێک بەو شێوە بوو کە قورئان قەدەغەی کردبوو، حەزو ئارەزووشی هەر بە پێی حەزی قورئان بوو، زوهدو خاکی و سادەیی بوونی هەر بەو شێوەیە بوو کە قورئان ئاماژەی بۆ کردبوو، حەز لێ نەکردنیشی بەو شێوەیە بوو کە قورئان پێی باش نەبوو و لێی ڕازی نەبوو، خۆشویستنیشی بەو شێوە بوو کە قورئان خۆشی دەویست، هەروەها کۆششی بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی و جیهاد کردنیش لە پێناویدا، دایکی بڕواداران رضي الله عنها لە سۆنگەی تەواوی شارەزابوونی بە قورئان و بە پێغەمبەر ﷺ ئەو وتەی فەرموو: {كَانَ خُلُقُهُ القُرْآن}. واتە: ڕەوشت و ئاکاری ئەو (وەک) قورئان بوو، پرسیارکارەکەش لەو مانایە تێگەیشت، بۆیە دڵی ئاوی خواردەوەو بێدەنگ بوو[2]، ئەوەش حاڵی هەرکەسێکە کە ڕێنمایی کرابێت بۆ خوێندنەوەی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە گرنگی پێدابێت دڵی ئاودەخواتەوەو بەسی دەبێت.

---

(١) أخرجه مسلم: ٧٤٦، وأحمد: ٢٥٣٠٢ واللَّفظ له.

(٢) التبيان في أقسام القرآن لإبن القيِّم: (ص ١٩٦)، ويشير إبن القيِّم بقوله: فاكتفى به واشتفى إلى قول راوي الحديث سعد بن هشام بن عامر: ((فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ فَلا أَسْأَلُ أَحَدًا عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَمُوتَ)).




**شەشەم**: خوا فەرمانی کردووە بە بەندەکانی کە صەڵاوات و سەلام لەسەری بدەن، ئەمەش وەک شوێنکەوتنی خۆی و فریشتەکانی کە چۆن صەڵاواتیان داوە، وەک پاداشتێک بۆ پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەندێ لەو مافانەی کە بەسەریانەوە هەیەتی، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ الأحزاب. (بەڕاستی خواو فریشتەکانی سەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ئێوەش سەڵاوات و سەلامی زۆری لەسەر بدەن). جا بەندە تا بەرچاو ڕوون بێ بە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ وە بە چاکی بیانناسێ، ئەوە زیاترو چاکتر صەڵاوات دەدات لەسەری، بۆیە صەڵاواتی خاوەن زانستەکان «ئەوانەی شارەزان بە سوننەت و ڕێنماییەکانی و شوێنی کەوتوون»، پێچەوانەی صەڵاواتی خەڵکانی عەوام و ئاساییە، ئەوانەی کە بەشیان تێیدا بێزارکردنی ئەندامەکانی جەستەیانە پێی، هەروەها بە دەنگ بەرزکردنەوەیان، بەڵام ئەوانەی کە شارەزان بە سوننەتەکانی و زانان بەوەی کە هێناویەتی، ئەوە صەڵاواتدانیان بە جۆرێکی دیکەیە، جا تا زیاتر صەڵاوات بدەن ئەوە خۆشەویستی و ناسینیان بە حەقیقەتی ئەو صەڵاواتەی داواکراوە لەلایەن خواوە زیاتر دەبێ[1].

**حەوتەم**: بێگومان تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ و ژیانی پڕ بەهای، بە بەرنامەی ژیانی هەموو مسوڵمانێک دەژمێردرێ، ئەو مسوڵمانەی کە ئومێدی خێر و بەرزبوونەوەو ژیانێکی خۆش دەکات لە دونیاو دوارۆژ بۆ نەفسی خۆی، منداڵان لەسەر ئەوە پەروەردە دەکاو ژیانی نەوەکانی داهاتووش لەسەر ئەوە بونیاد دەنێ، وە ئەگەر لەو ڕێڕەوە لابدەن ئەوە ئەوەی پێویستە لە دەستی دەدەن وەک دۆخی زۆرێک لە گەنجان لە کوڕان و کچان، کاتێ کە شوێنی خەڵکانی داڕماو دەکەون لە ڕووی ڕەوشت و بەها کۆمەڵایەتیەکان، ئیتر چۆن لادان لە بیروباوەڕو پەرستشیاندا دروست نابێت! وە چۆن لە بەها پیرۆزەکان دەرناچن!

---

(١) جلاء الأفهام لإبن القيِّم: (ص ٥٣١).




ئای ئەوانە چەندە پێویستیان بەم ژیاننامەو تایبەتمەندییە پیرۆزو پڕ بەهایانەی پێغەمبەر ﷺ هەیە، تا لەسەری بوەستن، کە هەرکەس لەسەری بوەستێ و ڕێنمایی لێ وەربگرێ بە تەواوەتی خۆشبەخت و خۆشگوزەران دەبێت بەویستی خوا، خوای بەرزو مەزن خۆشبەختی هەردوو دونیای گرێداوە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ، وە بەدبەختی و نەگبەتی هەردوو دونیای بەستۆتەوە بە پێچەوانە کردنی، بۆیە شوێنکەوتووانی هیدایەت و ئاسایش و سەربەرزی و شکۆو سەرکەوتن و پشتیوانی و خۆشبەختی دونیاو دواڕۆژیان دەست دەکەوێ بە ویستی خوا، ئەوانەشی پێچەوانەی دەکەن سەرشۆڕی و بچووکی و ترس و گومڕایی و بەدبەختی دونیاو دواڕۆژیان دەست دەکەوێ[1].

**هەشتەم**: بێگومان ناسینی پێغەمبەر ﷺ لە مەزنترین ئەو کاروبارانەیە کە ئیمان پێی زیاد دەکات، بەڵکو ئەوە لە مەزنترین ئەو کارانەیە کە ئیمان هێنان واجب دەکات لە حەقی ئەو کەسەی بڕوای نەهێناوە، وە ئیمانی ئەو کەسەش زیاد دەکات کە ئیمانی هێناوە، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾﴾ المؤمنون. (یان پێغەمبەرەکەیان نەناسیووە بەو هۆیەوە ئەوان دان بە پێغەمبەرایەتیەکەیدا نانێن). واتە: ناسینی پێغەمبەر ﷺ هۆکارێکی مەزنە بۆ بەدەستهێنانی ئیمان، بۆ ئەو کەسەی کە ئیمانی نەهێناوە، بێگومان خەڵکانێک هەبوون لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ساڵانێک هیچ کەس ئەوەندەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر زەویدا لەلایان بوغزێنراوتر نەبوو، بە هۆی ئەو بانگەشە درۆینانەی کە دەربارەی دەکراو دەگوترا، بەڵام هەریەکەیان کاتێ کە لێی نزیک دەبووەوە، ڕەوشت و مامەڵەکردنی دەبینی یەکسەر دەگۆڕاو ئەوەندەی خۆش دەویست، هیچ کەس لەسەر زەویدا ئەوەندەی ئەو ﷺ خۆشەویستر نەدەبوو لە لای.

جا هەر کەس ژیانی پێغەمبەری ﷺ خوێندبێتەوە چیرۆکی زۆرێک لەوانە دەبینێت مسوڵمان بوون، هۆکاری مسوڵمان بوونیان بریتی بوو لە وەستانیان لەسەر تایبەتمەندیی و ڕەوشت و ئاکارەکانی، ئەمەش مانای وتەی خوایە ﷻ کە فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا

---

(١) زاد المعاد لإبن القيّم: (١/٣٦).





رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ ﴿١٥٩﴾ آل عمران.

(بەهۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرم و نیان بویت ئەگەر تۆ بەدخوو قسە ڕەق و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوە هەموو بڵاوەیان دەکرد لەدەورت). سەرەڕای ئەو هەموو سوودە مەزن و بەرهەمە گەورانەی کە دەیچنێتەوە، ئەو کەسەی خوا ڕێزی لێگرتووە لەسەر تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ وەستاوەو بە چاکی خوێندویەتیەوە.

جا هەرکەس تەواوترین ئاداب و چاکترین ڕەوشتەکانی دەوێ تەنها لە ڕەوشت و ڕێنمایی و ئاکارەکانی پێغەمبەردا ﷺ دەستی دەکەوێ، ئەمەش ئەوە واجب دەکات گرنگی زۆر بدرێت بە تایبەتمەندیی و ئاکارو ئادابەکانی پێغەمبەر ﷺ.

لێرەدا دوو دەقی گەورە دەخەمە ڕوو:

**یەکەمینیان:** هی سوفیانی کوڕی عویەینەیە، کە خەتیبی بەغدادی بە سەنەدی خۆی لە پێشەکی کتێبەکەیدا (الجامع لأخلاق الرَّاوي وآداب السَّامع)[1] گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ گەورەترین تەرازووە، سەرجەم شتەکان بەو تەرازووە دەپێورێن لە سەر ڕەوشت و ژیاننامەو ڕێنماییەکانی، جا هەر شتێک لەگەڵ ئەوانەدا ڕێک بێتەوە ئەوە حەق و ڕاستە، هەر شتێکیش پێچەوانەیان بێ ئەوە پووچ و بەتاڵە.

**دووەمینیان:** هی پێشەوا (إبن القيم)ـە، کە لە کتێبی: (زاد المعاد)دا[2] کاتێک کە پلەوپایەی پێغەمبەران ڕوون دەکاتەوە دەڵێ: ئەوان تەرازووی قورسن، کە لەسەر وتەو کردارو ڕەوشتی ئەوان، وتەو کردەوەو ئاکارەکان دەپێورێن، وە بە شوێنکەوتنیان هیدایەت دراوان جیادەکرێنەوە لە گومڕایان، جا پێویست بوون بە ئەوان مەزنترە لە پێویست بوونی جەستە بە ڕووح، وە چاو بە ڕووناکی، وە ڕووح بە ژیان، جا چی گرنگی و پێویستیەک فەرزکراوە ئەوە پێویست بوونی بەندە بە پێغەمبەران لەوە پێویستترە، وە گومانت چۆنە ئەگەر هیدایەتی ئەوت لێ ون بێ بە ئەندازەی چاو تروکانێک، ئەوە دڵت فاسد دەبێ و تێکدەچێ، وەکو نەهەنگێکی لێ دێ کە لە دەریا دەربکرێ و لە دەشتایی دابنرێ، دۆخی مرۆڤیش کاتێ کە دڵی لە پەیامی پێغەمبەران

---

(١) (٩/١).

(٢) (١/ ٦٩_٧٠).




جیادەبێتەوە، هەروەک و حاڵی ئەو نەهەنگە وایە، بێگومان کەس هەست بەو دۆخە ناکات مەگەر دڵێکی زیندوو.

ئایا مردوو بە بریندار کردن ئێشی پێ دەگات؟!

وە ئەگەر خۆشبەختی بەندە لە هەردوو دونیادا پەیوەست بێ بە شوێنکەوتنی پەیامی پێغەمبەر ﷺ، ئەوە پێویستە لەسەر هەر یەکێک لەو کەسانە کە ئامۆژگاری نەفسی خۆی دەکات و حەز دەکا ڕزگاری بێ و خۆشبەخت بێ شوێنی ڕێنمایی و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بکەوێ، تا بە هۆیەوە دووربکەوێتەوە لە نەفامەکان، وە بچێتە چوارچێوەی شوێنکەوتووانی و کۆمەڵەکەی، خەڵکیش لەو نێوەندەدا هەیە سوودمەندەو هەیە بێ بەشە، فەزڵ و چاکەش بەدەستی خوایە، بەو کەسەی دەبەخشێ کە دەیەوێ، وە بێگومان خوا خاوەن فەزڵی مەزنە.

وە بە پوختی یەکێک لەو نازو نیعمەتە مەزنانەی خوا لەسەر بەندەکەی ئەوەیە: کاری بۆ ئاسان بکات تا شارەزا بێت لە تایبەتمەندیی و ئاکارە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئەمەش بەشێکی مەزنە لە بەشەکانی خێرو بەختەوەری، وە ڕێزو منەتێکە لەلایەن خواوە بەسەر هەر بەندەیەکدا کە بیەوێ لە بەندەکانی.

پاشان بەڕاستی ئەم پەرتووکە پیرۆزە کە لەژێر دەستماندایە (الشَّمَائِل النَّبِيّ ﷺ للإمام الترمذي) لە مەزنترین و بە سوودترینی ئەو کتێبانەیە کە دەربارەی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ نووسراون، بێگومان نووسەرەکەی جەختی کردۆتەوە لە ناوەڕۆکی ئەم بابەتەو بە گشتگیری هێناویەتی، وە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕێکی خستووە، هەروەها کۆی کردۆتەوە بە کۆکردنەوەیەکی کورت، نە ئەوەندە درێژە بێزارکەر بێ، نە ئەوەندەش کورتە مانا نەدا بەدەستەوە، بەڵکو مام ناوەندە لە قەبارەداو بە فراوانی بابەتەکەی باسکردوە، (إبن كثير) لە كتێبەكەیدا (البداية والنهاية)[1] ئاماژەی بەوە کردووەو گوتوویەتی: خەڵکی لە کۆن و لە ئێستادا دەربارەی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ کتێبی زۆریان نوسیوە، بەڵام چاکترینی ئەو کتێبانەو سوودبەخشترینیان کتێبەکەی ئەبو عیسا موحەممەدی کوڕی عیسای کوڕی سەورەی الترمذیە کە بەناو

---

(١) (١٣/٦).

بانگە بە (الشَّمَائِل) ئێمەش بە بیستن تا دەگاتەوە بە ئەو وەرمان گرتووە (واتە: بە سەنەد وەرمان گرتوە).

پاشان ناوەڕۆکی ئەوەی الترمذي ﷺ هێناوە تیایدا، شتانێکی گرنگی لەسەری زیاد کردووە فەرموودە ناس و فەقیھ بێنیاز نابن لێی، دەستی پێکردوە بە جوانی سەرنجڕاکێشی پێغەمبەر ﷺ، پاشان دوای ئەوە بە تێرو تەسەلی چووەتە نێو بابەتەکەوە.

موحەممەدی کوڕی ڕەئوفی مەنناوی کە لە ساڵی (١٠٣١ ھ) کۆچی دوایی کردوە، لە پێشەکی شەرحی (الشَّمَائِل)دا دەڵێ: پەرتووکی (الشَّمَائِل) هی زانای ڕیوایەو زانای دیرایە، پێشەوا الترمذي ﷺ پەرتووکێکی تاکە لە بەشەکەیدا، بێھاوتایە لە ڕێکخستنیدا، هیچ کەس هاوشێوەی ئەو نەیهێناوە، بەرنامەیەکی داهێنەری گرتۆتەبەر، بە جوانترین شێوە فەرموودەکانی داناوەو ڕێکی خستووە، تا ئەو پەرتووکە ئەژمار کراوە لە بەهرەمەندیەکان، لە خۆرهەڵات و خۆر ئاوادا دەنگی داوەتەوە.

مولا عەلی ئەلقاری دەڵێ[1]: لە چاکترینی ئەو پەرتووکانەی نووسراون دەربارەی تایبەتمەندی و ئاکارەکانی پێغەمبەر ﷺ پەرتوکی پێشەوا الترمذیە کورتکراوەیەکی گشتگیرە بە شێوەی تەواو، بە جۆرێک خوێنەری ئەو پەرتووکە وەکو ئەوە وایە لە خزمەتی ئەودا بووبێت، وە لە هەموو لایەکەوە چاکەکانی ببینێ، پاشان لە ئیبنو لجەزیرەوە گواستویەتیەوە دەڵێ[2]:

أَخِلاَّيَ إِنْ شَطَّ الحَبِيبُ وَرَبْعُهُ
وَعَزَّ تَلَاقِيهِ وَنَاءَتْ مَنَــازِلُهْ
وَفَاتَـكُمُ أَنْ تُبْصِرُوهُ بِعَيْنِكُمْ
فَمَا فَاتَـكُمْ بِالسَّمْعِ هَذِي شَمَائِلُهْ

وە وتەی زانایان لە پیاهەڵدانی ئەم پەرتووکە و دەرخستنی جوانیەکانی و سوودو وەدەست هاتوەکانی زۆرن، بەهەمان شێوە گرنگیدانی زانایان بەم پەرتووکە «لە کۆن

---

(١) جمع الوسائل في شرح الشَّمائل: (٢/١).

(٢) وقد نظمهما ﷺ في ختم كتاب الشَّمائل، كما في الضَّوء اللأمع للسَّخاوي: (٤/٤٤١).

و لە ئێستادا» جۆراو جۆرە، هەیە کورتی کردۆتەوە، هەیە پاڵفتەی کردوە، هەیە شی کردۆتەوەو هەیە وەکو شیعر دایڕشتووە .... جگە لەمانەش کۆششی زۆر بە سوود کراوە بۆ خزمەتی ئەم پەرتووکە، لە پاڵ ئەوەشدا لە کۆڕو مەجلیسە زانستیەکاندا گوتوویانەتەوە[1]. زانایان وەسیەتیان کردووە بە گرنگی پێدان و سوود وەرگرتن لێی.

پێشەوا الترمذي ﷺ پەرتوکەکەی (الشَّمَائِل) ڕێکخستووە بە ڕێکخستنێکی زۆر وردو بە سەلیقە، هەروەها بە شێوەیەکی داهێنەرانە بەشەکانی دابەش کردوە، کردوویەتی بە پەنجاو شەش بەش، چوارسەدو پازدە فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ تیادا کۆکردوەتەوە.

سەرەتا بە سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی دروست کردنەوە دەستی پێکردوە، بۆ نموونە: درێژی باڵای و ڕەنگی پێستی و قژی، هەروەها ڕوخساری، وە جگە لەوەش چەندین سیفاتی دروست کراوی دیکەی باسکردوە.

پاشان دوای ئەوە قسەی لەسەر پێویستی و بژێوی و خواردن و کەل و پەلەکانی کردوە، جا هەرچی پەیوەندی بە شمشێرەکەیەوە هەبووبێ باسی کردوە، هەروەها ئەوەشی پەیوەندی بە جل و بەرگەکانیەوە بووبێ باسی کردوە، وە هاوشێوەی ئەوە لە کاروبارەکانی دیکەشی.

پاشان قسەی لەسەر تایبەتمەندییەکانی و ڕەوشت و ئاکارو هەڵس و کەوتەکانی کردوە.

پاشان باسی پەرستش و عیبادەتەکانی کردوە.

پاشان کتێبەکەی کۆتایی پێ هێناوە بە بینینی پێغەمبەر ﷺ لە خەودا، باسی یاسا و ڕێساکانی ئەو خەوەی کردووە کە تاچەند ڕاستە، ئەگەر بەندە لە خەودا ببینێ (و بە خزمەتی بگات)، وە لە یاسا و ڕێساکانی ئەو خەوە «وەک لە کۆتایی کتێبەکەدا باسی کردوە» زانست و زانیاریە بە سیفەتەکانی، بۆیە کاتێ پیاوێک بە ئیبنو عەبباسی وت: من لە خەودا پێغەمبەرم ﷺ بینیوە، گوتی: وەسفم بۆ بکە چۆن بینیوتە؟ کاتێ

---

(١) وقد أكرمني الله ﷻ بشرح هذا الكتاب المبارك في خمسةٍ وأربعين مجليساً في مسجد النّبيّ ﷺ أودعتُ حاصِلَها في هذا الكتاب.

پیاوەکە وەسفی ئەوەی کرد کە لە خەودا بینیویەتی ئیبنو عەبباس پێی وت: ئەگەر لە کاتی بێداری و بەئاگایش بتبینیایە نەتدەتوانی لەوە زیاتر وەسفی بکەی[١]، جا یەکێک لە جوانیەکانی نووسەر لەم کتێبەدا ئەوەیە: سەرەتا پەرتوکەکەی بە باسی ئەو سیفەتانەی پێغەمبەر ﷺ دەست پێکردوە کە دروستکراوە، پاشان کۆتایی پێ هێناوە بە خەوبینین پێیەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ رَأَنِي فِي المَنَامِ فَقَدْ رَأَنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّل بِي}[٢]. واتە: هەر کەس لە خەودا من ببینێ، ئەوە بە دڵنیایی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ خۆی بچوێنێ بە من.

کەواتە: زانینی سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ سوودو قازانجی مەزنی هەیە لەوانەش: ئەوەی پەیوەستە بە دڵنیایی بوون لەوەی خەوبینین پێیەوە ڕاستە یان نا، جا خەڵکانێک لەم بوارەدا پێیان خزاوەو خەڵکانێکی دیکەش گومڕابوون، جا چەندین کەس خەڵکانێک هاتوون بۆ لایان گوتوویەتی: ئەو لە خەودا پێغەمبەری ﷺ بینیوە، بەڵام وێنەکەی بەو شێوەیە نەبووە کە لە پەرتوکەکانی شەمائیل و پەرتوکەکانی ژیاننامەیدا هاتوە، ئەوەی کە ئەو بینیویەتی ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نیە.

جا چەندین کەس لە مرۆڤەکان خزاونەتە ناو بیدعەو خورافیاتەوە، جۆرە پەرستشێکی کردووە کە خوا هیچ پەیامێکی لەو بارەوە دانەبەزاندووە، بە گومانی خۆی کە گوایە ئەو لە خەودا پێغەمبەری ﷺ بینیوە، بەڵام گومانی تێدانیە پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی نەکرد تا خوای گەورە ئاینەکەی پێی تەواو کرد، خوا فەرموویەتی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ ﴿٣﴾﴾ المائده. (ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو -کامڵ- کردووە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کەئیسلام ئایینتان بێت).

پاشان ئەم پەرتووکە خاوەنەکەی ناوی ناوە: (شَمَائِلُ النَّبِي ﷺ) ئەوەش زانراوە لەو لەبەرگیراوانەی کە بەدەستنووس نووسیویەتی لەسەری (شَمَائِلُ النَّبِي ﷺ)، وە هەروەها بەوەش دەناسرێتەوە زانایانی پێشوو ئەو ناوەیان لەم پەرتوکە ناوە، جا هەندێکیان کورتی کردۆتەوە "وەک (إبن کثیر)" ناویناوە بە (الشَّمَائِل) بە لابردنی

---

(١) سيأتي عند المصنّف برقم: ٤١٠.

(٢) أخرجه البخاري: ١١٠، ومسلم: ٦٠٥٦، من حديث أبي هريرة ﷺ

وشەی (النَّبي) وە لە جێگایدا (أل) تەعریفی داناوە، جا ئەم کورتکردنەوە زۆرێک لە زانایان پێی هەڵساون، بۆ نموونە: دەگوترێ (العمدة) لە بری (عمدة الأحكام) وە دەگوترێ: (الميزان) لە جیاتی (ميزان الأعتدال) وە دەگوترێ: (الفتح) لە جیاتی (فتح الباري) وە دەوترێ: (التيسير) لە جیاتی (تيسير العزيز الحميد)... بەو شێوەیە.

هەندێک لە زانایانی دوایین وشەیەکیان داوەتە پاڵ (الشَّمَائِل) دەڵێن: (الشَّمَائِل المُحَمَّدِية) جا ئەم دانەپاڵە لەم دواییانەدا بووە، ئەگەرچی لە ڕووی ماناوە هیچ گرفتێکی نیە.

خوای گەورە بۆی ئاسان کردم «تەنها ئەو پشتیوان و یارمەتیدەرە» لە دانانی ئەم شیکردنەوەیە بۆ کتێبی شەمائیل، جا بە شێوەیەکی ناوەند شیم کردۆتەوە، نە ئەوەندە درێژە خوێنەر بێزار بکات، نە ئەوەندەش کورتە سوود بە خوێنەر نەگەیەنێ[1]، ئومێدم هەیە خوا بە هۆیەوە سوود بگەیەنێ بە خوێنەرەکانی، وە بە چاکترین شێوە لێم وەربگرێ، وە ئێستا دەست دەکەم بەوەی کە مەبەستە، پشتیوان بە خوای بەرزو مەزن، داوا دەکەم خوا یارمەتیم بدا و بۆم ئاسان بکات، چونکە بەڕاستی تەنها ئەو پشتیوانەو هیچ هاوبەشێکی نیە.

---

(١) وقد أفدتُ في النَّواحي الحديثيَّة من مختصر الشَّمائل للشَّيخ الألباني: ﷺ ومن كُتبه الأخرى.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی دروستکرانی شێوەی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي خَلْقِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.





دانەر ﵀ ئەو بەشەی تایبەت کردووە بە ڕوونکردنەوەو باسکردنی هەر شتێک کە پەیوەندیدار بێت بە سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی درێژیی باڵایی و ڕەنگی (پێست و) پرچ (و موو)و جگە لەوانەش، بەڵام دەربارەی سیفەت و ڕەوشتە بەرزەکانی کە زۆر زۆرن، لە دوایی دا باسکردنیان دێت (إِنْ شَاءَ اللَّه) لە بابەتەکانی داهاتوو.

بێگومان خوای گەورە ڕێزێکی زۆری ناوە لە پێغەمبەرمان ﷺ بەوەی کە بە جوانترین و تەواوترین شێوە دروستی کردوە، هەروەکو چۆن ڕێزی لێناوە بەوەی جوانترین و باشترین خووڕەوشتی پێ بەخشیوە، پێشەوا ئیبنو تەیمیە ﵀ لە کتێبی (الجواب الصحیح)[1]دا کاتێک دەربارەی نیشانەو بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ دەدوێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شێوەو دروستکرانەکەی لە تەواوترین و ڕێکوپێکترین شێوەدا بوو، وە هەرچی سیفەتێکی جوان هەبوو کە بەڵگەی تەواوین (بۆ مرۆڤ) تێیدا کۆببوویەوە، جا خوا ڕێزی لێناوە بە دروستکرانێکی جوان و شێوەیەکی جوان، کە هەرچی جوانی هەیە تێیدا کۆببوویەوە.

دانەر ﵀، دەڵێ:

**١-** حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلَا بِالْقَصِيرِ، وَلَا بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ، وَلَا بِالْآدَمِ، وَلَا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلَا بِالسَّبْطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً، وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ»[2].

واتە: ئەبو ڕەجاء (واتە:) قوتەیبەی کوڕی سەعید بۆی گێڕاینەوە لە مالیکی کوڕی ئەنەس، ئەویش لە ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، ئەویش لە ئەنەسی کوڕی مالیکی ﵁ بیستوە، کە گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ باڵا درێژێکی ئاشکراو دیار نەبوو، وە کورتیش نەبوو، وە ڕەنگی پێستی زۆر سپی بوو، وە ئەسمەریش نەبوو، پرچی

---

(١) ٥/٤٣٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٩٠٠، ومسلم: ٢٣٤٧، والمصنّف في جامعه: ٣٦٢٣.



نە لوول و نە خاو بوو، خوای بەرز بە پێغەمبەرایەتی ڕەوانەی کرد لە سەرەتای (تەمەنی) چل ساڵیی دا، جا دە ساڵ مایەوە لە مەککە، دە ساڵانیش لە مەدینە (مایەوە)، وە خوای بەرز لە سەرەتای شەست ساڵی گیانی پێ سپارد (مراندنی)، (تا ئەو تەمەنەش) بیست تاڵە مووی سپی لە سەرو ڕیشیدا نەبوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «**كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلَا بِالْقَصِيرِ**» باسکردنی درێژی پێغەمبەری خوایە ﷺ، کە باڵای ناوەنجی بووە لە نێو زۆر درێژ بوون و تێپەڕاندن تێیدا، وە کورت بوونێک کە لاشەی کورت دیـار بێت، وە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر بە لای درێژی دا بوو، نەک بە لای کورتی، هەروەک ئەمە زۆر بە ڕوونی هاتوە لە هەندێک ڕیوایەتدا[1] بۆیە ئەنەس رضي الله عنه بەوە وەسفی کردوە کە درێژیەکەی هێندە زۆر نەبووە (پێوەی دیارو ئاشکرا بێت)، لە بەرامبەردا باسی کورتیەکەی نەکردوە، چونکە (وەک گوتمان) پێغەمبەر ﷺ زیاتر بە لای درێژی نزیکتر بووە.

کە دەڵێ: «**الْبَائِنِ**» گوتراوە: لە (بَانَ، يبِينُ، بَيَاناً)ـەوەیە، ئەگەر ئاشکراو دیار، وە گوتراویشە: لە (بان، يبونُ، بوناً)ـەوەیە، ئەگەر دوورکەوتەوە، مەبەستیش لەمەدا ئەوەیە درێژییەکەی لە سنووری ڕێک و تەواوی بەدەر نەبووە.

کە دەڵێ: «**وَلَا بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ، وَلَا بِالْآدَمِ**» ڕوونکردنەوەیە بۆ ڕەنگی پێستی پێغەمبەری خوا ﷺ، (بە کەسێک) دەگوترێ: (أَبْيَض أَمْهَق) ئەگەر سپیەکەی صاف و ڕوون بێ، ئەسمەری و سووری و جگە لەو ڕەنگانەی تێکەڵاو نەبووبێ، (الآدَم) واتە: ئەسمەر (گەنمی)، مەبەستیش لەم قسانە ئەوەیە کە ڕەنگی سپیەکی زۆر تۆخ نەبوو، هەروەکو گەنمیەکی زۆر تۆخ نەبووە، بەڵکو ڕەنگی پێغەمبەر ﷺ سپیەکی تێکەڵ بە سووری بوو، وەک دوایی باسی دەکەین کە لە هەندێک فەرموودەدا باسکراوە.

کە دەڵێ: «**وَلَا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلَا بِالسَّبْطِ**» ڕوونکردنەوەیە بۆ شێوەی مووی پرچی ﷺ، کە مامناوەند بووە، «**وَلَا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ**» زۆر لوول نەبوو، تێکەڵ بێ و هەندێکی

---

(١) كما في الأدب المفرد: ١١٥٥، ومسند البزّار: ٧٧٨٩ من حديث أبي هريرة رضي الله عنه

بچێتە نێو هەندێکی بە هۆی لوولیەکەی، «وَلَا بِالسَّبْطِ» (واتە: زۆر خاویش نەبوو) کە برچێکی زۆر خاوەو شۆڕدەبێتەوە، بەڵکو لەو نێوانەدا بوو.

کە دەڵێ: «بَعَثَهُ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً» واتە: پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدراو ئاگادار کرایەوە (کە دەبێ بە پێغەمبەر ﷺ) دوای ئەوەی تەمەنی چل ساڵی تەواو کرد.

کە دەڵێ: «فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ» دوای ئەوەی نێردرا بە پێغەمبەر ﷺ (دە ساڵ بە ئاشکرا بانگەوازی کرد لە مەککەو مایەوە)، لە هەندێک ڕیوایەت هاتوە کە سێزدە ساڵ ماوەتەوە (لە مەککە)، ئەوەش ئەو ماوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ماوەتەوە لە مەککە دوای نێردرانی، کە ئەو لە کۆتایی تەمەنی چل ساڵی نێردرا، وە دوای ئەوەی سێزدە ساڵی پێغەمبەرایەتی تەواو کرد، کۆچی کرد (بۆ مەدینە)، وە ئەوەی دەڵێ: دە ساڵ مایەوە لە مەککە، ئەوەی لێوەردەگیرێ مەبەست پێی ماوەی ئاشکراکردنی پێغەمبەرایەتییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێک کرا بە پێغەمبەر، سێ ساڵ بە نهێنی بوو (بانگەوازەکەی)[1]، وە لەوەش ڕوونتر قسەی ئەو کەسەیە کە دەڵێ: ئەوەی دەڵێ: دە ساڵ مایەوە لە مەککە، مەبەستی پێی ئەوەیە دوای دابەزینی سوورەتی (المدثر)و، فەرمان پێکرانی بە ئاگادار کردنەوەی خەڵکی، وە ئەوەی دەڵێ: سێزدە ساڵ مایەوە مەبەست پێی ئەوەیە بە سێ ساڵی پێش ئەوەی فەرمانی پێ بکرێ بەوەی خەڵک ئاگادار بکاتەوە، یانیش گێڕەرەوەی فەرمووده سێ ساڵەکەی باس نەکردبێ (چونکە لە نێو عەرەبدا باو بووە).

کە دەڵێ: «وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ» واتە: دوای کۆچ کردنی، دە ساڵ مایەوە لە مەدینە.

کە دەڵێ: «وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً» بۆچوونی تەواو سەلمێنراو ئەوەیە کە خوای بەرز لە کۆتایی تەمەنی شەست و سێ ساڵی وەفاتی پێ فەرمووەو (ڕووحی بۆ لای خۆی بەرز کردۆتەوە)، ئەم ڕیوایەتە بەو شێوەیە لێکدراوەتەوە: کە ئەو سێ ساڵە باس نەکرابێ (چونکە لە نێو عەرەبدا باس نەکردنی نێوان دوو ژمارە باو بووە).

کە دەڵێ: «وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ» واتە: مووی سپی لە ڕیشی ﷺ، وە لە سەری زۆر کەم بوو، بە جۆرێک نەدەگەیشتە بیست تاڵە موو.

---

(١) صفة الصَّفوة لإبن الجوزي: ١/١١٦.



٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَبْعَةً، لَيْسَ بِالطَّوِيلِ وَلَا بِالْقَصِيرِ، حَسَنَ الْجِسْمِ، وَكَانَ شَعْرُهُ لَيْسَ بِجَعْدٍ وَلَا سَبْطٍ أَسْمَرَ اللَّوْنِ، إِذَا مَشَى يَتَكَفَّأُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ (باڵای) مامناوەند بوو، نە درێژ بوو، وە نەکورتیش بوو، لاشەیەکی جوانی هەبوو، وە مووی سەرو قژی نەلوول بوو، نەخاوو شۆڕ بوو (بەڵکو بە جوانترین شێوە دەوەستا)، ڕەنگی (پێستی) گەنمی بوو، لە کاتی ڕۆیشتندا بەرەو پێشەوە دەچەمایەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَبْعَةً» لە هەندێک ڕیوایەتی دیکە بە (مَرْبُوعًا) دێ، کە هەردووکیان یەک مانایان هەیە، مەبەست لێیان مامناوەندییە لە باڵاو بەژنیدا، ئەمەشی بەو قسە ڕوونکردۆتەوە کە دەڵێ: «لَيْسَ بِالطَّوِيلِ وَلَا بِالْقَصِيرِ» واتە: ناوەنجی و ناوەند بووە، لە نێوان ئەو دووانەدا بوو.

کە دەڵێ: «حَسَنَ الْجِسْمِ» واتە: خوا ﷻ منەت و چاکەی ئەوەی لەگەڵ کردبوو لاشەیەکی هاوسەنگ و ڕێک و پێکی پێدابوو، کە هەموو ئەندامەکانی لاشەی گونجاو بوون بۆ یەکدی، جا بۆیە لاشەی پیرۆزی ﷺ زۆر جوان بوو، ئەندامەکانیشی ڕێک و شیاو گونجاو بوون، لەوبارەوە وتەی ئیبنو تەیمییە ﷺ باسکرا لە فەرموودەی ڕابردوودا.

کە دەڵێ: «وَكَانَ شَعْرُهُ لَيْسَ بِجَعْدٍ وَلَا سَبْطٍ» واتە: پرچی ناونجی بوو (نە زۆر درێژو، نە زۆر کورت بوو)، وەک لە فەرموودەی پێشتر ئەم ڕستە تێپەڕی (و باسکرا).

کە دەڵێ: «أَسْمَرَ اللَّوْنِ» پێشتر لە فەرموودەی ئەنەس ئەوە باسکرا کە پێغەمبەر ﷺ: «وَلَا بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ، وَلَا بِالْآدَمِ» نە سپییەکی زۆر تۆخ بوو، نە گەنمی و ئەسمەر بوو، کەچی لێرەدا دەڵێ: ڕەنگ گەنمی بوو، بۆیە هەندێک لە زانایان وا دەبینن کە ئەم بێژەی (أَسْمَرَ) جێگیر نەبووە، تەنها حومەیدی کوڕی ئەنەس باسی کردووەو، جگە لەو، ڕاویەکانی دیکە بە پێچەوانەی ئەویان گێڕاوەتەوە، جا دەڵێن: خۆی بێژەی: (أَزْهَرَ اللَّوْنِ)، واتە: ڕەنگی گوڵی هەبووە، وە هاتوە لە جیاتی (أَسْمَرَ اللَّوْنِ).

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٧٥٤ وقال: حسن صحيح غريب.




جا هەندێکیش لە زانایان ئەمەیان بەوە لێکداوەتەوە کە مەبەست لە (السمرة) بریتیە لە سوورایيەکی کەم، کە سپیایی لەگەڵ بێ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سپیایتیەکەی کەمێک لە سووری لەگەڵ بوو.

دەڵێ: «إِذَا مَشَى يَتَكَفَّأُ» واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەڕۆیشت بە ڕێگادا وەک ئەوە وابوو لە شوێنێکی لێژ بێتە خوار، دواتر فەرموودەی عەلی ؓ دێ کە وەسفی ڕۆیشتنی دەکات کە: {إِذَا مَشَـى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤاً كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ}[1]. واتە: کاتێ کە دەڕۆیشت بە ڕێگادا بەرەو پێشەوە دەچەمایەوە، وەک ئەوەی لە شوێنێکی لێژ بێتە خوارەوە. ئا ئەوە شێوەی ڕۆیشتنی بوو ﷺ.

٣- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ ؓ يَقُولُ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً مَرْبُوعاً بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ، عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، مَا رَأَيْتُ شَيْئاً قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ»[2].

واتە: ئەبو ئیسحاق دەڵێ: لە بەڕائی کوڕی عازیبم ؓ بیست دەیگوت: «پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی چوار شانە بوو، نێوان شانەکانی لێک دوور بوو (واتە: پان بوو)، قژێکی درێژی هەبوو، هەتاکو نەرمایی گوێیەکانی (درێژ ببوویەوە) دوو پۆشاکی سوورباوی پۆشیبوون، (پێشتر) هیچ شتێک و هیچ کەسێکی لەو جوانترم نەبینی بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «رَجُلاً مَرْبُوعاً» ئەمە وەک قسەی ئەنەسە کە لە فەرموودەی ڕابردوودا گوتی: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَبْعَةً»، (رَبْعَةً) و (مَرْبُوعاً): بە مانای ڕێک و ڕاستی و چوارشانەیی دێن، (لە ڕووی باڵاشەوە) نە زۆر درێژێکی دیارو، نە کورتیش بوو، بەڵکو مامناوەند بوو، هەڵبەت هەموو ئەو وەسفانەی باس دەکرێن لە ڕووی نزیک خستنەوەی شێوەو ڕووخسارو پێکهاتەی لاشەی پێغەمبەری خوایە ﷺ (بۆ ئێمە)، ئەگەرنا (خۆشەویستمان ﷺ) زیاتر بە لای درێژی نزیکتر بووە نەک لە کورتی.

---

(١) انظر: (ح ٥).

(٢) أخرجه البخاري: ٣٥٥١، ومسلم: ٢٣٣٧.





کە دەڵێ: «بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ» (واتە: نێوان شانەکانی لێک دووربوون)، بە (بَعِيْدَ) و (بُعْدَ) دەگێردرێتەوە بە گەورەیی و بچوککراوەیی (منكب): شوێنی کۆبوونەوەی شان و پیلە، کە دەڵێ: «مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ» واتە: لای ڕاستە و چەپەی، مەبەستیش ئەوەیە کە لای سەرەوەی پشتی لێک دوورو پان بووە.

کە دەڵێ: «عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ» دیارە پرچ (قژیش) بە گوێرەی درێژییەکەی سێ جۆرە، ئەوانیش: (الجُمَّة) و (الوَفْرَة) و (اللِّمة): کە هەر سێ جۆریش هاتوون و باس دەکرێن، لە وەسفی پرچی پێغەمبەری خوا ﷺ.

زانایانی زمانەوانی لەوبارەوە بۆچوونی جیاوازیان هەن:

**الوفرة**: (ئەو پرچەیە) کە درێژ دەبێتەوەو دێتە خوار تا دەگاتە نەرمایی گوێ، وە نەرمایی گوێ بەشە نەرمەکەی خوارووی گوێیە، بە نسبەت ئافرەتان ئەو شوێنەیە کە کون دەکرێ و گوارەی تێدەخرێ.

**اللِّمة**: (ئەو پرچەیە) کە لە نەرمایی گوێ درێژ دەبێتەوەو دێتە خوار، جا بگاتە سەر شانەکان، یاخود نەیگاتێ.

**الجمة**: (ئەو پرچەیە) کە دەگاتە سەر هەردوو شان.

کە دەڵێ: «عَظِيمَ الْجُمَّةِ إِلَى شَحْمَةِ أُذُنَيْهِ» مەبەست لە (جمة) لێرەدا قژو پرچە، واتە: پرچێکی زۆرو پڕی هەبوو (نەک تەنک و بێهێز)، تا نەرمایی گوێی هاتوە، ئەگەرنا خۆی پرچێک کە درێژبێتەوە تا نەرمایی گوێ، پێی دەگوترێ: (الوفرة)، (بەڵام کە لە تەنیشتەوە وەسفی کردووە بۆیە گوتوویەتی تا نەرمایی گوێ، بەڵام لە پشتەوە کە تەماشای بکرێ گەیشتۆتە سەر شانی).

کە دەڵێ: «عَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ» (حُلَّة) بە ڕەهایی بە مانای پۆشاک نایێ، مەگەر لە دوو بەش پێکهاتبێ، بەشی سەرەوەو خوارەوە، دەشگوترێ کە هۆکاری ناولێنرانی بەو ناوە ئەمەیە کە یەکێکیان بەسەر ئەوەی دیکەدا دێتە خوار.

پێغەمبەر ﷺ لێی گێردراوەتەوە: نەهی کردووە لە پۆشینی پۆشاکی سوورێکی صاف و تیر، وەک بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: {نَهَانَا النَّبِيُّ ﷺ عَنْ الْمَيَاثِرِ الْحُمْرِ}[1]. واتە:

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٣٨، ومسلم: ٢٠٦٦.



پێغەمبەر ﷺ لێی قەدەغە کردین لە پۆشینی پۆشاکی صاف سوور، کە هیچ ڕەنگی دیکەی لەگەڵ نەبێت.

تێبینی: **الْمَيَاثِر**: ڕاخەرێک بوو لەسەر کورتانی ئەسپ، یان پشتی وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو، لە حەریر دروست دەکرا، ئەوە پیشەی لووتبەرزەکان بوو).

جا هەندێک لە زانایان دەڵێن: بۆ پێکەوە کۆکردنەوەو پەیوەست کردنی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ خۆی پۆشاکی سووری پۆشیوەو کەچی (لە فەرموودەی دیکەدا) نەهی کردووە لە پۆشینی ئەوەیە کە بگوترێ: نەهیەکە لە پۆشینی پۆشاکی تەواو سوورە، بەڵام ئەگەر پۆشاکەکە تەواو سوور نەبوو، بەڵکو ڕەنگی دیکەی لەگەڵ بوو وەک: ڕەنگی سپی، یان ڕەش، یان هاوشێوەی ئەوانەش، ئەوە نەهی لێ نەکراوەو پۆشینی ئاساییەو ڕێگری لێناکرێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئەم جۆرە پۆشاکەی پۆشیوە.

کە دەڵێ: **«مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ»** (لێرەدا ئەگەر سەرنج بدرێ) بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ نەیگوتوە: هیچ مرۆڤێکم نەبینیوە، بەڵکو گوتوویەتی: هیچ شتێکم نەبینیوە، تاکو هەموو شتێک بگرێتەوە کە بینیویەتی لە نێویشیاندا: مانگ و خۆرو جگە لەوانیش، لە هەرچی شتێکی جوان هەیە.

کە دەڵێ: **«قَطُّ»** واتە: بەردەوام و هەموو کات هەرچی بینیومەو سەرنجیم داوە، کە ئەمەش ئەوپەڕی تەواوی لە پێکهاتەو دروستکرانی و جوانی ڕوخسارو شێوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنێ، وە هەرچی جوانی ڕێک و تەواوی هەیە، خوای بەرز تێیدا کۆکردبوویەوەو پێی بەخشی بوو.

بۆیە بەڕاء ﷺ دەڵێ: **«مَا رَأَيْتُ شَيْئًا قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهُ»** وەک دواتر قسەی پێشەوا عەلی ﷺ لەوبارەوە دێنین کە دەڵێ: **«لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ مِثْلَهُ، ﷺ»**[1]. واتە: نە لە پێش ئەو ﷺ وە نە لە دوای ئەو کەسم نەبینیوە وەک ئەو، (لە هیچ کام لە سیفەتەکانیدا: هەم لە ڕووی لاشەو پێکهاتەی، هەم لە ڕووی ڕەوشت بەرزی و جوانی ڕەفتاریی).

---

(١) انظر: (ح ٥).




ئیتر خوای بەخشندە جوانی و ڕێک و پێکی و ڕوخسارو ڕۆشناییەکی وای پێ بەخشیبوو، زیاترو لەسەر هەموو شتە جوانەکانەوە بوو، کە بە چاو دەبینرێن.

٤- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه قَالَ: «مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ، لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، لَمْ يَكُنْ بِالْقَصِيرِ وَلَا بِالطَّوِيلِ»[1].

واتە: ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە، بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه گوتوویەتی: «هیچ کەسێکم نەبینیوە کە خاوەنی قژێکی درێژییەکەی نەرماییەکانی گوێی تێپەڕاندبێ و دوو پارچە پۆشاکی سووری پۆشی بن، جوانتر بێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ، جا قژێکی وای هەبوو، دەگەیشتە سەر هەردوو شانەکانی، وە نێوان هەردوو شانی پان بوون، (باڵای) نە کورت بوو، نە درێژ بوو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەمە سەنەدێکی دیکەیە هەر بۆ ئەو فەرموودە کە بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه ڕیوایەتی کردوە.

کە دەڵێ: «مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ»، (اللِّمة): بەو پرچە دەگوترێ کە لە نەرمایی گوێ زیاتر هاتۆتە خوار، جا گەیشتبێتە سەر شانەکان، یاخود نا، مەبەست پێی لێرەدا مووی سەرە، کە دەڵێ: هیچ خاوەن پرچێکم نەبینیوە! دەڵێ: «فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ» لەبەر ئەوە وا دەڵێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەسێک و شتێک جوانتر بوو، هەتا ئەگەر لەسەر ئەم شێوەیەش بووبێ (لە پۆشینی بەرگ و پۆشاک و هێشتنەوەی ڕیش و پرچ و ... هتد).

کە دەڵێ: «لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ» یانی: پرچی درێژبوو، شۆڕ ببوویەوە سەر شانەکانی و، لەسەر شانەکانی دەدا.

کە دەڵێ: «بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ» پێشتریش باسمان کرد، کە بەشی سەرەوەی پشتی لێک دوورو پان بووە (چوار شانەو کەڵەگەت بووە ﷺ).

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٥٤٩، ومسلم: ٢٣٣٧، والمصنِّف في جامعه: ١٧٢٤.

کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ بِالْقَصِيرِ وَلَا بِالطَّوِيلِ» واتە: پێغەمبەر ﷺ لە نێوان درێژیی و کورتی دا بوو، نە زۆر درێژو، نە زۆر کورت، بەڵکو لەم نێوانە دابوو، بەڵام نزیکتر بوو بە لای درێژیی دا.

٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ قَالَ: «لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ بِالطَّوِيلِ وَلَا بِالْقَصِيرِ، شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، ضَخْمُ الرَّأْسِ، ضَخْمُ الْكَرَادِيسِ، طَوِيلُ الْمَسْرُبَةِ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤاً كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ، لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ مِثْلَهُ، ﷺ»[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ نە زۆر درێژ بوو، نە کورت بوو (مامناوەند بوو)، دەستەکان و پێیەکانی پتەو بوون، سەری گەورە بوو، (شوێنی بەیەکگەیشتنی) جومگەکانی گەورە بوون، مووی سینگی باریک و درێژ بوو تا ناوکی، کاتێ کە دەڕۆیشت بە ڕێگادا بەرەو پێشەوە دەچەمایەوە، وەک ئەوەی لە شوێنێکی بەرز بێتە خوارەوە، نە لە پێش ئەودا ﷺ، وە نە لە دوای ئەو، کەسم نەبینیوە وەک ئەو، (لە هیچ کام لە سیفەتەکانیدا: هەم لە ڕووی لاشەو پێکهاتەی، هەم لە ڕووی ڕەوشت بەرزی و جوانی ڕەفتاری))».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ بِالطَّوِيلِ وَلَا بِالْقَصِيرِ» یانی: بەژن و باڵای مامناوەند بوو، شایانی باسیشە هەموو ئەو کەسانەی وەسفی لاشەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن، لەم سیفەتەدا وەک یەک باسی دەکەن (بە هەمان شێوە تەعبیری دەکەن).

کە دەڵێ: «شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ» ناو لەپ و ژێر پێیەکانی ئەستوورو پتەو بوون، (هەڵبەت) ئەم ئەستووریی و پتەوییە بە مانای زبر بوون نایێ، وەک لە ئەنەس ﷺ گێڕدراوەتەوەو دواتریش باسی دێ[2]. گوتوویەتی: {وَلَا مَسَسْتُ خَزّاً وَلَا حَرِيراً وَلَا شَيْئاً كَانَ أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ}[3]. واتە: دەستم نەداوە لە هیچ خورییەک و

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٣٦٣٧ وقال: هذا حديث حسن صحيح. وفي إسناده المسعودي عبد الرَّحمن بن عتبة بن مسعود، صدوق اختلط قبل موته، وعثمان ابن مسلم فيه لين.

(٢) انظر: (ح ٣٤٥).

(٣) أخرجه الترمذي: ٢٠١٥، وقال: هذا حديث حسن صحيح.




ئاوریشمێک و هیچ شتێکی دیکە، کە نەرمتر بووبێ لە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ. دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمتر بووە لە ئاوریشمیش.

کە دەڵێ: «ضَخْمُ الرَّأْسِ» سەری (موبارەکی بچووک نەبوو)، بەڵکو گەورە بوو.

کە دەڵێ: «ضَخْمُ الْكَرَادِيسِ» (الْكَرَادِيسِ) بە مانای سەری ئێسکەکانە، بەم نزیکانە باسی (جَلِيلُ الْمُشَاشِ)[1] دێت، ئەویش بە واتای (ضَخْمُ الْكَرَادِيسِ) دێت، (الْمُشَاشِ) سەری ئێسکەکانە، گوتراویشە مەبەست پێی شوێنی بە یەکگەیشتنی جومگەکانە.

ئەم سیفەتانە: «شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، ضَخْمُ الرَّأْسِ، ضَخْمُ الْكَرَادِيسِ» وە هەروەها وێنەی ئەم سیفەتانە (کە دواتر دێن و باسیان دەکەین)، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە لاشەیەکی بەهێزو پتەوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو.

کە دەڵێ: «طَوِيلُ الْمَسْرُبَةِ» وشەی: (الْمَسْرُبَة) بەم مووە دەگوترێ کە لە سینگەوە تا ناوک درێژ دەبێتەوە، جا مووی سینگی پێغەمبەر ﷺ تا ناوکی بە شێوەیەکی تەنک و باریک درێژ ببوویەوە.

کە دەڵێ: «إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤًا» پێشتر ئەوەمان باسکردوە.

کە دەڵێ: «كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ» وشەی: (صَبَب) شوێنێکی نزم و لێژە لە زەوی، یانی: کاتێک پێغەمبەر ﷺ بە ڕێگادا دەڕۆیشت وەک ئەوە وابوو لە بەرزاییەوە، یان لە شوێنێکی لێژیی سەر زەوی بێتە خوارەوە.

کە دەڵێ: «لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ مِثْلَهُ، ﷺ» (واتە: نە لە پێش ئەو ﷺ، وە نە لە دوای ئەو کەسی وەک ئەوم نەبینیوە)، جا وەک گوتمان: خوای پەروەردگار جوانی و ڕێک و پێکی و ڕوخسارێکی زۆر جوانی پێ بەخشی بوو، کە لە هیچ یەکێک لە شتە جوانەکان (ی دونیادا) نیەو نابینرێ.

٦- حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي، عَنِ الْمَسْعُودِيِّ، بِهَذَا الْإِسْنَادِ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ.

واتە: (پێشەوا الترمذي رحمه الله) دەڵێ: سوفیانی کوڕی وەکیع بۆی باسکردین، گوتی: باوکم لە مەسعوودی هاوشێوەی ئەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە بە هەمان سەنەد، وەک مانای ئەم فەرموودەیە.

---

(١) انظر: (ح ٧).



٧- عَنْ إِبْرَاهِيم بْن مُحَمَّدٍ مِنْ وَلَدِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ إِذَا وَصَفَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ بِالطَّوِيلِ الْمُمَّغِطِ، وَلَا بِالْقَصِيرِ الْمُتَرَدِّدِ، وَكَانَ رَبْعَةً مِنَ الْقَوْمِ، لَمْ يَكُنْ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلَا بِالسَّبْطِ، كَانَ جَعْدًا رَجِلًا، وَلَمْ يَكُنْ بِالْمُطَهَّمِ وَلَا بِالْمُكَلْثَمِ، وَكَانَ فِي وَجْهِهِ تَدْوِيرٌ أَبْيَضُ مُشْرَبٌ، أَدْعَجُ الْعَيْنَيْنِ، أَهْدَبُ الْأَشْفَارِ، جَلِيلُ الْمُشَاشِ وَالْكَتَدِ، أَجْرَدُ ذُو مَسْرُبَةٍ، شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ فِي صَبَبٍ، وَإِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ مَعًا، بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ، وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ، أَجْوَدُ النَّاسِ صَدْرًا، وَأَصْدَقُ النَّاسِ لَهْجَةً، وَأَلْيَنُهُمْ عَرِيكَةً، وَأَكْرَمُهُمْ عِشْرَةً، مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ، وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ، يَقُولُ نَاعِتُهُ: لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ مِثْلَهُ ﷺ»[١].

واتە: ئیبراهیمی کوڕی موحەممەد کە لە نەوەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە، گوتوویەتی: عەلی رضي الله عنه هەر کاتێک وەسفی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد، دەیگوت: «پێغەمبەری خوا ﷺ باڵای زۆر درێژو دیارو ئاشکرا نەبوو، وە کورتیش نەبوو، لە نێو خەڵکیدا مامناوەندو تێرو تەواو دیار بوو، مووی سەری نە زۆر لوول بوو، نە زۆریش خاو بوو، بەڵکو لە نێوان لوولی و نەرم و خاوی دابوو، لوولیەکی کەمی تێدابوو، وە لاشەی گۆشتنێکی تەواو قەڵەو نەبوو، هەروەها لە ڕووخساریدا مەیلەو بازنەیی هەبوو، سپیەکی سوورباو بوو، چاوەکانی زۆر ڕەش بوون، برژانگی درێژ بوون، ئێسکەکانی پتەوو نێوشانی پان و فراوان بوو، (لاشەی تووکاویی نەبوو) بەڵکو موویەکی تەنک و درێژ لە سینگیەوە درێژ دەبووەوە تا سەر ناوکی، دەست و پێی پتەو بوون، کە دەڕۆیشت لاشەی بەرەوپێش دەچوو، وەک لە لێـژایی بێتە خوارەوە، وە ئەگەر ئاوڕی دابایەوەو ڕووی وەرگێڕابووایە هەموو لاشەی دەسووڕاند، لە نێوان هەردووک شانی مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو، وە ئەو کۆتایی پێغەمبەران بوو، لە هەموو کەس بەخشندەترو سەخیترو ڕاستگۆترو گونجاوترو بەڕێزتـرو نەرم و نیانتر بوو، وە باشترین مامەڵەی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد، هەر کەس کتوپڕو لە ناکاو بینیبای

---

(١) في إسناده مقال؛ عمر بن عبد الله مولى غفرة ضعيف، وفيه انقطاع بين إبراهيم بن محمَّد وبين عليٍّ رضي الله عنه، وبهذا أعلَّه المصنِّف رحمه الله في كتابه الجامع: ٣٦٣٨ حيث رواه فيه ثمَّ قال عقبه: وهذا حديثٌ ليس إسناده بمتَّصل، وما جاء في بعض نسخ جامع التِّرمذي: أنَّه قال: هذا حديث حسن غريب ليس إسناده بمتَّصل غلط من النُّساخ يتنافى مع قوله: ليس إسناده بمتَّصل؛ والَّذين نقلوا هذه الجملة عن الإمام التِّرمذي مثل الحافظ العراقي وغيره نقلوها دون هذا الزِّيادة؛ فالحديث ضعيف الإسناد؛ لكن ألفاظه تشهد لجُلِّها شواهد، تقدَّم بعضُها وستأتي أخرى.
أخرجه المصنِّف في جامعه: ٣٦٣٧، وقال: هذا حديث حسن صحيح.



سامی لێدەکرد، وە هەر کەس ناسیبای و تێکەڵی ببووایە خۆشی دەویست، (عەلی ﷛) دەڵـێ: نە پێشی ئەوو، نە لە دوای ئەو، کەسم نەبینیوە وەکو ئەو (لە هەموو ئەو سیفەتانەی کە باسم کردن))»[١].

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ بِالطَّوِيلِ الْمُمَّغِطِ» واتە: زۆر درێژ (نەبووە) وەک لە فەرموودەکەی ئەنەسدا ﷛ پێشتر باسمان کرد، هاتوە: «لَيْسَ الطَّوَيل البَائِن»[٢] واتە: درێژیەکی دیارو ئاشکرا (واتە: پێغەمبەر ﷺ لە ڕادەبەدەر درێژ نەبوو)، کە ئەویش بە واتای «طوِيلِ الْمُمَّغِطِ» دێ، وە (الأنغماط)یش بە مانای درێژیەکی دیارو ئاشکرا دێت، کە کشابێ لە درێژیدا.

کە دەڵێ: «وَلَا بِالْقَصِيرِ الْمُتَرَدِّدِ» واتە: باڵای زۆر کورت نەبوو.

کە دەڵێ: «وَكَانَ رَبْعَةً مِنَ الْقَوْمِ» واتە: باڵای مامناوەند بوو لە نێو پیاواندا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ باڵای مامناوەند بوو، نە زۆر درێژ بووەو نە زۆر کورتیش.

کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلَا بِالسَّبْطِ» واتە: وەک لە پێشتر باسمان کرد (الجعودة) واتە: پرچی لول و ئاڵۆز نەبوو، هەروەها زۆریش نەرم وخاوو شۆڕ نەبوو، بەڵکو لە نێوانی ئەو دووانەدا بوو، نە زۆر نەرم و خاوو بوو، نە زۆر لول و ئاڵۆز بوو.

کە دەڵێ: «كَانَ جَعْدًا رَجِلًا» ئەمەش ڕوونکردنەوەی تێدایە، کە پرچی لە نێوان لول و زۆر نەرم و خاویدا بووە.

---

(١) قَالَ أَبُو عِيسَى: سَمِعْتُ أَبَا جَعْفَرٍ مُحَمَّدَ بْنَ الْحُسَيْنِ يَقُولُ: سَمِعْتُ الْأَصْمَعِيَّ يَقُولُ فِي تَفْسِيرِ صِفَةِ النَّبِيِّ ﷺ: الْمُمَّغِطُ: الذَّاهِبُ طُولًا. وَقَالَ: سَمِعْتُ أَعْرَابِيًّا يَقُولُ فِي كَلَامِهِ: تَمَغَّطَ فِي نَشَّابَتِهِ أَيْ مَدَّهَا مَدًّا شَدِيدًا. وَالْمُتَرَدِّدُ: الدَّاخِلُ بَعْضُهُ فِي بَعْضٍ قِصَرًا. وَأَمَّا الْقَطَطُ: فَالشَّدِيدُ الْجُعُودَةِ. وَالرَّجُلُ الَّذِي فِي شَعْرِهِ حُجُونَةٌ: أَيْ تَثَنٍّ قَلِيلٌ. وَأَمَّا الْمُطَهَّمُ فَالْبَادِنُ الْكَثِيرُ اللَّحْمِ. وَالْمُكَلْثَمُ: الْمُدَوَّرُ الْوَجْهِ. وَالْمُشْرَبُ: الَّذِي فِي بَيَاضِهِ حُمْرَةٌ. وَالْأَدْعَجُ: الشَّدِيدُ سَوَادِ الْعَيْنِ. وَالْأَهْدَبُ: الطَّوِيلُ الْأَشْفَارِ. وَالْكَتَدُ: مُجْتَمِعُ الْكَتِفَيْنِ وَهُوَ الْكَاهِلُ. وَالْمَسْرُبَةُ: هُوَ الشَّعْرُ الدَّقِيقُ الَّذِي كَأَنَّهُ قَضِيبٌ مِنَ الصَّدْرِ إِلَى السُّرَّةِ. وَالشَّثْنُ: الْغَلِيظُ الْأَصَابِعِ مِنَ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ. وَالتَّقَلُّعُ: أَنْ يَمْشِيَ بِقُوَّةٍ. وَالصَّبَبُ الْحُدُورُ، نَقُولُ: انْحَدَرْنَا فِي صَبُوبٍ وَصَبَبٍ. وَقَوْلُهُ: جَلِيلُ الْمُشَاشِ يُرِيدُ رُءُوسَ الْمَنَاكِبِ. وَالْعِشْرَةُ: الصُّحْبَةُ، وَالْعَشِيرُ: الصَّاحِبُ. وَالْبَدِيهَةُ: الْمُفَاجَأَةُ، يُقَالُ: بَدَهْتُهُ بِأَمْرٍ أَيْ فَجَأْتُهُ.

(٢) انظر (ح ١).




کە دەڵێ: «وَلَمْ يَكُنْ بِالْمُطَهَّم» (مُطَهَّم): بریتیە لە زۆر قەڵەویی، جا (پێغەمبەر ﷺ) زۆر قەڵەو قەبەو پڕو قورس و گران نەبووەو، جەستەشی شل ونەرم و خاو نەبووە.

کە دەڵێ: «وَلَا بِالْمُكَلْثَمِ» (مُكَلْثَم): بریتیە لە ڕوخسارێکی زۆر خڕ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخساری زۆر خڕ نەبووەو زۆریش درێژ نەبووە، بەڵکو لەو نێوانەدا بووە، هەر بۆیە گوتی: «وَكَانَ فِي وَجْهِهِ تَدْوِيرٌ» واتە: لە ڕووخساریدا خڕییەک هەبوو، لەگەڵ ئەو خڕیەدا ئەندازەیەکیش بۆ خوار بوو.

کە دەڵێ: «أَبْيَضُ مُشَـرَبٌ» واتە: ئەوەندە سپی نەبوو تۆخ بڕوانێت، بەڵکو سوورو سپی بووە، ئەمەش وەسفەکەیەتی، وەک کەمێکی دیکە درێژەی پێ دەدەین کە ئەو (أَزْهَرَ اللَّوْن)ـە، واتە: ڕەنگی پێستی سپی بوو، سپی بوونێک تیکەڵ بە سوری (وەک لە کوردەواریی دا ئەگەر کەسێک جوان بێ و سوورو سپی بێ، پێی دەڵێن: دەڵێی گوڵە!!).

کە دەڵێ: «أَدْعَجُ الْعَيْنَيْنِ» واتە: چاوی زۆر ڕەش بوو.

کە دەڵێ: «أَهْدَبُ الْأَشْفَارِ» (الأَشْفَار): (برژانگ)ـە، واتە: ئەو مووەی لەسەر پێڵوی چاو دەڕوێ، یانی: برژانگی درێژ بوو.

کە دەڵێ: «جَلِيلُ الْمُشَاشِ وَالْكَتَدِ» (الْمُشَاش): بریتیە لەسەر ئێسکەکان، ئەویش بە مانای ئەو وەسفە دێت کە لە پێشتر هاتبوو: «ضَخم الكَرَادِيس»[1]، وە (الكَتَد) واتە: نێوشانی پان بووە، کە ئەمە پێی دەگوترێ: (الكَاهِل)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نێوشانی پڕو توندو تۆڵ و پان بووە، ئەویش بە مانای ئەوە دێت کە لە پێشەوە باسمان کرد «بَعِيد مَا بَيْنَ المنْكِبَيْنِ»[2].

کە دەڵێ: «أَجْرَدُ» واتە: جەستەی مووی زۆرو توکن نەبووە، (أَشْعَر) واتە: زۆری مووی جەستە، لە وەسفیدا باسکراوە هەندێ شوێنی جەستەی مووی پێوە بووە، بۆ وێنە: وەک دەڵێ: «ذُو مَسْرُبَةٍ» (مَسْرُبَة): بریتیە لەو مووەی لە سنگەوەیە تا دەگاتە ناوک. کە دەڵێ: «شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ» پێشتر ماناکەی ڕوون کرایەوە.

---

(١) انظر: (ح ٥).

(٢) انظر: (ح ٣).



کە دەڵێ: «إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ» واتە: کاتێک دەڕۆیشت بە ڕێگادا بەهێزەوە دەڕۆیشت، نەک وەک ڕۆیشتنی ئەو کەسەی بە قورسی قاچی لەسەر زەوی بەرز دەکاتەوەو (وەک نەخۆش دەردەکەوێ).

کە دەڵێ: «كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ فِي صَبَبٍ»، (صَبَب): بریتیە لە دابەزین و هاتنە خوار لە شوێنێکی بەرز بۆ خوارەوە.

کە دەڵێ: «وَإِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ مَعَاً» واتە: کاتێ ڕووی وەرگێڕابووایە بۆ دواوە، بە هەموو جەستەی ڕووی دەسووڕاند، ئەمەش لەبەر ڕێزو شکۆی بووە، هەرگیز بەسەر ئاوڕی نەدەدایەوەو، جەستەشی ڕووی لە پێشەوە بێت، بەڵکو بە هەموو جەستەی ئاوڕی دەدایەوە، بەڵام تەماشاکردنێکی ئاسایی بۆ لای ڕاست، یان لای چەپ، ناچێتە ئەو چوارچێوەیەوە.

کە دەڵێ: «بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ» واتە: لە پشتی دا لە نێوان هەردوو دەفەی شانی مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو، کە بریتی بوو لە پارچەیەک گۆشتی دیارو ئاشکراو زەق، لەم نزیکانە بە تایبەتی باسی ئەو فەرموودانە دەکەین کە لەو بارەوە هاتوون.

کە دەڵێ: «وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ» مەبەستی لە کۆتایی پێغەمبەران، واتە: دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نایەت، وەکو خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب. (موحەممەد ﷺ باوکی هیچ یەک لە پیاوەکانتان نیە (نە زەیدی کوڕی حاریسەو نە هیچ کەسێکی تر) بەڵکو ئەو نێردراوی خواو کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە وە خوا بەهەموو شتێک زانایە).

کە دەڵێ: «أَجْوَدُ النَّاسِ صَدْرَاً» ئەمە بە مانای لێبوردەیی سنگ فراوانی دێت، بەڕاستی بەخشندەیی و سەخاوەت و سنگ فراوانی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی سروشتی خودی خۆی بووە، ئەوە نەبوو خۆی ئەو سیفەتانە لە خۆیدا دروست بکات و، زۆرو زەخت لە خۆی بکات تا وا هەڵسوکەوت بکات، (بەڵکو ناخی چی تێدابوو، ئەوەی لە ڕواڵەتیش دەبینرا).





کە دەڵێ: «أَصْدَقُ النَّاسِ لَهْجَةً» واتە: ڕاستگۆترینی نێو مرۆڤەکان بوو لە ئاخاوتندا، ئەو هەر لە سەرەتای پێگەیشتنی بە ڕاستگۆو دەستپاک ناوبانگی دەرکردبوو لە نێو قەومەکەی و خزم و کەسەکانی دا.

کە دەڵێ: «وَأَلْيَنُهُمْ عَرِيكَةً» مەبەستی ئەوەیە: خوو ڕەوشتی نەرم و نیان بوو، دڵڕەق و وشک نەبوو، بەڵکو نەرم و نیان و لێبوردەو خاکی و میهرەبان و ئاسانکار بوو ﷺ.

کە دەڵێ: «وَأَكْرَمُهُمْ عِشْرَةً» واتە: بەڕێزترین بوو لە مامەڵەو تێکەڵاوی و هاوڕێیەتیدا، (پێغەمبەری خوا ﷺ) لەگەڵ هەر کەسێک مامەڵەو تێکەڵاوی کردبایە، بە جوانترین شێوە مامەڵەی دەکرد.

کە دەڵێ «مَنْ رَآهُ بَدِيهَةً هَابَهُ» واتە: هەر کەس لە پڕ، یان یەکەمجار بیبینیایە سام دایدەگرت، چونکە پیاوێکی مەزن و قورس و بە سام و سەنگین بوو، خوا لە دڵەکاندا هەیبەتێکی پێ بەخشی بوو، وە سڵی لێدەکرایەوە.

کە دەڵێ: «وَمَنْ خَالَطَهُ مَعْرِفَةً أَحَبَّهُ» واتە: هەر کەس تێکەڵاوی بکردایەو لەگەڵی بڕۆیشتایە لە خزمەتی دابنیشتایەو هاوڕێیەتی بکردایە خۆشی دەویست، چونکە هیچ شتێکی تێیدا نەدەبینی ئەوە نەبێ کە بانگی دەکات بۆ خۆشەویستی خۆی، ڕەوشتی بەرز بوو، مامەڵە و تێکەڵاوی و هەڵسوکەوتی زۆر جوان بوو لەگەڵ کەسی بەرامبەردا، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران. (بەهۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرم و نیان بوویت ئەگەر تۆ بەدخوو قسە ڕەق و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوە هەموو بڵاوەیان دەکرد لەدەورت).

کە دەڵێ «يَقُولُ نَاعِتُهُ» (نَاعِت): بریتیە لە وەسفکار، واتە: وەسفکارەکەی دەڵێ: «لَمْ أَرَ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ مِثْلَهُ ﷺ» ئەم ڕستەیە لە چەندین کەسەوە گێردراوەتەوە لەوانەی وەسفیان کردوە.

پاشان پێشەوا (تیرمذي ﷺ) لە ئەصمەعیەوە هێناویەتی لە شیکردنەوەی ئەو وشە غەریب و نامۆیانەی کە لەم فەرموودەدا هاتوە، جا زۆرێک لەو وشانەی لە پێشەوە باسکرا ماناکەی ڕوونە، هەروەها ئەوانەی دیکەش کە دێ، (بۆ وێنە:) کە دەڵێ:



(تَمَغَّطَ فِي نُشَّابَتِهِ) بە (ضَمَّة)ی نون و شەددەی شین، وە (النُّشَّابَة) تاکی (النُّشَّاب) ـە، ئەویش بریتیە لە تیر، وە وتەکەی: (وَالرَّجِلُ: الَّذِي فِي شَعْرِهِ حُجُونَةٌ) مەبەست لە (حُجُونَة) واتە: ئەندازەیەکی کەم چەماوە بووە، چونکە پرچی لوول نەبووە، بەڵکو جۆرێک لە لادان و چەماوەیی تێدابوو، وەک لە وەسفیدا هاتوە: (كَانَ جَعْدَاً رَجِلاً) پرچی کەمێک چەماوەیی بووە، بەڵام لوول و ئاڵۆزو بە یەکداچوو نەبووە، بەڵکو ئەندازەیەک خاوو نەرم بووە.

٨- عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ، قَالَ: سَأَلْتُ خَالِي هِنْدَ بْنَ أَبِي هَالَةَ، وَكَانَ وَصَّافاً، عَنْ حِلْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ، وَأَنَا أَشْتَهِي أَنْ يَصِفَ لِي مِنْهَا شَيْئاً أَتَعَلَّقُ بِهِ، فَقَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فَخْماً مُفَخَّماً، يَتَلأْلأُ وَجْهُهُ تَلَأْلُؤَ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، أَطْوَلُ مِنَ الْمَرْبُوعِ، وَأَقْصَرُ مِنَ الْمُشَذَّبِ، عَظِيمُ الْهَامَةِ، رَجِلُ الشَّعْرِ، إِنِ انْفَرَقَتْ عَقِيقَتُهُ فَرَّقَهَا، وَإِلَّا فَلَا يُجَاوِزُ شَعْرُهُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ إِذَا هُوَ وَفَّرَهُ، أَزْهَرُ اللَّوْنِ، وَاسِعُ الْجَبِينِ، أَزَجُّ الْحَوَاجِبِ سَوَابِغَ فِي غَيْرِ قَرَنٍ، بَيْنَهُمَا عِرْقٌ يُدِرُّهُ الْغَضَبُ، أَقْنَى الْعِرْنَيْنِ، لَهُ نُورٌ يَعْلُوهُ، يَحْسَبُهُ مَنْ لَمْ يَتَأَمَّلْهُ أَشَمَّ، كَثُّ اللِّحْيَةِ، سَهْلُ الْخدَّيْنِ، ضَلِيعُ الْفَمِ، مُفْلَجُ الْأَسْنَانِ، دَقِيقُ الْمَسْرُبَةِ، كَأَنَّ عُنُقَهُ جِيدُ دُمْيَةٍ فِي صَفَاءِ الْفِضَّةِ، مُعْتَدِلُ الْخَلْقِ، بَادِنٌ مُتَمَاسِكٌ، سَوَاءُ الْبَطْنِ وَالصَّدْرِ، عَرِيضُ الصَّدْرِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، ضَخْمُ الْكَرَادِيسِ، أَنْوَرُ الْمُتَجَرَّدِ، مَوْصُولُ مَا بَيْنَ اللَّبَّةِ وَالسُّرَّةِ بِشَعْرٍ يَجْرِي كَالْخَطِّ، عَارِي الثَّدْيَيْنِوَالْبَطْنِ مِمَّا سِوَى ذَلِكَ، أَشْعَرُ الذِّرَاعَيْنِ وَالْمَنْكِبَيْنِ وَأَعَالِي الصَّدْرِ، طَوِيلُ الزَّنْدَيْنِ، رَحْبُ الرَّاحَةِ، شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ، سَائِلُ الْأَطْرَافِ -أَوْ قَالَ: شَائِلُ الْأَطْرَافِ- خَمْصَانُ الْأَخْمَصَيْنِ، مَسِيحُ الْقَدَمَيْنِ، يَنْبُو عَنْهُمَا الْمَاءُ، إِذَا زَالَ زَالَ قَلِعاً[1]، يَخْطُو تَكَفِّياً، وَيَمْشِي هَوْناً، ذَرِيعُ الْمِشْيَةِ، إِذَا مَشَى كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ، وَإِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ جَمِيعاً، خَافِضُ الطَّرْفِ، نَظَرُهُ إِلَى الْأَرْضِ أَطْوَلُ مِنْ نَظَرِهِ إِلَى السَّمَاءِ، جُلُّ نَظَرِهِ الْمُلَاحَظَةُ، يَسُوقُ أَصْحَابَهُ وَيَبْدَأُ مَنْ لَقِيَ بِالسَّلَامِ»[2].

---

(١) فيه خمسة أوجه: فتح أوّله مع تثليث ثانيه (بفتحه وكسره وسكونه)، وضمّ أوّله مع سكون ثانيه أو فتحه.

(٢) وهو حديث طويل جدّاً، أورد المصنّف  بعضه هنا وسيأتي مقطّعاً في مواضع من كتابه، وقد ساقه بتمامه الإمام المِزّي ، في مقدّمة كتابه تهذيب الكمال: ٢١٤/١ وقال: وفي إسناد حديثه بعض من لا يُعرف. وقال العلّامة ابن القيّم في الكتاب المدارج: ٥٠٦/١: وأمّا حديث هند بن أبي هالة في صفة النّبي ﷺ فحديث لا يثبت وفي إسناده من لا يُعرف. وفي إسناده أيضاً جُميع بن عمير، قال الحافظ في التّقريب: ١٤٢/١: جُميع ابن عُمير... ضعيف رافضي. والرَّجل الذي من بني تميم من ولد أبي هالة زوجِ خديجة يُكْنَى أبا عبد الله: مجهول. فالحديث سنده ضعيف لا يثبت، وقد مرَّت بعض ألفاظه في أحاديث صحيحة، ويأتي بعضها أيضًا في أحاديث أخري صحيحة.
أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٦٣٧، وقال: هذا حديث حسن صحيح.





واتە: حەسەنی کوڕی عەلـی ﷺ دەڵێ: دەربارەی وەسفی جوانی پێغەمبەر ﷺ، لە خاڵم (هیندی کوڕی ئەبی هاڵە)م پرسی، کە زۆر باش وەسفی دەکرد، بە هیوای ئەوەی، کە شتێکم لە وەسفی پێغەمبەر بۆ باس بکات، تاکو پێیەوە پەیوەست بم و چاوی لێبکەم، جا گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ بە شان و شەوکەت و بەڕێز بوو، ڕووی وەک مانگ لە شەوی چواردەدا دەدرەوشایەوە، لە پیاوی ئاسایی درێـژترو لە کەسی زۆر باڵابەرزو لاواز (کە پیاو نارێک پێشان دەدات) کورتتـر بوو، سەری تێرو تەواوو گەورە بوو، پرچی لە نێوان لوولی و زۆر خاویی دابوو، ئەگەر بگونجایە بڵاوی بکردایەتەوە، بڵاوی دەکردەوە، وە ئەگەر هێشتبایەوە لە نەرمەی گوێی درێژتر نەدەبوو، ڕەنگی سپی و ڕوون بوو، تێکەڵ بوو بە سوور، نێوچەوانی پان بوو، برۆیەکانی باریک بوون و درێـژبوون، بەڵام پێکەوە نەلکابوون، دەمارێکیان لە نێواندا هەبوو لە کـاتی توورەییدا دەجووڵا، بە هۆی پڕبوونی لە خوێن بە جوانی دەردەکەوت، لووتی مەیلەو درێژبوو، ڕووناکیەکی بەسەرەوە بوو، ئەوەی سـەرنجی وردی نەدابایە وایدەزانـی بەلای درێژیی دایـە، ڕیشی چڕوپڕو زۆر بوو، ڕوومەتەکانی تەختو لووس بوون، دەمی فراوان بوو، ددانەکانی لێکتر دوورو شاش بوون، خەتی مووی نێوان سینگ و ناوکی باریک بوو، گەردەنی وەک بووکە شووشە بوو لە صافی و سپێتی زیودا، ئەندامەکانی ڕێک و پێکو پێکەوە هاوسەنگ بوون، لاشەی پڕو پتەو بوو و بەخۆوەو دامەزراو بوو، سینگ و سکی یەکسان بوون، سینەی پان بوو، نێوان شـانەکانی لێک دووربوون، ئێسک و جومگەکانی گەورە بوون، ئەو شوێنەی لاشەی موودار نەبووایە لە جوانی و سپیەتیدا دەدرەوشایەوە، نێوان سینگ و ناوکی خەتێکی مووی باریک پێکی دەگەیاند، بەڵام مەمکەکانی و سکی و لاشەی دیکەی توکن نەبوو، باسک و شانەکانی و سەرەوەی سینگی موودار بوون، باسکەکانی درێژ بوون، دەستەکانی پان بوون، هەردوو لەپە دەست و پێیەکانی ئەستوورو گۆشتن بوون، دەست و لاقەکانی درێژ بوون، نێوان پاژنەو سینگی پێیەکانی چاڵ بوون، پێیەکانی ساف و لووس بوون، ئاویان پێوە ڕانەدەوەستا، کاتێک دەڕۆیشت باش هەنگاوی هەڵدەهێنا (پێی بەرزدەکردەوەو نەیدەخشاند لەسەر زەوی)، وە بەلای پێشەوەدا بە ئارامی دەچەمایەوەو دەڕۆیشت بە خێرایی، کە دەڕۆیشت وەک ئەوە




بوو لە لێژایی بێتە خوارەوە، وە ئەگەر ئاوڕی دابایەوە بە تەواوی خۆی دەسووڕاند، چـاوی نزم دەکرد، سەرنجدان و تەماشاکردنی بۆ زەوی زیاتر بوو لە تەماشاکردنی بۆ ئاسـمان، بە زۆری بە گۆشەی چاو سەرنجی دەدا، هاوەڵانی پێش خۆی دەخستـن، هەر کەسێک پێی گەیشتبایە سەرەتا خۆی سڵاوی دەکرد».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

هیندی کوڕی ئەبو هالە کوڕی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بوو، دایکی خەدیجە بوو، خەدیجەی کچی خوەیلید کە هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ، بۆیە برای فاتیمەی کچی پێغەمبەر ﷺ بوو، لە دایکیەوە، هەر لەبەر ئەوەشە حەسەنی کوڕی عەلی لە گێڕانەوەی بۆ فەرموودەکەدا دەڵێ: پرسیارم لە خاڵم کرد.

هەموو کەسێک ناتوانێ بە باشی وەسف بکات، هەندێک لە خەڵکی هەیە چەندان جار کەسێک دەبینێ و پێی دەگوترێ: وەسفی بکە، ناتوانێ وەسفێکی باشی بکات، هەندێک کەسیش هەیە جارێک، یان دوو جار کەسێک دەبینێ و، بە شێوەیەکی زۆر ورد وەسفی دەکات، جا ئەو جۆرە کەسە (لە زمانی عەرەبیدا) پێی دەگوترێ: (وَصَّاف).

کە دەڵێ: «عَنْ حِلْيَةِ النَّبِيِّ ﷺ» مەبەست لە (حِلْيَةِ): سیفەتی پێغەمبەرە ﷺ، جا (لە نێو زۆر وشەی عەرەبی کە ئەم مانایە دەگەیەنن) ئەم وشەیەی هەڵبژاردوە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوپەڕی ڕازاوەیی و جوانیی کەشخەیی دا بووە.

وە کە دەڵێ: «وَأَنَا أَشْتَهِي أَنْ يَصِفَ لِي مِنْهَا شَيْئًا أَتَعَلَّقُ بِهِ» (من پێم خۆشە وەسفی شتێکی ئەوم بۆ بکات پێیەوە پەیوەست بم): مەبەست بە پەیوەست بوون لێرەدا: پەیوەست بوونە لە ڕووی زانست و شارەزاییەوە، واتە: سیفەتێکم لەلا بێت لەبەری بکەم و پەی پێ ببەم، بە جۆرێک شارەزای ببم و بتوانم کە باسی بکەم، لە سۆنگەی ئەو وشەو ڕستانەی کە لەبەریان دەکەم.

جا حەسەنی کوڕی پێشەوا عەلی ﷺ لەو کەسانە بوو، کە خوای پەروەردگار ڕێزی لێنان بە بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام کە ئەوی بینی لە تەمەنێکی بچوک دابوو، بۆیە ویستی هیندی خاڵی «کە لێزان بوو لە وەسف کردندا»، هەندێ ڕستەی پێ ببەخشێت لە وەسفەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە پەیوەست بێت بە بابەتی زانست و



مەعریفەت هەبوون بە وەسفەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ شارەزایی بە وەسفەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگایەکی بە قەدرە لە زانست، حەقی خۆیەتی گرنگی زۆری پێ بدرێ.

جا کە دەڵێ: «كَانَ النَّبِيّ ﷺ فَخْماً مُفَخَّماً» واتە: گەورە بووە لە وەسفەکانی و دیمەن و شێوەو ڕازاوەیی و خوەکانی و ڕووکەش و جوانی و سیفەتیدا، «مُفَخَّماً» واتە: گەورە بوو لە دڵی هاوەڵانی و لە دڵی ئەو کەسانەی دەیانبینی.

وە کە دەڵێ: «يَتَلَأْلَأُ وَجْهُهُ تَلَأْلُؤَ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ» (تَلَأْلُؤَ): بریتیە لە پرشنگداریی و گەشاوەیی، چونکە ڕوخساری پرشنگدارو گەشاوە بوو دەدرەوشایەوە وەک درەوشانەوەی مانگ.

وە کە دەڵێ: «أَطْوَلُ مِنَ الْمَرْبُوعِ» واتە: باڵای وەک باڵایەکی مامناوەندی خەڵکەکە وابوو، بەڵام لە درێژەوە نزیکتر بوو، کەواتە: مامناوەندێکی تەواو نەبووە، بەڵکو لە مامناوەندی درێژتر بووە، بەڵام درێژێکی بەرچاو نەبووە، وەک پێشتر ڕوونکرایەوەو باسکرا.

کە دەڵێ: «وَأَقْصَرُ مِنَ الْمُشَذَّبِ» (المشذب): بریتیە لە بەژن و باڵا درێژیی لەگەڵ باریکی بە هۆی لاوازی، (النحیف): بریتیە لە کەسی درێژ کە درێژیەکەی دیار بکەوێ بە شێوەیەکی ڕوون، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەسی (مشذب) کورتتر بووەو لە کەسی (مربوع)یش درێژتر بووە.

وە کە دەڵێ: «عَظِيمُ الْهَامَةِ» واتە: سەری موبارەکی گەورە بووە، وە پێشتر ڕوونکرایەوە.

وە کە دەڵێ: «رَجِلُ الشَّعْرِ» واتە: لە پرچیدا لولیەکی کەم هەبوو، (لادانێکی کەم هەبوو) کە پێشتر واتاکەی ڕوونکرایەوە.

وە کە دەڵێ: «إِنِ انْفَرَقَتْ عَقِيقَتُهُ فَرَّقَهَا» (العَقِيْقَة): قژو پرچە، واتە: ئەگەر بکرایە پرچی دوو لەت بکرێت (لە کاتی داهێناندا) ئەوە دوو لەتی دەکرد، «وَإِلَّا فَلَا» واتە: ئەگەر نەگونجابایە دوو لەت بکرێ، ئەوە لەسەر شێوەی خۆی بەجێی دەهێڵا بە شۆڕبوونەوە.




إبن القيم رحمه الله لە کتێبی: زاد المعادا[1] دەڵێ: لە سەرەتادا پرچی بەردەدایەوە، دواتر دوو لەتی کرد، دوو لەت کردنیش ئەوەیە: پرچی بکات بە دوو بەشەوە، هەر بەشێکی هۆنینەوەیەک (پەلکەیەک) بێ، بەردانەوەش ئەوەیە: لە دواوە بەریبداتەوەو نەیکات بە دوو بەشەوە.

کە دەڵێ: «يُجَاوِزُ شَعْرُهُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ إِذَا هُوَ وَفَّرَهُ» لە هەندێک لە فەرموودەکان هاووێنەی ئەوە ماناکراو تێپەڕ بوو.

کە دەڵێ: «أَزْهَرُ اللَّوْنِ» (أَزْهَر): بریتیە لە سپیەکی تێکەڵ بێت بە سوور.

کە دەڵێ: «وَاسِعُ الْجَبِينِ» (جَبِين): زانراوە (کە بە واتای تەوێڵ دێت)، واتە: تەوێڵی فراوان بووە لە ڕووی درێژیی و پانی.

کە دەڵێ: «أَزَجُّ الْحَوَاجِبِ» برۆ زانراوە، کە بریتیە لەو ئێسقانەی لەسەر چاوە بە گۆشت و ئەو موەوەی لەسەر گۆشتەکە هەیەو ڕوواوە تا کۆتایی سنووری چاو، ئا ئەو دووانە ئەبرۆن (برۆن)، (زجج)یش درێژایەتی و باریکی و تەواویەتی ئەبرۆیە.

وشەی: «سَوَابِغَ» کۆی (سَابغَة)یە، بە واتای کامڵی و تەواوی دێت، جا ئەبرۆیەکانی تەواوو کامڵ بوون.

وە کە دەڵێ: «فِي غَيْرِ قَرَنٍ» (قَرْن): بریتیە لە بەیەکگەیشتنی دوو ئەبرۆیەکان، بە شێوەیەک هیچ کەلێن و بۆشاییەک نەبێت لە نێوانیاندا، جا (الأقرن) ئەو کەسەیە مووی ئەبرۆکانی گەیشتبن بە یەکتری، (الأبلج)یش ئەو کەسەیە کە نێوانی ئەبرۆکانی خاڵی بێت لە موو و نێوانیان هەبێ، وە عەڕەب حەزیان بەو جۆرە بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نێوانی ئەبرۆکانی دیار بوون و، بەیەکەوە نەنوسابوون، لەبەر ئەوە گوتوویەتی: «بَيْنَهُمَا عِرْقٌ يُدِرُّهُ الْغَضَبُ» واتە: لە نێوانی دوو ئەبرۆکانی دەمارێک هەبوو توڕەیی وای دەکرد پڕ خوێن ببێت.

کە دەڵێ: «أَقْنَى الْعِرْنَيْنِ» بە کەسرە خوێندنەوەی ئەو نونەی لە دوای ڕا دێت، جا (عِرْنَيْن) لوتە، واتە: لوتی درێژ بووە، کەواتە: لە لوتیدا تۆزیکی کەم درێژیی هەبووە.

---

(١) ١٧٥/١.




کە دەڵێ: «بَادِنٌ مُتَمَاسِكٌ» ڕابورد لە وەسفی عەلی ﷺ کاتێ گوتی: «وَلَمْ يَكُنْ بِالْمُطَهَّمِ»[١] واتە: قەڵەو نەبووە، لێرەشدا گوتی: (بَادِنٌ مُتَمَاسِكٌ) واتە: جەستەی لاواز نەبووەو قەڵەویش نەبووە، بەڵکو جەستەی پڕ بووە، ئەوەش جۆرێک لە وەسف کردنی تێدایە بە بەهێزی، واتە: لاشەی بەهێز بووە.

وە کە دەڵێ: «سَوَاء الْبَطْنِ وَالصَّدْرِ» واتە: دەرچوون و بەرزی لە سک و سنگیدا نەبوو، بەڵکو ڕاست و وەک یەکتری بوو، وە کە دەڵێ: «عَرِيضُ الصَّدْرِ» واتە: سنگی پان و فراوان بوو، وە کە دەڵێ: «بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، ضَخْمُ الْكَرَادِيسِ» پێشتر ماناکەی ڕابورد.

کە دەڵێ: «أَنْوَرُ الْمُتَجَرَّدِ» واتە: ئەو ئەندامانەی موویان پێوە نەبوون، یان جلیان لەسەر نەبوون ڕوون و صاف بوون، واتە: ئەوەی لە جەستەیدا بێ موو بوو، یان بێ جل بوو ڕووناکی و درەوشاوەیی لێوە دەردەکەوت.

کە دەڵێ: «مَوْصُولُ مَا بَيْنَ اللَّبَّةِ وَالسُّرَّةِ بِشَعْرٍ يَجْرِي كَالْخَطِّ» (اللَّبَّة): ئەو چاڵەیە کە دەکەوێتە سەرەوەی سینگ (و کۆتایی گەروو)، جا ئەوەی لە نێوان لەببەو ناوک بە یەکەوە گەیەنراوە بە موویەک ڕێی دەکرد، وەک هێڵێکی ڕاست و ڕوون و دیار، پێشتر ڕابورد کە ئەوە باریکایی مەسروبەیە.

کە دەڵێ: «عَارِي الثَّدْيَيْنِ وَالْبَطْنِ» واتە: مەمکەکان و سکی موویان لەسەر نەبوو، «مِمَّا سِوَى ذَلِكَ» واتە: جگە لەو مووەی باسکرا، وە کە دەڵێ: «أَشْعَرُ الذِّرَاعَيْنِ وَالْمَنْكِبَيْنِ وَأَعَالِي الصَّدْرِ» واتە: ئەو شوێنانە لە جەستەی (باسکەکان و شانەکان و سەرەوەی سنگی) مووی پێوەبوو.

کە دەڵێ: «طَوِيلُ الزَّنْدَيْنِ» زەند خوارووی باڵە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ زەندەکانی درێژ بووە، کە دەڵێ: «رَحْبُ الرَّاحَةِ» واتە: ناو لەپی فراوان بووە، کە دەڵێ: «شَثْنُ الْكَفَّيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ» ماناکەی ڕابوردو باسکرا.

کە دەڵێ: «سَائِلُ الْأَطْرَافِ -أَوْ قَالَ: شَائِلُ الْأَطْرَافِ» واتە: دەست و لاقەکانی درێژ بوون، درێژیەکی مامناوەند، وە کە دەڵێ: «خَمْصَانُ الْأَخْمَصَيْنِ» (الأخمص): ئەو شوێن و

---

(١) انظر: (ح ٧).



چاڵەی ژێر پێیە کە بەر زەوی ناکەوێ لە کاتی داناندا، واتە: ئەو چاڵاییەی زۆر بەرز نەبوو، بەڵکو بەرزاییەکەی مامناوەندی بوو.

وە کە دەڵێ: «مَسِيحُ الْقَدَمَيْنِ، يَنْبُو عَنْهُمَا الْمَاءُ» واتە: پێیەکانی صاف و لووس بوون و، درز نەبوو بوون شەق نەبوون، یان هاوشێوەی ئەوە، ئاویشی لەسەر نەدەوەستا، جا پێی صاف و لووس ئەگەر ئاوی بەسەردا برژێ، ئەوە ئاوەکە یەکسەر لەسەری دەڕوات و ناوەستێ، بە پێچەوانەی ئەو پێیەی کە درزی تێدابێت و شەق بووبێت.

«إِذَا زَالَ زَالَ قَلِعاً» واتە: کاتێ دەڕۆیشت بە بەهێزی پێی بەرز دەکردەوە لە زەوی، بەرزی نەدەکردنەوە، وەک بەرزکردنەوەی کەسی ساردو سڕو خاو، بەڵکو بەرزی دەکردنەوە وەک بەرزکردنەوەی کەسێکی بەهێز، وە کە دەڵێ: «يَخْطُو تَكَفِّيَاً» مانای (التكفي)مان زانی لە فەرموودەکەی عەلی و ئەنەس ﵄ کە ڕابورد[1]، وە کە دەڵێ: «وَيَـمْشِي هَوْنَاً» ڕۆیشتنی هەون ڕۆیشتنێکی مامناوەندە، کە لە سیفەتەکانی بەندە تایبەتەکانی خوایە، وەک لە سوورەتی فورقاندا هاتوە.

کە دەڵێ: «ذَرِيعُ الْمِشْيَةِ» واتە: هەنگاوی فراوان بوو، بەڵام بەبێ زۆری لە خۆکردن، وە کە دەڵێ: «إِذَا مَشَـى كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ» واتە: کاتێ دەڕۆیشت وەک ئەوە وابوو لە لێژایی بێتە خوارەوە.

«وَإِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ جَمِيعَاً، خَافِضُ الطَّرْفِ، نَظَرُهُ إِلَى الْأَرْضِ أَطْوَلُ مِنْ نَظَرِهِ إِلَى السَّمَاءِ، جُلُّ نَظَرِهِ الْمُلَاحَظَةُ، يَسُوقُ أَصْحَابَهُ وَيَبْدَأُ مَنْ لَقِيَ بِالسَّلَامِ» وە ئەگەر ئاوڕی دابایەوە بە تەواوی لاشەی خۆی دەسووڕاندو ئاوڕی دەدایەوە، ڕووی لە کەسەکە دەکردو چـاوی نزم دەکرد، سەرنجدان و تەماشاکردنی بۆ زەوی زیاتر بوو وەک لە تەماشاکردنی بۆ ئاسـمان، بە زۆری بە گۆشەی چاو سەرنجی دەدا، هاوەڵانی پێش خۆی دەخستـن، هەر کەسێک پێی گەیشتبایە سەرەتا خۆی سڵاوی دەکرد.

---

(١) انظر: (ح ٢ و ح ٥).




کە دەڵێ: «مَنْهُوسُ الْعَقِبِ؟ قَالَ: قَلِيلُ لَحْمِ الْعَقِبِ» سیماک ئەم ڕستەیەی بەوە مانا کردوە: (پاژنە پێی گۆشتی کەم بوو)، مەبەست لە (عقب) بەشی دواوەی پێ یە.

١٠- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي لَيْلَةٍ إِضْحِيَانٍ، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِ وَإِلَى الْقَمَرِ، فَلَهُوَ عِنْدِي أَحْسَنُ مِنَ الْقَمَرِ»[1].

واتە: ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە، لە جابری کوڕی سەمورە ﷺ، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە شەوێکی ڕووناک (مانگە شەو)دا، دوو پارچە پۆشاکی سوورباوی پۆشی بوون، منیش بەراوردم دەکرد، تەماشای ئەوم دەکردو، تەماشای مانگم دەکرد (تا بزانم کامیان جوانترە!)، جا ئەو ﷺ لە لای من (ڕووی موبارەکی) زۆر جوانتر بوو لە مانگی چواردە».

جابر ﷺ کە دەڵێ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي لَيْلَةٍ إِضْحِيَانٍ» واتە: لە شەوێکدا کە مانگ زۆر ڕووناک بێت، ئەوەش لە حاڵێکدایە کە مانگی چواردە لە تەواویدایە، وە لەوپەڕی جوانی و ڕێکیەتی.

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ» واتە: ئەو دوو پۆشاکەی کە لەبەر پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، وە پێشتر واتای (الحُلَّة) باسکراو ڕابورد.

لە چەند فەرموودەیەکدا وێکچوواندنی ڕووخساری پێغەمبەری خوا ﷺ بە مانگەوە دێت، وە مەبەستیش لەم وێکچواندنە لێرەدا تەنها بۆ نزیک کردنەوەیە لە واتاو ڕوونکردنەوەیەتی، ئەگەرنا خوای بەرز ڕووخساری پێغەمبەری ﷺ داپۆشیوە بە جوانییەکی زۆر گەورە، جوانیەکی هێندە زۆر، کە زۆر زیاترە لە جوانی مانگ.

کە دەڵێ: «فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِ وَإِلَى الْقَمَرِ» واتە: سەیری جوانی و ڕێک و پێکی ڕووخساری پێغەمبەری خوام ﷺ کردو، پاشانیش سەیری جوانی مانگم کرد، ئنجا (هەڵساوە) هەردوو جوانیەکەی بەراورد کردوە.

---

(١) أخرجه والمصنِّف في جامعه: ٢٨١١، وفي إسناده أشعث بن سوَّار؛ وهو ضعيف، لكن تشبيه وجهه ﷺ بالقمر وأنَّه أجملُ من القمر له شواهد في أحاديث يأتي ذكُرها.

کە دەڵێ: **«فَلَهُوَ عِنْدِي أَحْسَنُ مِنَ الْقَمَرِ»** واتە: بۆی دەرکەوت کەوا جوانی پێغەمبەر ﷺ زۆر زۆر زیاتر بوو لە جوانیەکەی مانگ.

**١١- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ رضي الله عنه: أَكَانَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِثْلَ السَّيْفِ؟ قَالَ: «لَا، بَلْ مِثْلَ الْقَمَرِ»[1].**

واتە: ئەبو ئیسحاق دەڵێ: پیاوێک پرسیاری کرد لە بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه: ئایا ڕووخساری پێغەمبەری خوا ﷺ وەک شمشێر (ڕەونەقدار) بوو؟ گوتی: «نەخێر، بەڵکو وەک مانگ بوو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: **«مِثْلَ السَّيْفِ»** لەوانەیە مەبەستی پێی ڕەونەق و بریسکەی شمشێر بێت، وە دەشگونجێ مەبەستی پێی درێژیی و ڕێک و ڕاست وەستاوی شمشێر بێت.

کە دەڵێ: **«لَا، بَلْ مِثْلَ الْقَمَرِ»** باسی ئەوە دەکات کە ڕووخساری پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوورو ڕووناکی و درەوشاوەییەکەی وێنەی مانگ بووە، هەروەها لە شێوە خڕیەتیەکەشدا.

پێشەوا ئیبنو حەجەر رحمه الله لە (فتح الباري)دا[2] دەڵێ: وا دێتە پێش چاو پرسیارکار ویستوویەتی (وێنەی پێغەمبەر ﷺ) بچوێنێ بە وێنەی شمشێر، لە درێژیی و ڕێکی دا، بۆیەش بەڕائی کوڕی عازیب رضي الله عنه وەڵامی دەداتەوە بە نەخێرو گوتوویەتی: وەک مانگ بوو، هەروەها لە شێوە خڕیەتیەکەشدا، وە دەشگونجێ مەبەستیشی پێی ئەوە بێ وەک شمشێر بێ لە ڕووی بریسکە دانەوەو صافیەتیدا، بۆیەش گوتوویەتی: لەسەرووی ئەوەوە بوو، کە نموونەکەی گۆڕیوە بۆ مانگ لەبەر ئەوەی دوو سیفەتی تێدا کۆببوونەوە، ئەوانیش: لە شێوە خڕیەتیەکە لەگەڵ ڕەونەق و بریسکەو درەوشانەوە.

---

(١) أخرجه والمصنِّف في جامعه: ٣٦٣٦؛ وفي إسناده سفيان بن وكيع وهو ضعيف، لكن رواه البخاري: ٣٥٤٩ من طريق أخري عَنْ أَبِي نُعَيْمٍ، حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، قَالَ: سُئِلَ الْبَرَاءُ: أَكَانَ وَجْهُ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَ السَّيْفِ ؟ قَالَ: «لَا، بَلْ مِثْلَ الْقَمَرِ».

(٢) ٥٧٣/٦.

پێشتر ئەوە ڕوونکراوە کە ڕووخساری پێغەمبەری خوا ﷺ تەواو خڕو بازنەیی نەبوو، بەڵکو لە نێوان خڕیی و درێژیی دابوو.

١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبْيَضَ كَأَنَّمَا صِيغَ مِنْ فِضَّةٍ، رَجِلَ الشَّعْرِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ پێستی سپی باوبوو، وەک ئەوەی لە زیو دروست کرابێ و داڕێژرابێ، پرچی نە خاو بوو، نە لوول بوو (لەم نێوانەدا بوو)».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

قسەی ئەبو هورەیرە ﷺ کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبْيَضَ»، پێشتر ئەوەمان زانی (ڕوونمان کردەوە) کە سپیایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سپیەکی زۆر ڕوون و پوخت نەبوو، وە گەنم ڕەنگیش نەبووە، بەڵکو سپیەکی تێکەڵ بوو بە کەمێک سووریی.

کە دەڵێ: «كَأَنَّمَا صِيغَ مِنْ فِضَّةٍ» دیارە کە زیو بە بریسکەو درەوشاوەییەکەی ناسراوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە ڕوخسارو پێستیدا نوورو ڕووناکیی و درەوشاوەییەکی وێنەی زیوی هەبوو، (واتە: سیفەتی زیوی هەبوو لە درەوشاوەیی و بریسکەداریی دا).

کە دەڵێ: «رَجِلَ الشَّعْرِ» ئەوە ڕابردو باسکرا پێشتر کە پێغەمبەری خوا ﷺ پرچی نە لوول بوو، وە نە نەرم و خاویش بوو، بەڵکو لە نێوان ئەو دوو شێوەدا بوو.

١٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «عُرِضَ عَلَيَّ الْأَنْبِيَاءُ، فَإِذَا مُوسَى ﷺ ضَرْبٌ مِنَ الرِّجَالِ، كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ، وَرَأَيْتُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ ﷺ، فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهاً عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ، وَرَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ ﷺ، فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهاً صَاحِبُكُمْ، يَعْنِي نَفْسَهُ، وَرَأَيْتُ جِبْرِيلَ ﷺ فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهاً دِحْيَةُ»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێغەمبەرانم پیشاندرا جا مووسا ﷺ وێنەیەکە لە پیاوان هەروەک پیاوێک بێ لە (پیاوەکانی) هۆزی شەنوئە (کە بە شێوەیەکی گشتی باڵایان مامناوەندی بوو)، عیسا ﷺم بینی نزیکترین کەس لەوانەی بینیومن لەو بچێ عوروەی کوڕی مەسعوودە، وە

(١) في الإسناد صالح بن أبي الأخضرَ، قال عنه الحافظ ابن حجر ﷺ: ضعيفٌ يعتبر به تقريب التهذيب: ٢٧١/٢.

(٢) أخرجه مسلم: ١٦٧، والمصنّف في جامعه: ٣٦٤٩.



ئیبراهیم ؑم بینی نزیکترین کەس لەوانەی بینیومن لەو بچێ هاوەڵەکەی خۆتانە، واتە: زاتی خۆی، (واتە: پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ئیبراهیم ؑ چووە)، وە جیبریل ؑم بینی، نزیکترین کەس لەوانەی بینیومن لەو بچێ دیحیە ؓ بوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «عُرِضَ عَلَيَّ الْأَنْبِيَاءُ» دەگونجێ ئەم پێشاندان و ڕانواندنە لە خەوندا بووبێ، هەروەک دەشگونجێ لە کاتی شەوڕۆیی (الإسراء) پێکرانییدا بووبێ.

کە دەڵێ: «فَإِذَا مُوسَى ؑ ضَرْبٌ مِنَ الرِّجَالِ» واتە: کەسێکی مامناوەند بوو، لە بەژن و باڵاو لاشەیدا لە نێو پیاواندا، کە فەرموویەتی: «كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ» (شَنُوءَةَ): هۆزێکە لە یەمەن (خەڵکەکەی) بەوە ناسراون لە ڕووی لاشەوە بەهێزو پتەون و هاوسەنگ و جوانن.

کە دەڵێ: «وَرَأَيْتُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ ؑ ، فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهاً عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ» باسی پێغەمبەر عیسا ؑ دەکات، کە هاوشێوەی ئەو زۆر نزیکە، لە هاوەڵی بەڕێز عوروەی کوڕی مەسعوود ؓ.

کە دەڵێ: «وَرَأَيْتُ إِبْرَاهِيمَ ؑ، فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهاً صَاحِبُكُمْ، يَعْنِي نَفْسَهُ» (یانی: پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا باسی خۆی دەکات، کە زۆر لە پێغەمبەر ئیبراهیم ؑ چووە.

کە دەڵێ: «وَرَأَيْتُ جِبْرِيلَ ؑ فَإِذَا أَقْرَبُ مَنْ رَأَيْتُ بِهِ شَبَهاً دِحْيَةُ» لێرەدا مەبەست دیحیەی کەلبییە، کە لە نێو هاوەڵاندا لە جوانترینیان بووە، جا جیبریل کە لەسەر شێوەی مرۆڤ هاتبایە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەندێک جار لەسەر شێوەی دیحیەی کەلبی دەهاتە لای.

١٤- عَنْ سَعِيدٍ الْجُرَيْرِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا الطُّفَيْلِ ؓ يَقُولُ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَمَا بَقِيَ عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ رَآهُ غَيْرِي»، قُلْتُ: صِفْهُ لِي، قَالَ: «كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحاً مُقَصَّداً»[1].

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٣٩ من حديث عبد الأعلى بن عبد الأعلى عن الجريري عن أبي الطُّفيل ؓ.

واتە: سەعیدی جورەیری دەڵێ: گوێم لە ئەبو توفەیل بوو ﷺ دەیگوت: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر ڕووی زەوی هیچ کەسێکی دیکە نەماوە ئەوی بینیبێ و ئێستا مابێت لە ژیاندا جگە لە من»، دەڵێ: منیش گوتم: بۆم وەسف بکە (چۆن بوو؟)، (ئەبو توفەیل) گوتی: «کەسێکی سپی باوبوو، ڕێک و جوان و مامناوەندی بوو (لە کورت و درێژیی و لاوازیی و قەڵەویی)».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەبو توفەیل ﷺ کە دەڵێ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَمَا بَقِيَ عَلَى وَجْهِ الْأَرْضِ أَحَدٌ رَآهُ غَيْرِي»، واتە: هەموو هاوەڵانی (پێغەمبەر ﷺ) مردوون و، هیچ کەسێکیان لە ژیاندا نەماون جگە لەو، کە (ئەویش) لەساڵی (سەد) وەفاتی کردوە، (دەشگوترێ) کە لە دوای ساڵی سەد مردووە، (کەواتە:) ئەو دوا هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە وەفاتی کردبێ، جا (ئەم هاوەڵە بەڕێزە) لێرەدا بە سێ سیفەتی کۆکەرەوە وەسفی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات:

دەڵێ: «كَانَ أَبْيَضَ» (واتە: سپی باوبوو) کە دیارە ئێمە پێشتر زانیمان وشەی (سپیەتی) لە وەسفی پێغەمبەری خوادا ﷺ چ دەگەیەنێ.

وە دەڵێ: «مَلِيحاً» بریتیە لە کرانەوەی ڕوخسارو جوانی و تەواوی لە لاشەو پێست و شێوەی (بە گشتی).

وە دەڵێ: «مُقَصَّداً» مەبەست لێی مامناوەندییە، یانی: مامناوەند بوو لە ڕووی درێژیی و کورتی باڵایدا، لە ڕووی ڕەنگی پێستی دا (نە زۆر سپیەکی خوێن ساردو، نە گەنمیەکی تۆخ، بەڵکو سپی تێکەڵ بە سوور بوو)، هەروەها مامناوەند بوو لە ڕووی لاشەو پرچ و مووی لاشەی بە گشتی، کە ئێمە پێشتر هەموو ئەوانەمان ڕوونکردۆتەوە.

١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَفْلَجَ الثَّنِيَّتَيْنِ، إِذَا تَكَلَّمَ رُئِيَ كَالنُّورِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ ثَنَايَاهُ»[1].

---

(١) أخرجه الطبراني في الكبير: ١٢١٨١، والأوسط: ٧٧١؛ وفي إسناده عبد العزيز ابن أبي ثابت الزُّهري وهو متروك الحديث؛ وأمَّا وصفُ النَّبيِّ ﷺ بأنَّه أفلج الثَّنيَّتين فقد تقدَّم ذكره في بعض الأحاديث.




واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان دوو ددانەکانی پێشەوەی کەلێن هەبوون، کاتێک قسەی بکردبایە وێنەی نوورێک لە نێوان دوو ددانەکانی دەردەچوون و دەبینران».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر رحمه الله، ئەم بەشەی بەم فەرموودەی ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما کۆتایی پێهێناوە: کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَفْلَجَ الثَّنِيَّتَيْنِ» دوو ددانی پێشەوە شتێکی زانراوە (خەڵک دەزانن مەبەست پێی کامەیانە)، (أَفْلَجَ): ئەو کەسەیە کە لە نێوان ددانەکانیدا بۆشایی و لێک دوورییەک هەبێ، کە بێگومان ئەوە بە جوانی بۆی هەژمار دەکرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە بوو (ددانی موبارەکی)، بۆیەش دەڵێ: «إِذَا تَكَلَّمَ رُئِيَ كَالنُّورِ يَخْرُجُ مِنْ بَيْنِ ثَنَايَاهُ» (واتە: کاتێک قسەی بکردبایە وێنەی نوورێک لە نێوان دوو ددانەکانی دەردەچوو و دەبینرا).

### ئاگاداریەک:

وەسفکردنی پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە نوورێک لە نێوان ددانەکانی بینراون، وە پێغەمبەری خوا ﷺ وەک مانگ بووە لە ڕووی درەوشاوەیی و ڕەونەق و (جوانیدا)، (بەڵکو لە مانگیش جوانتر بووە)، وە وێنەی ئەم جۆرە قسانە، هەندێک کەس کە هەڵساون شتیان لە وەسفی پێغەمبەری خوا ﷺ نووسیوە تووشی ئەم هەڵەیە بوون، کردوویانە بە نوورێکی هەست پێکراو، بەو مانایەی کە ڕووناکی و ڕۆشناییەکەی دەوروبەری خۆی ڕووناک کردۆتەوە!

وە لەوانەیە هەندێکیان گوتبیان: (خۆشەویست ﷺ) هەر سێبەری نەبووە، بە گوێرەی ئەو ڕۆشناییەی کە نوورێکی هەستپێکراو بووە! جا ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە، چونکە زۆر فەرمایشت هاتوون، بەڵگەن و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە.





ـەوانە بەسەرهات و ڕووداوی دایکمان عائیشە ﵂ هاتوە، گوتوویەتی: {فَقَدْتُ رَسُولَ للّهِ ﷺ لَيْلَةً مِنَ الْفِرَاشِ، فَالْتَمَسْتُهُ، فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ، وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ، وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ»}[١].

واتە: شەوێک پێغەمبەری خوام ﷺ لەسەر جێگەی خەوتن لێ ون بوو، منیش بۆی دەگەڕام، جا دەستم بەر بنە پێیەکانی کەوتن، ئەو لە مزگەوت بوو، (هەر دوو پێی لە زەوی چەقاندبوون) لە سوژدە بوو، دەیفەرموو: «خوایە! پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیت لە تووڕە بوونت، وە بە لێبووردنت لە سزا دانت، پەنا دەگرم بە زاتی تۆ لە زاتی تۆ، ناتوانم بەو شێوە ستایشت بکەم کە شایستەی تۆیە، وەک تۆ دەتوانیت ستایشی خۆت بکەیت بەو شێوەی شایستەی زاتی پاکتە».

جا ئەگەر (پێغەمبەر ﷺ) نوورێکی هەست پێکراو بووایە، وەک ئەوانەی وای لێ تێگەیشتوون پێویستی نەدەکرد دایکمان عائیشە ﵂ کاتێک چووە نێو مزگەوت بە تاریکاییەدا بڕوات و بە دەست لە دوای بگەڕێ تاکو دەستی بەر پێی بکەوێ، کە لە کڕنووشدا بوو!

ئەم فەرموودەو هاووێنەکانی زۆرن، کە ئەم هەڵە تێگەیشتنەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە، دەربارەی ئەم فەرموودانەی کە باسی نووری پێغەمبەر ﷺ دەکەن و دەڵێن: نوورێکی هەست پێکراو بووەو، دەوروبەری خۆی ڕووناک کردۆتەوە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٤٨٦.

دانەر ﷺ ئەم بەشەی تایبەت کردووە بە ڕوونکردنەوەو باسکردنی سیفەتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی (چۆنیەتی) دروستکرانیەوە، کە ئەمەش بەشێکە لە بابەتی پێش خۆی، چونکە لە سیفەتە تایبەت دروستکرانەکەی پێغەمبەرە ﷺ، کە خوای بەرز مۆری پێغەمبەرایەتی لە نێوان شانەکانی داناوە، وە هەموو زانایانیش هاوڕان کە ئەم مۆرە، (یەکێک بووە لە) نیشانەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ، تەنها ڕاجیان لەسەر ئەوەی کە ئایا لە کاتی لە دایک بوونیش ئەم مۆرە هەبووە، یاخود دوای لە دایک بوون لێی بینراوە؟! ئەوەی دیارو ئاشکرایەو ڕیوایەتەکان پشت ڕاستی دەکەنەوەو بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو مۆرە لە ڕووداوی سینگ لەت کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیدابووە، کاتێک جیبریل هاتە لای و سینگی لەت کردو دڵی (بە ئاوی زەمزەم) شۆرد، ئا لەم ڕووداوەدا مۆری پێغەمبەرایەتی لێدراوە لە نێوان هەردوو شانەکانیدا.

وە ئەم مۆرە پارچەیەکی بەرزی دیار بوو لەسەر لاشەدا، لە نێوان هەردوو شانەکانی دا بوو، بەڵام لە لای شانی چەپەی نزیکتر بوو، وە باسی قەبارەو ئەندازەکەی لە داهاتوودا دێ، کە دانەر لە فەرموودەکانی دواتردا باسی دەکات، بەوەی کە بە ئەندازەی هێلکەی کۆترێک بووە، لە ڕووی ڕەنگیشەوە، وەک پێستی لاشە بووە.

لە کتێبە (ئاسمانیەکانی) پێشتردا باسی ئەم مۆرە کراوە وەک نیشانەو وەسفێکی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە خاوەن کتێبەکان شارەزاییان هەبووە لەبارەیەوە، ئەویش بە هۆی ئەوەی کتێبەکانیان دەخوێندەوەو دەیانزانی ئەوە نیشانەی پێغەمبەرایەتیەتی، وەک دواتر باسی دەکەین، کاتێک سەلمان ﷺ ناوی پێغەمبەری ﷺ بیست هاتە خزمەتی و داوای پێشاندانی ئەم نیشانەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئیدی دەگەڕا تاکو بینی (ئنجا باوەڕی پێ هێنا).

١٦- عَنِ الْجَعْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ[١] قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ﷺ يَقُولُ: «ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ. فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ، وَتَوَضَّأَ، فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، وَقُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ، فَنَظَرْتُ إِلَى الْخَاتَمِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، فَإِذَا هُوَ مِثْلُ زِرِّ الْحَجَلَةِ[٢]»[٣].

واتە: جەعدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: گوێم لە سائیبی کوڕی یەزید بوو ﷺ دەیگوت: «پوورم لەگەڵ خۆی منی برد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕە خوشکەم نەساغەو ئازاری هەیە، (پێغەمبەریش ﷺ) دەستی بەسەرمدا هێناو دوعای بەرەکەتی بۆ کردم، وە دەستنوێژی شۆردو، لە ئاوی دەستنوێژیم خواردەوە، پاشان وەستام لە پشتیەوە، سەیری مۆری (پێغەمبەرایەتیم) دەکرد، لە نێوان دوو شانەکانی، کە وەک هێلکەی کەو بوو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ» ئیبنو حەجەر ﷺ دەڵێ: نەمزانی (پووری ﷺ) ناوی چیە[٤].

کە (پووری) دەڵێ: «يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَجِعٌ» (وَجِع) واتە: نەخۆشە، لە هەندێک ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، بۆ وێنە لە صەحیحی بوخاریدا[٥] دەڵێ: {يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَقَعَ}، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم کوڕە خوشکەم بەربۆتەوە (پێی ئازاری هەیە).

جا هەندێک لە زانایان لەمەوە ئەوەیان وەرگرتووە کە ئێش و ئازارەکەی لە پێیەکانیدا بووە، وە ئیبنو حەجەریش دەڵێ: ئەو منداڵە ئازارەکەی لە پێیدا بووە، وەک لە غەیری ئەم ڕیوایەتەشدا ئەمە جێگیر بووەو باسکراوە[٦].

---

(١) الجعْد بن عبدِ الرَّحمن بالتَّكبير، يُصغَّر الجُعَيد.

(٢) الحَجَلة بفتحين، وقيل: بضم الحاء، وقيل: بكسر الحاء وسكون الجيم فيها.

(٣) أخرجه البخاري: ١٩٠، ومسلم: ٢٣٤٥، والمصنِّف في جامعه: ٣٦٤٣.

(٤) فتح الباري: ٥٦٢/٦.

(٥) أخرجه البخاري: ٣٥٤١.

(٦) فتح الباري: ٥٦٢/٦.




کە (منداڵەکە) دەڵێ: «فَمَسَحَ رَأْسِي» دیارە کە دەست هێنان بەسەری منداڵدا مانای خۆش ڕەفتاریی و بەزەیی پێداهاتنەوە دەگەیەنێ، هەروەک چۆن دەست هێنان بەسەر سەری نەخۆشیش دڵنەوایی و خۆشحاڵ کردنی کەسی نەخۆشە ئەم هەست کردنە بە هەندێک لەوەی بە هۆیەوە گرفتارە لە بەرزی پلەی گەرمای لەش و دڵەڕاوکەو هاوشێوەی ئەوە، کە گوتیشی: «وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ» مەبەست لە وشەی بەرەکەت: بە دەستهێنانی خێرو گەشەو زیادبوونی (بەخششی خوایە).

جا خوای پەروەردگاریش وەڵامی دوعاکەی پێغەمبەری ﷺ دایەوە بە بەرەکەت، وەک لە هەندێک لە فەرموودەکەدا هاتوە، لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە: {عَنِ الْجُعَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ رَأَيْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ ابْنَ أَرْبَعٍ وَتِسْعِينَ جَلْدًا مُعْتَدِلًا فَقَالَ: قَدْ عَلِمْتُ مَا مُتِّعْتُ بِهِ سَمْعِي وَبَصَرِي إِلَّا بِدُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِنَّ خَالَتِي ذَهَبَتْ بِي إِلَيْهِ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَ أُخْتِي شَاكٍ فَادْعُ اللَّهَ لَهُ قَالَ: فَدَعَا لِي}[1]. واتە: جوعەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: سائیبی کوڕی یەزیدم بینی تەمەنی (٩٤) ساڵ بوو، کەچی زۆر بەهێزو ڕێک و پێک و هاوسەنگ بوو (کوڕ نەبووبۆوە)، جا گوتی: جگە لە دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ گومان نابەم شتێکی دی هەبێ کە وای کردووە بەم شێوەبم و بەهرە لە بیستن و بینینم وەربگرم، کە (بچووک بووم) پوورم بردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەوە نەخۆشە، داوا لە خوا بکە شیفای بدات، ئەویش ﷺ دوعای بۆ کردم و بۆم پاڕایەوە.

تەمەنی لە نەوەد ساڵی تێپەڕی بوو، کەچی هێشتا لاشەی ڕێک و بەهێزو هاوسەنگ بوو، هیچ جۆرە لاربوونەوەیەکی پێوە نەدەبینرا، هەروەها بەهرەمەند بوو لە بیستن و بینینی دا، بێگومان ئەوەش بە هۆی بەرەکەتی پاڕانەوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، جا سائیب ﷺ دوا هاوەڵ بوو کە لە ساڵی (٩١)ی کۆچی لە مەدینە وەفاتی کردو، لەو کاتەش تەمەنی (٩٦) ساڵ بوو.

کە دەڵێ: «وَتَوَضَّأَ، فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ» پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی شۆردو، منیش لە ئاوی زیادەی دەستنوێژەکەیم خواردەوە، واتە: ئەو ئاوەی لە دوای بەرکەوتنی بە لاشەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺو جیابوونەوەی لێی خواردۆتەوە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٥٤٠.



کە ئەوەش جۆرێکە لە تەبەڕڕوک، هەروەک تەبەڕڕوک بە لیک و تاڵە موو، وە بە ئاوی دەستنوێژی ﷺ، کە ئەمە دروستەو چەندان بەڵگەشی لەسەرن، زۆر فەرموودە هەن، بەڵگەن لەسەر ئەوەی هاوەڵان وایان کردوە، ئەمەش یەکدەنگی کەسانی شارەزاو بەرچاو ڕۆشن بە سوننەتی پێغەمبەری خوای ﷺ لەسەرە، کە ئەوە لە تایبەتمەندی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

(شایانی باسە ئەمەی گوترا) لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، کەواتە: نابێ بە هیچ جۆرێک تەبەڕڕوک بە لیک و تاڵە موو و ئارەق و ئاوی دەستنوێژی هیچ کەسێک بکرێ غەیری پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئەوەی (وەک گوتمان) ئەوە لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ وە هیچ کەسێکیش بەو ﷺ ناگات، هەرچەندە ئەو کەسە خاوەنی فەزڵ و پلەوپایەش بێت.

کە دەڵێ: «وَقُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ» یانی سائیب ﷺ لە پشتی پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستا، وە مەبەستیشی لەو ڕاوەستانە لە پشت پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو ویستی تەماشای مۆرەکەی بکات، کە لەوانەیە لەوبارەوە بیستبی هێشتا نەیبینی بێت دوای ئەوەی بۆی باسکراوە، وە دەشگونجێ بێ ئەو مەبەستە بووبێ هەروا ڕاوەستابێ، بەڵام کاتێ ڕاوەستاوە چاوی کەوتۆتە سەر مۆرەکەو بینیویەتی.

کە دەڵێ: «فَنَظَرْتُ إِلَى الْخَاتَمِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ» ئەم ناوەندیەتیە لە ڕووی دیاری کردنی شوێنی مۆرەکە تەواو نیە، بەڵکو مەبەست لێی نزیک خستنەوەیە (بۆ زیهنی گوێگر، یان خوێنەر)، چونکە مۆرەکە بە تەواوی لە ناوەڕاستی پشتی نەبوو، بەڵکو زیاتر بەلای شانی چەپیەوە نزیکتر بوو، هەروەک بەڵگەکان گەواهیدەرو شایەدن لەسەر ئەمە، لەوانەیە یەکێک لە حیکمەتەکانی ئەوە بووبێ وەک زانایان باسیان کردووە ئەم شوێنە نزیکترە لە شوێنی دڵ.

کە دەڵێ: «فَإِذَا هُوَ مِثْلُ زِرِّ الْحَجَلَةِ» دانەری کتێب (پێشەوا الترمذي ﷺ) لە کتێبی: (الجامع الصحيح)دا[1] باسی ئەم فەرموودەی کردووەو دەڵێ: مەبەست لە (زِرِّ الْحَجَلَةِ) هێلکەی پۆڕە، کە ئەویش باڵندەیەکی ناسراوە، هەندێ فەرموودەی دیکە دواتر دێن

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٦٤٣.



ئەمە پشت ئەستوور دەکەن کە (مۆرەکە) وەک هێلکەی کۆتر بووە، ئەویش لە ڕووی قەبارەوە نزیکە لە هێلکەی پۆڕ، وە هەندێک لە زانایانی دیکە دەڵێن: مەبەست لە (الْحَجَلَة)ـە، یانی: وەکو گومەزە، وە مەبەستیش لە (الزِّر) ئەوەیە دەخرێتە ناو شوێنی خەوەکە وێنەی دەسک، کە ئەوەش نزیکە لە قەبارەی هێلکەی باسکراو.

١٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ الْخَاتَمَ بَيْنَ كَتِفَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ غُدَّةً حَمْرَاءَ مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ»[1].

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: «مۆری (پێغەمبەرایەتیم) لە نێوان هەر دوو شانی پێغەمبەری خوا ﷺ بینی گرێیەکی سوور بوو، بە وێنەی هێلکەی کۆتر بوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «رَأَيْتُ الْخَاتَمَ» واتە: مۆری پێغەمبەرایەتی، «بَيْنَ كَتِفَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» مەبەستیش لەو ناوەندیەتیە تەنها بۆ نزیک خستنەوەیەتی (لە زیهنی ئێمە) نەک دیاری کردنی شوێنەکەی بێ وەک خۆی، کە دەڵێ: «غُدَّةً»: وشەی (غُدَّة) بریتیە لەو گرێیەی (لووەی) لە نێوان پێست و گۆشت لە لاشە دەردەکەوێ، (هێندە نەرمە) ئەگەر پاڵی پێوەبنرێ بە دەست دەجووڵێ.

کە دەڵێ: «حَمْرَاءَ» کەواتە: ڕەنگی سوورە.

کە دەڵێ: «مِثْلَ بَيْضَةِ الْحَمَامَةِ» واتە: لە ڕووی قەبارەوە (هێندەی هێلکەی کۆترە).

## ئاگاداریەک:

ئەوەی باس دەکرێ لە هەندێک گێڕانەوەو ڕیوایەتدا کە گوایە (ئەم مۆرە) خاڵێکی ڕەش، یان خاڵێکی سەوز بووە، یان وێنەی ئەوانە، هیچ کامیان فەرموودەی صەحیحی لە بارەوە نەهاتوە، بەڵکو ئەوەی سەلمێنراوەو جێگیر بووە، ئەوەیە کە ڕەنگی وەک ڕەنگی پێستی لاشەیە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە پارچەیەکی بەرزبووەوەیە بە نزیکەی هێندەی قەبارەی هێلکەیەکی (کۆتر) دەبێ.

---

(١) في إسناده أيُوب بن جابر بن صيَّار؛ وهو ضعيف، وقد خرَّجه الإمام مسلم في صحيحه: ٢٣٤٤ من طريق عبد الله، عن إسرائيل، عن سِماك به، ولفظه: «رَأَيْتُ الخَاتَمَ عِنْدَ كَتِفِهِ مِثْلَ بَيْضَةِ الحَمَامَة، يُشْبِهُ جَسَدَهُ»، ومعنى «يُشْبِهُ جَسَدَهُ»: أي لونُه مثل لون الجسد.



١٨- عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بْنِ قَتَادَةَ، عَنْ جَدَّتِهِ رُمَيْثَةَ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَلَوْ أَشَاءُ أَنْ أُقَبِّلَ الْخَاتَمَ الَّذِي بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِنْ قُرْبِهِ لَفَعَلْتُ، يَقُولُ لِسَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ يَوْمَ مَاتَ: «اهْتَزَّ لَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ»[1].

واتە: عاصیمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە لە داپیری (کە ناوی) ڕومەیسەیە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: من گوێم لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ بووەو، (هێندە لێی نزیک بووم) ئەگەر ویستبام مۆرەکەی نێوان هەردوو شانی ماچ بکەم، ماچیم دەکرد، (دەڵێ ئەو قسانەی) بە سەعدی کوڕی موعاز دەفەرموو، (ئەو پیاوە بەڕێزەی لە کاتی مردنیدا) «عەرشی خوای بۆ هاتە هەژان».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ڕومەیسەی ئەنصاریی کە دەڵێ: «وَلَوْ أَشَاءُ أَنْ أُقَبِّلَ الْخَاتَمَ الَّذِي بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِنْ قُرْبِهِ لَفَعَلْتُ» (ئەگەر ویستبام مۆرەکەی نێوان هەردوو شانی ماچ بکەم، ماچیم دەکرد) مەبەستی لەم قسەیە زۆر نزیکیەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هەروەها ئەمە جەخت کردنەوەی ئەوەی تێدایە کە فەرمایشتی پێغەمبەری خوای ﷺ بیستوە، جا بە هۆی ئەو نزیکبوونەوەی لێی توانیویەتی مۆرەکەی ببینێ.

کە دەڵێ: «يَقُولُ لِسَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ يَوْمَ مَاتَ: اهْتَزَّ لَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ» واتە: عەرشی پەروەردگاری بۆ هەژا لە کاتی مردنی، ئەمەش پێگەیەکی مەزن و پلەیەکی زۆر بەرزە بۆ ئەم هاوەڵە بەڕێزە ﷺ، کاتێک عەرشی خوای بۆ هاتە هەژان، کە گەورەترین و فراوانترین دروستکراوی خوایەو، لە قورئان بە عەرشی مەزن و بەڕێزو فراوان باسکردووەو ئاسمان و سەقفی هەموو دروستکراوەکانەو بەرزترین دروستکراوی خوایە، بۆیە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، فەرموویەتی: {فَإِذا سَأَلْتُمُ اللهَ فَسَلُوهُ الفِردَوسَ، فَإِنَّهُ أَوسَطُ الجَنَّةِ وَأَعلَى الجَنَّةِ وَمِنهُ تُفجَرُ أَنهَارُ الجَنَّةِ}[2]. واتە: گەر داواتان لە خوا کرد فیردەوسی لێ داوا بکەن، چونکە ناوەڕاستی بەهەشتەو، بەرزترین شوێنی بەهەشتەو، لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقووڵێن (لە سەرووی ئەوەوە عەرشی خوای بێ وێنەیە).

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٢٦٧٩٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٧٤٢٣.




وە یەکێک لەو فەرموودانەی دەربارەی باسکردنی گەورەیی و مەزنی عەرش هاتوون ئەوەیە کە ئەبو زەڕ ﷺ دەیگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَا السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ، وَالأَرْضُونَ السَّبْعُ فِي الْكُرْسِيِّ إِلاَّ كَحَلَقَةٍ أُلْقِيَتْ فِي فَلاَةٍ، وَفَضْلُ العَرْشِ عَلَى الْكُرْسِيِّ كَفَضْلِ تِلْكَ الْفَلاَةِ عَلَى تِلْكَ الْحَلَقَةِ}[1]. واتە: بە ڕاستی هەر حەوت ئاسمانەکان و زەویەکان و هەر هەموو بەرامبەر بە کورسی وەک ئاڵقەیەکە لە بیابانێک فڕێ درابێ، وە فەزڵ و پێگەی عەرش لە چاو کورسیدا وەک فەزڵ و پێگەی ئەو دەشت و بیابانە فراوانەیە لە چاو ئەو ئاڵقەیەدا.

جا ئەو عەرشە مەزنە بۆ مردنی هاوەڵی خۆشەویست سەعد ﷺ هاتە هەژان، دیارە ئەو هەژانەش وەک هاتوە بەسەریدا تێپەڕ دەبین و لەسەر ڕووکەشی خۆی دەهێڵدرێتەوە، لەسەر بنەماو بنچینەی زانایانی سوننەت و جەماعەت لەوبارەوە کە گوتوویانەو دایانناوە.

١٩- عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى غُفْرَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، مِنْ وَلَدِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ، إِذَا وَصَفَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ -فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ- وَقَالَ: «بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ، وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ»[2].

واتە: عومەری کوڕی عەبدوڵڵای خزمەتکاری غوفرە، گوتی: ئیبراهیمی کوڕی موحەممەد کە یەکێکە لە کوڕانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ، گوتوویەتی: هەر کاتێک عەلی وەسفی پێغەمبەری خوای ﷺ کردبایە، (وەک لە فەرموودەکەی پێشێ هاتوە بە درێژی باسی دەکرد)، وە دەیفەرموو: «لە نێوان دوو شانەکانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو، وە ئەو کۆتایی پێغەمبەران بوو».

پێشتر لە فەرموودەی پێشەوا عەلی ﷺ باسی وەسفی پێغەمبەر ﷺ کراوە بە درێژیی لەم بەشەداو، بە هەمان سەنەدیش، (بەڵام) دانەر ﷺ لێرەدا دووبارەی کردۆتەوە (تەنها) لەبەر ڕستەی: «بَيْنَ كَتِفَيْهِ خَاتَمُ النُّبُوَّةِ، وَهُوَ خَاتَمُ النَّبِيِّينَ»، (واتە: لە نێوان دوو شانەکانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو، وە ئەو کۆتایی پێغەمبەران بوو).

---

(١) كتاب العرش لابن أبي شيبة: ١٧٤/١.

(٢) انظر: (ح ٧)؛ وقد تقدَّم بيان أنَّ في الحديث علَّتين: إحداهما ضعف عمر بن عبد الله، والأخرى الانقطاع بين إبراهيم وعليٍّ ﷺ.



٢٠- عَنْ أَبِي زَيْدٍ عَمْرُو بْنُ أَخْطَبَ الْأَنْصَارِيُّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا زَيْدٍ، ادْنُ مِنِّي فَامْسَحْ ظَهْرِي»، فَمَسَحْتُ ظَهْرَهُ، فَوَقَعَتْ أَصَابِعِي عَلَى الْخَاتَمِ قُلْتُ: وَمَا الْخَاتَمُ؟ قَالَ: «شَعَرَاتٌ مُجْتَمِعَاتٌ»[1].

واتە: ئەبو زەید کە عەمرِی کوڕی ئەختەبی ئەنصارییە رضي الله عنه، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: «ئەی ئەبو زەید: خۆتم لێ نزیک بخەوەو دەستت بە پشتمدا بێنە»، (منیش) دەستم بە پشتی داهێناو، ئیدی پەنجەکانی دەستم کەوتنە سەر مۆری (پێغەمبەرایەتی)، (ڕاوی دەڵێ) گوتم: مۆر چیە؟ گوتی: «کۆمەڵێک مووی کۆبووەوەیە».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

عەمرِی کوڕی ئەختەبی ئەنصاریی رضي الله عنه، کە دەڵێ: «قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا زَيْدٍ، ادْنُ مِنِّي فَامْسَحْ ظَهْرِي»، فَمَسَحْتُ ظَهْرَهُ». (ئەم شێوازە لە قسە کردن)و نەرم و نیانی و خۆش ڕەفتارو گوفتاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنێ (لەگەڵ کەسی بەرامبەرو) جوان دواندن و بایەخدانی بە هاوەڵانی خۆشەویستی لێ وەردەگیرێ، وەک دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ بە کونیەکەی ناوی ئەم هاوەڵە بەڕێزەی هێناوە، نەک ناوی خۆی!

کە دەڵێ: «ادْنُ مِنِّي» پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردوە لێی نزیک بکەوێتەوە.

کە دەڵێ: «فَامْسَحْ ظَهْرِي» یانی: دەستت بە پشتم دابێنە، دەست بخەرە سەر پشتم و بیجووڵێنە.

کە دەڵێ: «فَمَسَحْتُ ظَهْرَهُ» یانی: (عەمرِی کوڕی ئەختەب رضي الله عنه) دەستی داهێنا بە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

کە دەڵێ: «فَوَقَعَتْ أَصَابِعِي عَلَى الْخَاتَمِ» یانی: لە کاتی جووڵاندن و هێنان و بردنی دەستی لەسەر پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پەنجەکانی کەوتنە سەر مۆرەکە (مۆری پێغەمبەرایەتی).

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٢٠٧٣٢، وفيه فأدخلتُ يدي في قميصه، وفيه بين كتفيه بدل مجتمعات.




کە دەڵێ: «**قُلْتُ: وَمَا الْخَاتَمُ؟**» ڕاوی کە ناوی (علباء بن أحمر اليشكري)یە، پرسیار لە عەمڕی کوڕی ئەختەب ﷺ دەکات (دەربارەی مۆرەکە، ئایا چۆن بوو؟) عەمڕ ﷺ دەڵێ: کۆمەڵێک مووی کۆبووەوەن.

(شایانی باسە) ئەوەی لێرەدا عەمڕ ﷺ باسی دەکات بە پێی ئەوەیە کە دەستی بەری کەوتوە، (ئەگەرنا) مۆرەکە پارچە گۆشتێکی بەرزبووەوەیە، بە ئەندازەی نزیکەی هێلکەیەک و هەندێک مووی بە دەورەوەن، جا دەستی عەمڕ ﷺ کەوتۆتە سەر ئەم موانە، (وەک گوتمان) ئەگەرنا خودی مۆرەکە کورت هەڵنەهاتوە لە هەندێک موو بە تەنها، (دوای ئەم ڕوونکردنەوە) ئەوە هیچ ناکۆکیەک لە نێوان ڕیوایەتەکان دروست ناکات، جا بۆیە هیچ جیاوازیەک لە نێوان ئەمەو ئەوەی ڕابورد نیەو دژیەکیش نین.

## سوودێک:

لە (المسند)[1]ی پێشەوا ئەحمەد ﷺ، بە سەنەدێکی دروست (صحيح) هاتوە: لە ئەبو زەیدی عەمڕی ئەنصارییەوە ﷺ کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: لێم نزیکبەوە، (منیش لێی نزیک بوومەوەو) دەستی بە سەرو ڕیشم داهێنا، پاشان فەرمووی: خوایە جوانی بکەو، جوانیەکەشی بەردەوام بکە، جا پێغەمبەر ﷺ بەم دوعایە موبارەکە بۆی پاڕایەوەو داوای بۆ لە خوا کرد، تەمەنی گەیشتە سەدو چەند ساڵێک کەچی نە لە سەری و نە لە ڕیشی مووی سپی نەبوو، جگە لە چەند تاڵە مووەکی کەم، ئنجا ڕووخسارێکی جوان و ڕوویەکی خۆشی هەبوو، دووچاری هیچ چرچ و لۆچیەک نەبوو، کە لە ڕووخساری کەسانی بە ساڵاچوو پەیدادەبێ، بەڵکو جوانیەکەی ڕووخساری وەک خۆی مابوویەوە، هەتاکو وەفاتی کرد، (هەموو ئەوانەش کە باسمان کرد) بە هۆی دوعاو پاڕانەوەی تایبەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

وە ئەم بانگەوازە پیرۆزو مەزنە زۆر ئاسانە دەست پێوەگرتنی و سەرکەوتن و سەرفرازبوون بە هۆیەوە، تەنانەت لەم ڕۆژگارەی ئێمەش بۆ کەسێک کە خوا ڕێزی

---

(١) عَنْ أَبِي زَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ: قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ادْنُ مِنِّي»، قَالَ: فَمَسَحَ بِيَدِهِ عَلَىَ رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ جَمِّلْهُ، وَأَدِمْ جَمَالَهُ»، قَالَ: فَلَقَدْ بَلَغَ بِضْعًا وَمِائَةَ سَنَةٍ، وَمَا فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ بَيَاضٌ إِلَّا نَبْذٌ يَسِيرٌ، وَلَقَدْ كَانَ مُنْبَسِطَ الْوَجْهِ، وَلَمْ يَنْقَبِضْ وَجْهُهُ حَتَّى مَاتَ. أخرجه أحمد في المسند برقم: ٢٠٧٣٣.



لێنابێ بەوەی کە گرنگی بدات بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺو، فەرموودە پیرۆزو بەڕێزەکانی، بەوەی کەوا لەبەریان بکات و لێیان تێبگات و کاریان پێ بکات و بانگەوازی بۆ لا بکات، چونکە بێگومان بە صەحیحی گێردراوەتەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کاتێک کە لە خیف بوو، لە مینا فەرموویەتی: {نَضَّرَ اللهُ اِمْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَأَدَّاهَا كَمَا سَمِعَهَا}[١]. واتە: خوا ڕووخساری ئەو کەسە درەوشاوە بکات کە فەرموودەکانی منی بیست و لێیان تێگەیشت و گەیاندنی، بەو شێوەیەی کەوا بیستوویەتی.

جا ئەوە نزاو پاڕانەوەیە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ هەموو کەسێکە کە گرنگی بدات بەوەی کە خوای بەرز ڕووی گەشاوە بکات، وە ئەوەش نزایەکی بەردەوامە، جا هەر کەسێک ویستی سەرفراز ببێ، ئەوە با گرنگی بدات بە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، لەبەریان بکات و باسیان بکات و، کاریان پێبکات، وە بانگەوازیان بۆ لا بکات، سوفیانی کوڕی عویەینە گوتوویەتی: {مَا مِنْ أَحَد يطلب الحَدِيثَ إلاَّ وَفي وَجْهه نَضْرةٌ}[٢]. واتە: هەر کەسێک فێری فەرموودە ببێ و بە دوایدا بگەڕێ، مسۆگەر خوا ڕووخساری گەشاوە دەکات.

٢١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي بُرَيْدَةَ ﷺ، يَقُولُ: جَاءَ سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ ﷺ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ بِمَائِدَةٍ عَلَيْهَا رُطَبٌ فَوَضَعَهَا بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا سَلْمَانُ مَا هَذَا؟» فَقَالَ: صَدَقَةٌ عَلَيْكَ وَعَلَى أَصْحَابِكَ، فَقَالَ: «ارْفَعْهَا، فَإِنَّا لَا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ» قَالَ: فَرَفَعَهَا، فَجَاءَ الْغَدَ بِمِثْلِهِ، فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَا هَذَا يَا سَلْمَانُ؟» فَقَالَ: هَدِيَّةٌ لَكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: «ابْسُطُوا» فَنَظَرَ إِلَى الْخَاتَمِ الَّذِي عَلَى ظَهْرِ رَسُولِ الله ﷺ فَآمَنَ بِهِ، وَكَانَ لِلْيَهُودِ فَاشْتَرَاهُ رَسُولُ الله ﷺ بِكَذَا وَكَذَا دِرْهَماً، وَعَلَى أَنْ يَغْرِسَ نَخْلاً، فَيَعْمَلَ سَلْمَانُ فِيهَا حَتَّى يُطْعِمَ قَالَ: فَغَرَسَ رَسُولُ الله ﷺ النَّخْلَ إلاَّ نَخْلَةً وَاحِدَةً غَرَسَهَا عُمَرُ، فَحَمَلَتِ النَّخْلُ مِنْ عَامِهَا وَلَمْ تَحْمِلِ النَّخْلَةُ، فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «مَا شَأْنُ هَذِهِ»؟! قَالَ عُمَرُ: أَنَا غَرَسْتُهَا يَا رَسُولَ الله، قَالَ: فَنَزَعَهَا رَسُولُ الله ﷺ، ثُمَّ غَرَسَهَا فَحَمَلَتْ مِنْ عَامِهَا[٣].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٦٥٨، وابن ماجه في سننه: ٢٣٠، من حديث جبير ابن مطعم ﷺ.

(٢) رواه الخطيب البغدادي في شرف أصحاب الحديث: ٢٢.

(٣) في إسنادِ المصنِّف ﷺ علي بن حسين بن واقد: صدوقٌ يَهِم؛ لكن رواه أحمد في مسنده: ٢٢٩٩٧ من طريق زيد بن الحُباب عن الحسين بن واقِد عن عبد الله بن بُوريدة ﷺ به، وصحَّحَ إسنادَه البُوصيري في إتحاف الخِيَرَة.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە دەڵێ بیستم ئەبو بورەیدە ﷺ دەیگوت: سەلمانی فارسی ﷺ کاتێ هاتە مەدینە، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سینیەک (سفرەیەکی) لە خورمای تەڕو پێگەیشتووی هێنابوو، داینایە پێش دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئەی سەلمان ئەوە چیە؟» (سەلمان) گوتی: ئەوە خێرو صەدەقەیە بۆ خۆت و هاوەڵانت، جا (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: «هەڵیبگرەو (لە پێش دەستمان لایبە)»، ئێمە خێرو صەدەقە ناخۆین، (ئەبو بورەیدە) دەڵێ: جا (سەلمان خواردنەکەی) لابردو، بۆ ڕۆژی دواتر، هەمان خواردنی هێنایەوەو لە پێش دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ دانا، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوە چیە ئەی سەلمان؟ گوتی: دیارییە پێشکەشە بە تۆ، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: دەستتان درێژ بکەن و (بیخۆن). جا کە تەماشای مۆری سەر پشتی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، ئیمانی پێ هێنا، (ئەو کات) بەندەی جولەکەیەک بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ کڕیەوە بەوەندەو ئەوەندە درەمەو، ڕواندنی چەند دارخورمایەک، جا کە سەلمان کاری تێدا بکات هەتا بەرهەمەکەی دەخوریّ، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو شتڵەکانی ڕواند، جگە لە یەک دانە نەبێ، کە عومەر ﷺ ڕواندنی، هەموویان هەر لەم ساڵەدا بەرهەمیاندا، جگە لە یەکێکیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەمە بۆچی ئاوایەو بەرهەمی نەداوە؟!» عومەر ﷺ گوتی: من ڕواندم ئەی پێغەمبەری خوا، دەڵێ: جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەریهێناو ڕواندیەوە، هەر لەو ساڵە بەرهەمی دا.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

سەلمان ﷺ هەواڵی پێگەیشتوە کە نێردراني پێغەمبەری خوا ﷺ نزیک کەوتۆتەوە، هەندێک نیشانەو بەڵگەی پێغەمبەرایەتیشی بیستوە، کە یەکێکیان ئەوە بوو: دیاری وەردەگرێ و خێرو صەدەقە وەرناگرێ و نایخوات، (یەکێکی دی لە نیشانەکانی ئەوەیە) کە مۆری پێغەمبەرایەتی لە نێوان شانەکانیدا هەن، ئیدی ئەویش بە شوێن ئەو پێغەمبەری (کۆتا زەمانەدا) دەگەڕا تا بیدۆزێتەوەو بچێتە خزمەتی، تا ئەو ئەندازە تامەزرۆی بینینی بوو، هۆکاری گەشت کردنی بۆ مەدینە تەنها گەیشتن بوو بەم ئاوات و ئامانجەی.

بورەیدە ﷛ دەڵێ: «جَاءَ سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ ﷛ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَ الْمَدِينَةَ بِمَائِدَةٍ عَلَيْهَا رُطَبٌ فَوَضَعَهَا بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا سَلْمَانُ مَا هَذَا؟» مەبەستی پرسیارکردنی ئەم خواردنە جۆری خواردنەکە نەبوو کە سەلمان هێنای، کە خورمای تازە پێگەیشتوو بوو، بەڵکو بابەتێکی دیکە بوو، کە ئەو لێی تێگەیشتبوو، (ئەویش زانین و بینینی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی بوو، وەک لە فەرموودەکەدا هاتوە).

سەلمان ﷛ گوتی: «صَدَقَةٌ عَلَيْكَ وَعَلَى أَصْحَابِكَ»، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «ارْفَعْهَا، فَإِنَّا لَا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ»، ئەوە یەکەم نیشانەی (پێغەمبەرایەتی) بوو، کە بۆ سەلمان ﷛ دەرکەوت، کە ئەو پێغەمبەرە خێرو صەدەقە ناخوات، وە لە هەندێ ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە[1] کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە هاوەڵانی کرد بیخۆن، تەنها خۆی گرتەوە لە خواردنی، جا زانایانیش ئەوەیان لێوەرگرتوە کە فەرموویەتی: «ارْفَعْهَا»، بەرزی بکەنەوەو لایبەرن، واتە: لە پێش پێغەمبەر ﷺ لایبەرن، ئەو کاتە ئەم ڕیوایەتە پێچەوانەو دژی ڕیوایەتەکەی دیکە نیە کە دەڵێ: فەرمانی کرد بە هاوەڵانی بیخۆن.

کە دەڵێ: «فَجَاءَ الْغَدَ بِمِثْلِهِ»، یانی: (کە هات) سینیەکی هێنا خورمای تازە پێگەیشتووی لەسەر بوو، «فَوَضَعَهُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «مَا هَذَا يَا سَلْمَانُ؟» فَقَالَ: هَدِيَّةٌ لَكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: «ابْسُطُوا»، ئەگەر کەسێک دەستی درێژ کرد، ئەوە پێی دەگوترێ: (بَسَطَ يَدَهُ)، وە «ابْسُطُوا» واتە: دەستتان درێژ بکەن لێی بخۆن، فەرمانی بە بەرزکردنەوەو لابردنی نەکرد، ئەوەش دووەم نیشانەی پێغەمبەرایەتی بوو (کە بینی).

کە دەڵێ: «فَنَظَرَ إِلَى الْخَاتَمِ الَّذِي عَلَى ظَهْرِ رَسُولِ الله ﷺ فَآمَنَ بِهِ» ئەوەش نیشانەی سێیەمی (پێغەمبەرایەتیە)، (سەلمان ﷛) هەر سێ نیشانەی کە پێشتر بۆی باسکرابوو، ئێستا بۆی کۆکرایەوە، بۆیە ئیمانی بە (پێغەمبەر ﷺ) هێنا.

کە دەڵێ: «وَكَانَ لِلْيَهُودِ»، یانی: کۆیلەی جولەکەیەک بوو، «فَاشْتَرَاهُ رَسُولُ الله ﷺ بِكَذَا وَكَذَا دِرْهَمًا، وَعَلَى أَنْ يَغْرِسَ نَخْلًا»، پێغەمبەر ﷺ هەوڵیدا لە لای جولەکەکە بیکڕێتەوە بە ئەندازەیەک درەمی زیو، هەروەها چەند دارخورمایەکی بۆ بڕوێنێ، لە هەندێک ڕیوایەتدا هاتوە کە دوو سەد تا سێ سەد دارخورمایان بۆ بڕوێنێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ

---

(١) السُنن الكبرى البيهقي: ٣٢٧/٥.

فەرمانی بە هاوەڵانی کرد کە یارمەتی بدەن، ئەوانیش هەڵسان بە یارمەتی دانی و خەڵفێکی بۆ کۆدەکردەوە، هەر کەسەو چەند خەڵفە خورمایان بۆ دەهێنا، هەبوو دە شتڵی بۆ دەهێنا، هەبوو پێنج خەڵفی بۆ دەهێنا، پێغەمبەری خواش ﷺ وەک سوور بوون و جدی بوون لەسەر ئازاد کردنی سەلمان بە دەستی خۆی ڕاستەوخۆ بەشدار بوو لە ناشتن و ڕواندنی چڵ و خەڵفە خورماکاندا.

کە دەڵێ: «فَيَعْمَلَ سَلْمَانُ فِيهَا حَتَّى يُطْعِمَ»، یانی: هەتا بەرهەم دەدات و، لە بەرهەمەکەشی دەخورێ.

کە دەڵێ: «فَغَرَسَ رَسُولُ الله ﷺ النَّخْلَ إلاَّ نَخْلَةً وَاحِدَةً غَرَسَهَا عُمَرُ»، واتە: پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی چڵەکانی دەڕواند (دەناشت)، جگە لە یەک چڵ کە پێشەوا عومەر ﷺ ناشتبووی، (ئەویان بەرهەمی نەدا).

کە دەڵێ: «فَحَمَلَتِ النَّخْلُ مِنْ عَامِهَا وَلَمْ تَحْمِلِ النَّخْلَةُ، فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ: «مَا شَأْنُ هَذِهِ»؟! قَالَ عُمَرُ: أَنَا غَرَسْتُهَا يَا رَسُولَ الله، قَالَ: فَنَزَعَهَا رَسُولُ الله ﷺ، ثُمَّ غَرَسَهَا فَحَمَلَتْ مِنْ عَامِهَا». شایانی باسە لە ڕیوایەتی دیکەی پێشەوا حاکم هاتوە لە فەرموودەکەی عەففان کە گوتوویەتی: حەمادی کوڕی سەلەمە بۆی باسکردین لە عاصمی کوڕی سولەیمانەوەو لە عەلی کوڕی زەیدی کوڕی جەدکە (سەلمان ﷺ) گوتوویەتی: بڕیاری خۆکڕینەوەمدا لەگەڵ خاوەنەکەمدا لەسەر ئەوەی پێنج سەد خەڵفە خورمایان بۆ بڕوێنم، هەرکات ڕووان و هاتنەبەر، من ئازادبم، جا هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لە تەواوکاریی قسەکانیدا گوتی: پێغەمبەر ﷺ ڕوواندی، جگە لە یەک شتڵ کە من بە دەستی خۆم ڕواندم (بەرهەمی نەدا)، ئەوانی دیکە هەمووی بەرهەمیاندا.

دەگوترێ: لە کاتی کۆکردنەوەی هەردوو ڕیوایەتدا ئەوە دەردەکەوێ هەردووکیان واتە: سەلمان و عومەر ﷺ پێکەوە ئەم چڵەیان ڕواندوە، کە لە کۆتایی دا بێ بەرهەم بووە، چونکە ڕاوی فەرموودەکە جارێک ناشتنەکەی پاڵداوەتە لای عومەرو جارێکیش پاڵی داوەتە لای سەلمان ﷺ، لەوانەیە (یەکێک) لە حیکمەتەکانی ئەمە دەرخستنی موعجیزەی پێغەمبەر ﷺ بێ لە هاتنەدی بەرهەمی هەموو دارخورماکان، کە پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی ڕواندوویەتی، جگە لەم چڵە، جا موعجیزەی




دووەمیش (ئەوە بوو) کە بۆ جاری دووەم بە دەستی خۆی چڵەکەی چاند، هەر لە ساڵی خۆی بەرهەمی دا.

٢٢- عَنْ أَبِي نَضْرَةَ الْعَوَقِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ﷺ عَنْ خَاتَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ «يَعْنِي خَاتَمَ النُّبُوَّةِ»، فَقَالَ: «كَانَ فِي ظَهْرِهِ بَضْعَةٌ نَاشِزَةٌ».

واتە: ئەبو نەزرەی ئەلعەوەقی دەڵێ: پرسیارم لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ کرد دەربارەی مۆرەکەی پێغەمبەر ﷺ، (کە ئایا چۆن بوو، لە کوێ بوو؟)، (ئەبو سەعید) گوتی: «(مۆری پێغەمبەرایەتی) پارچەیەک گۆشتی بەرز بوو لەسەر پشتی (پێغەمبەری خوا ﷺ)دا بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ فِي ظَهْرِهِ بَضْعَةٌ نَاشِزَةٌ» فەرموودەکانی ڕابردوو بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە (مۆرەکە) لە نێوان هەردوو شانەکانیدا بووەو، لەلای شانی چەپەشی نزیکتر بووە.

کە دەڵێ: «بَضْعَةٌ» واتە: پارچە گۆشتێک، «نَاشِزَةٌ» دیارو بەرز بوو، واتە: لەگەڵ لاشەدا تەخت و یەکسان نەبوو، بە پێی ڕیوایەتەکانی کە پێشتر هێنامان، دیارو بەرزییەکەی بە ئەندازەی هێلکەی کۆترێک دەبوو.

٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَدُرْتُ هَكَذَا مِنْ خَلْفِهِ، فَعَرَفَ الَّذِي أُرِيدُ، فَأَلْقَى الرِّدَاءَ عَنْ ظَهْرِهِ، فَرَأَيْتُ مَوْضِعَ الْخَاتَمِ عَلَى كَتِفَيْهِ مِثْلَ الْجُمْعِ حَوْلَهَا خِيلَانٌ كَأَنَّهَا ثَآلِيلُ، فَرَجَعْتُ حَتَّى اسْتَقْبَلْتُهُ، فَقُلْتُ: غَفَرَ اللَّهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «وَلَكَ» فَقَالَ الْقَوْمُ: أَسْتَغْفَرَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، وَلَكُمْ، ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ﴿١٩﴾﴾ محمد[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس ﷺ دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێک لە نێوان هەندێک لە هاوەڵانی دانیشتبوو، من بە شێوەیەک لە دوایەوە خۆم وەرسووڕاند، زانی من مەبەستم چیە، بۆیە پۆشاکەکەی لەسەر پشتی هێنایە خوار، منیش شوێنی مۆرەکەم لەسەر شانەکانی بینی، وێنەی مشتێک بوو، لە دەوروبەری

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٤٦.



خاڵ هەبوون هەروەک بالووکە، ئیدی گەڕامەوەو تا ڕووی خۆم تێکردو پێم گوت: خوا لێت خۆش بێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «خوا لە تۆش خۆشبێ»، خەڵکەکەی دەوروبەری گوتیان: پێغەمبەری خوا داوای لێ خۆشبوونی بۆ کردی؟! عەبدوڵڵا گوتی: بەڵێ، بۆ ئێوەش، دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ١٩﴾ محمد. (وە داوای لێبوردن بکە -لە خوا- بۆ گوناهی خۆت وە بۆ -گوناهی- پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي نَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ» واتە: کۆمەڵێک لە هاوەڵانی بەڕێزی لەگەڵدابوو، خوا لێیان ڕازی بێ.

کە دەڵێ: «فَدُرْتُ هَكَذَا مِنْ خَلْفِهِ» واتە: ڕۆیشتمە پشت پێغەمبەر ﷺ، وە لەمەشدا مەبەستی بینینی مۆری پێغەمبەرایەتی بوو، کە پێشتر لەبارەیەوە هەواڵی بیستبوو، کە دەڵێ: «فَعَرَفَ الَّذِي أُرِيدُ» یانی: پێغەمبەر ﷺ کە من سووڕامەوەو چوومە پشتی زانی مەبەستم بینینی مۆرەکەیە، «فَأَلْقَى الرِّدَاءَ عَنْ ظَهْرِهِ» مەبەست لە (رِدَاء) ئەو پۆشاکەیە دەخرێتە سەر بەشی سەرەوەی لاشە، وە لابردنی لەسەر شان کارێکی زۆر ئاسانە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی لایدا.

کە دەڵێ: «فَرَأَيْتُ مَوْضِعَ الْخَاتَمِ عَلَى كَتِفَيْهِ مِثْلَ الْجُمْعِ» مەبەستیش لە وشەی: (الجُمْع) واتە: وەک مشتێک بوو، ئەویش مۆرەکەی بینیوە هێندەی مشتێک دەبوو بە نزیکەیی.

جا کۆی ئەو فەرموودانەی لەوبارەوە هاتوون دەربارەی وەسف کردنی شێوەو قەبارەی مۆری پێغەمبەرایەتی لێک نزیکن، چونکە هەر کەسێک بە پێی ئەوەی بۆی دەرکەوتوەو بینیویەتی وێنەی بۆ هێناوەتەوە، کەسی وایان هەیە دەڵێ: وەک هێلکەی پۆڕ بوو، یاخود وەک قۆچپەکی خڕ بوو، هەیە دەڵێ: وێنەی هێلکە بوو، وە کەسی سێیەم دەڵێ: وەک پارچە گۆشتێک بوو، هەروەها کەسی چوارەمیش گوتوویەتی: وەک مشتێک (لە کاتی دەست نوقانەوە) وا بوو.




هەر ئەم فەرموودەیە بەم شێوەش هاتوە لە (صحيح مسلم): {فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ عِنْدَ نَاغِضِ كَتِفِهِ الْيُسْرَى جُمْعًا عَلَيْهِ خِيلَانٌ كَأَمْثَالِ الثَّآلِيلِ}[1]. واتە: تەماشای مۆری پێغەمبەرایەتیم ﷺ کرد لە نێوان هەردوو شانیدا، لە لاسەرووی شانی چەپیەوە بوو، وەک کۆڵەمستە بوو، خاڵی ورد وردی لەسەر بوو، وەک بالووکە وەهابوو[2].

کە دەڵێ: {نَاغِضِ الْكَتِفِ}. ئێسکێکی تەنکی بەرزە لەسەر لێواری شان، ئەم ڕیوایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مۆری پێغەمبەرایەتی ﷺ لە نێوان هەردوو شانی بووەو، نزیکتر بووە لە لای چەپەی، وە ئەوەی ڕابورد لە ڕیوایەتەکاندا کە لە نێو شانەکانیدایە لە ڕووی نزیک خستنەوەیە، وە ئەگەرنا ئەوە بۆ لای شانی چەپەی نزیکتر بووە، هەروەک لەم ڕیوایەتەدا بە ئاشکرا باسکراوە.

کە دەڵێ: «حَوْلَهَا خِيلَانٌ» وشەی: (خِيلَان) کۆی (خال)ـە، کە شتێکی دیارو زانراوە، پارچەیەکی بچووکی ڕەنگ ڕەشە.

کە دەڵێ: «كَأَنَّهَا ثَآلِيلُ» وشەی: (ثَآلِيل) کۆی (ثُؤْلُول)ـە، ئەویش پارچەکی بچوکی بەرز بووەوەیە کە توووند بە لاشەوە نووساوە، کە پێی دەگوترێ بالووکە.

کە دەڵێ: «فَرَجَعْتُ حَتَّى اسْتَقْبَلْتُهُ» واتە: دوای ئەوەی مۆرەکەی بینی، چووە پێش پێغەمبەر ﷺ، «فَقُلْتُ: غَفَرَ اللَّهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «وَلَكَ»» پێغەمبەریش ﷺ ئەم دوعا مەزنەی بۆ کرد، کە لێ خۆشبوونی خوایە، «فَقَالَ الْقَوْمُ: أَسْتَغْفَرَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟» یانی سەرکەوتوو بوویت لەم کارەداو دەستکەوتێکی زۆر مەزنت دەستکەوت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ خۆشبوونی بۆ کرد.

وە ئەمە بەڵگەیەکی مەزنە دەربارەی گەورەیی پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لە دڵی هاوەڵان و دڵخۆشبوونیان بە دوعاو پاڕانەوەی، پێغەمبەر ﷺ هەتا لە ژیاندا بوو دوعای لێ خۆشبوونی دەکرد، بەڵام لە دوای وەفات کردنی ناتوانێ دوعای لێ خۆشبوون بۆ هیچ کەس بکات، بەڵگەش لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە کە لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە: دایکمان عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: {ذَاكِ لَوْ كَانَ

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٤٦.

(٢) پوختەی موسلیم بە کوردی




وَأَنَا حَيٌّ فَأَسْتَغْفِرُ لَكِ وَأَدْعُو لَكِ}[١]، واتە: ئەوە لە کاتێکدایە کە من زیندووبم و داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم و بۆت دەپاڕێمەوە لە خوا. ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە کە تەنها کاتێک توانیویەتی داوای لێ خۆشبوون بکات کە لە ژیان بێت، وە ئەمە مانای ئەو فەرمایشتەی خوای پەروەردگاریش دەگەیەنێ کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾﴾ النساء. (ئەگەر ئەوان کاتێک ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد بهاتنایە بۆلات وە داوای لێ بوردونیان بکردایە لە خوا پێغەمبەریش داوای لێ خۆش بوونی بۆ بکردنایە بێگومان دەیـان بینی خوا پەشیمانی وەرگر و بەبەزەییە)، مەبەست ئەوەیە کاتێک لە ژیاندا بوو.

بەڵام ئەگەر بێت و ئایەتەکە وا لێکبدەیتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوای مردنیشی داوای لێ خۆشبوون دەکات، ئەوە تێگەیشتنێکی هەڵەیە لەوەی ئایەتەکە دەلالەتی لەسەر دەکات، وە تێپەڕاندن و ناحاڵیبوونە لە شارەزایی لە ماناو مەبەستی ئایەتەکە.

بۆیە پێیان گوت: «أَسْتَغْفَرَ لَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ» واتە: داوای لێ خۆشبوونی بۆ کردی پێغەمبەری خوا، هاوەڵەکەش گوتی: داوای لێخۆشبوونی بۆ کردم، جا ئەگەر گونجابا داوای لێ خۆش بوونی لێ بکرێ دوای مردنی، ئەوە ئەم هاوەڵە بەڕێزانە داوای لێ خۆشبوونیان لێ دەکرد بۆ خۆیان، چونکە دەیانزانی ئەوە دەفەرتێکە تا لە ژیان ماوە داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکات.

وە کە دەڵێ: «وَلَكُمْ» یانی: پێغەمبەر ﷺ داوای لێ خۆشبوونی بۆ ئێوەش کردوە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾﴾ محمد. (وە داوای لێبوردن بکە -لە خوا- بۆ گوناهی خۆت وە بۆ -گوناهی- پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار وە بێگومان خوا دەزانێت بە جم و جۆڵتان -لە ڕۆژدا- و ئارام گرتنتان -لە شەودا-).

---

(١) أخرجه البخاري: ٧٢١٧.



پێغەمبەر ﷺ ئەمەی جێبەجێ کرد، کە دوعای بۆ پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار کرد.

ئەمە پوختەی ئەوە بوو کە دانەر هێنابووی دەربارەی مۆری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ، پێویستە لە کاتی باسکردنی ئەم بابەتانەدا پشت بە بەڵگە ڕاست و دروستەکان ببەسترێ، وە واز لە ڕیوایەتە لاوازو بێ ماناو هەواڵە هەڵبەستراوەکان و چیرۆکە گێڕدراوەکان بهێنرێ، کە گوایە مۆری پێغەمبەرایەتی وەک شوێنی کەڵەشاخ کردن بووە، یاخود وەک ڕەش یان سەوز دەرکەوتبێ، یان لەسەری نووسرابێ (مُحَمَّد رَسُول الله) یان لێی نووسرابێ: (سر فَأَنْتَ المَنْصُور) یان وێنەی ئەوانە، هیچ کام لەو شتانە ڕاست نین و جێگیر نەبوون[1].

## سوودێک:

پرسیار کراوە لە پێشەوا بورهانەدین حەلەبی ﷺ ئایا مۆری پێغەمبەرایەتی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ، یان هەموو پێغەمبەران ئەم مۆری پێغەمبەرایەتیەیان هەبووە؟

لە وەڵامدا دەڵێ: ئێستا هیچ شتێکم لە بیر نیە لەوبارەوە، بەڵام ئەوەی دەردەکەوێ ئەو مۆرە تایبەت بووە بە پێغەمبەر ﷺ لەبەر چەند مانایەک لەوانە: ئەو مۆرە ئاماژەیەکە بەوەی ئەوە کۆتا پێغەمبەرەو لە دوای ئەو کەسی دیکە وەک پێغەمبەر نیەو نانێردرێ، چونکە باس و خواسی پێغەمبەرایەتی بە نێردرانی ئەو کۆتایی پێهات و داخراو ناشکرێتەوە تا هەتاییە.

پێشەوا حاکم[2] لە وەهبی کوڕی مونەبیھ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە مەگەر لەسەر دەستی ڕاستی خاڵێک هەبووە، وەک مۆری پێغەمبەرایەتی، جگە لە پێغەمبەری (کۆتایی موحەممەد ﷺ) کە خاڵەکەی لە نێوان هەردوو شانەکانی دا بووە، لەسەر ئەم بنچینەیە ئەوە دەردەکەوێ کە بوونی ئەم مۆرە لە پشتی پێغەمبەری خوا ﷺ تایبەت بووە ﷺ، جیا لە هەموو پێغەمبەرانی دیکە[3].

---

(١) فتح الباري: ٥٦٣/٦ تحت حديث رقم: ٣٥٤١.

(٢) المستدرك: ٦٣١/٢.

(٣) سبل الهدى والرشاد للصَّالحي الشَّامي: ٥٠/٢.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی مووی سەری پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي شَعْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




دانەر ﷀ ئەم بەشەی تایبەت کردووە بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە پرچی (قژی) پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی درێژی و داهێنانی و گرنگی پێدانی.

دەگوترێ: دەتوانرێ دەربڕدرێ بە هەردوو بێژەی: (شعَر) و (شَعْر).

٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷛ قَالَ: «كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى نِصْفِ أُذُنَيْهِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷛ دەڵێ: «پرچی پێغەمبەری خوا ﷺ (درێژیەکەی) هەتا نیوەی گوێیەکانی بوون».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیە دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ پرچی گەیشتۆتە ناوەڕاستی گوێیەکانی، وە لە هەندێ فەرموودەی دیکەشدا هاتوە کە درێژیی پرچی دەگەیشتە سەر شانی.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ حاڵەتە جیاوازەکان کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا بووە، هەیە پێغەمبەری خوای ﷺ لە کاتێکدا بینیوە کە پرچی درێژ بووەو گەیشتۆتە سەر شانی، کەسانی دیکەش هەبوون بە پێچەوانەی ئەوە بینیویانە، (هەر کەسەش) چۆنی بینیوە ئاوای وەسف کردوە.

وە لەبەر ئەوەشە پێشەوا (إبن كثير) لە (البداية والنهاية)[2] دوای ئەوەی ئەم فەرموودانە دێنێ لەم بابەتەدا، (دواتر) دەڵێ: هیچ دژیەکی و ناکۆکیەک نیە لە نێوان حاڵەتەکاندا، چونکە پرچ جاری وایە درێژ دەبێ، جاری واش هەیە کورت دەکرێتەوە، وە هەرکەسە بەم شێوە وەسفی دەکات کە بینیویەتی.

هەندێک لە زانایان دەڵێن: پرچی پێغەمبەر ﷺ هەتا ناوەڕاستی گوێی هاتوە بەو پێیەی کە لەلا تەنیشت تەماشا کراوە، هەیە دەڵێ: پرچی درێژ بووە هەتا سەر شانی بووە بە گوێرەی ئەوەی کە لە دواوە بینیویەتی، بەڵام وا دەردەکەوێ قسەی یەکەم دیارترو تەواوتر بێ.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٣٨.

(٢) ٢٣/٦.



٢٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، وَكَانَ لَهُ شَعْرٌ فَوْقَ الْجُمَّةِ وَدُونَ الْوَفْرَةِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەک تەشت خۆمان دەشۆرد، پرچی بەرزتر بوو لەسەر شانی و نزمتر بوو لە نەرمەی گوێیەکانی (واتە: پرچێکی هەبووە لە نێوان شان و نەرمەی گوێی دا بووە)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە عائیشە ﵂ دەڵێ: «كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ» ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە دروستە ژن و مێرد خۆیان بشۆن لەیەک تەشتدا.

وە کە دەڵێ: «وَكَانَ لَهُ شَعْرٌ فَوْقَ الْجُمَّةِ وَدُونَ الْوَفْرَةِ» ئەم وەسف کردنە بە پێی (بینرانی) شوێنی پرچەکەیەتی (لە لای ئەو کەسەی بینیویەتی) نەک خودی پرچەکە وا بووبێ، واتە: پرچی موبارەکی لە نەرمایی گوێی هاتۆتە خوارێ و لەسەر شانی بەرزتر بووە (واتە: نەگەیشتۆتە سەر شان و لە نەرمایی گوێشی هاتۆتە خوار)، جا وێنەی ئەوە پێی دەگوترێ: (لـمَّة)، وە پێشتر ئەوە ڕابورد کە هەر یەکێک لە هاوەڵان وەسفی مووی سەری پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە، بە گوێرەی ئەوەی کە بینیویەتی.

پێشتریش باسی ئەوە کرا کە هەر یەک لە هاوەڵان بە پێی ئەوەی کە پرچی پێغەمبەری خوایان ﷺ بینیوە، وەسف و وێنایان کردوە.

٢٦- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَرْبُوعاً، بَعِيدَ مَا بَيْنَ الْمِنْكَبَيْنِ، وَكَانَتْ جُمَّتُهُ تَضْرِبُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ»[2].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٥٥ ثم قالَ: هذا حديثٌ حسنٌ صحيحٌ غريبٌ من هذا الوجه، وقد رُوي من غيرِ وجهٍ عن عائشة أنها قالت: «كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ»، ولم يذكروا فيه هذا الحرف [أي وكان له شعرٌ فوق الجُمَّة ودونَ الوفرة]، وإنَّما ذكره عبد الرَّحمن بن أبي الزِّناد؛ وعبد الرَّحمن بن أبي الزِّناد ثقةٌ، كان مالك بن أنس يوثِّقه ويأمر بالكتابة عنده، أراد ﵀ أن يُثبت صحَّة هذة الزِّيادة؛ لأنَّ عبد الرَّحمن بن أبي الزِّناد ثقةٌ حافظٌ، فزيادته زيادة ثقةٍ، ويضاف إلى ذالك أنَّ ابن مَعينٍ قال عن عبد الرَّحمن بن أبي الزِّناد: أثبتُ النَّاس بهشام؛ فهي زِيادةٌ صحيحةٌ مقبولةٌ.

(٢) انظر: (ح ٤).



واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ بەژن و باڵای مامناوەند بوو، نێوان شانەکانی لێک دوور بوو (واتە: پان بوو)، وە پرچی دەگەیشتە نەرمەی گوێیەکانی».

٢٧- عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسٍ ﷺ: كَيْفَ كَانَ شَعْرُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «لَمْ يَكُنْ بِالْجَعْدِ وَلَا بِالسَّبْطِ، كَانَ يَبْلُغُ شَعْرُهُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ»[1].

واتە: قەتادە دەڵێ: بە ئەنەسم ﷺ گوت: ئایا پرچی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ گوتی: «پرچی نە (زۆر) لوول و، نە (زۆر)یش خاو بوو، پرچی دەگەیشتە نەرمەی گوێیەکانی».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

شوێنی بەڵگە لە فەرموودەکەی بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ «كَانَتْ جُمَّتُهُ تَضْرِبُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ»، وە (الجمة)ش وەک باسمان کرد بریتیە لەوەی گەیشتبێتە سەر شانەکان، جا (جُمَّتُهُ) لێرەدا بە واتای مووی سەر دێت، بەڵام فەرموودەکەی ئەنەس ئەوەی تێدایە «كَانَ يَبْلُغُ شَعْرُهُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ»، ئەمە وەسف و باسکردنی قژیەتی لە هەندێک حاڵەت و کاتی (جیاوازدا).

٢٨- عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ، قَالَتْ: «قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَدْمَةً وَلَهُ أَرْبَعُ غَدَائِرَ»[2].

واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە کە ئوممو هانئی کچی ئەبو تاڵیب ﷺ، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەککە، لەو کاتەدا چوار کەزی هەبوون (یانی پرچی کردبووە دوو بەش و هەر بەشێکی کردبوو بە دوو کەزی و بەستابووی)».

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٩٠٥، ومسلم: ٢٣٣٨.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٨١ ثمَّ قال: هذاحديثٌ حسنٌ غريبٌ، قال محمَّد -يعني الإمام البخاري-: لا أعرفُ لمجاهدٍ سماعًا من أمِّ هانئٍ، لكن سَماعه منها ممكنٌ؛ لأنَّ مجاهدًا ﷺ وُلد سنة إحدى وعشرين، وهو مَكِّيٌّ، وأمُّ هانِئٍ كذالك مَكِّيَّةٌ، وَجاءَ في ترجمتها انَّها عاشت بعد وفاة عليٍّ ﷺ وهرِّن، في سنة أربعين، فالسَّماع إذًا ممكنٌ، وقد صحَّح الحديثَ ابنُ القيِّم ﷺ في زاد المعاد: ١/١٧٧، وغير واحدٍ من أهل العلم.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

جا ئوممو هانیء، کە خوشکی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ بوو کە دەڵێ: «قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ قَدْمَةً وَلَهُ أَرْبَعُ غَدَائِرَ» یانی: جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێناو سەردانی کردین لە مەککە، پرچی کردبوو بە پەلکە.

(إبن القيم) ﷺ دەڵێ: (پێغەمبەری خوا ﷺ) سەرەتا پرچی بەردەدایەوە، دواتر جیایی کردەوەو کردی بە دوو لەت (دوو بەش)، جا هەر بەشێکیشی دەکردە کەزی و دەیبەست، دیاریشە مەبەست لە بەردانەوە ئەوەیە کە شۆڕی دەکردە خوارەوەو لە پشتەوە نەیدەکرد بە دوو لەت (دوو بەش)[١].

٢٩- عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، عَنْ أَنَسٍ ﷺ: «أَنَّ شَعْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ»[٢].

واتە: سابتی بونانی دەگێڕێتەوە: لە ئەنەسەوە ﷺ کە گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ پرچی تا نیوەی گوێیەکانی بوو».

پێشتر لە فەرموودەی ئەنەس ﷺ لە سەرەتای ئەم بەشەدا ئەوە باسکراو ڕابورد، وە زیاد کردنی (أنفاق یانی: نیوە) کۆیەو دەگەڕێتەوە بۆ (أذنيه) کە دووانەو لە ڕووی زمانەوانیەوە ڕاستە هەروەک فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾﴾ التحريم. (بەڕاستی دڵتان لایدا -لە حەق وڕاستی-)، وە فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾﴾ المائدة. (پیاوو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن).

٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُسْدِلُ شَعْرَهُ، وَكَانَ الْمُشْرِكُونَ يَفْرِقُونَ رُءُوسَهُمْ، وَكَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يُسْدِلُونَ رُءُوسَهُمْ، وَكَانَ يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِشَيْءٍ، ثُمَّ فَرَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ»[٣].

---

(١) زاد المعاد: ١٧٥/١.

(٢) انظر: (ح ٢٧).

(٣) أخرجه البخاري: ٣٥٨٨، ومسلم: ٢٣٣٦.

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو پرچی خاو دەکردو بەری دەدایەوە، هاوبەشدانەرەکان پرچیان بەملاولادا دادەهێنا، خاوەن کتێبەکانیش بە هەمان شێوە پرچیان خاو دەکردەوە، (پێغەمبەر ﷺ) پێی خۆشبوو وەک خاوەن کتێبەکان بێت لەو شتەی کە خوا فەرمانی پێ نەکردبوو، (بەڵام دوایی) پێغەمبەری خوا ﷺ پرچی بەملاولا داهێناو قژی دەکردە دوو لەتەوە».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُسْدِلُ شَعْرَهُ» بە ضەممەو کەسرەی پیتی (د)، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قژی بەردەدایەوە وەک خۆی چۆن دەهاتە خوارەوە، کە دەڵێ: «وَكَانَ الْمُشْـرِكُونَ يَفْرِقُونَ رُءُوسَهُمْ» لەتکردنی سەر ئەوەیە قژ لە ناوەڕاستی سەرەوە بکرێ بە دوو بەشەوە، لایەکیان بە لای ڕاستداو، ئەویتریان بە لای چەپدا.

کە دەڵێ: «وَكَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يُسْدِلُونَ رُءُوسَهُمْ، وَكَانَ يُحِبُّ مُوَافَقَةَ أَهْلِ الْكِتَابِ فِيمَا لَمْ يُؤْمَرْ فِيهِ بِشَـيْءٍ» لەبەر ئەوەی خاوەن کتێبەکان کتێبی ئاسمانیان لە ژێر دەستدا بوو، بە شێوەیەکی گشتی، پێدەچێ هەندێک لە کردەوەکانیان بە گوێرەی ئەوە بووبێ کە لە کتێبەکانیاندا هاتوە، بە پێچەوانەی هاوبەشدانەران، چونکە ئەوان بە شێوەیەکی گشتی (کارەکانیان) داهێنراوەو لە بیرۆکەی خەڵکەوە سەرچاوەی گرتوە.

کە دەڵێ: «ثُمَّ فَرَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَأْسَهُ» (واتە: پاشان پێغەمبەر ﷺ قژی کرد بە دوو لەت)، زانای پایەبەرز ئیبنو حەجەر ﷺ دەڵێ: قژ لەت کردن کۆتا دوو کردەوەی[١] پێغەمبەر ﷺ بوو (دواتر لەسەر لەت کردن بەردەوام بو).

٣١- عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﷺ، قَالَتْ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ذَا ضَفَائِرَ أَرْبَعٍ»[٢].

واتە: موجاهید دەگێڕێتەوە: کە ئوممو هانیئ ﷺ، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی چوار کەزی هەبوون».

---

(١) فتح الباري: ١٠/٣٦٢.

(٢) انظر: (ح ٢٨).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەی ڕابورد پێشتر، لە ڕێگای موحەممەدی کوڕی یەحیا، لە سوفیان، لە ئیبنو ئەبی نوجەیح، هەرچی پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبوو باس کرا.

### سوودێک:

پرسیار کراوە لە زانای پایەدار (إبن العثيمين) ﵀ دەربارەی درێژکردنەوەی پرچ و هێشتنەوەی ئەوەی: ئایا لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەژمار دەکرێ؟

لە وەڵامدا دەڵێ:

نەخێر لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەژمار ناکرێ، لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ درێژی دەکرد لە نێو خەڵکی ڕۆژگاری ئەو سەردەمە باو بوو، بۆیەش کە منداڵێکی بینی هەندێکی تاشی بوو پێی فەرموو: هەمووی بتاشە، یان هەمووی بهێڵەوە، جا ئەگەر هێشتنەوەی پرچ و درێژکردنەوەی سوننەت بووایە، دەیفەرموو: بیهێڵەوە.

لەسەر ئەم بنچینەیە ئێمەش دەڵێین: هێشتنەوەو درێژکردنەوەی پرچ سوننەت نیە، بەڵام ئەگەر لە نێو خەڵک وا باو بوو، تۆش وا بکە، ئەگەرنا بڕوانەو بزانە خەڵک چۆنن تۆش وا بکە، لەبەر ئەوەی سوننەت دەگونجێ بە هۆی خودی خۆیەوە بێت، دەشگونجێ شتەکە بە هۆی جنسەکەیەوە ببێتە سوننەت.

بۆ وێنە: پۆشاکەکەی قەدەغە کراو نەبێ، یان شێوەکانیان قەدەغە کراو نەبن، ئەوە سوننەت تێیدا ئەوەیە کە خەڵک لەسەریەتی و دەیپۆشن، ئەویش لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوە وەک شوێنکەوتنی نەریتی خەڵک، ئێمەش دەڵێین: ئێستا وا باوە لە نێو خەڵکدا کە پرچ درێژ نەکرێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە گەورە زانایانمان و یەکەم کەسیش کە باسی دەکەین لە مامۆستاو زانامان عەبدوڕڕەحمان سەعدییە، هەروەها مامۆستامان عەبدولعەزیز بن باز، هەروەها مامۆستاو زاناکانی دیکەمان وەک: موحەممەدی کوڕی ئیبراهیم و براکانی و جگە لەویش لە گەورە زانایانمان پرچ و قژ ناهێڵنەوە لەبەر ئەوەی ئەوان وانازانن ئەو کارە سوننەت بێت. لەم ڕۆژگارەدا دەبینین هیچ کامێکیان پرچیان درێژ نەکردۆتەوە، چونکە پێیان وا




بوو کە هێشتنەوەو درێژ کردنەوەی سوننەت نیە، ئەگەرنا ئێمە باش دەزانین، ئەگەر ئەوان بە سوننەتیان بینیبایە لە هەموو کەس زیاتر عەودالْی گەڕان و دەستگرتووتر بوون بە سوننەت.

جا ئەوەی ڕاست و دروست بێت ئەوەیە کە بەگوێرەی نەریت و باوی خەلْک بێت، ئەگەر تۆ لە شوێنێک بووی نەریت و باوی خەلْک وابوو قژیان و پرچیان دەهێشتەوە ئەوە بیهێلْەوە، وە ئەگەرنا تۆش مەیکە (و درێژی مەکەوە)(١).

جا پێویستیشە زۆر وریابین لە خۆچوواندن بە بێبڕوایان و کافران، یان بە ئافرەتان، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ}(٢). واتە: هەر کەس خۆی بچوێنێ بە کۆمەلْێک لەوان هەژمار دەکرێ! وە هەروەها وەک لەم فەرموودە هاتوە: {لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنْ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ}(٣). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی کردووە لەو پیاوانەی خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

جا لەگەلْ ئەو (هەڕەشانەش دەبینین) هەندێک لە گەنجەکانمان جاری وایە پرچیان درێژ دەکەن، دێن لە گرنگی پێدان و داهێنان و شانە کردنیش ڕێک وەک ئافرەتی لێدەکەن، تەنانەت جاری وایە کەل و پەلی خوشکی خۆیان بە کاردێنن لەوانەی لەسەر پرچیان دادەنێن، تاکو وەک ئەو بکات! وەک (بەکارهێنانی) تەوقەی پرچ و (لاستیک) و کە بەمە بە تەواوی وەک خوشکی لێ دێت، بە تایبەتی کە ڕیشی دەتاشی و لووسی دەکات، بەلْکو دەری دێنێ (تا بە تەواوی لووسی بکات!!)، وە هەروەها هەندێک شت لە خوشکەکەی دەخوازێ تا کولْمەکانی بە جۆرێک سوور بکات، وە هەندێکیان لەوانەیە خۆی چواندبێ بە بێباوەڕانەوە لە داهێنانی قژی و بۆیە کردنی، کە ئەمەش کارەسات و مەترسیەکی گەورەیە، وە لەوانەشە هەلْە بکەن و (یەکێکیان) بلْێ: هێشتنەوەی قژو پرچ سوننەتە، کەچی کەمتەرخەم بێ لە (ئاست جێبەجێ کردنی) نوێژە فەرزەکان! والله المستعان.

---

(١) لقاء الباب المفتوح: (ص ٢٢).

(٢) أخرجه أبو داود في السُنن: ٤٠٣١.

(٣) أخرجه البخاري: ٥٨٨٥. من حديث عبد الله بن عباس رضي الله عنهما.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پرچ داهێنانی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرَجُّلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

دانەر ﷺ ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پەیوەستە بە پرچ و قژ داهێنانی پێغەمبەر ﷺ، (الترجل) بریتیە لە داهێنان و خاوکردنەوەو خاوێنکردنەوەو گرنگی پێدانی موو.

ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بابەتەدا وەک هەموو بابەتەکانی دیکەی مام ناوەندی و (خەتی ناوەڕاست گرتن) بوو، وەک ئەو کەسە نەبوو کە هەموو گرنگی دانی بۆ پرچیەتی و کاتێکی زۆر خەریکی داهێنان و چاککردنیەتی، وە وەک حاڵی ئەو کەسەش نەبوو کە پرچی خۆی پشت گوێ دەخات و بە هیچ جۆرێک گرنگی پێنادات، بەڵکو مام ناوەندو هاوسەنگ بوو لە نێوان زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی دا.

٣٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كُنْتُ أُرَجِّلُ رَأْسَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا حَائِضٌ»[١].

واتە: عائیشە ﷺ، دەڵێ: «من پرچی پێغەمبەری خوام ﷺ دادەهێناو لە سووڕی مانگانەش دابووم».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە دروستە ژن پرچی مێردەکەی دابهێنێ و بۆی شانە بکات، هەرچەندە لە سووڕی مانگانەشدا بێ، هەروەها ئەم فەرموودە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی دەست لێدانی ژنی حەیزدار لە مێردەکەی و بە پێچەوانەوەش ئاساییەو لاشەی ئافرەتی حەیزدار پیس نیە.

٣٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ دَهْنَ رَأْسِهِ وَتَسْرِيحَ لِحْيَتِهِ، وَيُكْثِرُ الْقِنَاعَ، حَتَّى كَأَنَّ ثَوْبَهُ ثَوْبُ زَيَّاتٍ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پرچی چەور دەکردو ڕیشی (ڕێک دەخست و) دایدەهێنا، وە قیناعی زۆر بە کاردەهێنا، هەتا (هەندێک

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٩٥، ومسلم: ٢٩٧.

(٢) إسناده ضعيفٌ؛ فيه الرَّبيعُ بن صَبيح، وهو صدوقٌ سيِّئ الحفظ، قال الإمام ابن حبَّان: كان عابدًا، ولم يكن الحديثُ من صناعته؛ فوقع في حديثه المناكير من حيث لا يشعر (الضعفاء والمتروكين) لابن الجوزي: ٢٨١/١، وفيه أيضًا يزيدُ بن أبان الرَّقاشي، وهو ضعيفٌ.




جار هێندە پرچی چەور دەکرد) پۆشاکەکەی وەک پۆشاکی زەیت فرۆش دەهاتە پێش چاو (واتە: پۆشاکیشی چەور دەبوو))».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ دَهْنَ رَأْسِهِ وَتَسْرِيحَ لِحْيَتِهِ»، یانی: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی داهێنانی پرچ و ڕیشی موبارەکی دا زۆر ڕۆنی چەور کردنی بەکارهێناوە.

کە دەڵێ: «وَيُكْثِرُ الْقِنَاعَ» وشەی: (قناع) بریتیە لە قوماشێک کە دادەنرێ لەسەر سەری مرۆڤ لە کاتی پرچ چەورکردندا، بە مەبەستی پارێزگاری لێکردنی پۆشاک لە چەور بوون، پێغەمبەریش ﷺ بە هۆی زۆر بەکارهێنانی ڕۆن بۆ ڕیش و پرچ چەورکردنی ئەو قوماشەی بەکاردەهێنا.

کە دەڵێ: «حَتَّى كَأَنَّ ثَوْبَهُ ثَوْبُ زَيَّاتٍ» (زَيَّات) بەو کەسە دەگوترێ کە بەردەوام ئیش لە ڕۆن دەکات و مامەڵەی پێوە دەکات، جا نموونەی ئەو کەسە کە دڵۆپە ڕۆن بەر پۆشاکی دەکەوێ، ئەوە شوێنەواری پێیەوە دیار دەبێ، ئەم مانایە ئاڵۆزیەکی تێدایە، (ابن کثیر) کاتێک باسی فەرموودەکەی کرد گوتوویەتی: (فِيهِ غَرَابَةٌ وَنَكَارَةٌ) واتە: جۆرێک لە نامۆیی و ئاڵۆزی تێدایە، ئەوەی کە ئاڵۆزە ئەوەیە: «كَأَنَّ ثَوْبَهُ ثَوْبُ زَيَّاتٍ» کە ئەمە سیفەتێکە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی نکووڵی لێ دەکرد ئەگەر لە کەسێکی بینیبایە، ئەبو داود لە سونەنەکەی خۆیدا لە جابرەوە رضي الله عنه هێناویەتی گوتوویەتی: {أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرَأَى رَجُلاً شَعِثًا قَدْ تَفَرَّقَ شَعْرُهُ، فَقَالَ: أَمَا كَانَ يَجِدُ هَذَا مَا يُسَكِّنُ بِهِ شَعْرَهُ؟! وَرَأَى رَجُلاً آخَرَ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ وَسِخَةٌ، فَقَالَ أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَاءً يَغْسِلُ بِهِ ثَوْبَهُ}[1]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لامان پیاوێکی بینی پرچی پرژو ئاڵۆز بوو، فەرمووی: ئایا ئەم (پیاوە) شتێکی نەبینیەوە پرچی خۆی پێ ڕێک بخات؟! وە پیاوێکی دیکەی بینی پۆشاکێکی پیسی پۆشی بوو، فەرمووی: ئایا ئەم (پیاوە) ئاوی دەست نەکەوت پۆشاکەکەی خۆی پێ بشوات.

---

(١) أخرجه أبو داود: ٤٠٦٤، وصححه الألباني. بەڵام لەم فەرموودە ئاڵۆزیەک نیە شایانی باس بێت، کە دەڵێ: «كَأَنَّ ثَوْبَهُ ثَوْبُ زَيَّاتٍ» لێرەدا وشەی (ثوب) بە واتای ئەو پارچە قوماشە دێت کە پێغەمبەر ﷺ دەیخستە ژێر مێزەرەکەی بۆ ئەوەی مێزەرەکەی چەور نەبێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆ چەورکردنی ڕیش و پرچی ڕۆنی بەکاردەهێنا. (وەرگێڕ).




٣٤- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إِذَا تَطَهَّرَ، وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ».

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو بە دەستی ڕاست دەست پێبکات، لە پاکو خاوێنیدا، لە کاتی خۆ پاککردنەوەی، وە لە پرچ داهێنانی، ئەگەر پرچی داهێنابووایە، وە لە لەپێکردنی نەعلدا، کاتێ نەعلی لەپێ کردبایە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

پێشەوا بوخاری رحمه الله، ئەویش ئەم فەرموودەی لە کتێبە صەحیحەکەی خۆی هێناوە، تەنها ئەوەی تێدا زیاد کردوە: {وَفِي شَأْنِهِ كُلِّهِ}[1]، واتە: وە لە هەموو کاروبارەکانیدا.

کە دەڵێ: «إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ»، یانی: پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بوو بە لای ڕاستی دەست پێبکات.

کە دەڵێ: «التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إِذَا تَطَهَّرَ»، یانی: ئەگەر ویستبای دەستنوێژ بشۆرێ بە لای ڕاستی دەستی پێدەکرد، جا سەرەتا دەستی ڕاستی دەشۆرد، پێش دەستی چەپی، هەروەها پێی ڕاستی دەشۆرد پێش پێی چەپی.

کە دەڵێ: «وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ، وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ»، واتە: ئەگەر پرچی داهێنابا، سەرەتا بە لای ڕاستی دەستی پێدەکرد پێش لای چەپی، هەروەها لە کاتی چەور کردنیش بە هەمان شێوەی دەکرد، لای ڕاستی چەور دەکرد پێش لای چەپ.

کە دەڵێ: «وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ»، یانی: ئەگەر ویستبای نەعل (پێڵاو) لە پێی بکات، پێی ڕاستی پێش پێی چەپی دەخست لە لەپێکردندا.

وە هەروەها لە هەر کارێکی دیکەدا وەک ڕێزگرتن لای ڕاستی پێش دەخست، وەک: چوونە نێو مزگەوت، خواردن و خواردنەوە، تەوقە کردن، شت وەرگرتن و شت پێدان بە کەسی بەرامبەر، پۆشینی پۆشاک، وە لە هەر شتێکی دیکەی پێچەوانەی ئەوانەشدا لای چەپی پێش دەخست بۆ وێنە: چوونە سەرئاو، هاتنە دەرەوە لە مزگەوت، هێنانەدەری شتی پیس لە لووت وێنەی ئەوانە.

---

(١) (ح ١٦٨).




٣٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ رضي الله عنه، قَالَ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلَّا غِبًّا»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل رضي الله عنه دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لەوە کردووە بەردەوام پرچ دابهێنرێ، مەگەر ماوە ماوە (واتە: نابێ مرۆڤ زۆرترین کاتی بەو کارەوە بەسەر ببات)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلَّا غِبًّا»، واتە: مەگەر ماوە دوای ماوە، نەک بە بەردەوام، جا بۆیە دروست نیە بۆ مرۆڤ کە داهێنانی سەرو ڕیشی ببێتە کارو پیشەی بەردەوامی، بەڵکو دەبێت مام ناوەند بێت، نە بە تەواوی وازی لێ بێنێ، وە نەبیکاتە کارو پیشەی بەردەوامی ژیانی ڕۆژانەی.

مەبەست لەم فەرموودە ئەوەیە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە ماوە پرچی دادەهێنا (نەک هەموو کات، یان زۆربەی کات)، بۆیە پەسندو ڕێگاپێدراو نیە مرۆڤ کاتی زۆر تەرخان بکات بە داهێنان و شانەکردنی پرچی، بەڵکو پێویستە مام ناوەند بێت لەم کارەداو نە کەمتەرخەم و ئیهمال بێ، وە نە زێدەڕۆیی بکات لە داهێنانی و بیکات بە دین.

٣٦- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَرَجَّلُ غِبًّا»[2].

واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان، دەگێڕێتەوە لە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، «کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە ماوە پرچی دادەهێنا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ»، نە ناسران و ناونەهێنرانی هەر کام لە هاوەڵان هیچ زیانی نیە، لەبەر ئەوەی هەموو هاوەڵان دادگەرو ڕاستگۆ بوون، رضي الله عنهم.

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٥٦، وفي إسناده الحسن، وقد عنعَن.

(٢) في إسناده يزيد أبي خالد، وهو صدوقٌ يخطئ كثيرًا، لكن الحديث صحيحٌ بشواهده.




کە دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَرَجَّلُ غِبًّا»، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی پێویست پرچی شانە دەکرد (واتە: ماوە ماوە، نەک هەموو کات خەریکی بێ)، کە پێویستیش نەبووبێ وازی لێهێناوە، نەبەردەوام خەریکی داهێنانی بوو، نە بە تەواویش وازی لێ دەهێنا.

ئەم باسە هاوشێوەی باسەکانی پێش خۆیەتی، پەیوەستە بە سیفەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە خوای گەورە لەسەری دروستی کردوە، وە سپی بوونیش بریتیە لە گۆڕینی ڕەنگی موو لە ڕەنگە بنەڕەتیەکەی خۆی کە ڕەشە، یان هەر ڕەنگێکە بۆ سپی، وە دانەریش ﷺ ئەم بەشەی تەرخانکردوە بۆ باسکردنی ئەوەی پەیوەندیدارە بە سپیەتی مووی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا لە سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ مووی سپی هەبووە؟ ئەگەر هەبووە ئەندازەکەی چەند بووە؟

وە ئەوەی فەرمووده ڕاست و دروستەکان بەڵگەن لەسەری و دانەریش ﷺ هەندێکیانی هێناوە لەم باس و بەشەدا ئەوەیە کە سپیەتی مووی سەرو ڕیشی کە بینراوە لە سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکی زۆر کەم بووە، بەشێکی زۆر کەم بووە لە سێ شوێندا کە ئەنەس ﷺ ئاماژەی بۆ کردوە، بە جۆرێک کە گوتوویەتی: {لَمْ يَخْتَضِبْ رَسُولُ اللَّهِ، إِنَّمَا كَانَ الْبَيَاضُ فِي عَنْفَقَتِهِ، وَفِي الصُّدْغَيْنِ، وَفِي الرَّأْسِ نُبَذٌ}[1]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ مووی سەرو ڕیشی ڕەنگ نەدەکرد، چونکە سپی مووی سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر کەم بووە، بە جۆرێک لە مووەکانی نێوان لێوی خوارەوەی و چەناگەی کەمێک هەبوو، وە لە مووەکانی نێوان چاوەکانی و گوێیەکانی کەمێک هەبوو، وە لە سەریشیدا کەمێک هەبوو، بۆیە ڕەنگی نەکردوە).

**الصُّدْغ**: بریتیە لەو شوێنەی کە دەکەوێتە نێوان چاو و گوێ.

**العَنْفَقَة**: بریتیە لەوەی کە دەکەوێتە نێوان چەناگەو لێوی خوارەوە.

**٣٧- عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: هَلْ خَضَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ، إِنَّمَا كَانَ شَيْبَاً فِي صُدْغَيْهِ» وَلَكِنْ أَبُو بَكْرٍ، خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ[2].**

واتە: قەتادە دەڵێ: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ پرچ و ڕیشی ڕەنگ دەکرد؟ گوتی: «بەوە ڕانەگەیشت (واتە: هێندە سپی نەبوو) چونکە سپییەکەی لە لاتەنیشتەکانی دا بوون»، بەڵام ئەبو بەکر ﷺ بە خەنەو وەسمە (کە گەڵایەکە، ڕەنگی پێ دەکرێت) بۆیەی دەکرد.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٤١.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٥٥٠، بلفظ: «شَيْءٌ» مكان «شيبًا»، ودون قوله: «ولكِن أبوبكر...»، وكذا أخرجه مسلم: ٢٣٤١ من طريق ابن سيرين، عن أنس ﷺ، وفي آخره: «وَقَدْ خَضَبَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ بِالحِنَّاءِ وَالكَتَمِ»؛ فأضاف عمر.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

قەتادە کە بە ئەنەسی ﷺ گوتوە: «هَلْ خَضَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟» واتە: ئایا پێغەمبەر ﷺ بۆیەو ڕەنگی بەکاردەهێنا؟ (الخضَاب): بریتیە لە گۆڕینی ڕەنگی سپی بە خەنەو وەسمەو وێنەی ئەوە.

ئەنەس ﷺ کە دەڵێ: «لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ» واتە: مووی سپی نەدەبینرا لە پێغەمبەر ﷺ جگە لە شتێکی زۆر کەم، کە نەدەگەیشتە ئەوەی خاوەنەکەی بۆیەو ڕەنگی بکات بە خەنەو وەسمە.

کە دەڵێ: «إِنَّمَا كَانَ شَيْبَاً فِي صُدْغَيْهِ» واتە: مووە سپیەکانی پێغەمبەر ﷺ زۆر کەم بوون لە نێوان چاوو گوێی بوون، پێشتر ئەم فەرموودەی ئەنەس ﷺ ڕابورد، کە سێ شوێنەکە بوون کە مووی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدا سپی ببوون.

کە دەڵێ: «وَلَكِنْ أَبُو بَكْرٍ، خَضَبَ بِالْحِنَّاءِ وَالْكَتَمِ»، یانی: ئەبوبەکر ﷺ ئەو تاڵە مووە سپیانەی هەیبوون گۆڕیبونی بە خەنەو وەسمە، کە ئەم دووانە دوو درەختی ناسراون بەکاردەهێنرێن لە بۆیەو گۆڕینی ڕەنگ، جا خەنە (ڕەنگی) سپی دەگۆڕێ بۆ سوور، وەسمەش (ڕەنگی سپی) دەگۆڕێ بۆ ڕەش، جا ئەگەر هەردووکیان کۆبکرێنەوە بەوەی هەندێک لە خەنەو هەندێک لە وەسمە پێکەوە دابنرێن (و تێکەڵ بکرێن) وەک لەم فەرموودەو جگە لەوە هاتوە ڕەنگی سپی دەگۆڕێ بۆ ڕەنگێکی مام ناوەند لە نێوان ڕەش و سوور، نابێتە ڕەشێکی تەواو، کە بێگومان نەهی کراوە لە گۆڕینی (ڕەنگی سپی) بۆ ڕەنگی (ڕەش)، هەروەها ناشبێتە سوورێکی تەواو، بەڵکو لەو نێوانەدا دەبێت.

لەم فەرموودەدا نەفی کردنی ئەنەس ﷺ هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مووی سەری، یان ڕیشی بۆیەو ڕەنگ کردبێ، بەم نزیکانە باسی ئەوە دێ و ئاماژە بە ڕاجیایی هاوەڵان دەکرێ ﷺ.

٣٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: «مَا عَدَدْتُ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلِحْيَتِهِ إِلَّا أَرْبَعَ عَشْرَةَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ گوتوویەتی: «لە سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە چواردە تاڵە مووی سپی زیاترم نەژماردوون».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودە ئەنەس ﷺ هەواڵ دەدات کە تاڵە مووە سپیەکانی کە لە مووی سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینرا شتێکی زۆر کەم بوو، بە ژماردن دەگەیشتنە چواردە تاڵە موو.

لە (الصحيحين)دا هاتوە لە ڕێگای ڕەبیعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانەوە، لە ئەنەسەوە ﷺ کە گوتوویەتی: {تَوَفَّاهُ اللهُ وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ}[٢]. واتە: (پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردو لە سەرو ڕیشیدا بیست تاڵە مووی سپی نەبوو)، یانی: ژمارەی تاڵە مووە سپیەکانی سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەگەیشتنە بیست تاڵە موو، وە ئەم ژمارە (لە ڕاستیدا) بە ژمارەیەکی زۆر کەم دادەنرێ، وە بۆیەش ئەنەس ﷺ ئەم قسەیەی کرد کە ڕابورد: «لَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ»، یانی: ژمارەکە نەگەیشتبووە ئەندازەیەک پێویستی بە بۆیەو ڕەنگکردن هەبێ بە هۆی کەمیانەوە.

٣٩- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ ﷺ، وَقَدْ سُئِلَ عَنْ شَيْبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «كَانَ إِذَا دَهَنَ رَأْسَهُ لَمْ يُرَ مِنْهُ شَيْبٌ، وَإِذَا لَمْ يَدْهِنْ رُئِيَ مِنْهُ»[٣].

واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەڵێ: گوێم لە جابری کوڕی سەمورە ﷺ بوو، کە پرسیاریان لێکرد دەربارەی سپیەتی مووی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتی: «ئەگەر (پێغەمبەر ﷺ) پرچی چەور بکردایە سپیەتیەکەی نەدەبینرا، وە ئەگەر پرچی چەور نەکردایە هەندێک (مووی سپی) تێدا دەبینرا».

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٢٦٩٠.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٩٠٠، ومسلم: ٢٣٤٧.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٣٤٤.



**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «كَانَ إِذَا دَهَنَ رَأْسَهُ لَمْ يُرَ مِنْهُ شَيْبٌ»، یانی: تاڵە مووی سپی دەشاردرێتەوە لەگەڵ بوونی زەیت، (کاتێک چەور دەکرێ) بە هۆی کەمیەوە بەدەرناکەوێت، «وَإِذَا لَمْ يَدْهِنْ رُئِيَ مِنْهُ»، وە ئەگەر چەوری نەکردبایە لێی دەبینرا.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ فەرموودەکەی پێشووی ئەنەس ﷺ، کە تاڵە مووە سپیەکانی ڕیش و سەری پێغەمبەری خوا ﷺ چەند تاڵە مووێکی زۆر کەم بوون، نەدەگەیشتنە بیست تاڵە موو، جا کاتێک ڕیشی یان سەری چەوور دەکرد (ئەم تاڵە مووە سپیانە) دیارنەدەمان بە هۆی کەمی (ژمارەیان)ـەوە.

٤٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا كَانَ شَيْبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نَحْواً مِنْ عِشْرِينَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ، دەڵێ: «مووە سپیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنها نزیکەی بیست تاڵە مووی سپی دەبوون».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەوەی تێدایە کە تاڵە مووە سپیەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ: «نَحْواً مِنْ عِشْرِينَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ»، یانی: نزیک بوون لە (بیست تاڵ)، کە ئەوە تەواو ڕێک دێتەوە لەگەڵ فەرموودەی ئەنەس و جابر کە پێشتر ڕابورد ﷺ.

٤١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ شِبْتَ، قَالَ: «شَيَّبَتْنِي هُودٌ، وَالْوَاقِعَةُ، وَالْمُرْسَلَاتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: ئەبو بەکر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پرچت سپی بوون! (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «(سوورەتەکانی:) هوودو واقیعەو مورسەلات و (عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ) و (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ) سەریان سپی کردووم».

---

(١) في إسناده شريكٌ القاضي، وفي حفظِه كلامٌ معروفٌ، لكن يشهدُ له حديثُ أنس المتقدِّم، ولا سيما ما جاء في الصَّحيحين من أنَّه ﷺ: «تَوَفَّاهُ اللهُ وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ».

(٢) انظر الحديث الَّذي يليه.



٤٢- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﵁ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَرَاكَ قَدْ شِبْتَ، قَالَ: «قَدْ شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَأَخَوَاتُهَا»[1].

واتە: ئەبو ئیسحاق دەگێڕێتەوە: کە ئەبو جوحەیفە ﵁ گوتوویەتی: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشات دەکەین مووی پرچت سپی بوون، (پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی:) «سوورەتی هوودو خوشکەکانی سەریان سپی کردووم».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لەم فەرموودانە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «شَيَّبَتْنِي هُودٌ، وَالْوَاقِعَةُ، وَالْمُرْسَلَاتُ، وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ»، وە کە ﷺ دەفەرموێ: «قَدْ شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَأَخَوَاتُهَا»، یانی: خوشکەکانی لە سوورەتەکانی قورئاندا، کە تیایاندا باسی ناڕەحەتی و سەغڵەتیەکانی ڕۆژی دوایی کراوە، جا ئەم سوورەتانەی کە باسکراون تیایاندا باسی سەغڵەتی و ناڕەحەتیەکانی ئەم ڕۆژە کراوە، بۆیەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: {مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ كَأَنَّهُ رَأْيُ عَيْنٍ؛ فَلْيَقْرَأْ: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١﴾ وَ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ۝١﴾ وَ ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾}[2]. واتە: هەر کەس حەز دەکات کەوا تەماشای ڕۆژی دوایی بکات، وەک ئەوەی بە چاوی خۆی ببینێ، ئەوە با (ئەو سوورەتانە) بخوێنێ: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ ۝١﴾ (کاتێک کە ڕۆژ پێچرایەوە و -ڕووناکی نەما-) و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ ۝١﴾ (کاتێک کە ئاسمان لەت بوو) و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ ۝١﴾ (کاتێک کە ئاسمان لەت بوو)، لەبەر ئەوەی ئەم سوورەتانە وەسفی ئەم ناڕەحەتی و سەغڵەتیە گەورانە دەکەن، کەوا خەڵک لەم ڕۆژەدا پێیان دەگەن (تووشی دەبن).

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٢٩٧ من طريقتين: أحدهما عن أبي إسحاق السَّبيعي، عن عكرمة، عن إبن عبّاسٍ، عن أبي بكرٍ به، والآخر عن أبي إسحاق السَّبيعي، عن أبي جُحَيفة به. ورُويَ الحديث أيضاً من غير هذا الوجهين، ولهذا عدَّه بعض العلماء في علم مصطلح الحديث من قبيل المضطرب، ومثَّل به الحافظ ابن حجرٍ للحديث المضطرب في النُّكت على مقدمة ابن الصَّلاح: ٧٧٤/٢، وذكر أنَّه يُروى على أكثر من عشرة أوجه اختلف فيها الرُّواة على أبي إسحاق السَّبيعي، ولهذا أعلَّه بعض أهل العلم وضعَّفوه بالاضطراب.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٣٣٣.




جا بۆیە ئەم چەند تاڵە مووە سپیەش کە بینراوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، بە هۆی گرنگیدانی نەبووە بە کاروباری دونیا، یان لە دەستدانی بەرژەوەندی، یان پەیوەست بوونی بە دونیاوە، یاخود ئارەزووی زیاتری تێدا کردبێ، یان وێنەی ئەوە، کە ئەمە حاڵی زۆربەی خەڵکیەو موویان سپی دەبن بەو هۆکارانەوە، بەڵام هی ئەو بە هۆی گرنگیدانیەوە بووە بە کاروباری دوارۆژ.

کە دەڵێ: «قَدْ شِبْتَ» یانی: تاڵە مووی سپیت لێ دەرکەوتوون، وە مەبەستیشی لەم پرسیارە هۆکاری ئەوە بوو (واتە: ویستی بزانێ بۆچی تاڵە مووی سپی لێ دەرکەوتوون).

کە دەڵێ: «قَدْ شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَأَخَوَاتُهَا» یانی: هۆکاری ئەم سپی بوونە، تەنها گرنگیدانە بە ڕۆژی دوایی.

وە تیایدا ڕوونکردنەوەی گەورەیی کاریگەری قورئانی تێدایە، بۆ ئەو کەسەی بیری لێ دەکاتەوەو لە ماناکانی تێدەگات و بەڵگەکانی دەزانێ، بۆیە هەر کەس ئەم کارە بکات ئەوە شوێنەواری چاکەکاری بۆ مسۆگەر دەبێ، ژیرو سەرکەوتوو دەبێ لە دونیاو دوارۆژی دا.

هەر کەس لەم قورئانە وردبێتەوەو مافی تەواوی ورد بوونەوەی پێ بدات، پەیوەستی دەکات بە ڕۆژی دوایی، وە ڕووی وەردەگێڕێ بۆ گرنگیی و ڕەچاو کردنی ئەم ڕۆژە مەزنە، بێ ئاوڕدانەوە لە بەرژەوەندیە دونیاییەکان، بۆیە لە دووعاکانی ئەوە بوو: {اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ الدُّنيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا}[1] ئەمە سوودی ئەوەی تێدایە کە ئاساییەو هیچی تێدانیە ئەگەر مرۆڤ گرنگی بدات بە دونیاو بەرژەوەندیەکانی و ژیان و گوزەران و پێویستی خۆی و منداڵەکانی، بەڵام هەڵە لەمەدایە کە گرنگیدانەکانی بە دونیا لەسەر حیسابی ئەوە بێ کە لە پێناوی دروست کراوەکە بە تاک گرتنی خوای بەرزە، خۆ ئامادەکردنە بۆ دیدارو پێگەیشتنی و توێشووی ڕۆژی دواییە.

وە هەروەها سوودی ئەوەی لێ وەردەگرین کە قورئان پزیشکە بۆ دڵەکان، چارەسەرە بۆ دەروونەکان، چاکسازە بۆ حاڵی خەڵک، هەر کاتێک بەندە پارێزگاری و گرنگی

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٥٠٢ من حديث ابن عمر رضي الله عنهما.





بدات بە قورئان بە بیر لێکردنەوەو قووڵبوونەوە بۆ ماناکانی و مەبەستەکانی، دەبینی پەیوەستی کردووە بە خواو گرنگی داوە بە ڕۆژی دوایی، خۆی بۆ ئامادە دەکات، وە توێشوو بۆ ئەم ڕۆژە مەزنە ئامادە دەکات، وە لە کۆتا ئەو ئایەتانەی کە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەرمان ﷺ فەرمایشتی خوای بەرزە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٢٨١﴾ ﴾ البقرة. (وە بترسن لـە ڕۆژێک دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای خوا).

هەر کەسێک بە تەواوی لە قورئان وردبێتەوەو قووڵبێتەوە شوێنەواری تەقوای لێ دیار دەبێ و توێشووی بۆ ڕۆژی دوایی دەبێ و خۆی بۆ ئامادە دەکات، بە پێچەوانەی حاڵی ئەو کەسەی دونیا سەرقاڵی کردوەو کردوویەتی بە گەورەترین ئامانجی و گەیشتنی بە زانیاریی، وە لە پێناویدا مووی سپی دەبن، وە لە پێناو دونیادا نەخۆش دەکەوێ، تەنها گرنگی بەوە دەدات و دەیکاتە دەستکەوت و ئامانجی خۆی، کە قسەی پێغەمبەری ﷺ ڕاست لەسەر جێبەجێ دەبێ کە دەفەرموێ: {تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، والدِّرْهَمِ، وَالقَطِيفَةِ، وَالخَمِيصَةِ؛ إن أُعطيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ}[(١)]. واتە: بەدبەختە ئەو کەسەی دەبێتە بەندەی دینارو زێڕو زیو و جل و بەرگ، ئەگەر پێی ببەخشرێ ڕازی دەبێ، و ئەگەریش پێی نەبەخشرێ ڕازی نابێ، (قەتیفەو خەمەیصە دوو جۆرە پۆشاکن).

٤٣- عَنْ أَبِي رِمْثَةَ التَّيْمِيِّ، تَيْمِ الرِّبَابِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَمَعِي ابْنٌ لِي، قَالَ: فَأُرِيتُهُ، فَقُلْتُ لَمَّا رَأَيْتُهُ: «هَذَا نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ، وَلَهُ شَعْرٌ قَدْ عَلَاهُ الشَّيْبُ، وَشَيْبُهُ أَحْمَرُ»[(٢)].

واتە: ئەبو ڕیمسەی تەیمی، تەیم ڕەباب دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کوڕێکم لەگەڵم بوو، (گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ) پێشان بدە، منیش پێشانمداو گوتم: «ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ (لەو کاتەدا) دوو دەستە جلی سەوزی پۆشی بوون، پرچیشی سپی تێدا دەرکەوتبوو، سپییەکەشی سوور بوو، (وەک بڵێی بە) سوور (ڕەنگکرابوو)».

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٨٨٦ من حديث أبي هريرة ﷺ.

(٢) في إسناده شعيب بن صفوان، قال عنه الحافظ في التّقريب: (مقبول) والمقبول لا يحتجُّ بحديثه إلاَّ إذا وجد له متابعٌ، ولم يوجد له متابعٌ، بل وُجد له مخالفون، ويقوّي هذا أنَّ بعضَ رواياته -كما سيأتي- ليس فيها لفظ «قَدْ عَلَاهُ الشَّيْبُ».



**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەبو ڕیمسەی تەیمی ﷺ دەڵێ: «أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَمَعِي ابْنٌ لِي، قَالَ: فَأَرَيْتُهُ»، واتە: پێغەمبەرم ﷺ پێشاندا، دەبێ ئەوە یەکەم چوونی بووبێ بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، نەیناسیوە بۆیە پرسیاری دەربارە کردوە، جا کاتێک بینی (گوتی:) ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ. «وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَخْضَرَانِ» وەک ئیزارو ڕیداء، وە مەرجیش نیە، کە دەڵێ: «أَخْضَرَانِ»، سەوزی تەواو بووبن، بەڵکو دەکرێ سەوزو ڕەشیش بووبێ، وەک پۆشاکی یەمانی.

کە دەڵێ: «وَلَهُ شَعْرٌ قَدْ عَلَاهُ الشَّيْبُ»، ئەوە شوێنی مەبەستە لە فەرموودەکەو دوو ئەگەری تێدان:

**یەکەمیان:** دەگونجێ مەبەستی وەسف کردنی زۆری تاڵە مووی سپی پێغەمبەری خوا ﷺ بووبێ بە زۆری، کە ئەگەر ئاوا بێ، ئەوە پێچەوانەی فەرموودەکانی ڕابردووە کە ئەوەی تێدا بەیان کرابوو، موو سپیەکانی زۆر کەم بوون ﷺ.

**دووەمیان:** دەشگونجێ مەبەستی هەبوونی مووی سپی بێ، کە ئەگەر ئاوا بێ، ئەوە ڕێک دەبێتەوە لەگەڵ فەرموودەکانی ڕابردوودا کە باسی لەکەمی تاڵە مووە سپیەکانی دەکرد، ئەوەش لە پێشترە.

کە دەڵێ: «وَشَيْبُهُ أَحْمَرُ»، ئایا ئەم سووریە شوێنەواری بۆیەو ڕەنگکردن بووە؟ یاخود شوێنەواری چەور کردن؟ بێگومان فەرموودەکانی ڕابوردن، بەڵگەن بۆ هی دووەم کە جابر ﷺ گوتی: «كَانَ إِذَا دَهَنَ رَأْسَهُ لَمْ يُرَ مِنْهُ شَيْبٌ، وَإِذَا لَمْ يَدْهِنْ رُئِيَ مِنْهُ» واتە: کاتێک سەری چەور دەکرد هیچ سپیاتیەکی لێ نەدەبینرا، وە ئەگەر چەوری نەکردبا لێی دەبینرا.

٤٤- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: قِيلَ لِجَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ: أَكَانَ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْبٌ؟ قَالَ: «لَمْ يَكُنْ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْبٌ إِلَّا شَعَرَاتٌ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ، إِذَا ادَّهَنَ وَارَاهُنَّ الدُّهْنُ»[1].

---

(١) انظر: (ح ٣٩).

واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەڵێ: بە جابری کوڕی سەمورە ﷺ گوترا: ئایا لە سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ مووی سپی هەبوون؟ گوتی: «لە سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ مووی سپی نەبوو، مەگەر چەند تاڵە موویێک لە ناوەڕاستی سەریدا نەبێ، لەو شوێنەی سەری کە قژی دەکرد بە دوو بەشەوە، کاتێک چەوری دەکرد، ڕۆن و چەوریەکە دەیشاردنەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ کۆتایی بەم بەشە هێناوە بەم فەرموودەیە، لە جابری کوڕی سەمورە ﷺ کە سیماکی کوڕی حەڕب پرسیاری لێکردووەو گوتوویەتی: ئایا لە سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ تاڵە مووی سپی هەبوون؟ پرسیارەکە لێرەدا دەربارەی تاڵە مووی سپیە لەسەری، نەک تاڵە مووی ڕەش و جگە لەویش، فەرمایشتی خوا دەربارەی بەسەرهاتی مووساو براکەی ﷺ: ﴿يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِي وَلَا بِرَأْسِيٓ ﴿٩٤﴾﴾ طه. (ئەی کوڕی دایکم موی ڕیش و سەرم مەگرە و ڕایمەکێشە).

قسەی پرسیارکار: «أَكَانَ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْبٌ؟»، یانی: ئایا تاڵە مووی سپی لە سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ هەبوون؟ جابریش ﷺ وەڵامی دەداتەوە بەوە کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ فِي رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْبٌ إِلَّا شَعَرَاتٌ فِي مَفْرِقِ رَأْسِهِ»، (مَفْرِق الرَّأْس): بریتیە لە ناوەڕاستی سەر، وە ئەم مانایەش تەواو ڕێک دێتەوە لەگەڵ ئەوەی ڕابورد لە قسەی ئەنەس ﷺ کە گوتی: {إِنَّمَا كَانَ البَيَاضُ فِي عَنْفَقَتِهِ، وَفِي الصُّدْغَيْنِ، وَفِي الرَّأْسِ نُبَذٌ}[1] یانی: شتێکی زۆر کەم.

کە دەڵێ: «إِذَا ادَّهَنَ وَارَاهُنَّ الدُّهْنُ»، یانی: بە هۆی کەمی تاڵە مووە سپیەکانەوە کاتێک پێغەمبەر ﷺ سەری بە زەیت یان بۆنی خۆش؟ یان وێنەی ئەوانە چەور دەکرد، سپیاتیەکە دەرنەدەکەوت، بەڵکو دیارنەدەما لەگەڵ چەور کردنەکە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٤١.

## سوودێک:

وەسفی هاوەڵان ﷺ بۆ سپیەتی تاڵە مووی پێغەمبەر ﷺ، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەندێک جار هیچی لەسەر نەبووە، بەڵکو هەندێک جار واجبە (سەرکۆت کردن) وەک ئەو کەسەی دەیەوێ مەسحی سەری بکات لە کاتی دەستنوێژ، چونکە (ما لا يتم الواجب إلا به فهو واجب)، هەروەها لە حەج کردن لە کاتی ئیحرامدا.

سوودێکی دیکە: مووی سپی وریاکەرەوەیە بۆ خاوەنەکەی، بانگبێژە بە نزیک بوونەوەی ئەجەل، شاعیر دەڵێ:[1]

أَلاَ فَامْهَدْ لِنَفْسِكَ قَبْلَ مَوْتٍ ... فَإِنَّ الشَّيْبَ تَمْهِيدُ الحِمَامِ
وَقَدْ جَدَّ الرَّحِيلُ فَكُنْ مُجِدّاً ... بِحَطِّ الرَّحْلِ فِي دَارِ المَقَامِ

داوای کردەوەی پاک و جوان و مردنی باش لە خوا دەکەین

(١) العمر والشّيب لابن أبي الدُّنيا ٦٢.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ڕەنگکردنی (سەرو ڕیشی) پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي خِضَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

پێشەوا الترمذي ﷺ ئەم بەشەی تایبەت کردووە بە ڕوونکردنەوەی ڕەنگکردنی مووی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە ڕووی جێگیر بوون و جێگیر نەبوونەوە، مەبەستیش لە ڕەنگکردن (خِضَاب) وەک پێشتر باسمان کرد، بریتیە لە گۆڕینی مووی سپی بە خەنەو وەسمە، یاخود تەنها بە خەنە، هاوەڵان لەوبارەوە ڕاجیاوازن خوا لێیان ڕازی بێ، کە ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیەی کردووە یاخود نا؟ هەروەک پێشەوا (إبن القيم) ﷺ باسی کردووە لە کتێبی (زاد المعاد)[1] کە ئەنەس ﷺ گوتوویەتی: سەرو ڕیشی ڕەنگ نەدەکردو، ئەبو هورەیرەش ﷺ گوتوویەتی: ڕەنگی کردوە، وە هەندێکیش گوتوویانە: بە هۆی ئەوەی پێغەمبەر گیان ﷺ چەوریی زۆری بەکاردەهێنا بۆیە گومانیان وا دەبرد کەوا بۆیەی کردوە، کەچی بۆیەشی نەدەکرد، بۆیە بەدڵنیاییەوە مووی سوورباو بوو، جا ئەوە دەرەنجامی ئەوەیە کە گوترا لەو بابەتە.

٤٥- عَنِ إِيَادِ بْنِ لَقِيطٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو رِمْثَةَ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَعَ ابْنٍ لِي، فَقَالَ: «ابْنُكَ هَذَا؟» فَقُلْتُ: نَعَمْ أَشْهَدُ بِهِ، قَالَ: «لَا يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلَا تَجْنِي عَلَيْهِ» قَالَ: وَرَأَيْتُ الشَّيْبَ أَحْمَرَ قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا أَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي هَذَا الْبَابِ، وَأَفْسَرُ؛ لِأَنَّ الرِّوَايَاتِ الصَّحِيحَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ. وَأَبُو رِمْثَةَ اسْمُهُ: رِفَاعَةُ بْنُ يَثْرِبِيٍّ التَّيْمِيُّ[2].

واتە: ئیادی کوڕی لەقیت دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئەبو ڕیمسە هەواڵی پێدام، گوتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کوڕێکم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئەوە کوڕی خۆتە؟» گوتم: بەڵێ کوڕی خۆمەو شایەتی دەدەم (لەسەر ئەم قسەم)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئەو باری گوناهی تۆ هەڵناگرێ، وە تۆش باری گوناهی ئەو هەڵناگری» (وەک بڵێی ئامۆژگاری کردن)، جا (ئەبو ڕیمسە) دەڵێ: تەماشام کرد سپیەتی پرچی سوور بوو، ئەبو عیسا (واتە: پێشەوا الترمذي ﷺ) دەڵێ: ئەم فەرموودەیە باشترین ڕیوایەتە لەوبارەوە لەم بەشە هاتوەو زۆر ڕوون و ئاشکرایە، چونکە ڕیوایەتە ڕاست و دروستەکان دەڵێن: مووی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیشتبوونە ئەندازەیەک بگوترێ مووەکانی سپی بوون. وە (أَبُو رِمْثَةَ) ناوی: ڕیفاعەی کوڕی یەسریبی تەیمییە.

---

(١) ١/١٧٦.

(٢) أخرجه عبد الله بن الإمام أحمد في زياداته على المسند: ٧١١٣.



## شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ بە فەرموودەی (ئەبو ڕیمسە) دەستی پێکردوە، کە دەڵێ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَعَ ابْنٍ لِي»، لەم ڕستەدا سوودی ئەوەی تێدایە کەوا باوکان هاوەڵیەتی منداڵەکانیان بکەن و بیانبەن بۆ کۆڕو مەجلیسی خێرو چاکە، ئەگەر باوک ڕێگای گرتەبەر بۆ ڕۆیشتنە لای مەجلیسی زانست، یاخود سەردانی زانایەکی کرد، یاخود وێنەی ئەوانە، ئەگەر بۆی گونجا با منداڵەکانی لەگەڵ خۆی ببات بۆ ئەم شوێنانە، چونکە بێگومان لەمەدا هەم پەروەردەو، هەم گەشەکردنیەتی لەسەر خۆشویستنی ئەهلی زانست و خۆشویستنی کۆڕەکانیان، وە پەیوەست بوون پێیانەوەو سوود بینین لێیان، دەبێ جەختی زۆر لەوە بکرێتەوە کە لە ڕۆژگاری ئێستاماندا لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی کات بەفیرۆدان و سەرلێشێواوی زۆر زۆر بوون، کە خەریکە گومانەکان و ئارەزووەکانی دونیا نەوەکانی مسوڵمانان بەرەو داڕوخان و لەناوچوون دەبات، بۆیە هاوەڵیەتی کردنی منداڵان و بردنیان بۆ ئەم کۆڕو مەجلیسانە، وە بە نەرمونیانی مامەڵە لەگەڵ کردنیان و هاندانیان و، خۆشەویست کردنی کۆڕی خێرو چاکە لەلایان زۆر زۆر بە سوودە بۆ پەروەردە کردن و فێرکردنیان.

کە دەڵێ: «ابْنُكَ هَذَا؟»، پێغەمبەر ﷺ پرسیار لە (ئەبو ڕیمسە) دەکات و دەفەرموێ: ئایا ئەوە منداڵی خۆتە؟ «نَعَمْ أَشْهَدُ بِهِ»، یانی: بەڵێ دان دەنێم و دڵنیات دەکەمەوە کەوا ئەوە منداڵی خۆمەو، ئەوەشی تەنها لەبەر دڵنیاکردنەوە گوت.

کە دەڵێ: «لَا يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلَا تَجْنِي عَلَيْهِ»، یانی: ئەگەر ئەو تاوانێک ئەنجام بدات، ئەوە گوناهەکەی لەسەر خۆیەتی، وە ئەگەر تۆش تاوانێک ئەنجام بدەی ئەوە گوناهەکە لەسەر خۆتە، چونکە بە دڵنیایی هیچ کەس گوناهی هیچ کەسێکی دیکە هەڵناگرێ، وە ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە بنەبڕکردنی سیفەتی کارێکی سەردەمی نەفامی بوو کە لە پێشدا هەبوو، کاتێک کوڕێک کەسێکی کوشتبایە لە هۆزێک، ئەوان باوکی کوڕەکە، یاخود برای، یاخود کۆمەڵێکیان لە خانەوادەی ئەو کەسە دەکوشتەوە، جا پێغەمبەر گیان ﷺ ئەم دیاردەیەی کە لە سەردەمی نەفامی هەبوو، پووچەڵ کردەوەو هەڵوەشاندەوە، کۆمەڵێک فەرموودە لەوانە فەرمایشتەکەی لێرەدا باسی کرد، کە فەرمووی: «لَا يَجْنِي عَلَيْكَ، وَلَا تَجْنِي عَلَيْهِ».




کە دەڵێ: «وَرَأَيْتُ الشَّيْبَ أَحْمَرَ»، ئەم ڕیوایەتە، ئەو ڕیوایەتە نیە دەربارەی وەسفی سپیەتیەکەی، لەوێدا فەرمووی: سپیەتی دەرکەوتبوو، بەڵام لێرەدا دەڵێ: بینیم سپیەکە سوور بوو، جا ئەم دابەشکردنە لەگەڵ ئەو ڕیوایەتانەی کە تیایدا هاتوە، کە ئەو سپیەتیەی لە سەرو ڕیشی پێغەمبەری خوا ﷺ هەبوو، شتێکی کەم بوو، وە وەسفکردنەکەی ئەبو ڕیمسە ﷜ بەوەی کە سوور بووە، جا ئایا ئەو سووریەتیە لە ئەنجامی ڕەنگکردنەوە بووە؟ یان لە ئەنجامی بەکارهێنانی ڕۆنەوە بووە؟

هەندێک لە زانایان وای دەبینن: ئەمە بە هۆی ڕەنگکردنەوە بووە، کە ئەمەش بە ڕوون و ڕاشکاویی هاتوە لە هەندێک لە هاوەڵانەوە گێردراوەتەوە، بۆ وێنە: ئوممو سەلەمە ﷞ وەک دوایی باسی دەکەین، هەندێک وایان زانیوە کە شوێنەواری چەور کردنەو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی بەکارنەهێناوە، هەروەک ئەنەسی کوڕ مالیک ﷜ زۆر جەختی لەوە کردۆتەوە، وەک پێشتر فەرموودەکەیمان هێنا.

جا دانەری کتێب ﷀ، دەڵێ: «هَذَا أَحْسَنُ شَيْءٍ رُوِيَ فِي هَذَا الْبَابِ، وَأَفْسَرُ؛ لِأَنَّ الرِّوَايَاتِ الصَّحِيحَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ. وَأَبُو رِمْثَةَ اسْمُهُ: رِفَاعَةُ بْنُ يَثْرِبِيٍّ التَّيْمِيُّ»، واتە: ئەوە باشترین شتێکە گێردرابێتەوە لەو بەشەدا، وە زۆر ڕوون و ئاشکرایەو لە هەندێک نوسخەدا هاتوە: دیارترین و ئاشکراترینیانە، وە (إبن القيم)یش ﷀ بەم شێوەیەی هێناوە لە (الزاد)دا[١].

جا واتای گوتەکەی: (وَأَفْسَرُ) واتە: دیارترینیانە لە حاڵی پێغەمبەر ﷺو ڕوونترینیانە بۆ ڕیوایەتەکان، پاشان هۆی ئەوەی دیاری کردووەو گوتوویەتی: «لِأَنَّ الرِّوَايَاتِ الصَّحِيحَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَبْلُغِ الشَّيْبَ»، واتە: ئەو سپیەی تێدابوو کەم بووە، پێویستی بە ڕەنگکردن نەدەکرد، بێگومان لەمەدا ئەوە وەردەگیرێ، خواش زاناترە کە دانەر لەگەڵ ئەم (بۆچوونە)یە کە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷜ لەسەری بووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرو ڕیشی ڕەنگ نەکردوە.

کە دەڵێ: «وَأَبُو رِمْثَةَ اسْمُهُ: رِفَاعَةُ بْنُ يَثْرِبِيٍّ التَّيْمِيُّ»، ئەمە ئەو شتەیە کە دانەری کتێب ﷀ جەختی لەسەر کردۆتەوە، هەروەها پێشەوایان (ئەحمەدو بوخاری و ئیبنو

---

(١) ١٧٦/١.



حیبان)یش، هەروەک پێشەوا ترمذیش ﷺ، لە باسی ژیانەکەیدا لە کتێبی: (تهذیب الکمال)[1] دا باسی کردوە، وە چەندین وتەی دیکەش هەن دەربارەی ناوەکەی.

٤٦- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ مَوْهَبٍ قَالَ: سُئِلَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: هَلْ خَضَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قَالَ أَبُو عِيسَى: وَرَوَى أَبُو عَوَانَةَ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَوْهَبٍ، فَقَالَ: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ[2].

واتە: عوسمانی کوڕی مەوهەب دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەبو هوڕەیرە ﷺ: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی دەکرد (واتە: مووی ڕەنگ دەکرد)؟ گوتی: «بەڵێ». ئەبو عیسا (واتە: پێشەوا الترمذي ﷺ) دەڵێ: وە ئەبو عەوانەش ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەوهەبەوە، ئەویش گێڕاویەتیەوە لە ئوممو سەلەمە ﷺ.

لە سەنەدی ئەم فەرموودەیەدا شەریکی قازی تێدایە، کە ئەویش هەروەک زانایان باسی دەکەن دەرخکردنی خراپ بووەو، متمانە پێکراوانیش پێچەوانەی ئەویان گێڕاوەتەوە، جا بۆیە لە موسنەدی ئوممو سەلەمە دایناوەو کە ئەوەش ڕاست و تەواوە.

---

(١) ٣١٦/٣٣.

(٢) *لعلَّ المصنِّف ﷺ أراد بإيراد هذا الرِّواية هنا إعلالَ جعل الحديث من مسند أبي هريرة ﷺ*؛ فإنَّ جماعةً من الثِّقات -كأبي عوانة، وسلام بن أبي مطيع، وإسرائيل ابن يونس- خالفوا شريكًا فجعلوه من حديث أمِّ سلمة ﷺ.

**أمَّا حديث أبي عوانة: فهو** ما أشار إليه المصنِّف بقوله: «وَرَوَى أَبو عَوَانَةَ هَذَا الْحَدِيثَ عَنْ عُثْمَانَ بنِ عَبْدِ الله بنِ مَوْهَبٍ، فَقَالَ: عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ».

**وَأَمَّا حَدِيث سلام بن أبي مطيع:** فقد أخرجه البخاري في صحيحه: ٥٨٩٧، وقالَ: عَنْ عُثْمَانَ بنِ عَبْدِ الله بنِ مَوْهَبٍ، قَالَ: «دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ؛ فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا شَعَرًا مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّ مَخْضُوبًا».

**وَأَمَّا حَدِيث إسرائيل بن يونس:** فقد أخرجه البخاري -أيضًا- في صحيحه: ٥٨٩٧، «عَنْ عُثْمَانَ بنِ عَبْدِ الله بنِ مَوْهَبٍ، قَالَ: أَرْسَلَنِي أَهْلِي إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ بِقَدْحٍ مِنَ مَاءٍ -وَقَبَضَ إِسْرَائِيلُ ثَلاثَ أَصَابِعَ- مِنْ فِضَّةٍ فِيهِ شَعَرٌ مِنْ شَعَرِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ إِذَا أَصَابَ الإِنْسَانَ عَيْنٌ، أَوْ شَيءٌ بَعَثَ إِلَيْهَا مِخْضَبَهُ؛ فَاطَّلَعَت فِي الجُلجُلِ فَرَأَيْتُ شَعَرَاتٍ حُمْرًا». قال الإسماعلي: لَيْسَ فِيهَا بيان أنَّ النَّبِيَّ ﷺ هو الَّذي خضَب، بل يحتمل أنَّه احمرَّ بعد لأن خالطه شَيءٌ من الطِّيب. هؤلاء الثِّقات: أبو عوانة، وسلام بن أبي مطيع، وإسرائيل بن يونس كلّهم رَووا الحديث عن عبد الله بن موهب من مسند أمِّ سلمة ﷺ، فهذا يضعِّف الرِّواية المتقدِّمة الَّتي جعلته من مسند أبي هريرة ﷺ.

٤٧- عَنْ إِيَادِ بْنِ لَقِيطٍ، عَنِ الْجَهْدَمَةِ، امْرَأَةِ بِشْرِ ابْنِ الْخَصَاصِيَّةِ، قَالَتْ: «أَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ يَنْفُضُ رَأْسَهُ وَقَدِ اغْتَسَلَ، وَبِرَأْسِهِ رَدْعٌ مِنْ حِنَّاءٍ» أَوْ قَالَ: «رَدْغٌ» شَكَّ فِي هَذَا الشَّيْخُ[1].

واته: ئەییادی کوڕی لەقیت دەگێڕێتەوە، لە جەهدەمەی کە خێزانی بیشری کوڕی خەصاصەیە گوتوویەتی: «من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەر لە ماڵەوە، خۆی شۆردبوو و سەری خۆی دەتەکاند، ڕەدعێک خەنە بە سەریەوە بوو»، یان گوتی: «ڕەدغێک» (خەنە بە سەریەوە بوو)، شەیخ گومانی لەوەدا هەبوو کە کامیانە.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «أَنَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ يَنْفُضُ رَأْسَهُ وَقَدِ اغْتَسَلَ، وَبِرَأْسِهِ رَدْعٌ»، ئەمە گومانێکە لە لایەن مامۆستای پێشەوا الترمذي ﷬ کە ناوی ئیبڕاهیمی کوڕی هاڕوونە، گومانی هەبووە، کە ئایا وشەی (رَدْعٌ) بوو، یاخود (رَدْغٌ) بوو، وشەی (رَدعْ): بۆیەیەکە لە زەعفەران و وەرەس دروست دەکرێ، بەڵام (رَدْغ): پەڵەیەکە لە خەنەو هاوشێوەی خەنە، وە هەروەها ئەو ئافرەتە ﷺ باسی ئەوەی کرد کە ئەو پارچەیەک لە خەنەی کۆکراوەی بینیوە لەسەری پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەمەش وەک هەندێک لە زانایان دەڵێن: ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە مووی سپی ڕەنگ کردبێ، بەڵکو دەگونجێ وەک چارەسەرێک بۆ بەکارهێنانی نەخۆشی، یاخود بۆ ساردکرنەوەو فێنک کردنەوە، یاخود وێنەی ئەوانە بەکاری هێنابێ.

٤٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ شَعْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَخْضُوباً». قَالَ حَمَّادٌ: وَأَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ شَعْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ مَخْضُوباً[2].

واته: ئەنەس ﷺ دەڵێ: «مووی پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ڕەنگکرابوو». واتە: حەماد دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیل ﷺ هەواڵی پێداین، گوتی: مووی پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە لای ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، ڕەنگ کرابوو.

---

(١) الحديث فيه النَّضر بن زُرارة، فهو مستورٌ كما قال الحافظ في التَّقريب: ٥٦٢/٢. وفيه أيضًا أبو جناب، وهو يحيى بن أبي حيَّة الكلبي؛ ضعَّفوه لكثرة تدليسه.

(٢) الحديث في إسناده عمرو بن عاصم، قال عنه ابن حجر في التَّقريب: (مقبول) ٤٢٣/٢، فحديث مثله لا يقوى لمعرضة أحاديث محمَّد بن سيرين وثابت وقتادة.





## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئنجا دانەر ﷺ کۆتایی ئەم بەشەی بە فەرموودەی ئەنەس ﷺ هێناوە.

که دەڵێ: «رَأَيْتُ شَعْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَخْضُوباً» بێگومان ئەو فەرموودانە ڕابورد کە جەختکردنەوەیان تێدابوو بەوەی کە (پێغەمبەر ﷺ سەرو ڕیشی) ڕەنگ نەکردوە، وە ئەم فەرموودەیەش پێچەوانەی ئەو ڕیوایەتە کەسانی جێی متمانەیە، بۆ وێنە: ئیبنو سیرین و سابیت و قەتادە، کە هەموویان لە ئەنەسەوە ﷺ دەگێڕنەوە، جەختی کردۆتەوە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ (سەرو ڕیشی) ڕەنگ نەکردوە.

که دەڵێ: «قَالَ حَمَّادٌ: وَأَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُحَمَّدِ بْنِ عَقِيلٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ شَعْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ مَخْضُوباً». ئەمە وێنەی ئەو فەرموودەیەی ڕابردوە کە ئوممو سەلەمە ﷺ بینیبووی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی کردبوو، ئەمە وەک زانایان گوتوویانە: بە مانای ئەوە نایەت کە ڕەنگی کردبێ، بەڵکو دەگونجێ ئەوە شوێنەواری چەور کردن و وێنەی ئەوە بووبێ.

وە لە (المستدرك)ی پێشەوا حاکم[1] هاتوە لە عەبدوڵڵای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەقیلەوە کە دەڵێ: {قَدِمَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ الْمَدِينَةَ وَعُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَالِيهَا فَبَعَثَ إِلَيْهِ عُمَرُ وَقَالَ لِلرَّسُولِ: سَلْهُ هَلْ خَضَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ فَإِنِّي رَأَيْتُ شَعْرًا مِنْ شَعْرِهِ قَدْ لُوِّنَ، فَقَالَ أَنَسٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ قَدْ مُتِّعَ بِالسَّوَادِ وَلَوْ عَدَدْتُ مَا أَقْبَلَ عَلَيَّ مِنْ شَيْبِهِ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ، مَا كُنْتُ أَزِيدُهُنَّ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ شَيْبَةً، وَإِنَّمَا هَذَا الَّذِي لُوِّنَ مِنَ الطِّيبِ الَّذِي كَانَ يُطَيَّبُ شَعْرَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ}.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ هاتە مەدینەو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز والی مەدینە بوو، عومەر بە دوایدا نارد، بە نێردراوەکەی گوت پرسیاری لێبکە ئایا پێغەمبەر ﷺ (سەرو ڕیشی) ڕەنگ دەکرد؟ چونکە بینیم چەند تاڵە موویێک لە مووەکانیم بینی کە ڕەنگکرابوون، ئەنەسیش ﷺ گوتی: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ نیعمەتی موو ڕەشی پێدرابوو، وە ئەگەر من کاتێک بەرامبەرم بووایەو مووە سپیەکانیم هەژمار کردبا لە سەرو ڕیشی دا، لە یازدە تاڵە مووم زیاتر نەدەژماردن، وە ئەوەش کە ڕەنگ

---

(١) أخرجه الحاكم: ٤٢٠١ وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، وقال: الذهبي: صحيح. ٦٦٣/٢.




کراوە لەو چەوریەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ مووی خۆی پێی چەور دەکرد.

بەهەرحاڵ فەرموودە ڕاست و دروستەکان، بەڵگەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ تاڵە مووە سپیەکانی هێندە کەم بوون، کە پێویستی بە ڕەنگکردن نەبووە، هەروەک لە ئەنەس و غەیری ئەنەسیش ﷺ بۆمان گێڕدراوەتەوەو زانایانی شەرعزانیش لەسەر ئەو بۆچوونەن و وایانگوتوە، بەڵام ئەوەی کەوا بینیویەتی سوور بووە، گومانیشی بردوە کەوا ڕەنگی کردوە، ئەوە بە دڵنیایی شوێنەواری چەورکردن بووە بە تاڵە مووەکانیەوە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی کل (چاوڕەشکەر)ی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي كُحْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

دانەر ﷺ ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی پەیوەستە بە کل لە چاوکردن و چاو ڕەشکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەوەش کە لە ڕێبازو سوننەتیەتی، هەم بە گوفتار فەرموویەتی و، هەم بە کردار کردوویەتی، هەر وەک لە فەرموودەکانی ئەم بەشەدا باسکردنی دێ، کە دانەریش فەرموودەکانی هێناوە.

وە (كُحْل)یش جۆرە بەردێکی ناسراوو تایبەتە، هەیانە ڕەنگی ڕەشە، هەشە مەیلەو سوورە، وە بە هەر یەکێکیان دەگوترێ: (إِثْمِد) واتە: کل و سوورمە، زۆر زوو وردو خاش دەبێ، بە تەواوی دەکوترێ و ورد دەبێ، تا وای لێدێ نەرم دەبێ، پاشان دەکرێتە چاو لە ڕێگای میلی کلەوە، یان هاوشێوەی ئەوە.

لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاندانی تایبەت هاتوە دەربارەی کل لە چاو کردن، چاو ڕەشکردن بە (إِثْمِد) یاخود کل و سورمە، زانایان چەندان سوودیان تێدا باسکردوە، زانای پایەبەرز (إبن القیم) ﷺ پوختەکەی کۆکردۆتەوە لە کتێبی (زاد المعاد)دا[١] کە دەڵێ: لە سورمەدا پارێزەری چاو هەیە بۆ تەندروستی چاو، وە بەهێز کردن هەیە بۆ ڕۆشنایی بینایی بینەرو، ڕووناکی دەکاتەوە، وە هۆکاری کەمکردنەوەی مادده زیانبەخشەکان و دەرکردنیانە لە چاو، لەگەڵ جوانی بەخشین بە چاو لە هەندێک جۆری کلدا، بەکارهێنانی (کل) لە کاتی شەودا باشترە، چونکە لە نێو چاودا دەمێنێتەوەو جووڵەی چاو دەسرەوێ و ئارام دەبێتەوە، وە لە هەر جووڵەیەکی زیانبەخش دەیپارێزێ و، خزمەتێکی باشی پێدەکات، کل لەم ڕووەوە تایبەتمەندی تایبەتی هەیە.

٤٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اكْتَحِلُوا بِالْإِثْمِدِ فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ». وَزَعَمَ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَتْ لَهُ مُكْحُلَةٌ يَكْتَحِلُ مِنْهَا كُلَّ لَيْلَةٍ ثَلَاثَةً فِي هَذِهِ، وَثَلَاثَةً فِي هَذِهِ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «چاوتان بە کل برێژن، بێگومان هەم چاو ڕۆشن دەکاتەوەو، هەم موو (برژانگ) دەڕوێنێ» (واتە: درێژی دەکات). وە پێی وابوو دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ کلدانێکی هەبوو، هەموو شەوێک (پێش بخەوێ) چاوی پێ ڕەش دەکرد، سێ جار ئەم چاوەو، سێ جاریش ئەو چاو».

---

(١) ٢٨١/٤.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٧٥٧، وابن ماجه: ٣٤٩٩.



٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيّ ﷺ يَكْتَحِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ بِالْإِثْمِدِ ثَلَاثًا فِي كُلِّ عَيْنٍ». وَقَالَ يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ، فِي حَدِيثِهِ: «إِنَّ النَّبِيّ ﷺ كَانَتْ لَهُ مُكْحُلَةٌ يَكْتَحِلُ مِنْهَا عِنْدَ النَّوْمِ ثَلَاثًا فِي كُلِّ عَيْنٍ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێک پێش ئەوەی بخەوێ هەر چاوێکی سێ جار دەڕێژت». یەزیدی کوڕی هاڕوون (کە یەکێکە لە ڕاویەکان) لە فەرموودەکەی خۆیدا دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ کلدانێکی هەبوو، هەموو شەوێک لەکاتی خەوتن چاوی پێ ڕەش دەکرد، بۆ هەر چاوێکی سێ جاران (کلی تێدەکرد)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە ڕەشکردنی چاو بە کلی (إِثْمِد)، دوو سوودیشی بۆ باسکردوە:

**سوودی یەکەم**: (يَجْلُو الْبَصَرَ) چاو خاوێن و ڕوون دەکات، یانی: دەبێتە هۆی جوانکردنی چاوو خاوێن و پاکبوونەوەی چاو، وە یارمەتی چاو دەدات لە جوان بینینی و ڕۆشنایی لە چاو دروست دەکات.

**سوودی دووەم**: (وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ) برژانگەکان دەڕوێنێ و درێژی دەکات، یانی: ئەو موانەی کە لە پێڵوەکانی چاودا دەڕوێن، جا ئەم موانە ڕووانین و درێژیەکەی و گەشەکردنی بە پارێزگاری کردنی چاو دادەنرێ لە هەر تەپوتۆزو خۆڵێک.

هەروەها سەرباری پێدانی جوانی بە چاو، چەندان سوودی دیکەی هەیە، وە لە چاکەو نیعمەتەکانی خوای گەورە بەسەر مرۆڤ ئەوەیە کە وای لە چاوی کردووە

---

(١) أورد المصنِّفُ ﷺ تعالى حديث ابن عبَّاسٍ هذا من طرقٍ، مدارُها على عبَّاد بن منصور، وهو صدوقٌ كان يدلِّس، وتغيَّرَ بأخرة. والإمام ابن كثيرٍ ﷺ لمَّا ساق هذا الحديث في كتابه الشَّمائل من البداية والنِّهاية: ٩/٦ أورد بعده عليَّ عليَّ بن المديني أنَّه قال: سمعتُ يحيى بن سعيد يقول: قلت لعبَّاد بن منصور: سمعتَ هذا الحديث من عكرمة؟ فقال: أخبرنيه ابنُ أبي يحيى، عن داود بن الحصين عنه، فصرَّح أنَّه أسقط واسطين في الإسناد بينه وبين عكرمة؛ الأوَّل ابن أبي يحيى، وهو -كما ذكر أهل العلم- متروك الحديث، والثَّاني داود بن الحصين، وهو ضعيفٌ في عكرمة خاصَّةً، فالحديث لا يصحُّ، والأمر بالاكتحال بالإثمد والإخبار أنَّه يجلو البصر وينبت الشَّعر ثابتٌ عن النَّبِيِّ عليه الصَّلاة والسَّلام- في غير هذا الحديث.

هەمیشە دەتروکێن و دەکرێنەوەو دادەخرێن، بۆیە لەمەدا سوودێکی گەورەی زۆر هەیە بۆ چاو، لە ڕووی پاکوخاوێنیی و پارێزگاری لێکردنی.

(وَزَعَمَ) واتە: ئیبنو عەباس رضي الله عنهما پێی وابوو، کە بە مانای ئەوە دێ کە گوتوویەتی: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَتْ لَهُ مُكْحُلَةٌ يَكْتَحِلُ مِنْهَا كُلَّ لَيْلَةٍ ثَلَاثَةً فِي هَذِهِ، وَثَلَاثَةً فِي هَذِهِ»، پێغەمبەر ﷺ کلدانێکی هەبوو، هەموو شەوێک (پێش بخەوێ) چاوی پێ ڕەش دەکرد، سێ جار ئەم چاوەو، سێ جاریش ئەو چاو. پێغەمبەر ﷺ سێی لە چاوی ڕاستی و، سێی لە چاوی چەپی دەکرد، بەڵام لێی گێردراوەتەوە ﷺ کە خەڵکی هانداوەو پێی خۆشبووە کە لە چاوڕشتنیان تاک بێ، واتە: تاک بەکاربێنن، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ}[1]. واتە: خوا تاکەو تاکی خۆشدەوێ، ئەوە بە شێوەیەکی گشتی، وە بە تایبەت دەربارەی چاوڕشتن فەرموویەتی: {إِذَا اكْتَحَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْتَحِلْ وِتْرًا}[2]. واتە: ئەگەر یەکێک لە ئێوە چاوی ڕشت با بە تاک بیڕێژێ، زانایان دەربارەی شێوازی تاک بەکارهێنان لە چاوڕشتندا دوو ڕێگا باس دەکەن لە هەر یەکێکیشیاندا هەندێ فەرموودە هاتوون، لەگەڵ بوونی قسە لەسەر هەندێکیان.

چاوڕەشکردن کە چەند فەرموودەیەکی لەسەر هەن، چەند ڕێگایەکیان باس کردوە:

**ڕێگای یەکەم**: سێ جار کل لە چاوی ڕاست بکرێ سەرەتا، دواتر سێ جاران کل بخرێتە چاوی چەپ بەمەش لە هەردوو چاودا ویتر ڕەچاو کراوە.

**ڕێگای دووەم**: سەرەتا جارێک کل لە چاوی ڕاست بکرێ، دواتر جاری دووەم لە چاوی چەپ بکرێ، دواتر جاری سێیەم لە چاوی ڕاست بکرێ، بۆ جاری چوارەم لە چاوی چەپ بکرێ، لە جاری پێنجەم و کۆتایی لە چاوی ڕاست بکرێ، ئەو کاتە بۆ هەردوو چاو حاڵەتی ویتر ڕەچاو کراوە، ئەم ڕێگایەش ڕەچاوکردنی پلەو پێگەی چاوی ڕاستە لە ئاست چاوی چەپدا، لە سێ شتدایە: لەبەرچاوگیراوە لە دەستپێکردن و، کۆتایی پێهێنان و زیادکردنی ژمارەکە.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٦٧٧ من حديث أبي هريرة رضي الله عنه .

(٢) أخرجه أحمد في المسند: ٨٦١٢.




٥١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ عِنْدَ النَّوْمِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ»[1].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(بۆ چاوڕشتن) کل بەکاربێنن لە کاتی خەوتن (پێش ئەوەی بخەون)، بێگومان هەم چاوڕۆشن دەکاتەوەو هەم موو (برژانگ) دەڕوێنێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

جەختکردنەوەی تێدایە لەسەر لەچاوکردنی کل لە کاتی خەوتن {عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ عِنْدَ النَّوْمِ} پێشتریش قسەی پێشەوا (إبن القيم)مان ﷺ هێنا دەربارەی سوودەکانی کل لە چاو کردن لە کاتی خەوتن کە هەم سوودی هەیە بۆ چاو، هەم چاو دەپارێزێ لە زەرەرو زیان.

پاشان دوو سوودی بۆ چاوڕشتن باسکرد، فەرمووی: کل و سورمە چاوڕۆشن دەکاتەوەو، مووی برژانگ دەڕوێنێ.

٥٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدُ، يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان باشترین (جۆری) چاوڕەشکردنتان بریتیە لە کل، هەم چاو ڕۆشن دەکاتەوە، هەم موو (برژانگ) دەڕوێنێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: «إِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدُ»، واتە: باشترین شت کە چاوتانی پێ بڕێژن (إِثْمِد)ـە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە چەندان شتی دیکەش هەن بۆ چاوڕشتن بەکاردەهێنرێ، بەڵام باشترینیان و سوودبەخشترینیان

---

(١) أخرجه ابن ماجه: ٣٤٩٦.

(٢) أخرجه أبو داود: ٣٨٧٨، وابن ماجه: ٣٤٩٧. والحديث رواه الإمام أحمد بلفظ: «خَيْرُ أَكْحَالِكُمُ الإِثْمِدُ عِنْدَ النَّوْمِ» ٢٤٧٩، فزاد فيه: «عِنْدَ النَّوْمِ».

(إِثْمِد)ـە، وە یەکێک لە سوودەکانی ئەوەیە کە بینینی چاو زیاد دەکات و، برژانگەکان دەڕوێنێتەوەو درێژی دەکات.

٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْإِثْمِدِ، فَإِنَّهُ يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ»(١).

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(بۆچاو ڕشتن) کل بەکاربێنن، بێگومان هەم چاوڕۆشن دەکاتەوەو، هەم موو (برژانگ) دەڕوێنێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﵀ کۆتایی بەم بەشە هێناوە بە فەرموودەی ئیبنو عومەر ﵄ کە هەمان مانای فەرموودەکەی پێش خۆی دەگەیەنێ.

## سوودێک:

جێگیر بووەو سەلمێنراوە لە هەندێک لێکۆڵینەوەی زانستی پزیشکی نوێ دەرکەوتوە کە هەندێک لەو کلانەی دەفرۆشرێن فێڵیان تێدا دەکرێ و پارێزراو نەبووە لە فێڵ کردن، تێکەڵاو دەکرێن لەگەڵ هەندێک جۆری قوڕقوشم و پێکەوە ورد دەکرێن، یان شتێکی دیکەی تێدایە لە پیسی، کە ئەو کاتە لە جیاتی سوود زیانی دەبێ بۆ چاو، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ سوور بێ و جەخت لەوە بکاتەوە کەوا ئەو کلەی دەیکڕێ کلی باش بێ، وە دڵنیابێ لە سەلامەتی و پارێزراویی ئەوەی کەوا دەیکڕێ بۆ سەلامەتی تەندروستی خۆی.

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السُّنن: ٣٤٩٥، وفي إسناده عثمان بن عبد الملك المكيّ، لينُ الحديث، لكنّه يتقوّى بالحديثين اللّذين قبله.




ئەم بەشە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەیە کە پەیوەستە بە پۆشاکی پێغەمبەر گیان ﷺ لە ڕووی چۆنیەتیی و جۆرەکانی و ڕەنگەکانی و هتد...، وە هەر شتێکی دیکەش کە پەیوەندی پێوە هەیە، پێویستە ئەوە بزانرێ کە بنچینە لە پۆشینی پۆشاک، ڕەوایەتیی و ڕێگاپێدراویە، بۆیە مرۆڤ بۆی هەیە هەرچی بیەوێ و پێی خۆش بێ بیپۆشێ لە پۆشاک، بە خۆ دوورگرتن لەوەی کەوا شەرع نەهی لێکردوە، بۆیە لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {كُلُوا وَاشْرَبُوا وَالْبَسُوا وَتَصَدَّقُوا فِي غَيْرِ إِسْرَفٍ، وَلَا مَخِيلَةٍ}[1]، واتە: بخۆن و بخۆنەوەو بپۆشن و ببەخشن، بێ ئەوەی زێدەڕۆیی و کەشخەو فیز بکەن.

هەروەها لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ گێردراوەتەوە، کە گوتوویەتی: {كُلْ مَا شِئْتَ، وَالْبَسْ مَا شِئْتَ، مَا أَخْطَأَتْكَ اثْنَتَانِ: سَرَف، وَمَخِيْلَة}[2]. واتە: چ دەخۆی بیخۆ، چ پۆشاکێک دەپۆشی بیپۆشە، بەڵام ئاگاداربە دوو شت تووشی گوناهت نەکات، زێدەڕۆیی کردن و کەشخەو فیزکردن.

وە لە سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ هاتوە کەوا باسی وریا بوون و، ئاگادارکردنەوەی تێدایە کە پەیوەستە بە پۆشینی هەندێک پۆشاک و خۆ لێ دوورگرتنی، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە خۆدوورگرتن کردووە لێی، لەوانە:

**الإِسْبَال:** ئەویش ئەوەیە پیاو پۆشاکەکەی بێتە خوارەوە بۆ ژێر گۆزینگەکانی، لەوبارەوە هەڕەشەی زۆر تووند هاتوە، لە چەندین فەرموودەدا، بۆیە هەندێک لە زانایان و شەرعزانان بە گوناهێکی گەورەی هەژمار دەکەن، وە یەک لەو هەڕەشانەی کە لەوبارەیەوە هاتوە ئەو فەرموودەیەیە کە لە (صحیح مسلم)دا[3] هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {ثَلَاثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمُسْبِلُ وَالْمَنَّانُ وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ}. واتە: سێ (جۆرە کەس هەن) خوا نایاندوێنێ لە ڕۆژی دوایی و سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوەو سزای سەختیان بۆ هەیە، ئەو کەسەی ئیزارەکەی هێناوەتە خوارەوە بۆ ژێر گۆزینگەکانی،

---

(١) أخرجه البخاري معلّقاً في كتاب اللّباس.

(٢) أخرجه البخاري معلّقاً في كتاب اللّباس.

(٣) (ح ١٠٦)، من حديث عَنْ أبي ذر الغفاري ﷺ.




ئەو کەسەی چاکە دەکات و منەت دەکات (بەسەر چاکە لەگەڵکراو)، ئەو کەسەی بە سوێندی درۆ کاڵاکەی ساغ دەکاتەوەو دەیفرۆشێ.

لەم بابەتەدا فەرمودە زۆر زۆرن، کە ورياکردنەوەيان تێدايە دەربارەی (إِسْبَال)و ڕوونکردنەوەی ترسناکيەکەی.

پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە لە پياوان کە پۆشاکی حەرير، ئاوريشم بپۆشن، وە نەهی کردووە لە پۆشينی پۆشاکی ناوبانگ و سومعەو شانازيی کردن، ئەويش ئەوەيە کەسێک پۆشاکێک بپۆشێ خۆی پێ جيا بکاتەوە لە خەڵکی ئەو شوێنەی کە لەگەڵياندايە، بۆيە بنچينە ئەوەيە هەمان پۆشاکی ناوچەی خۆی بپۆشێ، ئەگەر پێچەوانەی شەرعی تێدا نەبێ، بەڵام ئەگەر بينی پێچەوانەی شەريعەتە ئەوە نابێ بيپۆشێ و دەبێ لێی دووربکەوێتەوە.

هەروەها لەوەی هاتوە دەربارەی نەهی کردن لە پۆشينی پۆشاک: {مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ، فَهُوَ مِنْهُمْ}[1]. واتە: هەر کەس خۆی بە هەر کۆمەڵێک بچوێنێ، ئەوە لەوانە، بۆيە ئەو پۆشاکانەی کە تايبەتە بە کافران و بێبڕوايان و پێی دەناسرێنەوە، حەڵاڵ نيە بۆ مسوڵمان کە بيپۆشێ.

٥٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقَمِيصُ»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: «خۆشەويستترين پۆشاک لای پێغەمبەری خوا ﷺ (کە حەزی دەکرد بيپۆشێ) کراس بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

**الْقَمِيص**: پۆشاکێکی ناسراوە کە دوو قۆڵی هەن دەستەکانی تێدەخرێن، شوێنی مليشی هەيە کە ملی تێدەخرێ (دشداشە)، وە دەگوترێ هۆکاری زۆر خۆشەويستی پێغەمبەر ﷺ بۆ کراس بريتی بووە لە ئاسانی لەبەر کردنی و ئاسانی داکەندنی، لە کاتی خۆجووڵاندنيشدا فراوان بووە بە پێچەوانەی هەندێک پۆشاکی دی کە لە

---

(١) أخرجه أبو داود: ٤٠٣١، وصححه الألباني.

(٢) أخرجه المصنف في جامعه: ١٧٦٢.

کاتی خۆجوولاندن بەو شێوازە ئاسان نەبێ لە کاتی لەبەر کردن و داکەندن، بەڵکو پێویستی بە شارەزایی و خۆڕاهێنان هەیە وەکو پەشتەماڵ.

٥٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقَمِيصُ»[١].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: «خۆشەویستترین پۆشاک لای پێغەمبەری خوا ﷺ کراس بوو (پۆشینی ئەم پۆشاکەی پێ خۆش بوو)».

٥٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُهُ الْقَمِيصُ» قَالَ: هَكَذَا قَالَ زِيَادُ بْنُ أَيُّوبَ، فِي حَدِيثِهِ: عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أُمِّهِ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي تُمَيْلَةَ مِثْلَ رِوَايَةِ زِيَادِ بْنِ أَيُّوبَ، وَأَبُو تُمَيْلَةَ يَزِيدُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ «عَنْ أُمِّهِ» وَهُوَ أَصَحُّ[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە ﵂ دەڵێ: «ئەو پۆشاکەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری حەز دەکرد (لە جل و بەرگدا) بیپۆشێ کراس بوو». دەڵێ: زیادی کوڕی ئەییوبیش بەو شێوەیەی گوتوە، لە فەرموودەکەیدا لە عەبدوڵلای کوڕی بورەیدەوە لە دایکیەوە لە ئوممو سەلەمەوە، وە هەر بەو شێوەیەش جگە لە یەک کەس گێڕاویانەتەوە، لە ئەبو تومەیلەوە، وێنەی ڕیوایەتەکەی زیادی کوڕی ئەییوب و ئەبو تومەیلە لەو فەرموودەیەدا ئەوەی زیاد دەکرد «لە دایکیەوە» ئەوەش ڕاستترە.

ئەوە ڕیوایەتەکان بوون بۆ فەرموودەکەی ئوممو سەلەمە ﵂ و کۆتایی هێنان بەوەی ڕاستترینیان ئەوەیە کە ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵلای کوڕی بورەیدەوە لە دایکیەوە لە ئوممو سەلەمەوە بە زیادەی (عَنْ أُمِّهِ).

٥٧- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ كُمُّ قَمِيصِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى الرُّسْغِ»[٣].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٦٤ وانظر: الحديث الَّذي قبله.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٦٣، وأبو داود في السنن: ٤٠٢٦، وابن ماجه: ٣٥٧٥.

(٣) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٦٥، وأبو داود في السُنن: ٤٠٢٧، وفي إسناده شهُر بن حَوشَب، صدوق كثير الإرسال والأوهام، لكِن له شاهدٌ في كتاب (أخلاق النَّبيِّ) لأبي الشَّي: (ص ٩١) قال: {حدَثنا عبد الله بن محمَّد بن ناحية، أخبرنا محمَّد بن ثعلبة بن سواء، أخيرنا عمِّي، أخبرنا همَّام، عن قتادة، عن أنس قال: كان قميص رسول الله ﷺ إلى رُسغه}. ورواه البيهقي في شعب الإيمان: ٥٧٥٨ من طريق محمد بن ثعلبة به.



واتە: ئەسمائی کچی یەزید ﵂ دەڵێ: «کراسی پێغەمبەری خوا ﷺ سەر قۆڵەکەی تاکو مەچەکی (دەستی) بوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

**الرُّسْغ**: بریتیە لەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان دەست و باسک، سەردەستی کراسی پێغەمبەر ﷺ لەوێ تێپەڕ نەبووە.

٥٨- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنْ مُزَيْنَةَ لِنُبَايِعَهُ، وَإِنَّ قَمِيصَهُ لَمُطْلَقٌ، أَوْ قَالَ: زِرُّ قَمِيصِهِ مُطْلَقٌ، قَالَ: فَأَدْخَلْتُ يَدِي فِي جَيْبِ قَمِيصِهِ فَمَسَسْتُ الْخَاتَمَ[(١)].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕە لە باوکی ﵁ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێک لە هۆزی موزەینە بۆ ئەوەی پەیمانی پێ بدەین (لەسەر ئەوەی مسوڵمان بین و بڕوا بێنین)، (بینیم) کراسەکەی کرابۆوە، (ڕاوی دەڵێ) یان گوتی: قۆپچەی کراسەکەی کرابووەوە، جا بۆیە لە یەخەی کراسەکەیەوە دەستم بردە نێوەوەو دەستم بەر مۆرەکە کەوت.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «فِي رَهْطٍ مِنْ مُزَيْنَةَ لِنُبَايِعَهُ»، (الرَّهْط): بریتیە لە کۆمەڵێک کەس کە ژمارەیان لە نێوان سێ بۆ دە کەس بێ.

کە دەڵێ: «وَإِنَّ قَمِيصَهُ لَمُطْلَقٌ، أَوْ قَالَ: زِرُّ قَمِيصِهِ مُطْلَقٌ»، یانی: قۆپچەی کراسەکەی دانەخرابوو.

کە دەڵێ: «فَأَدْخَلْتُ يَدِي فِي جَيْبِ قَمِيصِهِ فَمَسَسْتُ الْخَاتَمَ»، واتە: قوڕڕە ﵁ دەستی خستۆتە یەخە کراسەکەی (لە ملیەوە دەستی بردۆتە ژووری) کە پێشتر لە بابەت و بەشی پەیوەست بە مۆری پێغەمبەرایەتی ﷺ ئەوەمان باسکرد.

---

(١) أخرجه أبو داود في السُّنن: ٤٠٨٢، وابن ماجه في السُّنن: ٣٥٧٨.

## سوودێک:

بنچینە ئەوەیە کە قۆپچەی کراس دابخرێ، بەڵام ئەگەر پێویستیەک هەبووە بۆ کردنەوە، ئەوە دەکرێتەوە، وە کردنە سوننەتی کردنەوەی قۆپچەی کراس بە ڕەهایی لای هەندێک کەس، ئەوە نەزانراوەو هیچ بەڵگەیەکی ڕوونی لەسەر نیە کە دروست بێ، وە ئەم فەرموودەش نزیک و دوور بەڵگە نیە لەسەر ئەمە، چونکە نازانرێ کە ئەم قۆپچە کردنەوەی خواپەرستی و سوننەت بووە، یاخود لەبەر هەر هۆکارێک لە هۆکارەکان وای کردوە، ئایا لەبەر زۆری تینی گەرما بووە؟ یاخود سینگی ئارەقی کردوە، یاخود وێنەی ئەوانە، ئەوەی دڵ زیاتر بۆی دەچێ ئەوەیە: کە لەبەر ئەمە وای نەکردوە سوننەت بێ، تاکو ئێمەش وا بکەین، چونکە ئەگەر ئەوە سوننەت بووایە، هەر لە بنچینەدا قۆپچەی دانەدەنا، ئەگەرنا سوودی قۆپچە چیە دابنرێ و بەکارنەهێنرێ؟!

٥٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ وَهُوَ يَتَّكِئُ عَلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَلَيْهِ ثَوْبٌ قِطْرِيٌّ قَدْ تَوَشَّحَ بِهِ، فَصَلَّى بِهِمْ»[1].

وَقَالَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ: قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْفَضْلِ: سَأَلَنِي يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَوَّلَ مَا جَلَسَ إِلَيَّ، فَقُلْتُ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، فَقَالَ: لَوْ كَانَ مِنْ كِتَابِكَ، فَقُمْتُ لِأُخْرِجَ كِتَابِي فَقَبَضَ عَلَى ثَوْبِي ثُمَّ قَالَ: أَمْلِهِ عَلَيَّ؛ فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ لَا أَلْقَاكَ، قَالَ: «فَأَمْلَيْتُهُ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَخْرَجْتُ كِتَابِي فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ (لە کاتی نەخۆش کەوتنی هێندە ئازاری زۆر بوو)، کاتێ لە ماڵ هاتەدەر (لەبەر بێهێزی) خۆی بەسەر ئوسامەی کوڕی زەید دابوو، پۆشاکێکی قیتری بەسەر شانەکانیدا دابوو، پاشان نوێژی بۆ کردن».

دەڵێ: عەبدی کوڕی حومەید گوتی: موحەممەدی کوڕی فەزڵ گوتی: یەحیای کوڕی مەعین یەکەم کەس بوو کە بۆم دانیشت و پرسیاری لێکردم دەربارەی (سەنەدی فەرموودەکە) منیش گوتم: حەمادی کوڕی سەلەمە بۆی گێڕاینەوە گوتی:

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٣٧٦٣.



ئەگەر لە نووسراوەکەت دایە (واتە: دەفتەرەکەت بێنەو بۆم بخوێنەوە)، هەڵسام بچم نووسراوەکەمی بۆ دەربێنم، پۆشاکەکەی گرتم و گوتی: لەبەر بۆم بڵێ، چونکە من ترسم هەیە پێت نەگەمەوە (واتە: بڕۆیی و نەگەڕێیەوەو وەفات بکەی)، منیش لەبەر بۆیم خوێندەوە، پاشان نووسراوەکەشم بۆ دەرهێناو، لەسەر نووسراوەکەش بۆم خوێندەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە ئەنەس ﷺ دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ وَهُوَ يَتَّكِئُ عَلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَلَيْهِ ثَوْبٌ قِطْرِيٌّ»، (الثَّوْبُ القِطْرِي) جۆرێکە لە پۆشاکی یەمەنی کە خەت خەتی باریکە، «قَدْ تَوَشَّحَ بِهِ»، واتە: لەسەر شانی داینا.

کە دەڵێ: «فَصَلَّى بِهِمْ»، واتە: ئیمامەتی بۆ کردن.

کە دەڵێ: «وَقَالَ عَبْدُ بْنُ حُمَيْدٍ: قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْفَضْلِ: سَأَلَنِي يَحْيَى بْنُ مَعِينٍ عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَوَّلَ مَا جَلَسَ إِلَيَّ، فَقُلْتُ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، فَقَالَ: لَوْ كَانَ مِنْ كِتَابِكَ»، مەبەستی ئەوە بوو لەبەر سەنەدی فەرموودەکەی بۆ بڵێ: (بە دەرخ سەنەدی فەرموودەکەی بۆ بڵێ)، بەڵام یەحیای کوڕی مەعین گوتوویەتی: سەنەدی فەرموودەکەم لەم نووسراوە بۆ بڵێ کە تێیدا نووسیوتەوە، واتە: نووسراوەکەت دەربێنە (بۆم بخوێنەوە).

کە دەڵێ: «فَقُمْتُ لِأُخْرِجَ كِتَابِي»، واتە: لەسەر داوای ئەو هەڵسام بچم نووسراوەکەم بێنم کە فەرموودەکانم تێدا نوسیبوون، پۆشاکەکەی گرتم و گوتی: «أَمْلِهِ عَلَيَّ»، واتە: لەبەر بۆم بڵێ، «فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ لَا أَلْقَاكَ»، ئەوەش بۆ زۆر سووربوونیانە لە ڕەچاوکردنی کات و ترسان لە هاتنەوەو گەیشتنەوە پێی، نەوەک شتێک بێتە پێش ببێتە هۆی دابڕان و کۆسپ لە نێوانیاندا.

کە دەڵێ: «فَأَمْلَيْتُهُ عَلَيْهِ»، واتە: لەبەر بۆم خوێندەوە سەرەتا، دواتریش دەفتەرەکەم بۆ دەرهێنا، لەسەر نووسراوەکەش دووبارە بۆی خوێندەوە جارێکی دیکە، سەرەتا لەبەر بۆی خوێندەوە، پاشان ڕۆیشت و نووسراوەکەی هێناو جارێکی دیکە بۆی خوێندەوە، ئا لەمەدا ڕوونکردنەوەی جددیەت و سوور بوونی زانایانی پێشین هەیە

لەسەر ڕەچاوکردن و توندبوونیان لەسەر وەرگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەری نازدار ﷺ.

٦٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْباً سَمَّاهُ بِاسْمِهِ عِمَامَةً أَوْ قَمِيصاً أَوْ رِدَاءً، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا كَسَوْتَنِيهِ، أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر پۆشاکێکی نوێی پۆشیبا، بە ناوی خۆیەوە ناوی دەبرد، (بۆ وێنە:) عیمامە، یان کراس، یان ڕیداء بووایە، دوایی دەیفەرموو: «خوایە ستایش بۆ تۆیە، وەک چۆن منت پێ پۆشی، داوای چاکەی بەردەوام مانەوەی ئەو خێرەت لێ دەکەم، کە بۆی دروستکراوە، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە خراپەیی و، خراپەی ئەوەش کە بۆی دروستکراوە».

٦١- حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ يُونُسَ الْكُوفِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا الْقَاسِمُ بْنُ مَالِكٍ الْمُزَنِيُّ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ، عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ.

واتە: هیشامی کوڕی یونوس کوفیی بۆی گێڕاینەوە، گوتی: قاسمی کوڕی مالیکی موزەنی بۆی گێڕاینەوە، لە جورەیری، لە ئەبو نەزرە، ئەویش لە ئەبو سەعیدی خودری، ئەویش لە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هەمان شێوەی فەرموودەی پێشوو.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەمە دووعایەکی بە پیت و پێزە، سوننەتە مسوڵمان بیڵێ لە کاتێک کە خوا فەزڵی پۆشینی پۆشاکێکی نوێی پێ دەبەخشێ، جا کراسێک بێ، یان مێزەرێک، یان کڵاوێک بێ، یاخود جگە لەوانە.

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْباً»، واتە: ئەگەر پۆشاکێکی نوێی پۆشیبا.

کە دەڵێ: «سَمَّاهُ بِاسْمِهِ عِمَامَةً أَوْ قَمِيصاً أَوْ رِدَاءً»، مانای ئەوەیە کاتێ دووعای دەکرد دەیگوت: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا كَسَوْتَنِيهِ»، (واتە: خوایە سوپاس و ستایشی تۆ دەکەم) کە ئەم مێزەرە، یان ئەو کراسە، یان ئەو پۆشاکەت پێ بەخشیم، واتە: ناوی شتەکەی

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٦٧، وأبو داود في السُّنن: ٤٠٢٠.




دەهێناو منەتی خوای لەسەر خۆی ئامادە دەکرد، وەک منەتی خوا ﷻ لەسەر خۆی ئاماژەی پێدەکرد، وە مەبەست ئەوە نیە ناو لە پۆشاکێکی نوێ بنێ، یان ناو لە مێزەرێکی نوێ بنێ.

سەرەتا بە سوپاسکردنی خوا لەسەر ئەو نیعمەتە دەستی پێدەکرد، گومانیشی تێدانیە کە پۆشاک عەورەتی مرۆڤ دادەپۆشێ و، جوانی پێ دەبەخشێ و، دەیرازێنێتەوە، نیعمەتێکی زۆر گەورەو منەتێکی زۆر گەورەی خوایە بەسەر بەندەکان، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴾ الأعراف. (ئەی نەوەی ئادەم بێگومان پۆشاکمان بۆ ناردوون کەعەیب و عەورەتتان دادەپۆشێ وە پۆشاکی جوان و ڕازاوەیش -مان بۆ ناردوون- بەڵام پۆشاکی ترسان لەخوا و پارێزکاری چاکترو باشترە ئەوەی باسکرا هەندێکە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا بۆ ئەوەی بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن).

بۆیە ئەگەر کەسێک پۆشاکێکی نوێ بپۆشێ، وا باشەو سوننەتە لەگەڵ پۆشینی سوپاسی خوا ﷻ بکات، زۆر لە خەڵکی کاتێک پۆشاکێکی نوێ دەپۆشێ دەیبینی بۆ لایەکی دیکە دەڕوات و لە بری سوپاسی خوا، بیری بۆ لای لێهاتووی خۆی دەڕوات، بۆ نموونە: لە دەستخستنی ئەو پۆشاکەدا، یاخود لێهاتووی لە بەدەستهێنان و هەڵبژاردنیدا، یان شارەزایی ئەوەی دروستی کردوەو چنیویەتی، یان جگە لەوە، لەو واتایانەی کە سەرقاڵی دەکات لە سوپاسکردنی خاوەن ئەو نیعمەتەو (کە خوایە ﷻ).

کە دەڵێ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا كَسَوْتَنِيهِ»، واتە: ئەی خوایە! من سوپاسی تۆ دەکەم بۆ ئەو چاکەیەی لەگەڵت کردم، منەتت لەسەر ڕشتم بەم پۆشاک بەخشینە، کە عەورەتم دادەپۆشێ و خۆمی پێ جوان دەکەم و خۆمی پێ دەڕازێنمەوە، وەک لە فەرموودەی قودسیشدا هاتوە، کە خوای بەرز وەک بەبیرهێنانەوەی نیعمەتەکانی خۆی بەسەر بەندەکانی دەفەرموێ: {يَا عِبَادِي! كُلُّكُمْ عَارٍ إلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ}[1]. واتە:

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٥٧٧، من حديث أبي ذر الغفاري ﷺ.




ئەی بەندەکانم! هەر کامێک لە ئێوە ڕووت و بێ پۆشاک دەبێ، مەگەر ئەوەی من بیپۆشم داوای پۆشاکم لێ بکەن، بۆ ئەوەی پۆشاکتان بکەمە بەر.

کە دەڵێ: «أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ»، واتە: داوای چاکەی ئەم پۆشاکەت لێدەکەم، ئەم (خَيْرهُ) تاکی پاڵدراوە (مفرد مضاف)ـە، وە لەلای زانایان ئەوە بنچینەیەکە کە (مفرد مضاف) بۆ گشتاندنە، چونکە ئەم چاکەی بە پۆشاکەوەیە هەر یەک چاکە نیە، بەڵکو چەندان خێری دیکەی تێدایە بۆ وێنە: عەوڕەتی دادەپۆشێ، خۆی پێ جوان دەکات، خۆی پێ دەپارێزێ لە سەرماو گەرما، جگە لەوەش، مرۆڤ سوودی زۆر زیاتریشی لێ دەبینێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هەموو خێرو چاکەکانی کردووە کە بە هۆی پۆشینی ئەم پۆشاکەوە دەست دەکەون.

کە دەڵێ: «وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ»، وشەی (شَرّ) لێرەدا تاکی پاڵدراوە (مفرد مضاف)ـەو بۆ گشتاندنە، وە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە پۆشینی هەندێک پۆشاک خراپە، لە جۆرەکانی خراپی پۆشاک پۆشین ئەوەیە: مرۆڤ پۆشاکێک بپۆشێ لە پێناوی ئەوەی کەوا ناوبانگی پێ پەیدا بکات، یاخود کەشخەو فیزی پێ بکات، یاخود خۆی پێ گەورە بێ، یاخود لەسەر پۆشاکەکەی وێنەیەکی حەڕام و قەدەغەکراو هەبێ، یاخود پۆشاکەکەی تەسک بێ و عەوڕەتی تێدا دەربکەوێ، یاخود بێتە خوار گۆزینگەکانی، هەروەها لەمەدا موحتاجیی و پێویستی بەندەی تێدایە بە خوای گەورە، لە هەموو کاروبارەکانیدا، وە لە هەموو حاڵەتەکانیداو، لە نێویشیان لە پۆشینی پۆشاکدا کە دەیپۆشێ زۆر موحتاجەو پێویستی بە خوایە ﷻ تەنانەت لە پەیداکردنی پۆشاک و، داوای خێرو چاکەکردنی پۆشاک و سوودەکانی و پەناگرتن بە خوا لە خراپەو زیانەکانی.

دەڵێ: ئەگەریش کەسێک موبتەلا بوو بە (إِسْبَال) واتە: شۆڕکردنەوەی پۆشاکی بۆ خوار گۆزینگەکانی، یاخود بە جگە لەویش، لە کارە حەڕامکراوەکان، کە پەیوەستە بە پۆشاک، بیردەکاتەوە لەم دووعایەو تەماشا دەکات چی گرتۆتە نێو خۆی، ئەوە بۆی دەبووە چارەسەریی لەوەی کە تووشی بووە، چونکە پۆشاک باشی و خراپی هەیە، جا بەندە داوالێکراوە، کە داوای چاکەکەی بکات و خۆی بپارێزێ لە خراپەکەی.



پێشەوا ئەبو داوود ﷺ لە سونەنەكەی ئەم فەرموودەی گێڕاوەتەوەو خۆی ئەمەی بۆ زیاد كردوە: {قَالَ أَبُو نَضْرَةَ فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا لَبِسَ أَحَدُهُمْ ثَوْبًا جَدِيدًا قِيلَ لَهُ: تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللَّهُ تَعَالَى}[1]. واتە: ئەبو نەزرە دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر یەكێكیان پۆشاكێكی نوێی پۆشیبا، پێی دەگوترا: كۆنی بكەی و بیدڕێنی و خوای ﷻ هی دیكەت پێ ببەخشێ.

كە دەڵێ: (قِيلَ لَهُ) واتە: كە كەسەكەی دەبینی پێی دەگوت: (تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللَّهُ تَعَالَى) واتە: بەردەوام چێژ ببینی لە تەمەن و لەش ساغیی و سەلامەتیت لەم پۆشاكە نوێیەتدا، هەتا كۆنی دەكەی و دەیدڕێنی، یاخود خوا بۆت قەرەبوو دەكاتەوە، ئەگەر كۆن بوو بە دانەیەكی دیكە، ئەو دووعایە ئەمەی تێدایە كەوا بە ژیانێكی خۆش و باش پێی بژیت، چونكە پۆشاك دوای ماوەیەكی درێژو ڕۆیشتن لە كات كۆن ببێ و، بە كەڵكی لەبەر كردن نەیەت (دووعایەكە بۆ مانەوەی ماوەیەكی درێژە لە ژیانێكی خۆش و بەختەوەرییدا)، وە ئەوەی لێرەدا ئەبو نەزرە باسی كردووەو وێنەی ئەویش بە (مرفوع)ی هاتوە لە صەحیحی بوخاریدا[2] لە فەرموودەی ئوممو خالیدی كچی خالیدی كوڕی سەعیدی كوڕی عاص ﷺ كە گوتوویەتی: {أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِثِيَابٍ فِيهَا خَمِيصَةٌ سَوْدَاءُ، قَالَ: مَنْ تَرَوْنَ نَكْسُوهَا هَذِهِ الْخَمِيصَةَ؟ فَأُسْكِتَ الْقَوْمُ، قَالَ: ائْتُونِي بِأُمِّ خَالِدٍ، فَأُتِيَ بِي النَّبِيُّ ﷺ، فَأَلْبَسَنِيهَا بِيَدِهِ، وَقَالَ أَبْلِي وَأَخْلِقِي}. واتە: قوماشێكیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، جا پارچەیەكیان ئاوریشمی ڕەش بوو، فەرمووی: كە شایەنی ئەم پۆشاكەی پێی بپۆشین (بیكەینە بەری)؟ خەڵكەكەش بێدەنگ بوون، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئوممو خالیدم بۆ بانگ بكەن، ئیتر منیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بە دەستی خۆی پۆشاكەكەی لەبەر كردم (دوعای بۆ كردم و) فەرمووی: (هێندە لەبەری بكەی) تا دەیڕزێنی و دەیدڕێنی.

لەوەدا ڕوونكردنەوە هەیە لەوەی كە دەبێ مسوڵمانان لەسەری بن (لە مامەڵەو گوفتاری جوان) لەگەڵ خوشك و برای دینیان كاتێك یەكێك لەوان جلێكی نوێ لەبەر براكەیدا دەبینێ لە كاتێكدا هەست دەكات بەو شتە دڵە صاف و بێخەوشەكان

---

(١) أخرجه أبو داود: ٥٨٤٥، وصححه الألباني.

(٢) برقم: ٥٥٠٧.

دەورە دراون پێی لە خۆشحاڵ بوون بە شتی چاک و باش بۆ خەڵکی دیکە، هەروەک بەڵگەیە لەسەر سەلامەتی و پاکی ئەو دڵانە بە پێچەوانەی حاڵی ئەو کەسەی دڵەکەی دەورە دراوە بە ئیرەیی و حەسوودیی، یان بوغزو ڕق و کین، ئەو جۆرە کەسە زمانی دەستەوسانە لەوەی کە بتوانێ دووعایەکی هاوشێوەی ئەو دووعایە مەزنە بە سوودە بۆ براکەی بکات بە وێنەی ئەم پاڕانەوە گەورەو بە سوودانە.

بە پێی مانای ئەوە کە ڕابوردو باسکرا، پاداشتێکی زۆر مەزن هەیە بۆ ئەو کەسەی پۆشاکێک بپۆشێ و سوپاس و ستایشی خوا بکات، لەوەی کە حاکیم لە موعازی کوڕی ئەنەس ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: {مَنْ أَكَلَ طَعَامًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ لَبِسَ ثَوْبًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ}[١]. واتە: هەر کەسێک خواردنێک بخوات، بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردنی پێدام لەم ڕۆزیە، بێ تواناو هێزی خۆم، لە گوناهی ڕابردووی دەبووردرێ، وە هەر کەسێک پۆشاکێک بپۆشێ و بڵێ: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەو پۆشاکەی پێ پۆشیم، بێ تواناو هێزی خۆم، لەو گوناهی ڕابردووی دەبووردرێ.

٦٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ أَحَبَّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُهُ الْحِبَرَةُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێک کە زۆر حەزی دەکرد بیپۆشی، پۆشاکی حیبەڕە بوو (لە لۆکە، یان کەتان دروستکرابوو، خەت خەتی سوور، یان ڕەشی تێدابوو)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «الْحِبَرَةُ» لەسەر کێشی (عِنَبَة)یە، پۆشاکێکە لە لۆکە دروست دەکرێ، یاخود لە کەتان، (مَجْرَة) واتە: جوان و ڕازێنراوە، وە وشەی (التَّحبِير) واتە: جوان کردن و ڕازاندنەوە، بۆیە بە هیچ پۆشاکێک ناگوترێ (حِبَرَةُ) مەگەر خەت خەتی جوان و ڕازاندنەوەی تێدا بێ، ئەوەش پەیوەستە بە ڕەنگەوە (یانی: خەت خەتی

---

(١) أخرجه مستدرك الحاكم: ٦٨٧/١، وقال: هذا حديث صحيح على شرط البخاري.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨١٣، ومسلم: ٢٠٧٩، والمصنّف في جامعه: ١٧٨٧.

ڕەنگاوڕەنگ) بۆیە پێشەوا ئیبنو قەییم ﵀ لە کتێبی (الزاد)دا[1] دەڵێ: (وَكَانَ أَحَبُّ أَلْوَانِ الثِّيَابِ إِلَيْهِ ﷺ بَيَاضَ وَالحِبْـرَة). واتە: خۆشەویستترین ڕەنگ لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگی سپی بووە، هەروەها پۆشاکی (حِبَرَة) بووە، یانی: پۆشاکی سپی صاف، وە هەروەها حیبرە کە پۆشاکێکی خەتخەتە بۆ وێنە: ڕەش و سپییە، یاخود ڕەش و سوورە، وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە.

٦٣- عَنْ عَوْنِ بْنِ أَبِي جُحَيْفَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَرِيقِ سَاقَيْهِ» قَالَ سُفْيَانُ: أُرَاهَا حِبَرَةً[2].

واتە: عەونی کوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «پێغەمبەرم ﷺ بینی پۆشاکێکی سوورباوی (سوورو ڕەش)ی پۆشی بوو، وەک ئەوەی سەرنج بدەم و سەیری بریسکەی لاقەکانی بکەم»، سوفیان گوتوویەتی: پێم وابێ پۆشاکەکە، پۆشاکی حیبەڕە بوو.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «حُلَّةٌ حَمْرَاءُ»، بەم پۆشاکە دەگوترێ کە لە دوو پارچە پێکهاتوە، بەشی سەرەوەو بەشی خوارەوە (الحُلَّةُ الحَمْرَاءُ) وەک زانایان گوتوویانە: دوو پۆشاکی یەمەنی خەتخەتن، خەتخەتی سووری تێدایە لەگەڵ ڕەش، جا بۆیە سووریەتیەکەیان تەواو سووری پوخت نیە.

کە دەڵێ: «كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَرِيقِ سَاقَيْهِ»، (البَرِيق): بریتیە لە درەوشاوەیی و بریسکە، وەک پێشتر باسی ئەوە کرا لە وەسفی لاشەی شەریفی ﷺ، وە لێرەشدا ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر گیان ﷺ ئیزارەکەی کورت بووە، وەک ئەبو جوحەیفە بینیویەتی و وەسفی دەکات کە لە ناوەڕاستی لاقەکانیدا بووە، (واتە: شەرواڵەکەی تاوەکو ناوەڕاستی لاقی بووە).

---

(١) ٢٣٨/٤.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٩٧، وأصله في البخاري: ٣٧٦، ومسلم: ٥٠٣.




کە دەڵێ: «قَالَ سُفْيَانُ: أُرَاهَا حِبَرَةً»، یەکێک لە ڕاویەکان کە لەم سەنەدەدا هاتوە سوفیانی سەوریە، وای دەبینێ کە ئەم پۆشاکە سووورباوە (حِبَرَة) بووە کە لەبەر پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، پێشتریش مانای وشەی حیبەڕەمان زانی، کە ئەمە ڕاستە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ڕەنگی سووری صافی نەپۆشیوە، هەروەک چۆن چەندان کەس لە زانایان و ئەهلی عیلم جەختیان لەوە کردۆتەوە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ زۆر بە توندی نەهی لێکردوە، بۆیەش (إبن القيم) ﷺ لە کتێبی (الزاد)دا[1] دەڵێ: هەڵە دەکات ئەو کەسەی گومانی وا دەبات کەوا ڕەنگی سوورێکی صاف بووەو هیچ ڕەنگێکی دیکەی لەگەڵ تێکەڵ نەبووە، چونکە بە دڵنیایی (الحُلَّةُ الحَمْرَاءُ) دوو پۆشاکی یەمەنین چندراون بە خەتخەتی سوور لەگەڵ ڕەش وەک هەموو پۆشاکە یەمەنیەکانی دیکە، کە ئەم پۆشاکە بەمە ناسراوە بەو پێیەی کە خەتی سووری تێدایە، ئەگەر نا سوورێکی صاف نەهی لێکراوە، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو جەمەدانی و عەگالەی کە لە ڕەنگی سپی و سوور دروست دەکرێ نەهی لێکراو نیە لەبەر ئەوەی سوورێکی صاف نیە.

٦٤- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، إِنْ كَانَتْ جُمَّتُهُ لَتَضْرِبُ قَرِيبًا مِنْ مَنْكِبَيْهِ»[2].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: «هیچ کەسێکم نەبینیوە پۆشاکی سووورباوی پۆشی بێ و جوانتر بێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ، لە کاتێکدا پرچی نزیک بوو بکەوێتە سەر شانەکانی».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەو مانایەی پێشترە لە جێگەی مەبەست باسکرا، کە ئەویش لەم وتەیەی بوو کە گوتی: «فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ»، مەبەست لە (حُلَّةٍ حَمْرَاءَ) دوو پۆشاکی یەمەنیە کە خەتخەتی سووریان تێدایە، وە خەتخەتی ڕەشیان تێدایە، بەڵام سووریەکەیان صاف نیە، واتە: صاف سوور نیە.

---

(١) ١٣٧/١.

(٢) انظر: (ح ٤).




٦٥- عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ أَخْضَرَانِ»[١].

واتە: ئەبو ڕیـمسە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەرم ﷺ بینی دوو کراسی خەتداری سەوزی لەبەردا بوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ أَخْضَرَانِ»، سەوزیی لێرەدا مەبەست پێی سەوزیەکی صاف نیە، بەڵکو سەوزێک تێکەڵ بە خەتی ڕەنگی دیکە، ئەگەر صاف سەوز بێ پێی ناگوترێ (بُرْد) چونکە (البرد) لە کاتێکدا وای پێ دەڵێن: کە ڕەنگاو ڕەنگ و خەتـخەتە.

٦٦- عَنْ قَيْلَةَ بِنْتِ مَخْرَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ أَسْمَالُ مُلَيَّتَيْنِ كَانَتَا بِزَعْفَرَانٍ وَقَدْ نَفَضَتْهُ». وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ[٢].

واتە: قەیلەی کچی مەخرەمە ﷺ، دەڵێ: «پێغەمبەرم ﷺ بینی دوو پۆشاکی کۆنی یەک ڕەنگی پۆشیبوو کە هیچ خەت و ڕەنگی دیکەی لەگەڵ نەبوو، بە زەعفەران ڕەنگ کرابوو، کاڵ بوو بۆوە». لە فەرموودەکەدا چیرۆکێکی دوورو درێژ هەیە.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ أَسْمَالُ»، (أسمال) کۆی (سمل)ـە وەک (أسباب) کۆی (سبب)ـە، کە بریتیە لە پۆشاکێکی کۆن.

کە دەڵێ: «مُلَيَّتَيْنِ»، ئەوە (مُثَنَّی)ی (مُلَيَّة)یە، کە بچووکردنەوەیە بۆ (مُلَاءَة) کە بەکاردێ بۆ هەموو پۆشاکێک کە هەندێکی لەگەڵ هەندێکی دیکە نەچنرابێ بە خەتێکی جیاواز لە خۆی، بەڵکو هەمووی بە یەک جۆر چنرابێ (بەو شێوەیە هاتوە لە فەرهەنگ).

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٨١٢، وأبوداود في السُّنن: ٤٠٦٥.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٨١٢، وقد وقع خطأٌ في إسناد المصنّف هنا -يصحّح من الجامع للمصنّف ومن غيره- وهو قوله: «حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حَسَّانَ الْعَنْبَرِيُّ، عَنْ جَدَّتَيْهِ، دُحَيْبَةَ وَعُلَيْبَةَ»، والصّواب: عن جدَّتَيه دَحَيبة وصفيّة، بنتَي عُلَيبة، قال ﷺ في الجامع: «حدَّثنا عبد الله بن حسّان، أنّه حدَّثته جدّتاه صفيّة بنت عُلَيبة، ودُحَيبة بنت عُلَيبة؛ حدَّثتاه عن قَيْلة بنت مخرَمَة».




کە دەڵێ: «كَانَتَا بِزَعْفَرَانٍ»، واتە: ڕەنگکرابوو بە زەعفەران.

کە دەڵێ: «وَقَدْ نَفَضَتْهُ»، واتە: پۆشاکەکە هێندە کۆن ببوو، ڕەنگی زەعفەرانەکەی کاڵ ببووەوە بە جۆرێ تەنها شوێنەوارێکی کەمی پێوە مابوو، پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە پیاوان پۆشاکێک بپۆشن کە بە زەعفەران و وەرس ڕەنگکراوە، بۆیە ئەو پۆشاکە کۆنەش کە پێغەمبەر ﷺ پۆشیوویەتی هەرچی زەعفەران بوو پێوەی نەماوە مەگەر شتێکی زۆر کەم.

کە دەڵێ: «وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ»، دوای هەندێکی دیکە (إنْ شاءَ الله) هەندێک لە زانایانی فەرموودەناس بە دوورو درێژی ئەو بەسەرهاتەیان هێناوەو گێڕاویەتیانەوە لەوانیش پێشەوا (طبراني) لە (المعجم الكبير)[1] کە زۆر سوودو قسەی سەرسوڕهێنەری تێدایە.

٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ بِالْبَيَاضِ مِنَ الثِّيَابِ لِيَلْبِسْهَا أَحْيَاؤُكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ «بۆ پۆشین جل و بەرگی سپی بەکاربێنن، زیندووەکانتان بیپۆشن و، مردووەکانیشتان تێدا کفن بکەن، چونکە (پۆشاکی سپی) لە باشترینی پۆشاکەکانتانە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «عَلَيْكُمْ بِالْبَيَاضِ مِنَ الثِّيَابِ»، واتە: دەستی پێوەبگرن و سوور بن لەسەر پۆشینی جلو بەرگی سپی، ئا لەمەدا هاندان و ئارەزوودانەبەر هەیە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ پۆشینی پۆشاکی سپی، پۆشاکی سپی لە سەرووی هەموو ڕەنگەکانی دیکەوەیە، جا ئەگەر صاف بێ یاخود ڕەنگی دیکەی لەگەڵ بێ، وە هۆکاری فەزڵی ڕەنگی سپی بەسەر ڕەنگەکانیدی (وەک لە فەرموودەی دوای ئەمە دێ) ئەوەیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ»، پاکترین و باشترینە.

---

(١) ١٨٣/١٨.

(٢) انظر: (ح ٥٢).

کە دەڵێ: «لِيَلْبِسْهَا أَحْيَاؤُكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ» پێغەمبەر ﷺ زیندووەکان هان دەدات لەسەر پۆشینی پۆشاکی ڕەنگ سپی، هانی مسوڵمانانیشی داوە لەسەر ئەوەی کەوا مردووەکانیشیان پێ کفن بکەن، وە هەواڵیشی داوە کەوا پۆشاکی سپی لە باشترین جۆری پۆشاکەکانمانە، دیارە کە ئەم هاندانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر پۆشینی پۆشاکی سپی ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە خودی خۆی ﷺ ئەم جۆرە پۆشاکەی پۆشیوە، وە ئەمەش ڕووێکی گەواهیدەرە لە بەشێکی فەرموودەکەدا ئاماژەی پێکراوە، وە لە (الصحيحين)دا هاتوە کە ئەبو زەڕ ﷺ گوتوویەتی: {أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ أَبْيَض}[1]. واتە: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی سپی پۆشی بوو.

٦٨- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَسُوا الْبَيَاضَ؛ فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ»[2].

واتە: سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(پۆشاکی) سپی بپۆشن، بێگومان پاکترین و چاکترینە، وە مردووەکانیشتان تێیدا کفن بکەن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەمەش هاندانی تێدایە لەسەر پۆشینی جلوبەرگی سپی وەک فەرموودەکەی پێش خۆی.

کە دەفەرموێ: «فَإِنَّهَا أَطْهَرُ وَأَطْيَبُ»، واتە: پۆشاکی سپی دوو سیفەتی تێدا کۆدەبێتەوە، ئەوانیش پاکیی و چاکیی، کە ئەمە زۆرباشە کاتێک کە ئەم جۆرە پۆشاکە دەشۆردرێ و پاک دەکرێتەوە پیسیەکانی لێ لادەچێ و صاف و خاوێنیەکەی دەردەکەوێ، وە ئەگەر شتێکی غەیری سپی پێوە بێ وەک چڵک، ڕاستەوخۆ دەردەکەوێ بە پێچەوانەی پۆشاکی دیکە کە جاری وایە ڕەنگە پیس بێ و پێشیەوە دیار نەبێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە دووعایەکانیشیدا ئەو ڕەنگەیی لە نێو ڕەنگەکاندا هەڵبژاردووەو فەرموویەتی:

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٢٧.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٨١٠.

{اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَس}[١]. واتە: خوایە لە هەڵەکان و گوناهەکانم پاکم بکەیەوە وەک چۆن پۆشاکی سپی لە چڵک و پیسی پاک دەکرێتەوە.

٦٩- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ غَدَاةٍ، وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مِنْ شَعَرٍ أَسْوَدَ»[٢].

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانییەکی زوو لە ماڵ چووە دەر، عەبایەکی ڕەشی لە تووک (دروستکراو)ی پۆشی بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «ذَاتَ غَدَاةٍ»، واتە: بەیانیەکی زوو.

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ مِرْطٌ مِنْ شَعَرٍ أَسْوَدَ» واتە: (مِرْط) بە ژێرەی (میم) پۆشاکێکی درێژی فراوانە، خۆی پێ دادەپۆشێ.

٧٠- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَبِسَ جُبَّةً رُومِيَّةً ضَيِّقَةَ الْكُمَّيْنِ[٣].

واتە: عورِوەی کوڕی موغیرەی کوڕی شوعبە رضي الله عنه لە باوکی دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ جوببەیەکی ڕۆمیی پۆشی بوو، سەرقۆڵەکانی تەسک بوون.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر رحمه الله بە فەرموودەی موغیرەی کوڕی شوعبە رضي الله عنه کۆتایی دێنێ بەم بەشە.

کە دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَبِسَ جُبَّةً رُومِيَّةً»، ئەمە دیارە (پۆشاکەکە) پاڵدەداتە لای ڕۆم (کە هی ئەوان بووە)، وە (جُبَّةً): جۆرێکە لە پۆشاک لەسەر کراس لەبەر دەکرێ.

کە دەڵێ: «ضَيِّقَةَ الْكُمَّيْنِ»، (الْكُمَّان): بریتیە لە شوێنی دەست تێوەنان (خستنە نێو) کە تەسک بووە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٧٤٤.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٨١٣، وأخرجه مسلم: ٢٠٨٢ وفيه: «مِرْطٌ مُرَحَّلٌ»، قال النَّووي في شرحه على مسلم: وأمَّا قوله: مرحَّل؛ فهو بفتح الرَّاء، وفتح الحاء المهملة، هذا هو الصَّاب الَّذي رواه الجمهور، وضبطه المتقنون، وحكي القاضي أنَّ بعضهم رواه بالجيم، أي: عليه صور الرِّجال، والصَّواب الأوَّل، ومعناه: عليه صورة رِحَال الإبل، بأس بهذه الصُّور، وإنَّما يحرم تصوير الحيوان، وقال الخطَّابي: المرحَّل الذي فيه خطوط.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٧٤، والمصنّف في جامعه: ١٧٦٨.



ئا بەم شێوەیە لێرەدا دانەر ﷺ کۆتایی دێنێ بەو باسە کە پەیوەستە بە پۆشینی پۆشاکی پێغەمبەر ﷺ، وە تێبینی ئەوە دەکرێ لە هێنانی کۆمەڵێک فەرموودەی جیاواز لەم بەشەدا کە دانەر ئاماژەی پێ کردن، پێغەمبەر ﷺ تێیاندا گۆڕانکاریی کردووە لە پۆشینی پۆشاکەکانی، کە پۆشاکی دوو پارچەی پۆشیوە، پۆشاکی یەک پارچەی پۆشیوە، کراسی پۆشیوە، هەروەها چەندان جۆری دیکەی پۆشاکی پۆشیوە، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کارەکە فراوانە، بنچینە تێیدا حەڵاڵییە، مادام بەڵگەی حەرامیەتی لەسەر نەبێ، بۆ وێنە: سەبارەت بە پیاوان دەبێ پۆشاکەکە (إِسْبَال) نەبێ، واتە: لە خوار گۆزینگیانەوە نەیەتە خوار، یان پۆشاکی ناوبانگ و کەشخەو فیزکردن نەبێ، یاخود ئاوریشم (حرير) نەبێ، یاخود لە جۆری ڕەنگکراو بە زەرد (معصفر) نەبێ، یاخود پۆشاکێک نەبێ کە کافران بیپۆشن و بەوە لە مسوڵمانان جیابکرێنەوە کە ئەو کاتە قەدەغەو حەرامە، بەڵام ئەوەی کە شەرع حەرامی نەکردوە، بنچینە تێیدا حەڵاڵییە، وەک خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأعراف. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بڵێ کێ ڕازاندنەوەو جوانی و -نازو نیعمەتە- خواییەکانی حەڕام کردووە کە خوا بۆ بەندەکانی دروستی کردووە هەروەها ڕۆزی و خۆراکە پاک و خۆشەکان -کێ حەڕامی کردوون-).

خوا لێرەدا قەدەغەی کردووە (غەیری خۆی) هەڵسێ بە قەدەغەکردنی جۆری پۆشاکەکان و خواردنەکان و خواردنەوەکان کە بۆ بەندەکانی ڕەخساندوون و حەڵاڵی کردوون، وەک نیعمەت و منەتی خۆی بەسەریانەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە بنچینەدا شتەکان حەڵاڵن، هەتا ئەو کاتەی بەڵگەیەکی شەرعی دێ حەڕام و قەدەغەی دەکات دەچێتە ژێر ئەو بنچینەیە.

وە دەچێتەوە نێو ئەو بنچینەی تەواوی ئەو پۆشاکانەی مرۆڤەکان دەیپۆشن لە هەر جۆرێک بێ، شتێکی ڕێگاپێدراوە، شەرعیش هیچ شتێکی حەڕام نەکردوە، مەگەر شتانێکی تایبەتی نەبێ کە دەگەڕێتەوە بۆ لادان و دوورخستنەوە مسوڵمان لە ڕێگای ڕاست، وە زیان بە پاراستنی دین و دونیای دەگەیەنێ.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي عَيْشِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

دانەر ﷫ ئەو بەشەی بۆ ڕوونکردنەوەی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، تەرخان کردوە، مەبەستیش لە وشەی (العيش): بریتیە لە خواردنی ڕۆزی، کە مرۆڤ پێی دەژیێ، یاخود پێی دەگوزەرێنێ، جا دانەر لەم بەشەدا دوو فەرموودەی هێناوە بەڵام دواتر دەگەڕێتەوە سەر ئەم بابەتەو زۆر بە فراوانی باسی ئەو فەرموودانە دەکات کە پەیوەستن بەم بابەتە، پێغەمبەر ﷺ بژێوو خواردن و ڕۆزیەکەی زۆر کەم بووەو ڕازیش بووە بەوەی خوا ﷻ پێیداوە، لە (الصحيحين)دا[١] هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {اللَّهُمَّ ارْزُقْ آلَ مُحَمَّدٍ قُوتاً}. واتە: خوایە ڕزقی بنەماڵەی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بای ئەوەندە بێ کە تێریان بکات، (قُوت): ئەوەیە ئەوەندە خۆراک هەبێ پێی بژیێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دونیای بە کەم دەهاتە پێش چاوو، واش تەماشای دەکرد، تەنها ئەوەندەی دەویست پێی بژیێ.

٧١- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَشَّقَانِ مِنْ كَتَّانٍ، فَتَمَخَّطَ فِي أَحَدِهِمَا، فَقَالَ: «بَخٍ بَخٍ يَتَمَخَّطُ أَبُو هُرَيْرَةَ فِي الْكَتَّانِ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لَأَخِرُّ فِيمَا بَيْنَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَحُجْرَةِ عَائِشَةَ ﷺ، مَغْشِيّاً عَلَيَّ فَيَجِيءُ الْجَائِي فَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى عُنُقِي يَرَى أَنَّ بِي جُنُوناً، وَمَا بِي جُنُونٌ، وَمَا هُوَ إِلَّا الْجُوعُ»[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: لە لای ئەبو هوڕەیرە ﷺ بووین، دوو پۆشاکی لە کەتانی پۆشی بوون، بە ڕەنگێکی سووری وەک ڕەنگی قوڕی سوور ڕەنگ کرابوون، جا لووتی بە یەکێک لەو پۆشاکانە پاک کردەوە، گوتی: «بەخ، بەخ، (وشەیەکە بۆ سەرسووڕمان بەکاردێ) وای لێهاتوە ئەبو هوڕەیرە لوتی بە کەتان بسڕێتەوە، سوێند بە خوا منتان بینیبایە کە چۆن دەکەوتم لە نێوان مینبەری پێغەمبەری خوا و ﷺ ژووری عائیشە ﷺ بە هۆی برسیەتیەوە بە شێوەیەکی وا لە هۆش خۆم چوو بووم، جا (جاری وا بوو) کەسێک دەهات قاچی لەسەر ملم دادەنا وای دەزانی شێتم، بەڵام شێت نەبووم، بەڵکو بە هۆی برسیەتیەوە بوو (وام لێهاتبوو)».

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٤٦٠، ومسلم: ١٠٥٥ من حديث أبي هريرة ﷺ.

(٢) أخرجه البخاري: ٧٣٢٤، والمصنّف في جامعه: ٢٣٦٧.



**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَشَّقَانِ»، واتە: ڕەنگاو ڕەنگ بوو، خەتخەتی تێدا بوو.

کە دەڵێ: «بَخٍ بَخٍ يَتَمَخَّطُ أَبُو هُرَيْرَةَ فِي الْكَتَّانِ» ئەبو هورەیرە ﷺ باسی حاڵی ڕابردووی خۆی دەکات و بەراوردی دەکات بە حاڵی ئێستای کە تێیدایە، کە ئەو ڕۆژێک لە ڕۆژان بە هۆی زۆر برسیەتیەوە شتێک نەبووە بیخوات، وە پێداویستی لاشەی خۆی پێ جێبەجێ بکات تا ئەندازەی ئەوەی بە هۆی زۆری برسیەتیەوە پێچی داوە تا لە هۆش خۆی چووە، ئەگەر کەسێک بینیبای وایدەزانی ئەو کەسێکە شێت بووەو تێکچووە، کەچی جگە لە برسیەتی هیچ هۆکارێکی دیکە نەبوو بۆ ئەو حاڵەتەی کە بەسەری هاتوە، کەچی ئەمڕۆش پۆشاکی کەتانی پۆشیوەو لووتی پێ دەسڕێ.

جا دیارە دانەر ﷺ ئەم شوێنەوار (الأثر)ـەی هێناوە لێرەدا، بۆ ئەوەی حاڵ و گوزەرانی هاوەڵانی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ڕوون بکاتەوەو، لە دوایشدا فەرموودەی تریش دێنێ بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە، کە جاری وابووە یەکێکیان واتە: یەکێک لە هاوەڵان لە برسان بەردێکی لە سکی خۆی بەستوە، یاخود گەڵای داریان خواردوە، بە هۆی ئەوەی برسیەتی تینی بۆ هێناون.

٧٢- عَنْ مَالِكِ بْنِ دِينَارٍ ﷺ قَالَ: «مَا شَبِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ خُبْزٍ قَطُّ وَلَا لَحْمٍ، إِلَّا عَلَى ضَفَفٍ»، قَالَ مَالِكٌ: سَأَلْتُ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ: مَا الضَّفَفُ؟ قَالَ: «أَنْ يَتَنَاوَلَ مَعَ النَّاسِ»[1].

واتە: مالیکی کوڕی دینار ﷺ دەڵێ: «هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ تێر نان و تێر گۆشتی نەخواردوە، مەگەر لەو کاتانەی کە لەگەڵ خەڵکی نانی خواردبێ»، جا مالیک گوتوویەتی: پرسیارم کرد لە پیاوێکی خەڵکی بیاباننشین دەربارەی وشەی (ضَفَف)؟ گوتی: «لەگەڵ خەڵک خواردن بخوات».

---

(١) أخرجه وهو مرسل، وسيأتي موصولًا في (بَابُ مَا جَاءَ فِي عَيْشِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) الآتي.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

که دەڵێ: «مَا شَبِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ خُبْزٍ قَطُّ وَلَا لَحْمٍ، إِلَّا عَلَى ضَفَفٍ»، واته: جگه لەم کاتەدا، وه دەربارەی مانای وشەی (ضَفَف) دەڵێ: مالیکی کوڕی دینار رضي الله عنه گوتوویەتی: پرسیارم کرد له پیاوێکی دەشتەکی ئایا (ضَفَف) چیه؟ گوتی: نان خواردنه لەگەڵ خەڵکی دیکه، دوایش لەم بەشەدا دانەر رحمه الله بابەتێک دێنێ که ئاماژە بەوە دەکات له مامۆستایەکەی ڕیوایەتی کردوه، عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان که گوتوویەتی: هەندێک گوتوویانه: (ضَفَف) واته: زۆر دەست کۆببێتەوه لەسەر نان خواردن، دیاره زۆری دەستەکانیش لەسەر سفرەو نان خواردن، بەرەکەتی خواردنەکە زیاد دەکات، پێشەوا ئەحمەد رحمه الله دەڵێ: {إِذَا جمع الطَّعَامُ أَرْبَعًا، فَقَدْ كَمُلَ: إِذَا ذكر اسْم اللَّهِ فِي أَوَّلِهِ، وَحَمِد اللهُ فِي آخِرِهِ وَكَثُرت عَلَيْهِ الأَيْدِي، وَكَانَ مِنْ حِلٍ}[1]. واته: ئەگەر له خواردندا چوار شت هەبوو ئەوه تەواوه: ئەگەر ناوی خوا له سەرەتاکەیدا بگوترێ، سوپاسی خوا له کۆتاییەکەیدا بگوترێ، خەڵکێکی زۆری بۆ کۆببێتەوەو خواردنەکەش حەڵاڵ بێت.

---

(١) الزّاد: ٢١٣/٤.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی خوففی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي خُفِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.



وشەی: (خوف) بە (خفاف) کۆدەکرێتەوە، کە شتێکی ناسراوەو زانراوە، لە پێست دروست دەکرێ، کاتێک لە پێ دەکرێ هەموو پێ دادەپۆشێ، جا دانەر ﷀ ئەم بەشەی داناوەو تایبەتی کردووە بە ڕوونکردنەوەی هەرچی پەیوەندی هەیە بە خوففی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی سیفەتی و چۆنیەتی و، شێوەو، وێنەی ئەوانە.

٧٣- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى لِلنَّبِيِّ ﷺ خُفَّيْنِ أَسْوَدَيْنِ سَاذَجَيْنِ، «فَلَبِسَهُمَا ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا»[1].

واتە: ئیبنو بورەیدە لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە: نەجاشی دوو خوففی ڕەشی سادەی بە دیاری ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ، «(پێغەمبەریش ﷺ) لە پێی کردن، پاشان دەستنوێژی شۆردو، دەستی بەسەر خوففەکاندا هێنا (واتە: لە کاتی پێ شۆردن، خوففەکانی لە پێ دانەکەند)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَنَّ النَّجَاشِيَّ» وشەی (نجَاشِي) نازناوی پادشای حەبەشەیە، بەڵام ناوی ڕاستی و تەواوی ئەو پادشا دیاری کراوە ئەصحەمەیە، کە بڕوای هێنا بە پێغەمبەر ﷺ، وە هاتە نێو ئاینی ئیسلامِ و لەسەر مسوڵمانیەتیش مرد، بۆیەش کاتێ کە وەفاتی کرد ﷺ پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ نوێژی مردووی بە غائیب لەسەر کرد.

جا دەڵێ: «أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى لِلنَّبِيِّ ﷺ خُفَّيْنِ أَسْوَدَيْنِ سَاذَجَيْنِ»، دوو خوففی ڕەشی بە دیاری بۆ نارد (واتە: ڕەنگیان ڕەش بوو). (سَاذَجَيْنِ) واتە: نەخشێنراو نەبوون، مووشیان لەسەر نەبوون.

کە دەڵێ: «فَلَبِسَهُمَا»، ئەو (ف)یە بۆ (عطف)ـە یانی: ڕاستەوخۆ لە پێی کردن، ئەوەش لوتفی خۆشەویست ﷺ دەگەیەنێ لە وەرگرتنی دیاریەکە، وە پەلە کردن لە سوود وەرگرتنی لێی بۆ خۆشحاڵ کردنی ئەو کەسەی دیاریەکەی بۆ ناردوە.

کە دەڵێ: «ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا»، لەبارەی مەسح کردن و دەستهێنان بەسەر خوف

---

(١) أخرجه والمصنِّف في جامعه: ٢٨٢٠، وأبو داود في السُنن: ١٥٥، وابن ماجه في السُنن: ٥٤٩، وفي إسناده: دَلْهَم بن صالحِ/ وهو ضعيفٌ، وفيه أيضًا حُجَير بن عبد الله وهو مقبول.



(لە کاتی دەستنوێژ شۆردندا) فەرموودەکانی لەوبارەوە هاتوون (متواتر)ن، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ (واتە: هێندە زۆرن بواری نەهێشتۆتەوە بۆ ئێمەومانان کەوا بڕوای پێ نەکەین).

٧٤- عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: قَالَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ ﷺ: «أَهْدَى دِحْيَةُ لِلنَّبِيِّ ﷺ خُفَّيْنِ، فَلَبِسَهُمَا». وَقَالَ إِسْرَائِيلُ: عَنْ جَابِرٍ، عَنْ عَامِرٍ «وَجُبَّةً فَلَبِسَهُمَا حَتَّى تَخَرَّقَا» لَا يَدْرِي النَّبِيُّ ﷺ أَذِكِيٌّ هُمَا أَمْ لَا. قَالَ أَبُو عِيسَى: وَأَبُو إِسْحَاقَ هَذَا هُوَ أَبُو إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيُّ، وَاسْمُهُ سُلَيْمَانُ[1].

واتە: شەعبی دەڵێ: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ گوتی: «دیحیە دوو خوففی کردنە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، (ئەویش ﷺ) لە پێی کردن». وە ئیسرائیل (یەکێکە لە ڕاویەکان) دەڵێ: جابر لە عامیرەوە گێڕاویەتیەوە: «وە جوببەیەکیش (ی کردە دیاری)، (پێغەمبەر ﷺ) هەردووکیانی پۆشی هەتا کۆن بوون و دڕان»، پێغەمبەر ﷺ نەیدەزانی ئەوەی پۆشیویەتی هی ئاژەڵی مردارەوە بووی خۆشکراوە، یان هی ئاژەڵی زیندووی خۆشکراوە. ئەبو عیسا (واتە: پێشەوا الترمذي ﷺ) دەڵێ: ئەبو ئیسحاق (کە لە سەنەدەکەدا هاتوە) ئەبو ئیسحاقی شەیبانییە، ناوی سولەیمانە.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَهْدَى دِحْيَةُ لِلنَّبِيِّ ﷺ خُفَّيْنِ»، واتە: دیحیە جووتێک خوففی کردە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، دیحیەی کەلبی ﷺ لە جوانترینی نێو هاوەڵان بوو، وە جاری وابوو کە جوبریل دەهات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەسەر شێوەی ئەو دەهات، (فَلَبِسَهُمَا) ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ دیاریی قبووڵ دەکردو پەلەی دەکرد لە سوودبینین لێی بە خۆشی و، خۆشحاڵی خستنە دڵی ئەو کەسەی دیاریەکەی بۆ ناردوە، وەک پێشتریش باسکرا.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٧٦٩. وقوله: «وَقَالَ إِسْرَائِيلُ: عَنْ جَابِرٍ...» أراد ﷺ أن يشير إلى أنّ الحديث جاء من طريقين: من طريقِ أبِي إسحاق؛ وعرّف به المصنّف فقال: «وَأَبُو إِسْحَاقَ هَذَا هُوَ أَبُو إِسْحَاقَ الشَّيْبَانِيُّ، وَاسْمُهُ سُلَيْمَانُ».
وَمِنْ طَرِيقِ جابر؛ وهو ابن يزيد الجعفي، ضعيفٌ جدًا، وفي طريقه زيادة: «وَجُبَّةٌ فَلَبِسَهُمَا حَتَّى تَخَرَّقَا لايَدْرِي النَّبِيُّ ﷺ أذَكِيٌّ هُمَا أَمْ لَا»، يَعْنِي: أَنَّ دحية ﷺ أهدى للنَّبِيِّ ﷺ خُفَّين وجبّةً فلبسهما النَّبيُّ ﷺ وهو لايدري هل هو متَّخذٌ من حيوانٍ مذبوحٍ بتذكيةٍ شرعيّةٍ أم لا، وهذه الزِّيادة غير ثابتةٍ، ولم تأت في الطَّريق الأولى الصَّحيحة.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ



ابُ مَا جَاءَ فِي نَعْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




نَعْل: واتە: پێڵاو، کە پێ دەپارێزێ لە زەرەرو زیان لە کاتی ڕۆیشتن لەسەر زەویدا، دانەر ﷺ ئەم بەشەی تایبەت کردووە بە ڕوونکردنەوەی شێوەو چۆنیەتی پێڵاوی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها ڕێبازو سوننەتی لە لەپێ کردنی.

وە هەمان شت لەم بەشەدا دەگوترێ وەک پێشتر لە بارەی پۆشینی پۆشاک باسکرا، بەوەی کە مرۆڤ هەرچی پێی خۆشە بیپۆشێ، لە مێزەرو کراس و پۆشاک و نەعل و پێڵاو، مادام نەهی لێ نەکرابێ لە ڕووی شەرعەوە، چونکە لە ڕاستیدا پێڵاو لە پێ دەکرێ لە هەموو ڕۆژگارێک لەگەڵ جیاوازی شێوەی دروستکرانیدا بە پێی باو و عورفی خەڵک و هۆگر بوونیان پێی، بنچینە لە هەموو ئەو شتانەدا ڕەوایەتییە، هەتا بەڵگەیەکی شەرعی دێ لەسەر حەڕام کردنیان.

٧٥- عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: كَيْفَ كَانَ نَعْلُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «لَهُمَا قِبَالَانِ»[1].

واتە: قەتادە دەڵێ: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ گوت: ئایا نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ گوتی: «دوو پەت و قەیتانی هەبوون».

تێبینی: (زانایان باسی هەردوو پەتیان کردوە، یەکێکیان: لە نێوان پەنجە گەورەکەی و، ئەوەی تەنیشتی بوو، ئەویتریان: لە نێوان پەنجەی ناوەڕاست و پەنجەی تەنیشت پەنجە گەورە بووە).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَهُمَا قِبَالَانِ» واتە: بۆ هەر تاکە نەعلێک، یان پێڵاوێک، دوو پەت و قەیتانی هەبوو، شوێنی خستنە پەنجەی بوو (واتە: پەنجەکانی پێی دەخستنە ئەو شوێنانە)، (قِبَالَانِ) (مُثَنَّى)ی (قِبَال)ـە، ئەویش بریتیە لەو پەتەی کە بڵاوی لە نێوان پەنجەکاندا ناهێڵێ و پێکەوەیان گرێ دەدات و تووندو تۆڵیان دەکات، واتە: هەر تاکە نەعلێک شوێن پەنجەی پێی هەبووە کە ئەوە یارمەتی مرۆڤ دەدات لەسەر ئاسوودە بوون لە کاتی ڕۆیشتن و جێگیر بوونی پێی لە نێو پێڵاودا.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٥٧، والمصنّف في جامعه: ١٧٧٢.



٧٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: «كَانَ لِنَعْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَالَانِ مَثْنِيٌّ شِرَاكُهُمَا»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ نەعلەکانی دوو پەتی هەبوون، وە پێبەستە (قەیتانەکان)ی کراوە بوون».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «مَثْنِيٌّ شِرَاكُهُمَا» (الشِّرَاك): بریتیە لە قەیتانێکی نەعل، کە بەستەرەوەیەتی، واتە: نەعلی پێغەمبەر ﷺ گیرەو جڵەوی هەبووە کە دوو پەتی پێوە بووە. «»

٧٧- عَنْ عِيسَى بْن طَهْمَانَ قَالَ: «أَخْرَجَ إِلَيْنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رضي الله عنه نَعْلَيْنِ جَرْدَاوَيْنِ لَهُمَا قِبَالَانِ»، قَالَ: فَحَدَّثَنِي ثَابِتٌ بَعْدُ عَنْ أَنَسٍ أَنَّهُمَا كَانَتَا نَعْلَيِ النَّبِيِّ ﷺ[2].

واتە: عیسای کوڕی تەهمان دەڵێ: «ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دوو نەعلی سادەو بێ تووکی بۆ دەرهێناین، دوو گیرەی هەبوون»، دەڵێ: «دوایی» سابیت لە ئەنەسەوە رضي الله عنه بۆی گێڕامەوەو گوتی: ئەو نەعلانە هی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «جَرْدَاوَيْنِ» واتە: هیچ مووی بەسەرەوە نەبوو، دەگوترێ: (أَرْضٌ جَرْدَاءُ) یانی: هیچ ڕووەکێکی لەسەر نیە، واتە: زەوییەک کە هیچ ڕووەکێکی لەسەر نیە.

کە دەڵێ: «فَحَدَّثَنِي ثَابِتٌ بَعْدُ عَنْ أَنَسٍ أَنَّهُمَا كَانَتَا نَعْلَيِ النَّبِيِّ ﷺ»، دیارە کە ئەنەس رضي الله عنه خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، ئەم جووتە نەعلەی پێغەمبەری ﷺ لە ماڵی خۆی لە لا بووەو پاراستوونی و دەریهێناوە، تەماشا ئەوەی دێ بکرێ لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەربارەی تەبەڕووک کردن بە شوێنەوارو کەلوپەل و شوێنەواری پێغەمبەر ﷺ کە لە لاشەی موبارەکی جیابۆتەوە وەک تاڵە مووەکان، وە ئەوەی بەر لاشەی کەوتووە وەک: پێڵاو.

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السُّنن: ٣٦١٤.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨٥٨ بغير لفظ: «جَرداوَين».





٧٨- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ، أَنَّهُ قَالَ لِابْنِ عُمَرَ ﵄: رَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، قَالَ: «إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ، وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا»[1].

واتە: عوبەیدی کوڕی جورەیج دەگێڕێتەوە: ئەو بە ئیبنو عومەری ﵄ گوتوە: دەتبینم نەعلی (دروستکراو لە) پێستی مانگای (بێ موو) دەکەیتە پێت؟! (ئەویش) گوتی: «من بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ نەعلی بێ مووی لە پێ دەکردن، وە دەستنوێژی دەشۆردو لە پێیدابوون، (بۆیە) منیش پێم خۆشەو حەز دەکەم (ئەو جۆرە نەعلە) لە پێ بکەم».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «رَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ»، (السِّبْتِيَّةَ): نسبەتە بۆ (سِبْت) کە بریتیە لە پێستەی خۆشکراوی مانگا، کە پێی دەگوترێ: (سِبْتِيَّةَ) لەبەر ئەوەی هەرچی موو هەیە لەسەری لابراوە، بە هۆی خۆشکردنەوە، جا (نِعَالَ السِّبْتِيَّةَ): بریتیە لەو نەعلانەی کە دروستکراوە لە پێستەی خۆشکراوی مانگا، کە هیچ تاڵە مووەکی لەسەر نەماوە.

کە دەڵێ: «إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ»، مەبەست لێی ئەوە واتای نەعل و پێڵاوی (سِبْت)یە، کە پێشتر باسمان کرد، ئەو نەعل و پێڵاوانە کە ئەگەر لە پێستی ئاژەڵ دروست بکرێ، جاری وایە بە تەواوی مووەکانی لەسەر ماوە، جاری واش هەیە کەمێکی لەسەر ماوە، جاری واش هەیە هەموو مووەکەی لەسەر لابردراوە، جا ئەو کاتە وەسف دەکرێ کە نەعلێکی بێ مووەو ئا ئەوە پێی دەگوترێ: (سبْتِيَّةَ).

کە دەڵێ: «وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا»، دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی هەڵگرتبێ، وە ئەم نەعلەی دانەکەندبێ، یاخود کە دەستنوێژی هەڵگرتوە، پاشان نەعلەکانی لە پێ کردوون، پێیەکانی تەڕ بوونە بە هۆی شوێنەواری ئاوی دەستنوێژەوە.

کە دەڵێ: «فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا»، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ پێی خۆش بووە هەمان نەعل لە پێ بکات، چونکە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە کە لە پێی کردوون.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٥١، ومسلم: ١١٨٧، وفيه قصَّة.

٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: «كَانَ لِنَعْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَالَانِ».

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: «نەعلەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو گیرەو پەت و قەیتانی هەبوون».

ئەم فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﷺ هەمان مانای فەرموودەی ئەنەس و ئیبنو عەبباسە ﷺ (کە لە ڕابردوو باسکرا).

٨٠- عَنِ السُّدِّيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي مَنْ سَمِعَ عَمْرَو بْنَ حُرَيْثٍ ﷺ يَقُولُ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي نَعْلَيْنِ مَخْصُوفَتَيْنِ»[١].

واتە: سودیی دەڵێ: ئەو کەسە کە گوێی لە عەمڕی کوڕی حورەیس بوو ﷺ بۆی باسکردم، دەیگوت: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی بە دوو نەعلی پینەکراوەوە نوێژی ئەنجام دەدا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مَخْصُوفَتَيْنِ»، یانی: دووراو، (خصف): بریتیە لەوەی شتێک پاڵبدرێتە لای شتێک، کە دەگوترێ: (خصف النّعْل) یانی: هەندێکی بە هەندێکی دیکەی پەیوەست بکرێتەوەو، پێکەوە بدوورێن، جا پێغەمبەر ﷺ نەعلی خۆی (ئەگەر دڕابا) بە دەستی خۆی چاکی دەکردنەوە، هەروەک لە (المسند)دا هاتوە لە فەرموودەی دایکمان عائیشە ﷺ کاتێک پێی گوترا: {مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ ؟ قَالَتْ : كَمَا يَصْنَعُ أَحَدُكُمْ ؛ يَخْصِفُ نَعْلَهُ وَيُرَقِّعُ ثَوْبَهُ}[٢]. واتە: ئایا پێغەمبەر ﷺ چ ئیش و کارێک دەکات لە ماڵەکەی؟ ئەویش گوتی: هەر وەک یەکێک لە ئێوە وایە، نەعلەکانی خۆی چاک دەکاتەوەو، پۆشاکەکانی خۆی دەدورێتەوەو، پینەی دەکاتەوە.

وە لەو فەرموودەدا هەیە کە نوێژی کردووە ﷺ بە نەعلەکانیەوە ئەوەش بە جێگیری لێیەوە چەسپاوە، هەم لە سوننەتی گوفتاریەو، هەم لە سوننەتی کرداری (واتە: هەم

---

(١) أخرجه النسائي في السُنن الكبرى: ٩٧١٩، وفي إسناده من لم يُسمَّ وهو الرّوي عن عمرو، لكن جاء ما يقوِّيه عند الإمام أحمد ﷺ في المسند: ٢٠٥٨٧ وغيره.

(٢) مسند الإمام أحمد: ٢٤٧٤٩.




فەرمانی کردووە بە نەعلەوە نوێژ بکرێ، هەم خۆی بە نەعلەوە نوێژی کردوە) هیچ کێشەیەک لە دروستیەتی نوێژکردن بە پێڵاوەوە نیە مادام هەموو زەویەکە خۆڵێکی پاک بێ، یاخود نوێژەکە لە بیاباندا بکرێ، بەڵام دوای ئەوەی مزگەوتەکان فەرش و ڕایەخی بایەخدارو گرانبەهای تێدا ڕاخراوە بە زۆریی، پێویستە ئەو کەسەی دەچێتە مزگەوتەوە نەعلەکانی دابکەنێ و ڕەچاوی پاک و خاوێن ڕاگرتنی ڕایەخەکان بکات، وەک ڕێگریەک لە ئەزیەتدانی نوێژخوێنان کە بە هۆی ئەو پیسیەی بەژێرەوەی نەعل و پێڵاوەوە نووساوە زیانیان پێبگات هەرچەندە پێڵاوەکە خاوێنیش بێ[1].

٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَمْشِيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ، لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعاً أَوْ لِيُحْفِهِمَا جَمِيعاً»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هیچ یەکێکتان بە تاکە نەعلێکەوە بە ڕێگادا نەڕوات، یان هەردوو تاکەکەی لە پێ بکات، یانیش هەردووتاک دابکەنێ».

٨٢- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ أَبِي الزِّنَادِ نَحْوَهُ.

واتە: (پێشەوا الترمذي ﷺ) دەڵێ: قوتەیبە بۆی گێڕاینەوە، لە مالیکی کوڕی ئەنەس، ئەویش لە ئەبو زیناد، وێنەی هەمان فەرموودە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ کۆتایی هێنا بەوەی پەیوەندی هەبوو بە سیفەت و شێوەی نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە دەستی کرد بە باسکردنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە لەپێکردنی نەعلدا، جا بۆیە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەی ﷺ هێنا، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لَا يَمْشِيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ»، واتە: پێیەکی نەعلی لە پێ بێ، پێیەکەی دیکەی ڕووت پێخواس بێ، نەعلی لە پێ نەبێ.

کە دەڵێ: «لِيُنْعِلْهُمَا جَمِيعاً أَوْ لِيُحْفِهِمَا جَمِيعاً»، واتە: یان بە شێوەیەک بێ کە هەردوو

---

(١) فتاوى اللَّجنة الدَّائمة: ٦/٢١٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨٥٥، ومسلم: ٢٠٩٧، والترمذي في جامعه: ١٧٧٤.





نەعلی لە پێ بن، یاخود بە پێی خواسی بڕوات، بەڵام بە شێوەیەک کە نەعلێکی لە پێ بن و یەکێکی لە پێ نەبن ئەوە نەهی لێکراوە، پێغەمبەر ﷺ نەهی لێکردوە، وە دیارترین شتێک لە حیکمەتی ئەو نەهی کردنەش ڕوونکراوەتەوەو باسکراوە، دوو هۆکارن:

**یەکەم**: دەگوترێ: بۆ ئەوەی ئەمە خۆچوواندن نەبێ بە شەیتان، بۆیەش لە هەندێک گێڕانەوەی دیکەدا هاتوە کە ئەم زیادەیەی تێدایە: {إِنَّ الشَّيْطَانَ يَـمْشِي بِالنَّعْلِ الوَاحِدَةِ}[1]. واتە: چونکە شەیتان بە یەک تاکە نەعلەوە دەڕوات.

**دووەم**: تاوەکو نەبێتە ستەم لە جەستە، شەریعەت فەرمان بە مرۆڤ دەکات دادگەر بێت، هەتا لەگەڵ جەستەی خودی خۆشیدا، جا ئەگەر بە یەک نەعل ڕۆیشت بە ڕێگاداو پێیەکەی دیکەی ڕووت بوو، ئەگەر سەر زەویەکە گەرم، یان سارد بوو، ئەوە ستەمە لە پێیە ڕووتەکە، شەریعەت هاتوە نەهی بکات لەو ستەم کردنە.

جا (إبن القيم) ﷺ لە کتێبی: (تحفة المودود بأحكام المولود)[2] لە مامۆستاکەی خۆی کە ئیبنو تەیمییەیە ﷺ قسەیەکی زۆر ناوازەو جوانی هێناوە لەوبارەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە (القزع): بریتیە لەوەی کە بەشێکی پرچی منداڵ بتاشرێ و، بەشەکەی دیکەی بهێڵدرێتەوە، دەڵێ: (مامۆستامان دەیگوت: ئەوە لە تەواوی خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ بۆ دادگەریی (العدل)، چونکە ئەوە فەرمان کردنە بە کارێکی باش بۆ مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆی کە نەهی کردووە لەوەی بەشێکی پرچی بتاشێ و هەندێکی دیکەیشی بهێڵێتەوە، چونکە ئەوە ستەمە لە سەر دەکرێ کە هەندێکی داپۆشراو بێ و، هەندێکی ڕووت بێ، هەروەک چۆن نەهی کردووە لە دانیشتن لە نێوان ڕۆژو سێبەردا، چونکە ئەوە ستەم کردنە لە هەندێکی جەستەو، هەروەها نەهی کردووە لە ڕۆیشتن بە یەک تاکە نەعل و پێڵاو، بەڵکو یان دەبێ هەردووکی لە پێ بکات، یاخود هەردووکی دابکەنێ).

دەگێڕنەوە: یەکێک پرسیار دەکات لە شێخ (ابن باز) ﷺ کە گوتوویەتی: ئایا ئەگەر تاکە نەعلەکەی دیکەم، هەنگاوێک، یان چەند هەنگاوێک لێم دوور بێ، بە تاکە

---

(١) شرح مكل الآثار للطحاوي: ٣٨٦/٣، عن اللَّيث بن سعد، عن جعفر بن ربيعة، عن عبد الرَّحمن الأعرج، عن أبي هريرة، وقد تفرَّد بها جعفرٌ، وللحديث طرقٌ عديدةٌ ليس فيها هذا الزِّيادة.

(٢) ١٠٠/١.

نەعلەیەک بۆی بچم؟ ئەویش لە وەڵامدا گوتوویەتی: گەر توانیت بە یەک دوو هەنگاویش سەرپێچی سوننەت نەکەی، ئەوە ئەو سەرپێچیە ئەنجام مەدە.

٨٣- عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يَأْكُلَ، يَعْنِي الرَّجُلَ، بِشِمَالِهِ، أَوْ يَمْشِيَ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ[١].

واتە: جابر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە مسوڵمان بە دەستی چەپ خواردن بخوات، هەروەها (نەهی کردوە) بە تاکە نەعلێک بە ڕێگادا بڕوات.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «يَعْنِي الرَّجُلَ»، ئەمە بە مانای ئەوە نایەت کە تایبەت بێ بە پیاوان، بەڵکو باسی پیاوان دەکرێ زۆرجار لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە زۆری ئەوانی دواندوەو، پەیامەکانی ئاڕاستەی وان کردوون (ئەوان لە کۆڕو مەجلیسی ئەو دانیشتوون)، ئەگەر نا ئەوەی دەفەرمووێ بۆ پیاوان و ئافرەتان وەک یەکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە خواردن بە دەستی چەپ، کە نەهی کردنەکە خواردنەوەش دەگرێتەوە، بۆیە دروست نیە بە دەستی چەپ خواردنەوە بخورێتەوە، هەروەک چۆن دروست نیە بە دەستی چەپ خواردن بخورێت.

وە کە دەڵێ: «أَوْ يَمْشِيَ فِي نَعْلٍ وَاحِدَةٍ»، واتە: پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە پیاو بە تاکە نەعل و پێڵاوێک بڕوات بە ڕێگادا، بە شێوەیەک کەوا پێیەکی نەعلی تێدابێ و پێیەکەی دیکەی ڕووت بێ، کە هەمان مانای فەرموودەی پێش خۆی لە خۆ گرتووە.

٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا انْتَعَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِالْيَمِينِ، وَإِذَا نَزَعَ فَلْيَبْدَأْ بِالشِّمَالِ، فَلْتَكُنِ الْيَمِينُ أَوَّلَهُمَا تُنْعَلُ وَآخِرَهُمَا تُنْزَعُ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر هەر یەکێکتان نەعلی لە پێکرد، با بە پێی ڕاست دەست پێبکات، وە ئەگەر لە پێی کردەوە، با بە پێی چەپ دەست پێبکات، با یەکەمجار بە ڕاست لە پێ بکرێ، وە دواجاریش ڕاستە لەپێ بکرێتەوە».

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٩٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨٥٦، ومسلم: ٢٠٩٧، وأخرجه المصنّف في جامعه: ١٧٧٩.





### شەرح و ڕوونكردنەوە:

ئەمە ئەوەی تێدایە كە لە نەعل و پێڵاو لەپێكردندا لای ڕاست ڕێز لێگیراوترە، بۆیەش سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بووە كە پێی خۆش بووە، لە هەر كارێكی ڕێزدار جوانی و ڕازاوەیی هەبێ، وەك: لە پرچ داهێنان، پێڵاوو نەعل لەپێكردن، وە هەموو كاروبارەكانی دیكەیدا، وە بە پێشخستنی لای چەپی لە پێچەوانەی ئەوانەدا، وەك: داكەندنی نەعل و پێڵاوو، چوونە ئاودەست و، لە كاتی هاتنەدەرەوە لە مزگەوتدا.

٨٥- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي تَرَجُّلِهِ وَتَنَعُّلِهِ وَطُهُورِهِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری پێ خۆش بوو دەستپێكردن لە لای ڕاستەوە بێت، ئەوەی لە توانای بووایە، لە داهێنانی پرچی و لە لەپێكردنی نەعلی و خۆ پاككردنەوەیدا».

### شەرح و ڕوونكردنەوە:

ئەم فەرموودەی دایكمان عائیشە ﵂ هەمان مانای فەرموودەی پێشتر دەگەیەنێ، كە ئەبو هورەیرە ﵁ گێڕایەوە، كە پێغەمبەر ﷺ حەزی دەكرد لە كاتی لەپێكردنی نەعل و پێڵاودا لای ڕاست پێشبخات، هەروەها لە داهێنانی پرچ و شانەكردنی، هەروەها لە كاتی خۆشۆردن و خۆ شۆردنیدا بە دەستی ڕاست دەستی پێ دەكردو، هەمیشە لای ڕاستیشی پێشدەخست.

٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: «كَانَ لِنَعْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَالَانِ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ ﵄»، «وَأَوَّلُ مَنْ عَقَدَ عَقْدًا وَاحِدًا عُثْمَانُ ﵁»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁، دەڵێ: «نەعلەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ دوو قەیتانی هەبوون، (نەعلەكانی) ئەبو بەكرو عومەریش ﵄ هەر وا بوون، یەكەمین كەس (كە نەعلی) بە یەك قەیتان گرێ دابێ، عوسمان ﵁ بوو».

---

(١) انظر: (ح ٣٤).

(٢) إسناده لا يثبت؛ لأنَّ فيه عبد الرَّحمن بن قيس أبا معاوية وهو متروك، كذَّبه أبو زُرعة وغيره.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «كَانَ لِنَعْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قِبَالَانِ»، پێشتر مانای (قِبَالَين) ڕوون کرایەوە.

کە دەڵێ: «وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ»، واتە: نەعلی ئەوانیش دوو گیرەو قەیتانی هەبوو بە هەمان شێوەی نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ.

کە دەڵێ: «وَأَوَّلُ مَنْ عَقَدَ عَقْدًا وَاحِدًا عُثْمَانُ»، واتە: یەکەم کەس کە یەک شوێن پەنجەی دروست کرد عوسمان بوو، پێغەمبەر ﷺ ئەم نەعل لەپێکردنەی بە پێی عورف و باوی کۆمەڵگە بوو، نەک مەبەستی پێی عیبادەت و خواپەرستی بێ، ئەگەرنا عوسمان ﷺ هەرگیز وازی لەو شێوەیە لە دروستکردن و لەپێکردنی نەعل نەدەهێنا (کە پێغەمبەر ﷺ لە پێی دەکرد).

## سوودێک:

دەربارەی بابەتی تەبەڕڕوک بەو شوێنەوارانەی پێغەمبەر ﷺ کە لە لاشەی جیابوونەتەوە وەک تاڵە مووەکان، وە هەروەها ئەو شوێنەوارانەش کە لەبەری بوون و بەر لاشەی موبارەکی کەوتبوون.

لە هاوەڵانەوە ﷺ گێردراوەتەوە: کە ئەوان پارێزگاریان کردووە لە شوێنەوارەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە گرنگیان پێداوەو تەبەڕڕوکیان پێکردوە، پێشتر ئەوە باسکرا کە دایکی بڕواداران ئوممو سەلەمە ﷺ جەڕەسێکی زیوی هەبوو، چەند تاڵە مووەک لە مووەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدابوو، ئەگەر کەسێک تووشی چاوپیسی ببووایە، یاخود ئەزیەت و ئازارێکی لە لاشە بووایە، قاپێکیان بۆ دەناردو، ئەویش تاڵە مووەکانی دەخستنە نێو قاپەکەو دەیهێناو دەیبرد، دەیشلەقاند بەملاولادا تا تەڕ دەبوون، دواتر ئاوەکەیان دەبردەوە بۆ خاوەن قاپەکەو دەیخواردەوە، یاخود دەستنوێژی پێدەگرت.

جا ئیبنو حەجەر ﷺ دەڵێ: مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەگەر کەسێک نەخۆش کەوتبایە قاپێکی دەنارد بۆ ئوممو سەلەمە، ئەویش تاڵە مووەکانی دەخستە نێو قاپەکەو پێی دەشۆردن تێیدا، وە دووبارەی دەکردەوەو ڕایدەشەقاند، خاوەن قاپەکەش ئاوەکەی

دەخواردەوە، یاخود خۆی پێ دەشۆرد تاکو شیفای بۆ بێ و چاک بێتەوە، بە فەرمانی خوا چاک دەبوویەوە بە هۆی ئەو بەرەکەتەوە[1].

کە بە دڵنیایی ئەمە خوا ﷻ تایبەتی کردووە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کەوا لاشەی موبارەک کردوە، هاوەڵان تەبەڕووکیان کردووە بە ئارەقەو بە تف و بە تاڵە مووەکانی، وە هەروەها بە ئاوی زیادەی دەستنوێژی، کە هەموو ئەوانە سەلمێندراون و جێگیر کراون لە فەرموودە ڕاست و دروستەکاندا، بۆیە تەبەڕروک بە شوێنەواری پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکە جێگیرەو هاوەڵانیش لێیان گێردراوەتەوە، هەروەها لە ئەوانەی دوای وانیش لە شوێنکەوتووان کە بە باشترین شێوە شوێنیان کەوتوون، وە ئەم حاڵەتەش وەک خۆی ماوەتەوەو کورتهەڵنەهاتوە لەسەر هاوەڵان و شوێنکەوتووان، بەڵام لێرەدا پرسیارێک دەکرێ: ئایا هیچ لە شوێنەوارەکانی پێغەمبەرمان ﷺ لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا ماوە؟ بە شێوەیەک ئێمە دڵنیابین و یەقینمان هەبێ بە تەواوی کە ئەوە تاڵە مووەکانی پێغەمبەری خوان ﷺ، یان ئەوە نەعلی پێغەمبەری خوایە ﷺ، یاخود وێنەی ئەوانە؟! چونکە بە نسبەت شوێنەواری لە فەرموودەکانی ﷺ و لە سوننەت و ئادابەکانی و ڕەوشت و ڕەفتارە بەرزەکانی و هەڵسوکەوت و مامەڵەی هەر هەمووی پارێزراوەو تۆمار کراوە لە نووسراوەکانی سوننەتدا بە سەنەدی جێگیرو بە ڕاست و دروستی، بەڵام ئەوەی کە پەیوەستە بە شوێنەوارەکانی وەک تاڵە مووەکانی، نەعل و پێڵاویەوە، هەروەها دارو گۆچان و وێنەی ئەوانە، ئایا هیچ شتێکی دەبینرێ لە ڕۆژگاری ئێستاماندا؟ وەڵامی ئەو پرسیارە چەند شتێک لە خۆدەگرێ:

**یەکەم**: بێگومان ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ جێیهێشتوە لە شوێنەوار زۆر زۆر کەمە، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو فەرموودەیەیە کە پێشەوا بوخاری[2] لە عەمری کوڕی حاریس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە ئەو گوتوویەتی: {مَا تَرَكَ رَسُولُ ٱللَّهِ ﷺ عِنْدَ مَوْتِهِ دِرْهَمَاً، وَلَا دِينَارَاً، وَلَا عَبْدَاً، وَلَا أَمَةً، وَلَا شَيْئَاً، إِلَّا بَغْلَتَهُ ٱلْبَيْضَاءَ، وَسِلَاحَهُ، وَأَرْضَاً جَعَلَهَا صَدَقَةً}. واتە: پێغەمبەر کاتێ وەفاتی فەرموو (کۆچی دوایی کرد)، هیچ دەرهەم و دینارێک

---

(١) فتح الباري: ٣٥٣/١٠.

(٢) ٢٧٣٩.

و کۆیلەیەکی کوڕ، یان کچ، یان هەر شتێکی دیکەی جێ نەهێشت جگە لە هێسترە سپییەکەی و، چەکەکەی و، زەویەک کە کردبووی بە صەدەقە.

**دووەم:** زۆربەی ئەو شوێنەوارانەش کە هەبوون تووشی لەناوچوون بوون بە تێپەڕ بوونی کات و هۆکارەکانی ئەو ئاشووبانەی ڕوویاندا لە نێوان مسوڵمانان، جا لە (الصحيحين)دا هاتوە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ کە گوتوویەتی: {اتَّخَذَ رَسُول اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، وَكَانَ فِي يَدِهِ، ثُمَّ كَانَ، بَعْدُ، فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ، ثُمَّ كَانَ، بَعْدُ، فِي يَدِ عُمَرَ، ثُمَّ كَانَ، بَعْدُ، فِي يَدِ عُثْمَانَ، حَتَّى وَقَعَ، بَعْدُ، فِي بِئْرِ أَرِيسٍ نَقْشه (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)}[1]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە زیو دروستکراوی هەبوو، دەیخستە دەستی، دوای ئەو لە دەستی ئەبو بەکر بوو، دوای ئەو لە دەستی عومەر بوو ﷺ دوایی لە دەستی عوسمان بوو هەتا کەوتە بیری ئاریسەوە، لەسەری هەڵکەنرابوو: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ).

کە لەو بەشەی دوایی ئەو باسە دێ.

وە هەروەها لە هۆکارەکانی دیکەی لەدەستدانی ئەو شوێنەوارانەش، ئەوە بووە کە هەندێ لە هاوەڵان وەسیەتیان کردوە، بەوەی هەر شتێک لە شوێنەواری پێغەمبەری ﷺ لەلای بووبێ لەگەڵی بنێژرێ و بخرێتە نێو گۆڕەکەی، وەک سەهلی کوڕی سەعد ﷺ وەسیەتی بەمە کردووە (لە چەندان ڕیوایەتی دیکە هاتوە کەوا هەندێک لە هاوەڵان تاڵە مووەکانی پێغەمبەری خوایان ﷺ لەلای خۆیان پاراستووەو داوایان کردووە کەوا لەگەڵیان بنێژرێ).

وە یەکێک لە هۆکارەکانی دیکەی نەمانی ئەو شوێنەوارانە بریتیە لە شەڕو جەنگەکان، چونکە هەر کەسێک تەماشای کتێبەکانی مێژوو بکات بۆ وێنە (البداية والنهاية) دەبینێ کەوا چەندین شت ون بوون و، نەماون، وەک بوردەو پۆشاکی قوتەیفە کە لە کۆتایی دەوڵەتی عەبباسی کاتێک تەتارەکان هاتن سووتاندیان لە کاتی هێرش هێنانیان بۆ سەر بەغدا.

**سێیەم:** ئەوەیان لەم بەشەدا لە هەموو خاڵەکانی دیکە گرنگترە، ئەویش نەبوونی بەڵگەی دڵنیاکەرەوەیە، چونکە مرۆڤ پێویستی بە بەڵگەی دڵنیاکەرەوەو جێگیر

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٧٣، ومسلم: ٢٠٩١.

هەیە، کە جەخت لەوە بکاتەوە ئەو شتە لە شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بۆیە لە چەندان زانا گێڕدراوەتەوە کە گوتوویانە: بە دڵنیایی ئەو شوێنەوارانە بۆ وێنە: کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەن ناتوانرێ بڕوای تەواوی لەسەر هەڵبچنرێ و دابمەزرێ، وەک گوتمان: چونکە ئەوانە هیچیان بەڵگەی دڵنیاکەرو جێگیریان لەسەر نیە بیسەلمێنێ، بۆیەش دروست نیە تەبەڕڕوک بە هیچ شتێک بکرێ، مەگەر کەسێک دڵنیاییەکی تەواوی هەبێ کە ئەوە لە شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بەڵام تەنها بانگەشەو گومان لە بابەتێکی ئاوا پشتی پێ نابەسترێ و وەرناگیرێ، چونکە شوێنەکەو باسەکە باسێکی ترسناکە.

سەرەڕای ئەوەش کە هەندێک لە خەڵکی زێدەڕۆیی کردووە لەو بابەتەدا چوونەتە جۆرێک لە زێدەڕۆیی و هەڵەشەیی، کە بێگومان زۆر کاریگەریی هەیە لەسەر بیروبڕواو عەقیدە، درێژەی پێ نادەم و وێنەو نموونەی بۆ ناهێنمەوە، بەڵکو تەنها یەک دێڕە شیعر دێنمەوە کە هی یەکێکیانە کاتێ باسی نەعلی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات و دەڵێ:

ولمَّا رَأَيتُ الدَّهر قد حاربَ الورى     جعلتُ لنفسي نعلَ سيِّده حصناً

دەڵێ: کاتێک کە بینیم ڕۆژگار جەنگاوە لەگەڵ باشترین مەخلوق، خۆم کردە نەعلی گەورەی ڕۆژگار (واتە: پێغەمبەرم ﷺ) کردە قەڵا بۆ پارێزرانم!

دەڵێ: (سيِّدُ الورى) مەبەستی پێغەمبەرە ﷺ، وە تەنها لەم دێڕە شیعرەدا سێ سەرپێچی شەرعی هەیە:

**یەکەمیان:** کە دەڵێ: (ولمَّا رَأَيتُ الدَّهر قد حاربَ الورى) ئا لەوەدا قسە گوتن بە ڕۆژگاری تێدایە، کە لە چەندان فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەر ﷺ هاتوە نەهی کردووە لە قسەگوتن بە ڕۆژگار.

**دووەمیان:** کە دەڵێ: (جعلتُ لنفسي نعلَ سيِّده حُصْناً) واتە: نەعلی گەورەی ڕۆژگارم کردووە بە قەڵا بۆ خۆپاراستنم، واتە: نەعلەکەی کردۆتە قەڵا، کە لەمەشدا خۆ پەیوەست کردن بە غەیری خواو خۆ پەنادان بە غەیری خوا هەیە کە ئەوەش لە هاوبەشدانانە بۆ خوا ﷻ.




**سێیەم**: لەو قسەیەی کە دەڵێ: (نعلَ سيِّده) یانی: گەورەی ئەم ڕۆژگارو ئەم کەونە، کە دژایەتی پێغەمبەر ﷺ دەکات، ئەوە لە ڕۆچوون و تێپەڕاندنەو شتێکی ڕەوا نیە.

ئەوەش کە جێگەی داخە دووبارە بڵاوبوونەوەی وێنەیەکە لە هەندێ پەیج و ماڵپەڕ کە گومانی ئەوە دەبەن ئەوە نەعلی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بۆیە هەندێک لە خەڵکی تەبەڕروکی پێدەکەن، بێ ئەوەی سەلمێنرابێ بە سەنەدێکی (صحيح)، کە ئەوە نەعلی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە ئەگەر سەلمێنراش ئاوا بووە، یان ئەوە نەعلی پێغەمبەری خوایە ﷺ، خۆ ئەم وێنەیە نەعلەکە نیە، تاکو تەبەڕروکی پێ بکرێ!! بۆیە پێویستە لەسەر مسوڵمان وا بە ئاسانی موجازەفە بە دین و عەقیدەی خۆی نەکات، وە هەندێ حاڵەتی سۆزو عاتیفە نەچێتە ناخیەوە کە دواتر هەڵبخلیسکێ و سەرەنجامێکی خراپی هەبێ.

بە دڵنیایی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ تاجی سەری بڕوادارانە، نیشانەو مەدالیای شەرەفە لە دڵیان و سازشی لەسەر ناکرێ و کەس کێشەی لەگەڵی نیە، وە پلەو پێگەی بەرزو مەزنی هەیە پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو لە پێش خۆیان و هەموو شتێکی پڕ بایەخیانە، وە لە دایک و باب و منداڵ و خزم و کەس و تێکڕای خەڵکی خۆشتریان دەوێ، بەڵام خودی خۆی ﷺ بە توندترین شێوە ئوممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوەو وریا کردوونەوە لە تێپەڕاندن و زێدەڕۆیی کردن، وەک لە دایکمان عائیشە رضي الله عنها گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ}[1]. واتە: هەر کەسێک کردەوەیەک بکات، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە، هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکە دەفەرموێ: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَدٌّ}[2]. واتە: هەر کەسێک شتێک دابهێنێ لەم ئایینەدا نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیە. جا بێگومان لەوبارەوە فەرموودەی زۆر هاتوون، کە هەمان ماناو ئاماژەیان تێدایە.

---

(١) أخرجه مسلم: ١٧١٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٦٩٧، ومسلم: ١٧١٨.

بۆیە پێویستە مسوڵمان نەفسی خۆی پەیوەست بکات بە سوننەت، خۆی ڕێکبخات بە پێی یاساو ڕێساکانی پێغەمبەرﷺ، وە وریا بێ لە هەردوو حاڵەتی زێدەڕۆیی کردن و سنور بەزاندن تیایدا، هەروەها داهێنان و بیدعەت لە دینی خوا ﷻ.

## ئاگاداریەک:

تەبەڕڕوک بە شوێنەوار تایبەتە بە شوێنەواری پێغەمبەری خواﷺ، بە هیچ جۆرێک تەبەڕڕوک بە شوێنەواری هیچ کەسێکی دیکەوە دروست نیە، جا ئەم کەسە هەر کەسێک بێ و، لە هەر کەسێک بێ، بۆیەش بە هیچ شێوەیەک نەگوازراوەتەوە بۆمان کە یەکێک لە هاوەڵان تەبەڕڕوکی کردبێ بە شوێنەواری ئەبوبەکر، یان عومەر، یان عوسمان، یان عەلی ﷺ کە لە نێو ئۆممەتدا هیچ کەسێک لەوان باشتر نیە، لە دوای پێغەمبەری خواﷺ.

**الخاتم**: بریتیە لە ئەڵقەیەک و شتێکی دیکەی تێدایە لە غەیری خۆیەتی، جا ئەگەر ئەم شتەی تێدانەبێ، ئەوە بریتیە لە (فتخة) واتە: ئەڵقە، ئەم بەشە پەیوەستە بە باسکردن و ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە هاتوەو پەیوەندی هەیە بەو ئەنگوستیلەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەستی بووە، لە ڕووی سیفەت و نیگارو هۆکارو، مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە لەدەستکردنی ئەم ئەنگوستیلەیەو غەیری ئەوەش.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای ماوەیەک لە کۆچکردنی بۆ مەدینە مۆری بەکارهێنا لە کۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچی، کاتێک ویستی دەست بکات بە ناردنی نووسراوەکانی بۆ پادشاکان و بانگ کردنیان بۆ نێو ئایینی ئیسلام، جا کاتێک ویستی نووسراوو نامە بنێرێ بۆ پادشای ڕۆم، پێی گوترا: ئەوانە هیچ نووسراوێک، یان نامەیەک ناخوێننەوە ئەگەر مۆر نەکرا بێ، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ مۆرێکی دروستکرد.

جا لەبەر ئەوە هەندێک لە زانایان درێژەیان بەم باسە داوە، دەربارەی حوکمی دروستکرانی مۆر (لەلایەن کەسانی دیکەوە)، گوتوویانە: ئەگەر بۆ کارێکی پێویست بوو بۆ وێنە: کەسەکە دادوەر بێ، یان بەرپرسێک بێ، ئەوە پێویستی بە مۆر دەبێ، وە بۆ ئەو کەسە ئەنگوستیلەکە کە (لە هەمان کاتدا) مۆریشە، سوننەتە، بەڵام ئەگەر پێویست نەبوو، ئەو کاتە دەبێتە کارێکی (مُباح)و ڕێگاپێدراو[١].

٨٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ وَرِقٍ، وَكَانَ فَصُّهُ حَبَشِيًّا»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «ئەنگوستیلەی پێغەمبەر ﷺ لە زیو (دروستکرابوو) شوێنی هەڵکۆڵینەکەش حەبەشی بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەنەس ﷺ دەڵێ: «كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ وَرِقٍ» (الوَرِق): بە ژێرەی پیتی ڕا (ر) بریتیە لە زیو، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لە زیو بوو، کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروست و ڕێگاپێدراوە پیاو ئەنگوستیلەی لە زیو دروستکراو لە دەست بکات.

---

(١) وقد أفرد جماعةٌ من أهل العلم أجزاءً في أحكام الخواتيم وأحاديثها: كالبيهقي في الجامع في الخاتم، وابن رجبٍ في كتاب أحكام الخواتيم وما يتعلَّق بها.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٠٩٤، والمصنِّف في جامعه: ١٧٣٩.

کە دەڵێ: «وَكَانَ فَصُّهُ حَبَشِيّاً»، (الفص): بریتیە لەو شوێنەی کە لەسەر ئەنگوستیلەکە هەڵدەکۆڵدرێ، جا ئەو ماددەی لەو شوێنەی نەخشی ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانرابوو حەبەشی بوو، واتە: بەردێکی حەبەشی بوو، یاخود سیفەتی حەبەشی بوو، یاخود شێوەی نەخشکردنەکە حەبەشیانە بوو، (واتە: وەک خەڵکی حەبەشە بوو).

٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَماً مِنْ فِضَّةٍ، فَكَانَ يَخْتِمُ بِهِ وَلَا يَلْبَسُهُ، قَالَ أَبُو عِيسَى: أَبُو بِشْرٍ اسْمُهُ جَعْفَرُ بْنُ أَبِي وَحْشِيَّةَ [1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە زیو دروستکراوی بەکاردەهێنا، مۆری پێدەکرد، وە نەیدەخستە پەنجەی. ئەبو عیسا گوتوویەتی: ئەبو بیشر ناوی جەعفەری کوڕی ئەبو وەحشییە بوو.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوە پێچەوانەی چەندان فەرموودەیە، کە مانای ئەوە دەگەیەنن پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەکەی لە دەست کردوە، جا لە نێو زانایان هەیە هەوڵیداوە ڕێگای ئەوە بگرێتە بەر کە تەوفیق و کۆکردنەوە بکات لە نێوان فەرموودەکاندا، وە هەشیانبووە گوتوویەتی: (علة)ی هەیە، یان فەرموودەکە (شاذ)ـە، بە هۆی ئەوەی ئەو فەرموودەیە پێچەوانەی فەرموودەکانی دیکەیە.

وە دەشگوترێ: ئەگەر (شاذ)، یان (معلول) نەبێ، ئەوە دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە مۆرێکی هەبووە، هەر جارەو یەکێکیانی لە دەستکردوە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەم ئەنگوستیلەیە لە دەست نەکات کە زیوێکی تەواو صاف نەبووبێ، بەڵکو ئاسنی تێدا بووبێ کە دروست نیە ئەنگوستیلەیەک، یان ئەڵقەیەک لە دەست بکرێ کە لە ئاسن دروست کرابێ، وەک لە فەرموودەی دیکەدا هاتوە.

لە پێشەوا (أحمد بن حنبل) ﷺ، گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی هەبوو زیوی لەسەر بوو بە هۆیەوە فڕێیدا، (الحافظ ابن رجب) ﷺ لە کتێبی

---

(١) انظر: (ح ١٠٤).

(أحكام الخواتم)دا دەڵێ: ڕەنگە ئەمە ئەو مۆرە بووبێ کە مۆری پێ دەکردو لە دەستی نەدەکرد، هەروەک لە فەرموودەی ئیبنو عومەردا هاتوە کە پێشەوا ترمذي گێڕاویەتیەوە لە (الشَّمَائِل) ئەگەر جێگیر بێ و ڕاست بێ، لێرەدا ئاماژە دەکات بەو فەرموودەیەی ئێرە: ئەگەر ئەم زیادەیە (وَلَا يَلْبَسُهُ) ڕاست بێ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بۆ حاڵەتی تایبەت و دیاریکراو (پێغەمبەری خوا ﷺ بەکاری هێناوە).

٨٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ خَاتَمُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ فَصُّهُ مِنْهُ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «ئەنگوستیلەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو دروستکرابوو، وە نەخشە هەڵکۆڵراوەکەش لە خۆی بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەنەس ﷺ دەڵێ: «فَصُّهُ مِنْهُ» پێچەوانەی فەرموودەی پێشووە کە خۆی گێڕایەوەو فەرمووی: «وَكَانَ فَصُّهُ حَبَشِيًّا» هەندێک لە زانایان بەم شێوەیە ئەم دوو فەرموودەیان کۆکردۆتەوە کە دەڵێن: لە سیفەت و نەخشەکەیدا ئەنگوستیلەکە حەبەشی بووە، هەشیانە دەڵێ: بەوە کۆدەکرێتەوە کە دوو مۆری هەبوون، مۆرێکی شوێن مۆرکردنی حەبەشی بووە، وە ئەنگوستیلەکانی دیکەشی هەمووی لە زیو بووە.

٩٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «لَمَّا أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الْعَجَمِ قِيلَ لَهُ: إِنَّ الْعَجَمَ لَا يَقْبَلُونَ إِلَّا كِتَابًا عَلَيْهِ خَاتَمٌ، فَاصْطَنَعَ خَاتَمًا فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي كَفِّهِ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک ویستی دەست بە نووسین و ناردنی نامە بکات بۆ خەڵکی غەیری عەرەب، پێی گوترا: کە خەڵکی جگە لە عەرەب هیچ نووسراوێک وەرناگرن، ئەگەر مۆری لەسەر نەبێ، بۆیە مۆرێکی دروست کرد، وەک ئەوەی تەماشای سپیاییەکەی بکەم لە نێو لەپیدا».

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٧٠، والمصنّف في جامعه: ١٧٤٠.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨٧٥، ومسلم: ٢٠٩٢، والمصنّف في جامعه: ٢٧١٨.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەمە ڕوونکردنەوەی هۆکاری دروستکرانی مۆری تێدایە لە لایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە ئەو ﷺ ئەم مۆرەی بۆیە دروستکرد تا کاتێک ویستی نووسراوێک بنووسێ بۆ پادشاکان، کە ئەمە لە کۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچیدا بوو، کاتێک گەڕایەوە لە حودەیبیە، پێی گوترا کە پادشاو گەورەکانی غەیری عەرەب هیچ نووسراوێک وەرناگرن و نایخوێننەوە، مەگەر مۆری ئەو کەسەی لەسەر بێ کە ناردوویەتی، مەبەستیش لە عەجەم جگە لە عەرەبەو مەبەستیش لە خەتم مۆرە.

٩١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ نَقْشُ خَاتَمِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولٌ سَطْرٌ، وَاللَّهُ سَطْرٌ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «نەخش و نیگاری ئەنگوستیلەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵکەندرابوو، دێڕێک نووسرا بوو (مُحَمَّدٌ)، دێڕێک نووسرا بوو (رَسُول) دێڕێک نووسرا بوو (اللّه)».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەی تێدایە کە مۆرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سێ وشە پێکهاتبوو، ئەوانیش (مُحَمَّدٌ)، (رَسُول)، (اللّه)، بەڵام لە یەک دێڕدا نەنووسرابوون، بەڵکو لە سێ دێڕدا نووسرابوون، بەم شێوەیە: «مُحَمَّدٌ سَطْرٌ، وَرَسُولٌ سَطْرٌ، وَاللَّهُ سَطْرٌ»، لەوانەیە بەم شێوەیە بووبێ (والله أعلم) مۆرەکە بە جۆرێک بووە نەدەگونجا سێ وشەکە لە یەک دێڕدا بنووسرێ.

ڕواڵەتی فەرموودەکەش ئەوە دەگەیەنێ کە دێڕی یەکەم لە سەرەوە نووسراوە (مُحَمَّدٌ)، هی دووەم (رَسُول)، هی سێیەم (اللّه)[2]، ئا بەم شێوەیە بووە نەخشەکەی، وە هیچ شتێکی دیکەی لەسەر نەبووە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣١٠٦، والمصنّف في جامعه: ١٧٤٧.

(٢) قال الحافظ في الفتح: وأمّا قول بعض الشُّيوخ أنَّ كتابته كانت من أسفل إلى فوق، يعني أنَّ الجلالة في أعلى الأسطر الثَّلاثة، ومحمَّد في أسفلها؛ فلم أر التَّصريح بذلك في شيءٍ من الأحاديث، بل رواية الإسماعيلي يخالف ظاهرها ذلك؛ فإنَّه قال فيها: محمَّد: سطر، والسَّطر الثَّاني: رسول، والسَّطر الثَّالث: الله.



٩٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ إِلَى كِسْرَى وَقَيْصَرَ وَالنَّجَاشِيِّ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لَا يَقْبَلُونَ كِتَابًا إِلَّا بِخَاتَمٍ فَصَاغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا حَلْقَتُهُ فِضَّةٌ، وَنُقِشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ نووسراوی کرد بۆ کیسراو قەیسەرو نەجاشی، جا پێی گوترا: ئەو (سەرۆک و دەسەڵاتدارانە) نووسراو وەرناگرن، مەگەر مۆری پێوە بێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆرێکی دروستکرد (واتە: داوای کرد بۆی دروست بکرێ)، کە ئاڵقەکەی لە زیوو (دروستکرا) بوو، لەسەر مۆرەکە ئەمە هەڵکەنرابوو: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَتَبَ إِلَى كِسْرَى»، واتە: ویستی نووسراوێک بنێرێ بۆ (کیسرا)، هەروەک لە ڕیوایەتی پێشتردا ئەمە ڕوون کراوەتەوە، کە فەرمووی: «لَمَّا أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ».

کە دەڵێ: «فَصَاغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا»، واتە: فەرمانی کرد کە مۆرێکی بۆ دروست بکرێ.

کە دەڵێ: «حَلْقَتُهُ فِضَّةٌ»، واتە: لە زیو بوو.

کە دەڵێ: «وَنُقِشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»، یانی: سێ دێڕی لێ نووسرابوو، وەک لە ڕیوایەتەکانی ڕابردوودا زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی هاتوە.

٩٣- عَنْ أَنَسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ نَزَعَ خَاتَمَهُ»(٢).

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ویستبای بچێتە سەرئاو ئەنگوستیلەکەی لە دەست دەردەهێنا (دادەکەند)».

---

(١) سبق تخريجه في (ح ٩٠).

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٤٦ وقال: هذا حيدث حسن غريب، وأبو داود في السُنن: ١٩. وقال: هذا حديث منكر، وابن ماجه في السُنن: ٣٠٣.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ویستبای بچێتە سەرئاو مۆرەکەی (ئەنگوستیلەکەی) لە دەستی دادەکەندو دەریدەهێنا، واتە: لە کاتی چوونە سەرئاو لە دەستیدا نەبوو، وەک خۆ دوورگرتنێک لەوەی کە ناوی خوا لە شوێنێک بێ پاک نەبێ.

٩٤- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: «اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ، فَكَانَ فِي يَدِهِ ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ أَبِي بَكْرٍ، وَيَدِ عُمَرَ، ثُمَّ كَانَ فِي يَدِ عُثْمَانَ رضي الله عنهم، حَتَّى وَقَعَ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ»[1].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عومەر رضي الله عنهما کە گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە زیو دروستکراوی هەبوو، دەیخستە دەستی، دوای ئەو لە دەستی ئەبو بەکرو پاشان لە دەستی عومەر بوو، دوایی لە دەستی عوسمان بوو رضي الله عنهم هەتا کەوتە بیری ئاریسەوە، لەسەری هەڵکەنرابوو: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

(بِئْرِ أَرِيسٍ): بیرێکە لە باخچەیەکی نزیک لە مزگەوتی قوباء، پێشەوا عوسمان رضي الله عنه لەسەر ئەو بیرە بوو مۆرەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ لە دەستی بوو دەیجوڵاند، لە دەستی کەوتە خوارەوەو کەوتە نێو بیرەکە، پێشەوا عوسمان رضي الله عنه لەگەڵ هاوەڵانی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ گەڕان و ئاویان دەرهێنا لەم بیرە، بەڵام مۆرەکەیان نەدۆزیەوە.

وە ئەگەر بشگوترێ: مۆری پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا ماوە، ئەمە قسەیەکە پێویستی بە بەڵگە بۆ هێنانەوە هەیە، وە وێنەی ئەم جۆرە قسانە وەرناگیرێ و بە ڕاست دانانرێ، مەگەر بە بەڵگەیەکی جێگیرو ڕوون و ئاشکرا.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٨٧٣، ومسلم: ٢٠٩١.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەی دەخستە دەستی ڕاستی



---

بابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ.




دانەر ﷬ ئەم بەشەی داناوە کە پەیوەستە بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە سوننەت لە لەدەستکردنی ئەنگوستیلە، ئەوەیە بخرێتە دەستی ڕاستەوە "پێشەوای دانەر ئەوەی هەڵبژاردوە" کە چەندان فەرموودەی هێناوە لەوبارەوە، وە ئەو فەرموودەیەش کە باسی ئەوە دەکات پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لە دەستی چەپی کردووە بە (معلول) ی دادەنێ و دەڵێ: لاوازە.

وە هەر کەسێک وردبێتەوە لەم فەرموودانەش کە لەم بەشەدا هاتوون، دەبینێ فەرموودەکان مانای ئەوە دەگەیەنن کە پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لە دەستی ڕاستی بووە، وە هەندێک فەرموودەی تریش هەن مانای ئەوە دەگەیەنن کە لە دەستی چەپی بووە، جا (إبن القيم) ﷬ لە کتێبی: (زاد المعاد)دا[1] دەڵێ: فەرموودەکان جیاوازن کە ئایا پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لە دەستی ڕاستی بووە، یاخود لە دەستی چەپ؟ هەموویان سەنەدەکەیان ڕاستە.

(الحافظ العراقي) لەو بارەوە شیعری داناوەو دەڵێ:

يَلبَسُه كما روى البُخارِي　　　في خِنْصَرٍ يـَمينٍ أو يَسارٍ

كلاهُما في مُسلمٍ وَيُجمَعُ　　　بأنَّ ذَا فـي حالَتَينِ يَقَعُ

ماناکەی: لە دەستی کردووە وەک بوخاری دەیگێڕێتەوە، لە پەنجەی بچووکی ڕاست و چەپیدا، هەردوو فەرموودە لە (صحيح مسلم)دا هەن، کۆکردنەوەی نێوانیان ئەوەیە هەر کامیان لە حاڵەتییجیاواز بووە.

وە هەرچی دەربارەی بڕیارە لە بابەتەکەدا لەو ڕووەوە پێشەوا نەوەوی ﷬[2] دەڵێ: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە دروستە ئەنگوستیلە لە دەستی ڕاست و لە دەستی چەپ بکرێ، هیچ ناپەسندییەکی تێدانیە لە هیچ کامیاندا، بەڵام ڕاجیان لەسەر ئەوەی کامیان باشترە، زۆرێک لە زانایانی پێشین ئەنگوستیلەیان لە دەستی ڕاستیان کردوە، زۆرێکیش لە دەستی چەپ، پێشەوا مالیک دەستی چەپی پێ باش بووەو، دەستی ڕاستی پێ ناپەسند بووە، وە لە ڕێبازی ئێمەشدا لە لای هاوەڵانمان

---

(١) ١/١٣٤.

(٢) شرح صحيح مسلم: ١٤/٧٢_٧٣.

دوو حاڵەتە: ڕاستتر ئەوەیە دەستی ڕاست باشترە، چونکە (ئەنگوستیلە لە دەستکردن) ڕازاندنەوەیە لای ڕاستیش بەڕێزترو لە پێشترو شایستەترە بەم ڕازاندنەوەو ڕێزلێگرتنە.

٩٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ «كَانَ يَلْبَسُ خَاتَمَهُ فِي يَمِينِهِ»[١].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی».

٩٦- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ صَالِحٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ، عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بِلَالٍ، عَنْ شَرِيكِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي نَمِرٍ، نَحْوَهُ.

واتە: بەم سەنەدە هەمان فەرموودەی پێشەوە گێڕدراوەتەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ ئەم فەرموودەیەی هێناوە لەم دوو ڕێگایەوە، لە ڕێگای عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ، لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەی لە دەستی ڕاستی کردوە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەنگوستیلەی لە دەستی چەپی نەکردوە، بۆیەش هەندێک لە زانایان ئەم قسەیان وەرگرتووەو گوتوویانە: سوننەت لە لەدەست کردنی ئەنگوستیلە ئەوەیە کە لە دەستی ڕاست بکرێ نەک لە دەستی چەپ، کەچی دەبینرێ هەندێکی دیکە لە زانایان لەگەڵ ئەم مانایەدا نین لەبەر دژیەکیی لەگەڵ فەرموودەیەکی دیکەدا کە مانای ئەوە دەگەیەنێ: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەی لە دەستی چەپی کردوە، وە ئەمە پێشەوا موسلیم ﷺ لە (صحيح)ـەکەیدا[٢] لە (ثابت)ـەوە لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە گوتوویەتی: {كَانَ خَاتَمَ النَّبِيَّ ﷺ فِي هَذِهِ وَأَشَارَ إِلَى الخِنْصَرِ من يَدِهِ اليُسْرَى}. واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لەمەدا بوو ئاماژەی کرد بۆ پەنـجە توتەی دەستی چەپی.

---

(١) أخرجه أبو داود في سننه: ٤٢٢٦، وفي إسناده شريك بن عبد اله بن نمر، وهو صدوقٌ يخطئ، ولكن للحديث ما يشهد له، كما سيأتي عند المصنِّف ﷺ.

(٢) برقم: ٢٠٩٥.

٩٧- عَنْ حَمَّادِ بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ أَبِي رَافِعٍ، يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جَعْفَرٍ رضي الله عنهما يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ، وَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ»[1].

واتە: حەمادی کوڕی سەلەمە، دەڵێ: ئیبنو ئەبو ڕافیعم بینی، ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی، لە بارەی ئەوە پرسیارم لێکرد، گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرم رضي الله عنهما، بینی ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی، وە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەریش گوتی: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی».

٩٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ رضي الله عنهما: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر رضي الله عنهما، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی. (فەرموودەکەی جابر رضي الله عنه بە واتای ئەوەی ڕابردووە)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

فەرموودەی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر رضي الله عنهما هەمان مانای فەرموودەی عەلی رضي الله عنه هەیە کە پێشتر دانەر هێنابووی.

٩٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ»[3].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنهما، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی».

١٠٠- عَنِ الصَّلْتِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ وَلَا إِخَالُهُ إِلَّا قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ»[4].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٤٤، وقال: قال محمَّد بن إسماعيل: هذا أصحُّ شيءٍ روي عن النَّبيِّ ﷺ في هذا الباب، وفي إسناده عبد الرحمن بن أبي رافع، وهو مقبول، لكن تابعَه عبد الله بن محمَّد بن عَقيل في الحديث الآتي بعده.

(٢) في إسناده إبراهيم بن الفَضل متروكٌ -كما قال الحافظ في التَّقريب-، وقال البخاري والنسائي وأبو حاتم: منكر الحديث، وقال الدَّارقطني والأزدي: متروك.

(٣) إسناده ضعيفٌ جدًّا؛ لأنَّ فيه عبد الله بن ميمون، وهو متروك الحديث.

(٤) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٤٢، وأبو داود في السُّنن: ٤٢٢٩، وفي إسناده الصَّلت بن عبد الله، وهو مقبولٌ، وتشهد له الأحاديث الصَّحيحة الواردة في الباب.




واتە: صەڵتی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: ئیبنو عەبباس ﷺ، ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی، پێشم وانیە، لە خۆڕاش وای گوتبێ و وای کردبێ، مەگەر ئەوەی گوتی، «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەش هەمان مانای فەرموودەکەی پێش خۆی هەیە.

١٠١- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ، وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَنَهَى أَنْ يَنْقُشَ أَحَدٌ عَلَيْهِ» وَهُوَ الَّذِي سَقَطَ مِنْ مُعَيْقِيبٍ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ[1].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، لە ئیبنو عومەر ﷺ کە گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی بەکاردەهێنا لە زیو دروست کرابوو، ئەو شوێنەی نەخش و نیگارەکەشی کردبووە ڕووی لەپی دەستی، (ڕستەی:) (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّه)ی لەسەر هەڵکەندبوو، وە قەدەغەشی کردبوو کەسێکی دیکە وەک ئەو نەخشەی ئەوی لەسەر هەڵکەنێ»، جا ئەو ئەنگوستیلەیە بوو لەلای موعەیقیب کەوتە نێو بیری ئاریسەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَجَعَلَ فَصَّهُ مِمَّا يَلِي كَفَّهُ»، واتە: ئەو شوێنەی کە ناوەکەی لەسەر نووسرابوو دیار نەبوو، بەڵکو لە دیوی بەر لەپی دانابوو، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئەنگوستیلەیەی بۆ جوانی بەکارنەهێناوە، بەڵکو بۆ پێویستی بە کاری هێناوە.

کە دەڵێ: «وَنَقَشَ فِيهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، وَنَهَى أَنْ يَنْقُشَ أَحَدٌ عَلَيْهِ»، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەگەر مرۆڤ بۆ خۆی مۆرێکی تایبەت دروست بکات بە شێوەیەکی جیاواز، ئەوە تایبەتە بە خۆی، بۆیە بۆ هیچ کەسێک نیە هەڵسێ مۆرێکی وەک ئەو دروست بکات، لەبەر ئەوەی تێکەڵی ڕوودەدات لە نێوان شتە تایبەتەکانی خەڵکیدا.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٩١.




وە هەروەها ئەمە ترسناکی فرت و فێڵ و ساختەکاری ڕوون دەکاتەوە لە مۆرەکاندا، کە ئەویش جۆرێکە لە فرت وفێڵ، کە جۆرەها تاوانی بە دوادا دێ لە بواری زانستی، لە بواری بازرگانی، هەروەها لە غەیری ئەم بوارانەشدا.

کە دەڵێ: «وَهُوَ الَّذِي سَقَطَ مِنْ مُعَيْقِيبٍ فِي بِئْرِ أَرِيسٍ»، پێشتر باسکرا کە لە دەستی پێشەوا عوسمان رضي الله عنه کەوتە خوارەوە، دەشگونجێ کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو فەرموودەکەدا ئەوە بێ، لەوانەیە پێشەوا عوسمان کە مۆرەکەی داوە بە موعەیقیب بۆ ئەوەی مۆرێک بکات، یان پێداویستیەکی دیکەی جێبەجێ بکات، پاشان کە موعەیقیب گەڕاندوویەتیەوە ویستوویەتی لە دەستی وەربگرێتەوە، لەو کاتەدا ئەنگوستیلەکە کەوتۆتە نێو بیرەکە.

موعەیقیب کوڕی ئەبو فاتیمەی دەوسییە، لەو کەسانەیە کە هەر زوو بڕوایان هێناو هاتوونەتە نێو ئیسلام، بەشداری هەموو جەنگەکانی کردووەو سەرپەرشتی بەیتولمالی کردووە لە سەردەمی جێنشینایەتی عومەردا رضي الله عنه.

١٠٢- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: «كَانَ الْحَسَنُ وَالْحُسَيْنُ رضي الله عنهما يَتَخَتَّمَانِ فِي يَسَارِهِمَا»[١].

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکی دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «حەسەن و حوسەین رضي الله عنهما ئەنگوستیلەکانیان دەخستە دەستی چەپەیان».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ کارەکە فراوانە (مرۆڤ سەرپشکە) ئەگەر ویستی ئەنگوستیلە لە دەستی ڕاستی دەکات، ئەگەریش ویستی ئەنگوستیلە لە دەستی چەپی دەکات، (لە هەر کامێکیان بکرێ) سابت و جێگیر بووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

١٠٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: «أَنَّهُ ﷺ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَمِينِهِ».[٢] وَرَوَى بَعْضُ أَصْحَابِ قَتَادَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «أَنَّهُ كَانَ يَتَخَتَّمُ فِي يَسَارِهِ» وَهُوَ حَدِيثٌ لَا يَصِحُّ أَيْضاً[٣].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٤٣، وهو منقطع.

(٢) وَقَالَ أَبُو عِيسَىَ هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ لاَ نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ سَعِيدِ بْنِ أَبِي عَرُوبَةَ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَ هَذَا إِلَّا مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

(٣) أخرجه النَّسائي: ٥٢٠٤.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی ڕاستی». ئەبو عیسا ﷺ، دەڵێ: وە گێڕدراوەتەوە لە هەندێک لە هاوەڵانی قەتادە، لە قەتادە، لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ (گوایە) گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەکەی دەخستە دەستی چەپەی». ئەوەش فەرموودەیەکە بە هەمان شێوە صەحیح نیە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

بەڵام پێشتر ئەوە باسکرا کە لە (صحيح مسلم)[1] لە فەرموودەی (ثابت) لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: {كَانَ خَاتَمَ النَّبِيِّ ﷺ فِي هَذِهِ وَأَشَارَ إِلَى الخِنْصَرِ من يَدِهِ اليُسرى}. واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەکەی لەمەدا بوو ئاماژەی کرد بۆ پەنجەی توتەی دەستی چەپی.

**١٠٤- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: اتَّخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَاتَمًا مِنْ ذَهَبٍ، فَكَانَ يَلْبَسُهُ فِي يَمِينِهِ، فَاتَّخَذَ النَّاسُ خَوَاتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ، فَطَرَحَهُ ﷺ وَقَالَ: «لَا أَلْبَسُهُ أَبَدًا» فَطَرَحَ النَّاسُ خَوَاتِيمَهُمْ[2].**

واتە: نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەنگوستیلەیەکی لە زێڕ دروستکردو، دەیخستە دەستی ڕاستی، جا خەڵکیش ئەنگوستیلەیان لە زێڕ دروست کرد، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەنگوستیلەکەی) فڕێداو فەرمووی: «لەمەو دوا هەرگیز نایخەمە دەستم»، خەڵکیش (بە هەمان شێوە) ئەنگوستیلەکانی خۆیان فڕێداو دایانکەند.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ کۆتایی بەم بەشە هێناوە بەم فەرموودە کە لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە دەربارەی ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی زێڕی هەبوو، کە ئەمە لە سەرەتادا بووە پێش قەدەغەکرانی، دوایی نەسخ کراوەتەوە

---

(١) برقم: ٢٠٩٥.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٨٦٥، ومسلم: ٢٠٩١، والمصنّف في جامعه: ١٧٤١.

(واتە: حەڕام کراو حەڵاڵیەکەی هەڵوەشایەوە)، بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فڕێیداو خەڵکیش هەر وەک ئەو فڕێیاندا، وە فەرمووی: لەمەودوا هەرگیز لە دەستی ناکەم.

ئەنگوستیلەی زێڕ دروست نیە بۆ پیاوان، بەڵکو مۆڵەتیان پێدراوە کە ئەنگوستیلەی زیو لە دەست بکەن، هەروەک لەو بارەوە پێشتر کۆمەڵێ فەرمووده هێنرا لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

## سوودێک:

پێشەوا نەوەوی رحمه الله دەڵێ: هەموو مسوڵمانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە سوننەتە ئەنگوستیلە لە پەنجەی توتە بکرێ، بەڵام ئافرەت لە هەر پەنجەیەکی بکات[1]، واتە: لە هەرکام پەنجەی دەستی حەز بکات و بیەوێ دەتوانێ ئەنگوستیلەی تێبخات، لەبەر ئەوەی ئافرەت کە لە دەستی دەکات مەبەستی پێی خۆڕازاندنەوەو جوان کردنە.

---

(١) شرح صحيح مسلم: ٧١/١٤.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی شمشێری پێغەمبەری خوا ﷺ





بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

ئەم بەشەو، هەروەها هەندێک لە بەشەکانی دیکە کە لە دوایی دێن، تایبەت کراوە بەو ئامێرو کەلوپەلە جەنگیانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەکاریدەهێنا، جا یەکەم شت کە دانەر باسی کردوە، بریتیە لە شمشێری پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی چۆنیەتیی و، ئەو ماددەی کەوا لێی دروستکراوەو، دەسکەکەی و، غەیری ئەوانەش لەو شتانەی کە پێیەوە پەیوەستن.

دانانی ئەم بەشە لە دوای ئەوەی دانەر ﷺ باسی بابەتی پێشتری کرد، کە مۆری پێغەمبەر ﷺ بوو - والله أعلم - خاڵێکی جوان و ناسکی تێدایە، کە بانگەواز کردن بە پێنووس و بە زمان لە پێشترە لە بانگەوازی کردن بە شمشێرو بە ڕم، چونکە ئەو مۆرەی کە پێغەمبەر ﷺ هەیبوو بۆ ئەوە دروستی کردبوو، تاوەکو مۆر بدات لەسەر ئەو نووسراوو نامانەی کە بۆ پادشاو سەرۆکەکانی دەناردن، ئەوانیش نووسراوی بانگەواز کردن بوون بۆ لای ئاییني خوا ﷻ، وە وریاکردنەوەیان و ئاگادارکردنەوەیان لەوەی کە بەسەریاندا دێ لە سۆنگەی بێبڕواییان بە خوا، وە بە درۆ زانینی ئەو هەقەی کە پێغەمبەر ﷺ پێی هاتوەو هێناویەتی، بۆیە باسی مۆرەکە کە بۆ بانگەواز بەکارهاتوە پێشی خستوە لە پێناوی بانگەوازی کردن، ئنجا هاتوە باسی ئەوەی کردووە کە پەیوەندی بە شمشێرەوە هەیە، وە بەوەوە دەزانرێ کە لە ڕاستیدا بانگەواز بە پێنووس و نووسین و ڕوونکردنەوەو ئامۆژگاری کردن و دڵسۆزی و ئاڕاستەکردنی قسەی خێر، لە پێشترە لە بانگەوازی کردن بە شمشێرو بە ڕم.

کە دەڵێ: «بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» (السيف): تاکی پاڵدراوە (مفرد مضاف)ـە، بنچینەش ئەوەیە کە هەر کات (مفرد) تاکێک پاڵدرایە لای کەسێک، یان شتێک، شتەکە دەگشتێنێ، پێغەمبەریش ﷺ وەک زانایان باسیان کردووە زیاتر لە شمشێرێکی هەبووە، بەڵکو هەندێکیان گەیاندوویانەتە نۆ شمشێر، کە دەگونجێ لە یەک کاتدا هەر هەمووی لەلابووبن، وە دەشگونجێ لە کاتە جیاوازەکاندا کۆی شمشێرەکانی کە هی پێغەمبەر ﷺ بوون، گەیشتبنە ئەم ژمارەیە کە ئەوەشیان

لە ڕاستیەوە نزیکترە، (إبن القيم) رحمه الله لە کتێبی (زاد المعاد)دا[١] کە باسی ناوی شمشێرەکانی پێغەمبەری ﷺ کردوە، کە هەندێک لە زانایان[٢] کۆیان کردۆتەوە لەم دوو دێرە شیعرەدا، دەڵێ:

لِهَادِينَا مِنَ الأَسْيَافِ تِسْعٌ[٣] رَسُوبُ، وَالمِخْذَمُ، ذُو الفِقَارِ

قَضِيبٌ، حَتْفُ، وَالبَتَّارُ، غَضبٌ وَقَلْعِي، وَمَأْثُورُ الفُجَارِ

١٠٥- عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: «كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ»[٤].

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێ: «ئەوەی بەسەر دەسکی شمشێرەکەی پێغەمبەری خواوە بوو ﷺ لە زیو دروست کرا بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، (قَبِيعَةُ): ئەوەیە کە لە قەراغی دەسکی شمشێرە بۆ ئەوەی لە دەست نەخزێ.

کە دەڵێ: «مِنْ فِضَّةٍ»، یانی: لە زیو دروستکرا بوو، ئەم فەرموودە ئەگەر جێگیر بێ و (صحیح) بێ، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مۆڵەتدراوە بەوەی کەوا شمشێرو وێنەی ئەو لەو کەلوپەلانەی جەنگی بە زیو برازێنرێنەوە، بەڵام لە سەنەدی ئەم فەرموودەدا (جرير ابن حازم الأزدي) هەیە کە ئەگەرچی متمانە پێکراویشە، بەڵام لەو فەرموودانەی کە لە قەتادەوە دەیگێڕێتەوە بە لاواز دانراوە، کە ئەو فەرموودەش لەو فەرموودانەیە کە لە قەتادەوە دەیگێڕێتەوە، وەک لە صەحیحی بوخاریدا[٥] هاتوە لە ئەبی ئومامەوە رضي الله عنه کە دەڵێ: {لَقَدْ فَتَحَ الفُتُوحَ قَوْمٌ مَا كَانتْ حِلْيَةُ سُيُوفِهِم الذَّهَبَ وَلاَ الفِضَّةَ، إِنَّمَا كَانَتْ حِلْيَتُهُمُ العَلابِيَّ وَالآنُكَ وَالحَدِيدَ}. واتە: بە دڵنیاییەوە کەسانێک فتوحاتیان کردو

---

(١) ١/١٣٠.

(٢) نظمها عبد الباسط سبط السرَّاج البلقيني، انظر التراتيب الإداريَّة: ١/٣٤٣.

(٣) ڕێنیشاندەرمان نۆ شمشێری هەبوو.

(٤) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٦٩١، وأبو داود في السُّنن: ٢٥٨٣.

(٥) برقم: ٢٩٠٩.

ناوچەکانیان ڕزگار کرد کە جوانکاری شمشێرەکانیان لە زێڕو زیو نەبوو، بەڵکو جوانکاری شمشێرەکانیان لە پێستەی خۆش نەکراوو قوڕقوشم و ئاسن بوو. (بەوانە شمشێرەکانیان دەڕازاندنەوە نەک بە زێڕو زیو).

١٠٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ ﷺ، قَالَ: «كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فِضَّةٍ»[1].

واتە: سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەن ﷺ دەڵێ: «دەسکی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زیو دروست کرابوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەنی بەصرِی کە برای زانای ناسراو حەسەنی بەصرِیە، دەڵێ: {عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي الْحَسَنِ قَالَ: «كَانَتْ»...} ئەوە (مُرْسَل)ـە، وە پێشەوا ئەبو داوود ﷺ گوتوویەتی: بەهێزترینی فەرموودەکان، فەرموودەی سەعیدی کوڕی ئەبو حەسەنە، ئەوانیتر هەموویان لاوازن.

١٠٧- عَنْ هُودٍ وَهُوَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: «دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَعَلَى سَيْفِهِ ذَهَبٌ وَفِضَّةٌ» قَالَ طَالِبٌ: فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْفِضَّةِ فَقَالَ: «كَانَتْ قَبِيعَةُ السَّيْفِ فِضَّةً»[2].

واتە: هود، کە ئیبنو عەبدوڵلای کوڕی سەعدە، لە باپیریەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «ڕۆژی ئازاد کردنی مەککە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە نێو مەککە، شمشێرەکەی زێڕو زیوی بەسەرەوە بوو»، تاڵیب (کە یەکێکە لە ڕاویەکان) دەڵێ: دەربارەی زیوەکە پرسیارم لێکرد (لە کوێی شمشێرەکە بوو) گوتی: «دەسکی شمشێرەکەی زیو بوو».

---

(١) أخرجه أبو داود في السُنن: ٢٥٨٤، وفي إسناده -كذلك- معاذ بن هشام؛ صدوقٌ ربَّما وهِم.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٦٩٠، وجاء في بعض النُّسخ: عن جدِّه لأمِّه، واسم جدِّه: مَزِيدة -على وزن كبيرة- ابن مالك، وقيل: مزيدة بن جابر، وهود بن عبد الله مجهولٌ، فالإسناد غير ثابتٍ، وهذا قال الذَّهبي في ميزان الاعتدال ٣٣٣/٢: وهذا منكرٌ؛ فما علمنا في حِلية سيفه ﷺ ذهبًا.




### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «قَالَ طَالِبٌ» کە ئەوە ئیبنو جوحەیرە کە لە هود ڕیوایەت دەکات، دەڵێ: «فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْفِضَّةِ»، واتە: پرسیارم کرد لە هود دەربارەی زیوەکە، «فَقَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ السَّيْفِ فِضَّةً» وەک ئەوەی پرسیار بکات دەربارەی ئەو شوێنەی کە زیو بوو لە شمشێرەکەدا، دیارە پێشتریش باسی مانای (قَبِيعَةُ) کرا، واتە: دەسکەکەی.

١٠٨- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ ﷺ قَالَ: «صَنَعْتُ سَيْفِي عَلَى سَيْفِ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ ﷺ، وَزَعَمَ سَمُرَةُ أَنَّهُ صَنَعَ سَيْفَهُ عَلَى سَيْفِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ حَنَفِيًّا»[1].

واتە: ئیبنو سیرین ﷺ دەڵێ: «شمشێرێکم دروستکرد لەسەر شێوەی شمشێری سەمورەی کوڕی جوندوب ﷺ، سەمورە پێی وا بوو شمشێرەکەی خۆی لەسەر شێوەی شمشێرەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروست کردوە، یان سەمورە نیسبەتی دا بۆ لای ئەحنەفی کوڕی قەیس، کە لەسەر شێوەی (شمشێرەکانی هۆزی) بەنی حەنیفە بووە».

١٠٩- حَدَّثَنَا عُقْبَةُ بْنُ مُكْرَمٍ الْبَصْرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَكْرٍ، عَنْ عُثْمَانَ بْنِ سَعْدٍ، بِهَذَا الْإِسْنَادِ نَحْوِهِ.

واتە: بە هەمان سەنەد ئەم فەرمودە گێڕدراوەتەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَكَانَ حَنَفِيًّا» ئەمە قسەی سەمورەیە، دەشگونجێ قسەی موحەممەدی کوڕی سیرین ﷺ بێ، کە وەسفی شمشێرەکەشی بەوە کراوە بەم شێوەیە، لەبەر ئەوە بووە کە لەسەر شێوەی شمشێرەکانی بەنی حەنیفە دروستکراوە، ئەوانیش بەوە ناسراون کە شمشێری زۆر جوان دروست دەکەن، وە دەشگونجێ بۆیە بەم شێوەیە وەسف کرابێ، چونکە پیاوێک لە پیاوانی بەنی حەنیفە دروستی کردبوو.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٦٨٣، وإسناده لأنّ فيه عثمان بن سعدٍ، وهو ضعيف.




دانەر ﷀ ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ زرێی بەکارهێناوە لە جەنگدا پۆشیویەتی، (الدرع): پۆشاکێکی ئاڵقە ئاڵقەییە لە ئاسن دروست دەکرێ، کەسی جەنگاوەر دەپارێزێ بە مۆڵەتی خوا لە لێدانی ڕم و تیرو شمشێرو وێنەی ئەوانە.

(الدرع): لێرەدا تاکی پاڵدراوە (مفرد مضاف)ـە کە بۆ گشتاندنە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە زرێیەکی هەبوو، (إبن القیم) ﷀ لە کتێبی (الزاد)دا[1] دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەوت زرێی هەبوون (ذات الفضول) کە ئەوەیانی بە بارمتە دانابوو لە لای ئەبو شەحمی جوولەکە، لە بەرامبەر هەندێک جۆ کە بۆ خاوو خێزانی لێی قەرز کردبوو، ئەندازەکەی سی صاع بوو، قەرزەکەش بۆ ماوەی یەک ساڵ بوو، زرێیەکەش لە ئاسن دروستکرابوو، (ذاتُ الوِشاح، وذَاتُ الحَواشي، وَالسَّعديَّة، وفضَّة، وَالبَتراء، وَالخِرنَق). (ئەوانە ناوی زرێیەکانی پێغەمبەر گیان ﷺ بوو).

پێغەمبەر ﷺ زرێیەک و دوو زرێی پۆشیوون، وە حەوت زرێشی هەبوون، لەگەڵ ئەوەی ئەو (پێغەمبەر ﷺ) گەورەو سەروەری ئەوانەیە کە زۆر پشتبەستوون بە خوا، وە زانایان لەوەوە ئەوەیان وەرگرتووە کە گرتنەبەری هۆکارەکان بۆ پارێزگاری و خۆپارێزی و وێنەی ئەوە، هیچ دژیەکیەکی نیە لەگەڵ پشتبەستن بە خوا ﷻ، بەڵکو حەقیقەتی پشت بەستن بە خوا ڕاوەستاوە لەسەر دڵ پەیوەست کردن بە خوا، وە گێڕانەوەی کارەکە بۆ لای خوا ﷻ، لەگەڵ بەکارهێنان و گرتنەبەری هۆکارەکان، نابێ مرۆڤ دڵی پەیوەست بکات بە هۆکارەکە، بەڵکو ئەو (مرۆڤ) بە تەواوی پشت بە خوا دەبەستێ و کارەکە حەواڵەی خوا دەکات و سەرەنجامەکەی بۆ لای ئەو دەگێڕێتەوە.

١١٠- عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ ﷺ قَالَ: «كَانَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ دِرْعَانِ، فَنَهَضَ إِلَى الصَّخْرَةِ فَلَمْ يَسْتَطِعْ، فَأَقْعَدَ طَلْحَةَ تَحْتَهُ، وَصَعِدَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى اسْتَوَى عَلَى الصَّخْرَةِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: أَوْجَبَ طَلْحَةُ»[2].

---

(١) ١/١٣٠.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٦٩٢، وفي إسناده محمّد بن إسحاق، وهو مدلّس وقد عنعن، لكن الحديث جاء في مسند الإمام أحمد: ١٤١٧، وفيه تصريحه بالسّماع.



واتە: زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ دەڵێ: «لە جەنگی ئوحودا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو زرێی لەبەردابوون، بە پەلە ویستی بڕوات بۆ سەر بەردەکە، کەچی نەیتوانی (سەر بکەوێ)، بۆیە تەڵحەی دانیشاند لە ژێری و پێغەمبەر ﷺ سەرکەوت هەتا چووە سەر بەردەکەو ڕاست بۆوە، (پاشان) گوتی: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: بەهەشت بۆ تەڵحە واجب بوو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ أُحُدٍ دِرْعَانِ»، ئەوانیش (ذات الفضول) و (فضّة) بوون (واتە: ئەو دوو زرێیەی لەبەردا بوو، کە لە بەنی قەینوقاعەوە دەستی کەوتبوو، واتە: لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەر ﷺ دوو زرێی بەستبوون، یەکێکیان لەسەر ئەویدیکەیان، ئا لەمەدا زێدە پارێزگاری و خۆپارێزی هەیە، کە ئەمەش بێگومان وەک پێشتریش باسمان کرد، هیچ دژیەکیەکی لەگەڵ پشتبەستن بە خوای پەروەردگاردا نیە، (إبن القیم) ﷺ دەڵێ: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەی پشتبەستووانە بە خوا، کەچی زرێی دەپۆشی، بەڵکو لە ڕۆژی ئوحود کاتێک کە دەرکەوت دوو زرێی پۆشیبوون لەسەر یەکتر، وە هەروەها بۆ ماوەی سێ ڕۆژان لە ئەشکەوت خۆی شاردەوە (کاتێک لە دەستی سەرانی قوڕەیش ڕایکرد)، (پێغەمبەر ﷺ) هۆکاری گرتبووە بەر نەک پشت ببەستێ بە هۆکار[1] (واتە: گرتنەبەری هۆکارەکان، بەشێکە لە پشتبەستن بە خوا).

کە دەڵێ: «فَنَهَضَ إِلَى الصَّخْرَةِ فَلَمْ يَسْتَطِعْ»، دەگونجێ نەتوانینەکە بە هۆی بەرزی و بڵندی بەردەکە بووبێ، یاخود بە هۆی قورسی لاشەی خۆی کە دوو زرێی لەسەر یەکتر پۆشیبوون، وە دەشگونجێ بە هۆی ئەوە بووبێ کە نەیتوانی بێ سەر بەردەکە بکەوێ، کەوا بریندار ببوو لە جەنگی ئوحوددا (بە قوربانی بین ﷺ)، هەموو ئەوانەش ڕێی تێدەچێ و گونجاوەو ئەگەرەکان دروستن.

کە دەڵێ: «فَأَقْعَدَ طَلْحَةَ تَحْتَهُ»، واتە: داوای لە تەڵحە ﷺ کرد لە ژێری دابنیشێ، بۆ ئەوەی وەک پەیژەی لێ بێ، تا بتوانێ سەر بەردەکە بکەوێ.

---

(١) الرُّوح: (ص ٣٤٧).




حیکمەت لەم سەرکەوتنەی بۆ سەر بەردەکە ئەوە بوو کە مسوڵمانان ببینن، ئەوانەی نزیکن لێیەوە یان دوورن، (گرنگ ئەوەیە بزانن پارێزراوەو زیندووە)، تا دڵنیابن لەسەر زیندوویەتی و دڵخۆش بن بەوە، وە هەروەها لە پێناوی ئەوەش کە هەموویان (دوای ئەو بینینە) لە دەوری کۆببنەوەو هێزیان بۆ بگەڕێتەوە، هێزو هەیبەتیش بێگومان لە کۆبوونەوەدایە.

کە دەڵێ: «حَتَّى اسْتَوَى عَلَى الصَّخْرَةِ»، واتە: تا بەرزبوویەوەو سەرکەوتە سەر بەردەکە، چونکە لە زمانی عەرەبیدا ئەوە بە مانای (استیواء) دێ، بۆیە کاتێک فەرمایشتی خوا ﷻ دەخوێنینەوە لە قورئاندا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾ طه. (کە -خوای- میهرەبانە کە بەرز بووە سەر عەرش و قەراری گرت -بەو شێوەی شیاوی بێت ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین-) لە ئەصڵی زماندا (إستوی) بە مانای (علا وارتفع) دێ، بەرزیی و بڵندییەک کە شایستەی تەواوی و گەورەیی خوای گەورەیە هیچ واتایەکی دیکەی جگە لەوە نیە، ئەو واتایە بۆ ئایەتەکەو وێنەی ئەو ئایەتە ئەوەیە کە زانایانی پێشین ﷺ لەسەری بوون و تەفسیریان کردوە.

کە دەڵێ: «أَوْجَبَ طَلْحَةُ»، واتە: بەهەشتی بۆ پێویست بووە، جا تەڵحەو زوبەیر (کە گێڕەرەوەی فەرموودەکەن)، هەردووکیان لەو دە کەسە بوون، کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە.

١١١- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ عَلَيْهِ يَوْمَ أُحُدٍ دِرْعَانِ، قَدْ ظَاهَرَ بَيْنَهُمَا»[1].

واتە: سائیبی کوڕی یەزید ﷺ دەڵێ: «لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەری خوا ﷺ دوو زرێی پۆشی بوون لەسەر یەکتر، (وەک پێشاندانی گرنگی و گەورەیی جەنگەکە)».

---

(١) أخرجه ابن ماجه في سننه: ٢٨٠٦، وهذا الحديث من قبل مراسيل الصَّحابة، وقد جاء في سنن أبي داود ٢٥٩٠: «عنِ السَّائِبِ بنِ يزِيدَ عَنْ رَجُلٍ قَدْ سَمَّاهُ -أي: من الصَّحابة- أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ الحديث».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

سائیبی کوڕی یەزید ﷺ هاوەڵێکی بچووکی پێغەمبەرە ﷺ لە ساڵی حەجی ماڵئاوایی لە تەمەنی حەوت ساڵیدا پێکراوە، وە کۆتا هاوەڵە کە لە مەدینە وەفاتی کردووە کە لە ساڵی نەوەدو یەکی کۆچی، وەفاتی کردووە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی کڵاوی سەربازی پێغەمبەری خوا ﷺ



بُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ مِغْفَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




**المِغفَر**: لە (الغَفر)ـەوە هاتوە واتە: داپۆشین، بریتیە لەو ئامێرە جەنگیەی جەنگاوەر لەسەری دەكات وەک كڵاوی ئاسن، لەسەر سەری دادەنێ وەک (الخوذة) كە لە ئاسن دروست دەكرێ بۆ پارێزگاری كردن و پاراستنی سەر، لە تیرو پێكەوتنی شمشێرو وێنەی ئەوانە.

١١٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ مِغْفَرٌ، فَقِيلَ لَهُ: هَذَا ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: «اقْتُلُوهُ»[1].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ چووە نێو مەككەوە (لە ساڵی ئازاد كردنی) كڵاوێكی سەربازی لە سەردا بوو، پێی گوترا: ئەوە ئیبنو خەتەڵە خۆی بە پەردەكانی كەعبە هەڵواسیوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «بیكوژن».

### شەرح و ڕوونكردنەوە:

كە دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ مِغْفَرٌ»، یانی: پێغەمبەر ﷺ كڵاوێكی سەربازی لە سەردا بوو، دواتریش لە دوای ئەم بەشەدا دێت، كە: «أَنَّهُ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»، واتە: پێغەمبەر ﷺ كاتێک چووە نێو مەككە مێزەرێكی ڕەشی لەسەر بوو، كە ئەمەش هیچ دژیەكیەكی تێدانیە، چونكە دەگونجێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووكیانی پێكەوە لەسەر كردبن، چونكە دەكرێ كڵاوی سەربازی بە تەنیا لەسەر بكرێ، وە هەروەها دەگونجێ كڵاوێكی سەربازی لەسەر كڵاوێكی ئاسایی لەسەر بكرێ، وە دەشگونجێ لەسەر كڵاوی سەربازییەوە مێزەریش لەسەر بكرێ، یاخود دوای هاتنی بۆ نێو مەككە كڵاوی جەنگی داكەندبێ و، پاشان مێزەرێكی ڕەشی لەسەر كردبێت.

كە دەڵێ: «فَقِيلَ لَهُ: هَذَا ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ»، لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتوە، كە ئەوەی ئەم قسەی كردووە سەعیدی ﷺ كوڕی حورەیس بووە.

ئیبنو خەتەڵ: یەكێكە لەو كەسانەی كە پێغەمبەر ﷺ خوێنی (كوشتنی) حەڵاڵ كرد لە ڕۆژی ئازاد كردنی مەككەدا، وە فەرمانی كرد بەوەی بكوژرێ لە هەر شوێنێک

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٠٤٤، ومسلم: ١٣٥٧، والمصنّف في جامعه: ١٦٩٣.



بەردەست و بەرپەل کەوتن، لە حەرەم بن، یان لە هەر شوێنێک، چونکە ئەو کەسە سەرەتا مسوڵمان بوو، ئنجا مسوڵمانێکی خزمەتکاری هەبوو کە خزمەتی دەکرد، دواتر ئیبنو خەتەڵ هەڵگەڕایەوەو کافر بوو، پاشان ئەو خزمەتکارە مسوڵمانەی خۆی کوشت، پاشان دەستی کرد بە جنێودان بە پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ (تەنانەت دوو ئافرەتی گۆرانی بێژی گرتبوو، گۆرانیان بۆ دەگوت، لە گۆرانیەکانیاندا جنێویان بە پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی دەدا).

(کەواتە هۆکاری کوژرانی ئەم ئیبنو خەتەڵـە بریتی بووە لەوەی مسوڵمانێکی بە ناهەق کوشتوەو، دژایەتی و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە)[1].

کە دەڵێ: «اقْتُلُوهُ»، واتە: فەرمانی کرد بە کوشتنی لە هەر شوێنێک بینرا، دەگوترێ: ئەبو بەرەزەی ئەسلەمی ﷺ کوشتویەتی، وە دەشگوترێ کەسی دی بووە کوشتویەتی، لە کاتێکدا ئەو کەسە لە نێوان ڕوکن و مەقامدا بووە (واتە: ئیبنو خەتەڵـە لە نێوان ڕوکن و مەقامدا بووە) بەڵام بە فەرمانی پێغەمبەری خواوە ﷺ کوژراوە.

١١٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ، وَعَلَى رَأْسِهِ الْمِغْفَرُ قَالَ: فَلَمَّا نَزَعَهُ جَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ لَهُ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ فَقَالَ: «اقْتُلُوهُ».

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ مُحْرِماً[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک چووە نێو مەککەوە (لە ساڵی ئازاد کردنی) کڵاوێکی سەربازی لە سەردا بوو، کاتێک (کڵاوەکەی) لەسەری داکەند، پیاوێک هات، پێی گوت: ئیبنو خەتەڵ خۆی بە پەردەکانی کەعبە هەڵواسیوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «بیکوژن».

ئیبنو شیهاب دەڵێ: پێم گەیشتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەدا (واتە: ساڵی ئازاد کردنی مەککە) ئیحرامی نەبەستبوو.

---

(١) وەرگێڕ.

(٢) موطأ الإمام مالك: ١٢٧١.




**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەمە سەنەدێکی دیکەیە، بۆ فەرموودەکەی ئەنەس رضي الله عنه.

کە دەڵێ: «قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وَبَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَوْمَئِذٍ مُحْرِمًا»، واتە: پێغەمبەر ﷺ بە ئیحرامەوە نەچۆتە نێو مەککە (بە مەبەستی حەج و عومرە)، ئەوەی بەڵگەو گەواهیدەرە لەسەر ئەمە کە لە بەشی دوایی دێ لە فەرموودەکەی، جابر رضي الله عنه گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک چووە نێو مەککە مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو: «أَنَّهُ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو کەسەی بیەوێ بچێتە نێو مەککە بۆ پێداویستیەکی خۆی نیەتی حەج و عومرەی نەبێ، پێویست ناکات و لەسەری نیە کەوا پۆشاکی ئیحرام بپۆشێ، پۆشینی ئیحرام لەسەر کەسێکە بچێتە نێو مەککە بە مەبەستی ئەنجامدانی حەج و عومرە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی مێزەری پێغەمبەری خوا ﷺ





بَابُ مَا جَاءَ فِي عِمَامَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




العمامة: ناوێکە بەکاردەهێنرێ بۆ هەر شتێک کە لەسەر بکرێ (یاخود لەسەر سەر دابنرێ)، وە دەشگوترێ: بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە، چونکە هەموو سەر دادەپۆشێ بە تەواوی، عیمامە (مێزەر) پۆشاکێک بووە کە لە کۆنەوە نەریتی عەرەب بووەو خوویان پێیگرتوە، پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ لەسەر ئەم نەریتە پۆشیویانە وە لەسەریان کردوە.

بنچینە لە پۆشاکدا ڕەواییە، بەندە بۆی هەیە چی پێ خۆشە بیپۆشێ، مادام شەرع نەهی لێ نەکردبێ، جا وەک یەکە ئەم شتە لەسەر دابنرێ، یاخود لاشەی پێ دابپۆشرێ، یاخود ئەوەی پێیەکانی پێ دابپۆشرێ، جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ مێزەری لەسەر کردوەو لە ژێرەوەش کڵاوی لەسەر کردوە، وە مێزەری لەسەر کردووە بەبێ کڵاو، جاری واش هەبووە کڵاوی لەسەر کردووە بەبێ مێزەر.

هەروەکو پێغەمبەریش ﷺ جاری وابووە لایەکی مێزەرەکەی شۆڕ دەکردەوەو، جاری واش هەبووە مێزەرەکەی لە هیچ لایەکەوە، هیچ بەشێکی و لایەکی شۆڕ نەدەکردەوە، هەروەکو پێشەوا (إبن القیم) ؒ ئەوەی ڕوونکردۆتەوە[1].

ئەم بەشە پەیوەستە بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی هاتوە دەربارەی مێزەری پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی شێوەو چۆنیەتی و ڕەنگی، هەروەها دەربارەی ئەو ئەحکامانەی کە پێیەوە پەیوەستن.

١١٤- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: «دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[2].

واتە: جابر ؓ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ چووە نێو مەککەوە لە ڕۆژی ئازاد کردنی (مەککەدا) مێزەرێکی ڕەشی لە سەردا بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لە بەشی پێش ئەمەدا، باسی ئەوە کرا پێغەمبەر ﷺ کاتێک چۆتە نێو مەککە، کڵاوێکی سەربازیی لەسەر بووە، وە لەم فەرموودەیەشدا کە دەڵێ: چۆتە نێو مەککەو

---

(١) انظر زاد المعاد: ١٣٥/١.

(٢) أخرجه مسلم: ١٢٥٨، والمصنّف في جامعه: ١٧٣٥.




مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بووە، هیچ دژیەکیەکی تێدانیە، بۆیە ئەگەری ئەوەی هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کڵاوە سەربازیەکەی لەسەر کردبێ بە مەبەستی پاراستنی سەری و لەسەر ئەوەشەوە مێزەری بەستبێ، وە دەشگونجێ سەرەتا کڵاوە سەربازیەکەی لەسەر کردبێ، پاشان کە حاڵەتەکە ئاسایی بوو (خەڵک بەرگریان نەکردووەو شەڕ دروست نەبووە لە نێوان مسوڵمانان و بێبڕوایانی مەککە)[1]، کڵاوە سەربازیەکەی داکەندووەو مێزەرێکی لەسەر کردوە.

زانایان باسی ئەوەیان کردووە کە پێغەمبەر ﷺ بە بەردەوامی مێزەری ڕەشی لەسەر نەکردوە، بە شێوەیەک کە ئەو مێزەرە ڕەشە ببێتە هۆی ناسرانەوەی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو مێزەری ڕەش و غەیری ڕەشیشی لەسەر کردوە، وە بۆیەش ئیبنو قەییم ﷺ لە کتێبی (زاد المعاد)دا[2] دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەردەوامی مێزەری ڕەشی لەسەر نەکردوە، وە ئەمە دروشمی نەبووە، کە لە جەژنەکان و هەینیەکان و کۆبوونەوە فراوانەکاندا مێزەری ڕەش لەسەر بکات، بەڵکو وا ڕێککەوتوە لەم کاتەدا کە ئازاد کردنی مەککە بووە مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بووە جگە لە هاوەڵانی (واتە: هەر ئەو مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بووە)، وە لەم ڕۆژەشدا هەموو پۆشاکەکەی ڕەش نەبووە، بەڵکو ئاڵاو بەیداغەکەی ڕەنگی سپی بووە.

١١٥- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[3].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حورەیس لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: «پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر مینبەر وتاری بۆ خەڵک دەداو، مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو».

---

(١) وەرگێر.

(٢) ٤٥٩/٣.

(٣) أخرجه مسلم: ١٣٥٩.




١١٦- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرُو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»[1].

واتە: جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حورەیس لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ خەڵکیداو، مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەم فەرموودەدا کە باسی ئەوە دەکات پێغەمبەر ﷺ مێزەری ڕەشی لەسەر کردوە، دانەری ئەم کتێبە لە دوو ڕێگا (طَريقة) هێناویەتی.

١١٧- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اعْتَمَّ سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ» قَالَ نَافِعٌ: «وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ ﷺ، يَفْعَلُ ذَلِكَ» قَالَ عُبَيْدُ اللَّهِ: «وَرَأَيْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسَالِماً يَفْعَلَانِ ذَلِكَ»[2].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر ﷺ گوتوویەتی: «پێغەمبەر ﷺ ئەگەر مێزەری لەسەر کردبایە یەک لە لایەکانی مێزەرەکەی بەردەدایەوە نێوان هەردوو شانەکانی». جا نافیع دەڵێ: «ئیبنو عومەر ﷺ ئەو کارەی ئەنجام دەدا (واتە: لایەکی مێزەری دەخستە نێوان هەردوو شانەکانی))»، عوبەیدوڵڵاش دەڵێ: «من بینیم قاسمی کوڕی موحەممەدو سالم هەمان کاریان ئەنجام دەدا».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «إِذَا اعْتَمَّ»، واتە: ئەگەر مێزەری لەسەر کردبا.

کە دەڵێ: «سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ»، واتە: لایەکی مێزەرەکەی شۆڕدەکردەوە لە نێوان هەردوو شانی موبارەکی.

---

(١) انظر الحديث الَّذي قبله، جاء في بعض النُّسخ ذكر التَّحويل في الإسناد في قوله: «حَدَّثَنَا مَحمُودُ بنُ غَيْلاَنَ»، أثبت قبلها حرف (ح) ثمَّ قال: وحدَّثنا...

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٣٦، وفي إسناده يحيى بن محمَّد المدني، وهو صدوقٌ يخطئ، لكنَّ للحديث طرقًا وشواهدَ يتقوَّى بها.

کە دەڵێ: «وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما، يَفْعَلُ ذَلِكَ»، یانی: ئیبنو عومەریش رضي الله عنهما، لە کاتی مێزەر بەستاندا هەمان شتی دەکرد، لایەکی مێزەرەکەی لە نێوان شانەکانیدا شۆڕدەکردەوە.

کە دەڵێ: «وَرَأَيْتُ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ، وَسَالِمًا يَفْعَلَانِ ذَلِكَ»، واتە: ئەوانیش بە هەمان شێوە لە کاتی مێزەر لەسەر کردن، لایەکی مێزەرەکەیان بە نێو شانەکانیاندا شۆڕدەکردەوە.

١١٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ النَّاسَ وَعَلَيْهِ عِصَابَةٌ دَسْمَاءُ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ وتاری دەدا بۆ خەڵک و مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ عِصَابَةٌ»، (العِصَابَة): بریتیە لەو شتەی لەف و لول دەدرێ و، سەری پێ دەپێچرێ، کە مانای مێزەر دەگەیەنێ.

کە دەڵێ: «دَسْمَاءُ»، (إبن الأثير) لە (النّهاية في غريب الحديث)دا دەڵێ: (سوداء) واتە: ڕەش[2].

بە هەرحاڵ ئەو فەرموودە بە پێی ئەو مانایە وەک هەردوو فەرموودەکەی جابرو عەمری کوڕی حوڕەیسە رضي الله عنهما کە دەڵێن: «وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ»، واتە: مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو ﷺ.

### ئاگاداریەک:

هیچ فەرموودەیەکی (صحيح) نەهاتوە دەربارەی فەزڵی لەسەرنانی مێزەر، وە هەرچی (صحيح)ـە لەم بەشەدا، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ مێزەری پۆشیوەو لەسەری ناوە، وە لەو بارەوە زۆر فەرموودەی ناڕاست دەگێڕدرێنەوە، جا ئەو فەرموودانە یان زۆر لاوازن، یان هەڵبەستراون، بۆ وێنە: {صَلاةٌ بِعِمَامَةٍ خَيْرٌ مِنْ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ صَلاةً بِلا عِمَامَةٍ}. واتە: نوێژێک بە مێزەرەوە بکرێ خێری زیاترە لە بیست و پێنج نوێژ بەبێ

---

(١) أخرجه البخاري: ٩٢٧.

(٢) ٢٦٨/٢.




مێزەر، (یان ئەم ڕیوایەتە): {جُمُعَةٌ بِعِمَامَةٍ خَيْرٌ مِنْ سَبْعِينَ جُمُعَةً بِلاَ عِمَامَةٍ}[١]. واتە: ئەنجامدانی جومعەیەک بە مێزەرەوە خێرترە لە حەفتا جومعە بەبێ مێزەر، وێنەی ئەو ڕیوایەتانە دروست نیە پاڵبدرێتە لای پێغەمبەر ﷺ.

جا ئەگەر پرسیار بکرێ: ئایا مێزەر لەسەرنان سوننەتە؟ بەمە وەڵامدەدرێتەوە کە بنچینە ئەوەیە مرۆڤ ئەم شتە بپۆشێ کە خەڵکی ناوچەکەی خۆی دەیپۆشن، خۆی جیانەکاتەوە بە هیچ شتێک لە خەڵکەکە، بە مەرجێک پێچەوانەی شەرع نەبێ، چونکە بە دڵنیایی پێغەمبەر ﷺ لێی گێردراوەتەوە نەهی کردووە لە پۆشینی پۆشاکێک ئەگەر بۆ ناوبانگ و کەشخەو فیزلێدان و خۆبەگەورەزانین بێت.

لەبەر ئەوە دروست نیە بۆ هیچ کەسێک کە زۆر بکات، یان توندی بکات لەسەر خەڵکی دیکە بۆ پابەند بوونیان بە پۆشینی پۆشاکێکی دیاریکراو، یان دیمەن و شێوازێکی دیاریکراو، نکوڵی هەر کەسێک بکات کە پێچەوانەی ئەوە بکات و سەرزەنشتی بکات.

چونکە بنچینە لە پۆشاک پۆشیندا ئەوەیە: مرۆڤ چی پێ خۆشە بیپۆشێ، مادام پێچەوانەی شەرع نەبێ، ئەگەر ئەو پۆشاکەی دەیویست بیپۆشێ پۆشاکی ناوبانگ و کەشخەو فیز بوو، پێی لە خەڵک جیادەبوویەوە، نابێ بیپۆشێ، بەڵکو ئەو پۆشاکەی کە نەریتی خەڵکەو خەڵک پێی ڕاهاتوە لەو شارو کۆمەڵگەو شوێنەی کە لێی دەژیێ ئەو پۆشاکە دەپۆشێ (والله تعالى أعلم).

هەروەها لە (فتاوى اللّجنة الدائمة)[٢] قسەی مامۆستایانی بەڕێزمان لەوبارەوە ئەوەیە: لەسەرنانی مێزەر لە نەریتی خەڵکەو عیبادەت نیە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ لەسەری ناوە، ئەویش لەبەر ئەوە بووە کە نەریتی خەڵکەکەی خۆی وابووە، وە هیچ فەرموودەیەکی ڕاست نیە لەبارەی فەزڵی مێزەر، جگە لەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەسەری ناوە، وا باشە بۆ مرۆڤ کە ئەوەی بۆی دەستەبەر دەبێ بیپۆشێ کە خەڵکی ناوچەکەی خۆی دەیپۆشن مادام قەدەغەکراو نەبێ.

---

(١) المصنوع في معرفة الحديث الموضوع: ١١٨/١.

(٢) ٤٤/٢٤.

کەسێک پرسیار دەکات: ئەو وازی لە شێوەی پۆشینی پۆشاک پۆشینی وڵاتی خۆی هێناوەو مێزەر دەپۆشێ (پێی وایە کە سوننەتە)، لە بارەی کەسێک کە لەو بارەوە پرسیار دەکات (وەڵامی لێژنەی فەتوا) ئەوەیە: کە پۆشینی مێزەر لە شتە ڕێگاپێدراوەکانەوەو سوننەت نیە وەک تۆ بۆی چووی و تێگەیشتووی، باشتر وایە لەسەر پۆشینی پۆشاکی خەڵکی وڵاتەکەی خۆت بمێنیەوە کە لە سەری دەکەن، لە جەمەدانی و وێنەی ئەوە (یانی: هەر کەسێک لە هەر وڵات و شوێنێک دەژی وەک شێوازی خەڵکی ناوچەکەی خۆی بەرگ و پۆشاک بپۆشێ).



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ئیزاری (پەشتەماڵی) پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ إِزَارِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

**الإزَار**: بریتیە لەو پۆشاکەی کە لە بەشی خوارەوەی لاشە دەپێچرێ (شەرواڵ)، (**الرداء**)یش: بریتیە لەو پۆشاکەی کە لەسەر شانەکان دادەنرێ و، بەشی سەرەوەی لاشەی پێ دادەپۆشرێ، وە ئەم پۆشاکە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ هەبووە، بۆیە چەندان فەرموودە دێ لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پۆشاکی (إزار)و (رداء)ی پۆشیوە، بەڵام تەنانەت یەک فەرموودەشی لێ نەگێردراوەتەوە دەربارەی فەزڵی پۆشینی (إزار)و (رداء)، بۆیە ڕاست نیە ئەگەر بگوترێ: پۆشینی (إزار)و (رداء) سوننەتە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ کە پۆشیویەتی وەک داب و نەریتی کۆمەڵگەی ڕۆژگاری خۆی پۆشیویەتی.

١١٩- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ ﵂، كِسَاءً مُلَبَّدًا وَإِزَارًا غَلِيظًا، فَقَالَتْ: «قُبِضَ رُوحُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَيْنِ»[1].

واتە: ئەبو بوردە گوتوویەتی: عائیشە ﵂ پۆشاکێکی کۆکراوەو ئیزار (پەشتەماڵ)ێکی ئەستووری بۆ دەرهێناین و پیشانی داین، جا گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو ئەم دوو (پارچە قوماش)ـانە، ڕووحی کێشرا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كِسَاءً مُلَبَّدًا»، مەبەست لە (كِسَاء) لێرەدا پارچە قوماشێکە کە نەدوورابێ، واتە: قوماش چۆنە، ئاوا وەک خۆی، جا پێغەمبەر ﷺ بەم پارچە پۆشاکە بەشێکی لاشەی سەرەوەی پێ دادەپۆشی، (الملبّد)یش ئەوەیە کە ناوەڕاستەکەی چڕبووبێتەوەو ئەستوور بووبێت، چوێنراوە بەوەی لەسەر یەک کەڵەکە بووبێ و کۆبووبێتەوە.

کە دەڵێ: «وَإِزَارًا غَلِيظًا»، ئەوەی کە بەشی خوارەوەی لاشەی پێ دادەپۆشرێ و لێی دەپێچرێ و ئەستوورە.

کە دەڵێ: «قُبِضَ رُوحُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَيْنِ»، یانی: کە پێغەمبەر ﷺ دونیای جێهێشت و جیابوویەوە لێی ئەم پۆشاکەی لەبەر بوو.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣١٠٨، ومسلم: ٢٠٨٠، والمصنّف في جامعه: ١٧٣٣.




١٢٠- عَنِ الْأَشْعَثِ بْنِ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَمَّتِي، تُحَدِّثُ عَنْ عَمِّهَا قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَمْشِي بِالْمَدِينَةِ، إِذَا إِنْسَانٌ خَلْفِي يَقُولُ: «ارْفَعْ إِزَارَكَ، فَإِنَّهُ أَتْقَى وَأَبْقَى» فَإِذَا هُوَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّمَا هِيَ بُرْدَةٌ مَلْحَاءُ قَالَ: «أَمَا لَكَ فِيَّ أُسْوَةٌ؟» فَنَظَرْتُ فَإِذَا إِزَارُهُ إِلَى نِصْفِ سَاقَيْهِ[١].

واتە: ئەشعەسی کوڕی سولەیم دەڵێ: لە پوورم بیست کە لە مامی دەیگێڕایەوە، گوتبووی: لە مەدینە بە ڕێگادا دەڕۆیشتم لە ناکاو یەکێک لە دوامەوە گوتی: «پەشتەماڵەکەت بەرز بکەوە»، ئاوا پارێزکارانەترەو زیاتر دەمێنێتەوە، (کە بینیم) ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە کراسێکی خەتداری ڕەش و سپییە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئایا من بۆ تۆ لەوەدا سەرمەشق نیم؟» جا تەماشام کرد بینیم ئیزارەکەی تا ناوەڕاستی لاقەکانی هەڵکردبوو.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

پۆشینی پەشتەماڵ (إزار) پێویستی بە ڕاهێنان هەیە، لەبەر ئەوەی هەرکات مرۆڤ دەڕوات بە ڕێگادا پۆشاکەکەی شۆڕدەبێتەوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە توندکردنی، وە فەرمووی: «ارْفَعْ إِزَارَكَ، فَإِنَّهُ أَتْقَى»، واتە: ئەوەی لە نێوان خۆت و خوادایە بە هێنانەدی داواکاریەکانی و ئەنجامدانی هەرکارێک کە داوای کردووەو وازهێنان لە هەر شتێک کە قەدەغەی کردوە، «وَأَبْقَى»، واتە: پۆشاکەکەت، چونکە ئەگەر بەرزت کردەوە (لە زەوی نەخشا) زیاتر دەمێنێتەوە لەلات، بە پێچەوانەی ئەوەی شۆڕی بکەیتەوەو لە زەوی بخشێ، چونکە زەوی کاریگەری لێدەکات، کۆن بوونی تێدا دروست دەکات، لە هەندێ ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: «فَإِنَّهُ أَنْقَى»، لە (نقاء) ـەوە هاتوە کە بریتیە لە پارێزرانی لە پیس بوون و وێنەی ئەوە.

هاوشێوەی ئەوە پێشەوا بوخاری ﷺ لە کتێبە صەحیحەکەی[٢] خۆی گێڕاویەتیەوە دەڵێ: لە کاتی پێکرانی (بە شمشێر لە پشتەوە لێدرانی) ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ کە خەڵک هاتن مەدح و ستاییشیان کرد، پیاوێکی گەنجیش

---

(١) مسند الإمام أحمد: ٢٣٠٨٦ و ٢٣٠٨٧، من رواية عمَّة الأشعث بن سليم، عن عمِّها، وهو وإن لم يُعرف فإنَّ جهالة الصَّحابي لا تضرُّ، وعمَّته لا تُعرف، وجاء في المسند للإمام أحمد ﷺ: ٢٣٠٨٧ تسميتها (رُهْم)، وهي مجهولةٌ؛ فالإسناد ضعيفٌ، لكن جاء له شاهدٌ في مسند الإمام أحمد: ١٩٤٧٢ من حديث الشَّريد ﷺ فيتقوَّى به.

(٢) ٢٧٠٠ من حديث عَمْرو بن ميمون ﷺ

هات گوتی: موژدەت لێ بێ ئەی ئەمیری بڕواداران بە موژدەیەکی خوا بۆت، لە هاوەڵیەتی پێغەمبەرِی خوا ﷺ و زوو مسوڵمانیەتیت و هەنگاوێک لە ئیسلامەتیدا ناوتە، پاشان بوویتە کاربەدەست و دادپەروەر بوویت، پاشان لە بە دەستهێنانی شەهیدبوون لە پێناوی خوادا، پێشەوا عومەر ﷺ فەرمووی: ئای چەندم پێخۆش بوو ئەو کابرایە دەستی لەسەرم هەڵگرتایەو خراپەی بۆم نەبووایە، هیچ چاکەیەکم لێ نەدەویست (مەبەستی کابرای مەجوسیە)[1]، جا کاتێک کە گەنجەکە ڕۆیشت و پشتی هەڵکرد، لەو کاتەدا پەشتەماڵەکەی بەر زەوی کەوت، پێشەوا عومەر ﷺ گوتی: ئەم گەنجەم بۆ بگەڕێننەوە، کاتێک کە گەڕایەوە، پێی گوت: برازای خۆم! پۆشاکەکەت بەرز بکەوە، چونکە ئەم کارەت وا دەکات پۆشاکەکەت زیاتر بەرگە بگرێ و بمێنێتەوەو، پارێزکاری زیاتریشی تێدایە بەرامبەر پەروەردگارت.

ئەم حاڵەتە حوکمەکەی تایبەتە بە پیاوان و ئافرەتان ناگرێتەوە، بۆیە کاتێک پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ القِيَامَة}. ئوممو سەلەمە ﷺ گوتی: ئایا ئەدی ئافرەتان چی بکەن لە پۆشاکی زیادیان، فەرمووی: {يُرخِينَ شِبْراً}، با بستێک بە دوایاندا بخشێ، گوتی: ئاخر ئەو کاتە پێیەکانیان دیاردەبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {فَيُرخِينَهُ ذِرَاعاً لايَزِدْنَ عَلَيْهِ}[2]. با باسکێک شۆڕ بێتەوەو لەوە زیاتر نەبێ، (الذِّرَاع): لە ئانیشک تاکو سەری پەنجەکان دەگرێتەوە.

ئافرەت فەرمانی پێکراوە بە خۆداپۆشین، ئەوەش بۆیان بە پارێزران و قەڵایەک دادەنرێ، وە پارێزگارییان لە تەماشاکرانی خراپ و گوناهبارانە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە درێژکردن و شۆڕکردنەوەی پۆشاکیان، ئەگەرچی هەندێک لە پۆشاکەکە پیس دەبێ، بەڵام بەرژەوەندیە گەورەو باشەکە لەوەدایە پێیەکانیان دابپۆشرێ و دیار نەبن.

کە دەڵێ: «فَإِذَا هُوَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»، واتە: ئەو کەسەی قسەی کرد، پێغەمبەری خوا بوو ﷺ.

---

(١) یان دەگونجێ -والله أعلم- لە دوای بیستنی وتەکانی گەنجەکە بەو جوانییە کە پێشەوا وەسفی کرد، گوتبێتی: ئاواتەخوازم خوا ئەوەندە کارەم لێوەربگری، پێی ڕازیم و لەوە زیاترم ناوێ. (ئەم واتایە لە ڕاستی نزیکترە والله أعلم).

(٢) أخرجه الترمذي في جامع: ١٧٣١، وابن ماجه في السنن: ٣٥٨٠.



کە دەڵێ: «إِنَّمَا هِيَ بُرْدَةٌ مَلْحَاءُ»، واتە: پۆشاکەکە دوو ڕەنگ بوو، واتە: پۆشاکەکە لە دوو ڕەنگ پێکهاتبوو، ڕەش و سپی، وەک ئەوەی خوا لێی ڕازی بێ (والله تعالى أعلم) بیەوێ ئاماژە بکات بەوەی ئەم جۆرە پۆشاکە بەم شێوەیە لەو پۆشاکانە نیە کە بۆ شانازیی و فیزکردن و خۆبەگەورە زانین بپۆشرێ، هەرچەندە ئەگەر بێتە خوار گۆزینگەکانیش، بەڵکو پۆشاکێکی سادەو خاکیانەیە.

پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: «أَمَالَكَ فِيَّ أُسْوَةٌ؟ فَنَظَرْتُ فَإِذَا إِزَارُهُ إِلى نِصْفِ سَاقَيْهِ»، واتە: ئایا لە مندا باشترین پێشەنگی نیە بۆ تۆ؟ منیش تەماشام کرد بینیم ئیزارەکەی تا نیوەی قاچی هاتوە.

وە لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە خەڵکی خوا هیدایەتیان بدات و حاڵیان بۆ چاک بکات، بەردەوامن لەسەر پۆشینی پۆشاکی درێژ، کاتێک دەچن بۆ لای بەرگدوور داوای لێ دەکەن ئیزارەکەیان بۆ بێنێتە خوار گۆزینگەکانیان، دوایش دەڵێن: بۆ کەشخەو فیزو خۆبەگەورەزانین درێژی ناکەین و شۆڕی ناکەینەوە.

جا کاتێک مسوڵمان دەزانێ کە چەندان فەرموودەی زۆر هاتوون لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربارەی ورياکردنەوەو ئاگادارکردنەوەیان لە درێژ کردنەوەی ئیزار، وەک دەفەرموێ: {مَا أَسفَلَ مِنَ الكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ فَفي النَّار}[١]. واتە: هەر کەسێک ئیزارەکەی شۆڕ بێتەوە خوار گۆزینگەکانی ئەوە لە نێو ئاگرە، یان دەفەرموێ: {ثَلاثَةٌ لا يُكَلِّمَهُمُ اللَّهُ يَومَ القِيَامَةِ، وَلا يَنْظُرُ إِلَيْهِم، وَلآ يُزَكِّهِم، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ، المُسْبِلُ، وَالمَنَّانُ، وَالمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالحَلِفِ الكَاذِب}[٢]. واتە: سێ کەس هەن خوا لە ڕۆژی دواییدا قسەیان لەگەڵ ناکات، وە تەماشایان ناکات، و پاکیشیان ناکاتەوە، وە سزایەکی بە ئێش و ئازاریشیان بۆ هەیە، ئەو کەسەی پۆشاکی شۆڕ دەکاتەوە خوار گۆزینگەکانی، وە ئەو کەسەی دەبەخشێ و منەت بەسەر کەسی پێبەخشراو دەکات، وە ئەو فرۆشیارەی بە درۆ سوێند دەخوات تا کەلوپەل و کاڵاکەی ساغ دەکاتەوەو دەیفرۆشێ، چۆن ڕازی دەبێ لە خۆی ئەم کارە ئەنجام بدات، لە کاتێکدا ئەم هەڕەشە توندو سەختەشی

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٧٨٧ من حديث أبي هريرة ﷺ.

(٢) أخرجه مسلم: ١٠٦ من حديث أبي ذر ﷺ.

لەسەرە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پەشتەماڵ درێژکردن و شۆڕکردنەوە لە گوناهە گەورەکانە.

١٢١- عَنِ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، قَالَ: كَانَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ ﷺ، يَأْتَزِرُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ، وَقَالَ: «هَكَذَا كَانَتْ إِزْرَةُ صَاحِبِي»، يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ[1].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەڵێ: عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ ئیزارەکەی هەڵدەکردو بۆ نیوەی لاقەکانی و، دەیگوت: «شێوازی پەشتەماڵی هاوەڵەکەشم بەم شێوەیە بوو». واتە: (ئیزاری) پێغەمبەر ﷺ.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «يَأْتَزِرُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ»، یانی: ئیزاری هەڵدەکێشا تاکو ناوەڕاستی لاقەکانی دەهات.

کە دەڵێ: «هَكَذَا كَانَتْ إِزْرَةُ صَاحِبِي -يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ-»، (إزرة): ناوە بۆ شێواز، یانی: پێغەمبەر ﷺ ئیزارەکەی بەم شێوەیە بوو کە ئاوا هەڵیدەکێشا تاکو ناوەڕاستی لاقەکانی.

١٢٢- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَضَلَةِ سَاقِي أَوْ سَاقِهِ فَقَالَ: «هَذَا مَوْضِعُ الْإِزَارِ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَأَسْفَلَ، فَإِنْ أَبَيْتَ فَلَا حَقَّ لِلْإِزَارِ فِي الْكَعْبَيْنِ»[2].

حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ماسولکەی قاچی من، یان هی خۆی گرت (ڕاوی دڵنیا نیە کامیان بوو)، ئنجا فەرمووی: «ئێرە جێگەی ئیزارە، ئەگەر نەتویست خوارتر، ئەگەر هەر نەتویست، ئەوە با پەشتەماڵ و شەڕواڵ و پانتۆڵ گۆزینگ (کەعب)ـەکان داپۆشێ».

---

(١) في الإسناد موسى بن عبيدة؛ ضعيفٌ.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٨٣، وابن ماجه في السنن: ٣٥٧٢، وفي إسناده أبو إسحاق، وهو مدلِّسٌ وقد عنعن، فيه أيضًا مسلم بن نذير؛ مقبولٌ، والمقبول لا يُحتجُّ بحديثه إلاَّ إذا وجد مَن يتابعه عليه.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «بِعَضَلَةِ سَاقِي أَوْ سَاقِهِ»، یەکێک لە ڕاویەکان گومانی لەم دوو بێژە هەیە، (عَضَلَةِ السَّاقِ) بریتیە لەو گۆشتە پتەوەی لە پشتەوەی قاچ (خوار ڕان)ـە، کەمێک لە سەرووی قاچەوەیە، هەروەک فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە رضي الله عنه بەڵگەیە بۆ ئەوەو گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {إِزْرَةُ الْمُؤْمِنِ إِلى عَضَلَةِ سَاقَيهِ، ثُمَّ إِلى نِصْفِ سَاقَيْهِ، ثُمَّ إِلى الكَعْبَينِ، فَمَا كَانَ أَسْفَلَ مِنْ ذَالِكَ فَهُوَ فِي النَّارِ}[١]. واتە: ئیزاری بڕوادار تاکو کەمێک سەرووی قاچە، دوایی تاکو ناوەڕاستی قاچە، دوایی تاکو هەردوو گۆزینگەکانە، ئەوەی لە خوار ئەمەوە بێ ئەوە لە نێو ئاگرە.

کە دەڵێ: «فَإِنْ أَبَيْتَ فَلَا حَقَّ لِلْإِزَارِ فِي الْكَعْبَيْنِ» یانی: نابێ ئیزار بێت بۆ خوار گۆزینگەکان، ئەمەش مانای حەڕام بوون دەگەیەنێ.

ئەوەی شۆڕدەبێتەوە لە ناوەڕاستی لاقەکانیش تا گۆزینگەکان شوێنێکی جێگیرن و لە سوننەتدا ڕێگاپێدراوە، هەموو زانایان لەسەر ڕێگاپێدراویی یەکدەنگن، لەسەر ئەوەی هیچ ناپەسندیەکی تێدانیە، لەبەر کۆمەڵێک فەرموودە، لەوانە ئەو فەرموودەی عەلائی کوڕی عەبدوڕڕەحمانە کە لە باوکیەوە دەڵێ: پرسیارم کرد لە ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەربارەی ئیزار، ئەویش گوتی: لە کەسێکی شارەزات پرسیوە: {إِزْرَةُ الْمُسْلِمِ إِلَى نِصْفِ السَّاقِ وَلَا حَرَجَ أَوْ لَا جُنَاحَ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَعْبَيْنِ فَمَا كَانَ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ فَفِي النَّارِ مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ بَطَرًا لَمْ يَنْظُرْ اللَّهُ إِلَيْهِ}[٢]. واتە: ئیزارو پەشتەماڵی مسوڵمان تاکو نیوەی لاقیەتی و، هیچ گوناهی تێدانیە ئەگەر لە نێوان لاق و گۆزینگیش بێ، بەڵام ئەگەر لەمە زیاتر بێتە خوار، ئەوە لە نێو ئاگرە، هەر کەسێک ئیزارەکەی درێژ بکات و لە دوای بخشێ بە هۆی خۆبەگەورە زانین، ئەوە خوا تەماشای ناکات لە ڕۆژی دوایی.

---

(١) مسند أحمد: ٧٨٥٧، وأخرجه النسّائي في السنن الكبرى: ٩٧٠٩.

(٢) مسند أحمد: ١١٣٩٧.

ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە هەندێک لە گەنجانی نەزان و نەشارەزا (لە ئایین) ئەگەر کەسێکیان بینیبا ئیزارەکەی تا نیوەی لاقیەتی گاڵتەیان پێدەکرد، پاشان دواتر کە ڕۆژئاواییەکان دوای ماوەیەک پانتۆڵێکیان لەپێ کرد (بە ناوی سێ چارەگ نزیکەی) تا ئەژنۆیان دەهات ئەوانیش لاساییان کردنەوەو، بەو شێوەیە دەڕۆیشتنە دەرەوە بۆ سەر شەقامەکان، دواتر ڕۆژئاواییەکان بۆ خۆیان وەک مۆدێلێک پانتۆڵەکانیان شەق شەق کرد، بە هەمان شێوە ئەوانیش (ئەو گەنجە مسوڵمانە نەزانانە) لاساییان کردنەوە لەم کارەشدا، پانتۆڵی تەسک و شەقکراویان لە پێ کرد، بێگومان ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو گەنجانە دڵیان نەخۆشە، کاتێک پشتیان هەڵکرد، بەڵکو گاڵتەیان کرد بە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کە باشترینی ڕێنماییکارانە، ڕوویان کردە شتانێکی پووچ کە لە لایان دوژمنەکانیانەوە بۆیان هاتوە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بە ڕێگادا ڕۆیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي مِشْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

المِشيَة: ناوە بۆ شێوەو هەیئەت، وە ڕێبازو شێوازی پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆیشتن بە ڕێگادا تەواوترین شێوە بووەو، مامناوەند بوو، هەروەک لە هەموو کاروبارەکانیدا، هەر مامناوەند بووە، وەک: کارکردن بە فەرمایشتی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ ﴿١٩﴾ ﴾ لقمان. (وە لە ڕۆیشتندا مام ناوەندی بە -نە هێواشبە نە پەلە پەل-).

١٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: «وَلَا رَأَيْتُ شَيْئاً أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّ الشَّمْسَ تَجْرِي فِي وَجْهِهِ، وَمَا رَأَيْتُ أَحَداً أَسْرَعَ فِي مِشْيَتِهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّمَا الْأَرْضُ تُطْوَى لَهُ، إِنَّا لَنُجْهِدُ أَنْفُسَنَا وَإِنَّهُ لَغَيْرُ مُكْتَرِثٍ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: «هیچ شتێکم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ جوانتر بێ، وەک ئەوەی کە خۆر لە نێو ڕوویدا بێ (نووری پێ بەخشیبێ)، وە هیچ کەسیشم نەبینیوە لە ڕۆیشتندا خێراتر بووبێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ، وەک ئەوە وابوو کە زەوی بۆ وێک هێنرابێتەوەو پێچرابێتەوە، (لەکاتی ڕۆیشتنی) ئێمە بۆ پێگەیشتنی خۆمان ماندوو دەکردو، ئەویش ئاسایی بوو بەسەرخۆی نەدەهێناو خۆی ماندوو نەدەکرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَلَا رَأَيْتُ شَيْئاً أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، نەیگوت هیچ مرۆڤێکم نەبینیوە، بەڵکو گوتی: هیچ شتێکم نەبینیوە، بۆ ئەوەی بیگشتێنێ بۆ هەموو ئەو شتانەی کە بینیویەتی لە مرۆڤ و مانگ و ڕۆژو غەیری ئەوانەش، لەو شتانەی کەوا زۆر جوان و ڕازاوەو ناوازەن.

کە دەڵێ: «كَأَنَّ الشَّمْسَ تَجْرِي فِي وَجْهِهِ»، یانی: لەبەر زۆری شەوقی ڕووخساری ﷺ و درەوشاوەیی، کەسی تەماشاکار وایدەزانی خۆر لە ڕووخساریدا دەدرەوشێتەوە، وە ئەم ڕووناکی و درەوشاوەییەش شتێکی هەستکراو نەبووە، بە جۆرێک دەوروبەری ڕووناک بکاتەوە وەک پێشتریش باسمان کرد، وە ئەوەش کە پاڵدراوەتە لای ئیبنو عەبباس ﷺ کە گوتبێتی: (لَا ظِلَّ لَهُ) واتە: پێغەمبەر ﷺ سێبەری نەبووە، ڕاست نیەو قسەیەکی پووچە.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٦٤٨ وفي إسناده ابن لهيعة وهو صدوق اختلط، لكنّه توبع عليه، فقط رواه ابن حبّان في صحيحه: ٢١٦/١٤ من طريق عمرو بن الحارث عن أبي يونس به.




که دەڵێ: «وَمَا رَأَيْتُ أَحَداً أَسْرَعَ فِي مِشْيَتِهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّمَا الْأَرْضُ تُطْوَى لَهُ»، یانی: وەک ئەوەی زەوی بۆ خڕکرابێتەوەو هەندێکی لە هەندێکی نزیک کرابێتەوە.

که دەڵێ: «إِنَّا لَنُجْهِدُ أَنْفُسَنَا وَإِنَّهُ لَغَيْرُ مُكْتَرِثٍ»، یانی: بە شێوەیەک دەڕۆیشت بێ ئەوەی خۆی ماندوو بکات، یاخود زەحمەت و زۆر لە خۆی بکات، بەڵکو ڕۆیشتنێکی ئاسایی دەڕۆیی، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هاوەڵان خۆیان ماندوو دەکرد تاکو بتوانن لەگەڵیدا بە ڕێگادا بڕۆن، لەمەدا ئاماژەی بەهێزی لاشەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە.

١٢٤- عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى غُفْرَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُحَمَّدٍ، مِنْ وَلَدِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ قَالَ: كَانَ عَلِيٌّ إِذَا وَصَفَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «كَانَ إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ»[1].

واتە: عومەری کوڕی عەبدوڵڵا مەولای غوفرە دەڵێ: ئیبڕاهیمی کوڕی موحەممەد کە یەکێکە لە منداڵانی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب رضي الله عنه، گوتوویەتی: عەلی کاتێک وەسفی پێغەمبەری ﷺ دەکرد دەیگوت: «(پێغەمبەری خوا ﷺ) کاتێک ڕۆیشتبا هەنگاوی دەنا، وەک ئەوەی لە شوێنێکی بەرز بێتە خوارەوە (واتە: وەک کەسێکی نەخۆش و سیس و سست دەرنەدەکەوت)»[2].

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

پێشتر ئەم فەرموودە ڕابرد، شوێنی مەبەست لێرەدا ئەم بڕگەیە کە دەڵێ: «كَانَ إِذَا مَشَى تَقَلَّعَ» یانی: پێی بە تەمبەڵیی و خاوی لەسەر زەوی بەرز نەدەکردەوە، بەڵکو بە بەهێزیەوە بەرزی دەکردەوەو هەنگاوی دەنا، وە بەهێزەوە بە ڕێگادا دەڕۆیشت بە هۆی تەواوی هێزو لاشەو جەستەی پێغەمبەر ﷺ.

کە دەڵێ: «كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ» یانی: وەک ئەوەی لە شوێنێکی بەرزبێتە خوارەوە، پێشتر ئەوەش ڕوونکراوەتەوە.

١٢٥- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤاً كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ»[3].

---

(١) انظر: (ح ٧).

(٢) وەرگێڕ.

(٣) انظر: (ح ٥،٦).




واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷛، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ کاتێ کە دەڕۆیشت بە ڕێگادا بە شێوەیەکی مامناوەندی و ئاسایی دەڕۆیشت، وەک ئەوەی لە شوێنێکی بەرز بێتە خوارەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەش پێشتر ڕوونکرایەوە، هەمان مانای فەرموودەی پێش خۆی دەگەیەنێ، کە دەڵێ: «إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ تَكَفُّؤًا»، بەم فەرمایشتە تەفسیری کردووە «كَأَنَّمَا يَنْحَطُّ مِنْ صَبَبٍ»، (الصبب): بریتیە لە هاتنەخوار لەسەر زەویەکی لێژو بەرز.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی سەرداپۆشین (قناع)ی پێغەمبەری خوا ﷺ






التَّقَنُّع: بریتیە لە دانانی قیناع لەسەر سەر، مەبەستیش لێی داپۆشینی تەواوی سەری مرۆڤە بە پارچە قوماشێک، یاخود وێنەی پارچە قوماشێک، مرۆڤ لە کاتی پرچ چەورکردندا بە زەیت پێویستی پێی دەبێ، بۆ ئەوەی پۆشاکی پارێزراو بێ لە زەیتەکە، کە لەسەر سەری دادەنرێ.

١٢٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ الْقِنَاعَ كَأَنَّ ثَوْبَهُ ثَوْبُ زَيَّاتٍ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ قیناعی زۆر بە کاردەهێنا، هەتا (هەندێک جار هێندە پرچی چەور دەکرد) پۆشاکەکەی وەک پۆشاکی زەیت فرۆش دەهاتە پێش چاو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُكْثِرُ الْقِنَاعَ» قیناعی زۆر لەسەر سەری دادەنا ﷺ هەتا ئەو ئەندازەیەی «كَأَنَّ ثَوْبَهُ ثَوْبُ زَيَّاتٍ» وەک پۆشاکی ئەو کەسەی کاری زەیت دەکات، شوێنەوارو دڵۆپی زەیتی بەسەرەوە دیارە، پێشتریش ئاگاداریماندا لەسەر لاوازی ئەو فەرموودەیە، ئەوەش لە مەتنی فەرموودەکەدا هەیە زیاتر ڕوونکەرەوەیەتی.

وە لە صەحیحی بوخاریدا[2] هاتوە کە زۆر گونجاوە بۆ ئەو شوێنە دایکمان عائیشە ﷺ گوتوویەتی: ئێمە ڕۆژێک دانیشتبووین لە ماڵی ئەبو بەکر ﷺ لە کاتێکدا خۆر گەیشتبووە ئەوپەڕی بەرزیەتی، دەڵێ: بە ئەبوبەکر ﷺ گوترا ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ قیناعی کردووە (یانی: سەری داپۆشیوە)، (إبن القيم) ﷺ لە کتێبی (زاد المعاد)دا[3] دەڵێ: بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەم کاتەدا ئەو کارەی کردووە تا دیار نەبێ، وە ئەمەشی بۆ پێویستی ئەنجامداوە، ئەگەرنا نەیکردبووە نەریت بە بەردەوامی سەرو ڕووخساری داپۆشراو بێت.

---

(١) تقدَّم بسنده ومتنه عند المصنِّف برقم: ٣٣.

(٢) برقم: ٣٩٠٥.

(٣) ١٣٧/١.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی (شێوەی) دانیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي جِلْسَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




**الجِلسة**: بە ژێرە (الكسر) ناوە بۆ شێوەو هەیئەتێک، مەبەست لەم بەشەدا ڕوونکردنەوەی شێوەی دانیشتنی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

**١٢٧- عَنْ قَيْلَةَ بِنْتِ مَخْرَمَةَ رضي الله عنها، أَنَّهَا رَأَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ وَهُوَ قَاعِدٌ الْقُرْفُصَاءَ قَالَتْ: «فَلَمَّا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ الْمُتَخَشِّعَ فِي الْجِلْسَةِ أُرْعِدْتُ مِنَ الْفَرَقِ»[1].**

واتە: قەیلەی کچی مەخرەمە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: کە ئەو پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە لە نێو مزگەوت دانیشتوە بە شێوەی (الْقُرْفُصَاءَ)، جا دەڵێ: «کە تەماشام کرد، دەبینم هێندە بە ملکەچی و سادەیی دانیشتوە، لە ترسان موچڕکەو تەزووم پێداهات».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودە پێشتر بەشێکی لێ باسکرا، کە خۆی فەرموودەیەکی زۆر درێژە، دەربارەی مسوڵمان بوونی قەیلەی کچی مەخرەمە رضي الله عنها، جا کە دەڵێ: «**وَهُوَ قَاعِدٌ الْقُرْفُصَاءَ**»، زانایان رحمهم الله دوو سیفەتیان بۆ شێوازی ئەم جۆرە دانیشتنە باسکردوە:

**یەکەمیان:** ئەوەیە مرۆڤ لەسەر سمتی دابنیشێ و ڕانەکانی بە سکیەوە بنوسێنێ و بە دەستەکانی توند بیگرێ، ئا ئەوە بەو شێوەیە وەسف کراوە، چونکە لاشە دێتەوە یەک، یانی: کۆدەبێتەوەو هەندێکی دێتەوە نێو هەندێکی، ئەم شێوەیە لە دانیشتن پێشی دەگوترێ: (الإحتباء).

**دووەمیان:** (کەسەکە لەسەر ئەژنۆکانی دادەنیشێ وەک دانیشتن بۆ خوێندنی تەحیات) پاشان سکی بە چۆکیەوە دەنووسێنێ، دەستەکانیشی دەخاتە ژێر بنباڵەکانیەوە.

وە کە دەڵێ: «**أُرْعِدْتُ**»، تووشی موچڕکەو لەرزین بووم، کە بریتیە لە تەزوو هاتن بە لاشەدا، «**مِنَ الْفَرَقِ**»، یانی: لە ترسان، بە هۆی ئەو گرانی و سام و هەیبەتە کە خوا ﷻ بە پێغەمبەری خۆی دابوو ﷺ.

---

(١) أخرجه أبو داود في السنن: ٤٨٤٧.

١٢٨- عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﷺ، «أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى»[1].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم لە مامی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: «پێغەمبەری ﷺ بینیوە لە مزگەوت لەسەر پشت ڕاکشاوەو درێژ بووە، قاچێکی خستۆتە سەر ئەوەی دیکەی».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

مامی عەبباد ناوی عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصیمە ﷺ هاوەڵێکی گەورەو بەڕێزی پێغەمبەر بووە ﷺ، بەشداری پەیمانی عەقەبەو جەنگی بەدرو هەموو جەنگەکانی دیکەی کردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، وە ئەو کەسەشە کە لە خەوندا شێوەی بانگی پێ نیشاندرا، بەشداریشی کردووە لە کوشتنی موسەیلەمەی درۆزندا.

کە دەڵێ: «مُسْتَلْقِيًا»، یانی: (ڕاکشابوو) لەسەر پشتی (خەوتبوو لەسەر پشت)، «وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى» وەک یەکە لەمەدا دانانی یەکێک لە پێیەکان لەسەر ئەویتر، لەو کاتەشدا پێیەکانیش درێژکرابن، یاخود بە چەقاندن و ڕاستکردنەوەی یەکێک لە پێیەکان و دانانی ئەویتر لەسەری.

ئەم شێوە ڕاکشانە هەندێک جار مرۆڤ ئەنجامی دەدات کاتێک پێویستی بە پشوودان دەبێ، چونکە ئەم شێوەیە لە ڕاکشان حاڵەتێک نیە مرۆڤ لە سەرەتاوە پێی ڕاهاتبێ و هۆگری بووبێ و بەو هۆیەوە ئەنجامی بدات، بۆیە لە مزگەوت و شوێنی قەرەباڵغ زۆر ئەنجام نادرێ، بەڵکو مرۆڤ کاتێک ئەنجامی دەدات کە مزگەوت یان غەیری مزگەوت چۆڵەو خاڵیە لە مرۆڤ، یاخود لە نێوان چەند کەسێک کە ژمارەیان کەمە لە نێوان هاوەڵەکانی ئەویش لە کاتی پێویستی بە پشوودان ئەنجام دەدرێ.

پێشەوا موسلیم ﷺ لە (صحیح)ـەکەی خۆیدا دەیگێڕێتەوە لە جابرەوە ﷺ: {أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ اشْتِمَالِ الصَّمَّاءِ وَالإِحْتِبَاءِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ وَأَنْ يَرْفَعَ الرَّجُلُ إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٢٨٧، ومسلم: ٢١٠٠، والمصنّف في جامعه: ٢٧٦٥.




الأُخرى وَهُوَ مُسْتَلْقٍ عَلى ظَهْرِهِ}[١]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە کە (مسوڵمان) پۆشاکێک لەبەر بکات هیچ دەرچەیەکی نەبێ و خۆی تێدا شەتەک بدات و لە خۆی ئاڵاندبێ، وە هەروەها لە دانیشتن لەسەر سمت و، ڕانەکانی بە سکیەوەو بلکێنێ و بە دەستەکانی خۆی پێ قایم بکات و شەتەکی بدات لە پۆشاکێکدا، لە کاتێکدا ڕاکشاوە لەسەر پشت.

هەندێک لە زانایان گوتوویانە: دەکرێ تەوفیق و کۆبوونەوە لە نێوان هەردوو فەرموودەکەدا بەم شێوەیە بکرێ: فەرموودەکەی نەهی تێدایە بۆ ئەو حاڵەتەیە کاتێک کە مرۆڤ دڵنیانیە لە ئاشکرانەبوون و بەدەرنەکەوتنی عەورەتی، وەک ئەو کەسەی پەشتەماڵەکەی لە خۆی پێچاوەو ئاسانە دەرکەوتی عەورەتی، بەڵام ئەگەر دڵنیابوو لە دەرنەکەوتنی و ئاشکرا نەبوونی عەورەتی، هیچ سەغڵەتیەکی تێدا نیە، وەک ئەو کەسەی شەرواڵ و پانتۆڵ و ئەو شتانەی پۆشیوە.

١٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا جَلَسَ فِي الْمَسْجِدِ احْتَبَى بِيَدَيْهِ».

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وا بوو، کە لە مزگەوت دادەنیشت، هەردووک دەستی لە هەردووک قاچی دەئاڵاندو قاچەکانی بە سکییەوە دەنووساندن»[٢].

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «احْتَبَى بِيَدَيْهِ»، (الإحتباء): ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر سمتی دابنیشێ و سکی و لاقی تا ڕانەکانی بێنێتەوە لای یەک، وە توونـد بە دەستەکانی بیگرێ لە لای پێشەوەی لاقەکانیەوە، یاخود بە پارچەیەک لە قوماش لە پشتیەوە بیسوڕێنێتەوەو لە جیاتی دەستەکانی (خۆی پێ ببەستێتەوە)، کە ئەم دانیشتنە پشوو بە لاشە نادات، کە ئەمە مرۆڤ بێنیاز دەکات لەوەی پاڵبدات بە دیوار، یاخود شتی دیکە، هەر لە کۆنەوە گوتراوە: ئەم جۆرە دانیشتنە دیواری عەرەبە.

---

(١) برقم ٥٦٢٣.

(٢) إحتباء: ئەوە ماناکەیەتی کە باسکراوە.

بێگومان دەربارەی شێوەی دانیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندان فەرموودەی دیکەی، جگە لەمە هاتوون لە نێوانیان ئەو فەرموودەی جابری کوڕی سەمورەیە رضي الله عنه کە لە (سنن أبي داود)[1] بە سەنەدێکی جێگیر واتە: (صحیح) هاتوە کە دەڵێ: {كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ تَرَبَّعَ فِي مَجْلِسِهِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَسْنَاءَ}. واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نوێژی بەیانی بکردایە چوار مشقی لە شوێنی خۆی دادەنیشت تا خۆر بە جوانی دەردەکەوت.

---

(١) برقم: ٤٨٥٠.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پاڵدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي تِكَأَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




**التُّكَأة**: بریتیە لەو شتەی کە مرۆڤ شانی پێدادەدات (پاڵی پێوە دەدات) لە کاتی دانیشتن، وەک: بالیف و سەرین و وێنەی ئەوانە.

١٣٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُتَّكِئاً عَلَى وِسَادَةٍ عَلَى يَسَارِهِ»[1].

واتە: جابری کوڕی سەموڕە رضي الله عنه دەڵێ: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەسەر سەرینێک پاڵی دابۆوە بە لای چەپیدا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مُتَّكِئاً عَلَى وِسَادَةٍ عَلَى يَسَارِهِ» یانی: لەسەر لای چەپی، جاری واش بووە لەسەر لای ڕاستیشی شانی داداوە، ئەم جۆرە لە شان دادان و پاڵکەوتنە جاری وایە مرۆڤ پێویستی پێی دەبێ، چونکە پشوو بە لاشە دەدات (کاتێک لاشە پێویستی بە پشوودان دەبێ).

١٣١- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُحَدِّثُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟» قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: «الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ». قَالَ: وَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ مُتَّكِئاً قَالَ: «وَشَهَادَةُ الزُّورِ» أَوْ «قَوْلُ الزُّورِ» قَالَ: فَمَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ[2].

واتە: ئەبو بەکرە رضي الله عنه دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێ نەدەم بە گەورەترینی گوناهە گەورەکان؟» (هاوەڵانیش) گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: «هاوبەشدانان بۆ خوا، ئازاردانی دایک و باوک»، (ڕاوی) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا پاڵیدابۆوە، دوایی هەڵساو دانیشت فەرمووی: «شایەدی دانی بە درۆ»، یان «قسەی درۆ»، بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی دووبارە دەکردەوە، هەتا گوتمان: خۆزگە بێدەنگ بووبایە، (واتە: هێندە خۆی ئەزیەت نەدابایە).

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٧٧٠، وأبو داود في سننه: ٤١٤٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٦٥٤، ومسلم: ٨٧.



**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «أَلَا أُحَدِّثُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟»، ئەم شێوازی قسەکردنە پێغەمبەر ﷺ زۆر بەکاری دەهێنێ، سوودی تێدایە بۆ فێربوون و ئاراستە کردن، لەبەر ئەوەی سەرنجڕاکێشەو دڵەکان کەمەندکێش دەکات و سەرنج ڕاکێشان و هۆشیارکردنەوەی تێدایە.

وە پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی هەواڵبدات دەربارەی گەورەترینی گوناهەکان بۆ ئەوەی مسوڵمانان خۆیانی لێ بپارێزن و نەکەونە نێوی، هەروەک چۆن پێویستە لەسەر مسوڵمان خۆی فێری کردەوەی چاک بکات تا کاری پێبکات، بە هەمان شێوەش لەسەری پێویستە شەڕو خراپەش بناسێ تاکو خۆی لێ دوور بگرێ، جا باشە کەسێک چۆن خۆی دەپارێزێ لە خراپە، لە کاتێکدا نەزانێ کە کامە خراپەیە؟

هەندێک لە زانایان ﷺ، هەڵساون بە جیاکردنەوەو بە تایبەت کتێبیان نووسیوە دەربارەی گوناهە گەورەکان، لە گرنگترین و پڕ بایەخترینیان کتێبی: (الكبائر)ی پێشەوا (الذهبي)یە ﷺ[1].

کە دەڵێ: «الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ» ئەوە گەورەترینی گوناهەکانەو، گەورەترین ستەمیشە، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ لقمان. (بەڕاستی هاوبەش دانان بۆ خوا ستەمێکی زۆر گەورەیە). چونکە ئەم کارە یەکسان کردنی غەیری خوایە لەگەڵ خوا لە شتانێکدا لە تایبەتمەندییەکان و مافەکانی خوایە ﷻ.

جا هەر کەسێک شتێک لە تایبەتمەندییەکانی خوا، لە پەروەردگاریەتی، یان لە ناوو سیفاتەکانی، یان لە هەر شتێکی دیکەی مافی خوا وەک پاڕانەوەو سەربڕین و نەزر کردن و غەیری ئەوانەش لە خواپەرستی ئەنجام بدات بۆ غەیری خوا، ئەو کەسە بەو کارەی دەبێتە هاوبەشدانەرو ئەنجامدەری گەورەترینی گوناهەکان.

کە دەڵێ: «وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ» (العق): بریتیە لە بڕین، وە وشەی (وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ) وشەیەکە هەموو خراپەکانی کە بەرامبەر دایک و باوک ئەنجام دەدرێن دەگرێتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە دوای هاوبەشدانان کە باسی ئازاردانی دایک و باوکی کردوە، ئەمە

(١) ينبغي للآباء في البيوتات المسلمة أن يُعنوا بهذا الكتاب مع أهليهم وأولادهم قراءة، ولو مرَّةً حتَّى يعرفوا الكبائر، ويقوفوا على ما أعدَّه الله ﷻ لفاعِليها منَ العقوبات؛ ليكونوا منها على حذَرٍ.

بەڵگەیە لەسەر گەورەیی مافی دایک و باوک و ترسناکی ئازاردانیان، وە خوا ﷻ لە چەندان شوێنی قورئاندا ئەمەی جێگیر کردوەو، باسی مافی دایک و باوکی لەگەڵ مافی خۆی کردوە، بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ﴿٢٣﴾﴾ الإسراء. (وە پەروەردگارت بڕیاریداوە کە هیچ شتێک نەپەرستن بێجگە لە ئەو وە لەگەڵ دایک و باوکتان چاکە بکەن). وە کە دەفەرموێ: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ ﴿١٤﴾﴾ لقمان. (-وە فەرمانمان بەئادەمی دا- کە سوپاسگوزاری من -خوا-و باوک و دایکت بکە).

کە دەڵێ: «وَجَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَكَانَ مُتَّكِئاً»، واتە: کاتێک پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ» سەرەتا شانی دادابوو، پاشان دانیشت، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئاساییە مرۆڤ شان دابدات و هەندێک بابەتی زانستیش باس بکات (واتە: بە شان دادانەوە قسە بکات، باسی زانستی شەرعی بکات).

کە دەڵێ: «وَشَهَادَةُ الزُّورِأَوْ قَوْلُ الزُّورِ» گومانەکە لە لایەن ڕاویەکەوەیە، بەڵام بێگومان لە صەحیحی بوخاریدا[1] هاتوە کە دەفەرموێ: {وَقَوْلُ الزُّورِ وَشَهَادَةُ الزُّورِ} کە لێرەدا گومانەکە نەماوە.

**الزور:** بریتیە لە داپۆشین و گۆڕین و تێکەڵکردنی (هەق و ناهەق)، وە دەرخستنی شتەکان بە پێچەوانەی حەقیقەتی خۆیان بە هۆی درۆو بوختانەوە، وە شایەدیدانی درۆ کۆمەڵگە تێکدەدات و خراپی دەکات و مافەکانیش لەناو دەبات و زایەی دەکات.

کە دەڵێ: «فَمَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُهَا حَتَّى قُلْنَا: لَيْتَهُ سَكَتَ»، وەک سۆزو بەزەیی هاتنەوە بە پێغەمبەر ﷺ (وایان فەرمووە).

١٣٢- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا أَنَا فَلَا آكُلُ مُتَّكِئاً»[2].

واتە: ئەبو جوحەیفە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڵام من بە پاڵدانەوە خواردن ناخۆم».

١٣٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْأَقْمَرِ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا آكُلُ مُتَّكِئاً».

---

(١) برقم: ٥٩٧٦.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٣٩٨، المصنّف في جامعه: ١٨٣٠.

واتە: عەلی کوڕی ئەقمەر دەڵێ: بیستم ئەبو جوحەیفە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «من بە پاڵدانەوەو شان دادان خواردن ناخۆم».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەم فەرموودەدا کە دانەری کتیب پێشەوا الترمذي ﷺ بە دوو سەنەد هێناویەتی، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی شاندادان و پاڵکەوتن نانی نەدەخوارد، وە گوتراویشە هۆکاری ئەمەش ئەوە بووە کە دانیشتن بە شاندادانەوە مرۆڤ چڵێس دەکات و تەماعی زیاد دەکات، وای لێدەکات زۆر بخوات، وە هەروەها ئەم شێوازە لە دانیشتندا هی کەسانی خۆ بەگەورەزانە لە کاتی نان خواردندا.

١٣٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مُتَّكِئاً عَلَى وِسَادَةٍ»، قَالَ أَبُو عِيسَى: «لَمْ يَذْكُرْ وَكِيعٌ عَلَى يَسَارِهِ، وَهَكَذَا رَوَى غَيْرُ وَاحِدٍ عَنِ إِسْرَائِيلَ نَحْوَ رِوَايَةِ وَكِيعٍ، وَلَا نَعْلَمُ أَحَداً رَوَى فِيهِ عَلَى يَسَارِهِ إِلَّا مَا رَوَاهُ إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنِ إِسْرَائِيلَ»[1].

واتە: جابری کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەرم ﷺ بینی پاڵی دابوویەوە بەسەر سەرینێک لەسەر لای چەپەی»، ئەبو عیسا دەڵێ: «وەکیع باسی لەسەر لای ڕاستی نەکردوە، هەروەها زیاتر لە یەکێک (لە ڕاویەکان) لە ئیسرائیل (کە یەکێکە لە ڕاوی فەرموودە) وەک وەکیعیان لێی گێڕاوەتەوە، وە ناشزانم هیچ کەسێک بە بێژەی لەسەر لای چەپی گێڕابێتەوە، جگە لە ڕیوایەتی ئیسحاقی کوڕی مەنصوڕ لە ئیسرائیلەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

دانەر ﷺ کۆتایی بەم بەشە هێناوە بە دووبارەکردنەوەی فەرموودەی جابری کوڕی سەموڕە ﷺ لە ڕێگایەکی دیکەوە کە باسی (عَلَى يَسَارِهِ) تێدانیە، بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەی کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا هێنابووی.

---

(١) انظر: (ح ١٣٠)، أشار المصنِّف ﷺ إلى أنَّ زيادة «عَلَىَ يَسَارِهِ» إنَّما جاءت من طريق إسحاق بن منصور عن إسرائيل، وقد رواه وكيعٌ عن إسرائيل بدونها، وكذلك رواه غير واحدٍ عن إسرائيل بدونها.

لكـنَّ إسحاق بن منصور قد تُوبع بهذه الزِّيادة، فقد جاء في مسند الإمام أحمد: ٢٠٨٠٣ أنَّه قال: «حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، أَخْبَرَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ سِمَاكٍ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ سَمُرَةَ يَقُولُ: أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ... وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَّكِئٌ عَلَى وِسَادَةٍ عَلَى يَسَارِهِ».



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پاڵدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک بە پێوە بووە



بَابُ مَا جَاءَ فِي اتِّكَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




دانەر ﷺ ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی شاندادانی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی وەستاوییدا، بەشی پێشوو، پەیوەست بوو بە شاندادانی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی دانیشتنیدا، وە شاندادانی مرۆڤ لە کاتی وەستاوی بەسەر شانی کەسانی دیکەدا، لەو کاتە دەبێ کە ئەم کەسە ماندوویەتی زۆری بۆ هێنابێ، یاخود نەخۆش بێ، یاخود شەکەت بێ.

١٣٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ شَاكِياً فَخَرَجَ يَتَوَكَّأُ عَلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ قِطْرِيٌّ قَدْ تَوَشَّحَ بِهِ فَصَلَّى بِهِمْ».

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ (لە کاتی نەخۆش کەوتنی هێندە ئازاری زۆر بوو)، کاتێ لە ماڵ هاتەدەر (لەبەر بێهێزی) خۆی بەسەر ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دا دابوو، پۆشاکێکی قیتری بەسەر شانەکانیدا دابوو، پاشان نوێژی بۆ کردن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ شَاكِياً»، واتە: لەو نەخۆشیەی کە تێیدا گیانی سپارد، «فَخَرَجَ يَتَوَكَّأُ عَلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﷺ وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ قِطْرِيٌّ»، (الثَّوْبُ القِطْرِيُّ) جۆرێکە لە پۆشاکی یەمەنی، «قَدْ تَوَشَّحَ بِهِ فَصَلَّى بِهِمْ»، یانی: دابوونی بەسەر شانەکانی و نوێژی پێکردن، یاخود بۆ کردن، فەرموودەکە پێشتر هێنرا[1].

١٣٦- عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ وَعَلَى رَأْسِهِ عِصَابَةٌ صَفْرَاءُ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «يَا فَضْلُ» قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: «اشْدُدْ بِهَذِهِ الْعِصَابَةِ رَأْسِي» قَالَ: فَفَعَلْتُ، ثُمَّ قَعَدَ فَوَضَعَ كَفَّهُ عَلَى مَنْكِبِي، ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ فِي الْمَسْجِدِ وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ[2].

---

(١) برقم: ٥٩.

(٢) إسناد الحديث ضعيفٌ؛ ففيه عطاء بن مسلم الخفّاف، وهو صدوقٌ يخطئ كثيرًا، وفيه أيضًا جعفر بن بُرقان، وهو صدوقٌ يهم.

واتە: فەزڵی کوڕی عەبباس ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ئەو نەخۆشیەی کە بە هۆیەوە وەفاتی کرد، سەرپێچەکی زەردی لەسەر سەری بوو، سەلامم لێکرد، فەرمووی: «ئەی فەزڵ!» منیش گوتم: لە خزمەتت ئامادەم بۆ هەرچی فەرمان بکەی، فەرمووی: «بە توونذی سەرم ببەستە بەم سەرپێچە»، دەڵێ: منیش وام کرد، دوایی دانیشت، جا دەستی خستە سەر شانم، پاشان هەڵسایەوەو چووە نێو مزگەوت، لەم فەرموودەیەدا بەسەرهاتێک هەیە (دیارە پێشەوا الترمذي ﷺ بە پێویستی نەزانیوە بیهێنێ).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «ثُمَّ قَعَدَ فَوَضَعَ كَفَّهُ عَلَى مَنْكِبِي، ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ فِي الْمَسْجِدِ»، ئەوە شوێنی بەڵگەو ئاماژە پێکردنە لە فەرموودەکەدا.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی چۆنیەتی خواردنی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ أَكْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

دانەر ﷀ ئەم بەشەی تایبەت کردووە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازو شێوازو شێوەی خواردن و خواردنەوەی پێغەمبەر ﷺ، وە چۆنیەتی دانیشتن کاتێک ویستوویەتی کە نان بخوات، وە جگە لەوانەش لە ئاداب و سوننەتەکانی دیکەیدا.

**١٣٧- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَلْعَقُ أَصَابِعَهُ ثَلَاثًا». قَالَ أَبُو عِيسَى: وَرَوَى غَيْرُ مُحَمَّدِ بْنِ بَشَّارٍ هَذَا الْحَدِيثَ قَالَ: يَلْعَقُ أَصَابِعَهُ الثَّلَاثَ[1].**

واتە: کەعبی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ سێ جاران پەنجەکانی دەلێسایەوە»، وە ئەبو عیسا ﷀ دەڵێ: جگە لە موحەممەدی کوڕی بەشار ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە دەڵێ: سێ پەنجەکەی دەلێسایەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کەعبی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: **«أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَلْعَقُ أَصَابِعَهُ ثَلَاثًا»**، یانی: سێ جار پەنجەی دەلێسایەوە، ئەم فەرموودە بەم شێوەیە هاتوە، وە لە فەرموودەی دیکەشدا بە جۆرێکی دی هاتوە بە بێژەی: **«يَلْعَقُ أَصَابِعَهُ الثَّلَاثَ»** (واتە: سێ پەنجەکەی دەلێسایەوە)، ئەوەی دووەمیان جێگیرترەو هی یەکەمیان لاوازە (شَاذٌّ)ـە.

ئەم فەرموودەیە دوو لە ئادابەکانی خواردنی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدان:

**یەکەمیان**: خواردن بە سێ پەنجان، جا دیاری نەکراوە ئەم سێ پەنجە کامانەن، بەڵام شتێکی زانراوە کە پەنجەی گەورەو پەنجەی شەهادەو پەنجەی ناوەڕاستە، ئەوە لە ئادابەکانی خواردنەو سوننەتە.

هەندێ لە ڕوونکەرەوانی فەرموودە باسی ئەوەیان کردووە کە خواردن بە سێ پەنجان لەو خواردنانەدا دەبێ کە بە دەست دەخورێن، ئەو جۆرە خواردنانەی کە بە سێ پەنجە دەگیرێن، بخۆر بتوانێ خواردنەکە بگرێ، بەڵام ئەگەر خواردنەکە پەرش و بڵاو بوو، ئەوە هیچ سەغڵەتیی تێدانیە کە بە چوار، یان پێنج پەنجانیش بخورێ ئەگەر پێویستی کرد.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٣٢.




**دووەمیان:** لێستنەوەی پەنجەکان لە دوای تەواو بوونی خواردن بە تەواوی، نەک لە کاتی نان خواردن، چونکە لەوانەیە بەم کارە ئەو کەسەی لەگەڵی نان دەخوات ئەزیەت بخوات، وە حیکمەتیش لەمەدا بریتیە لە گەڕان بە دوای بەرەکەتی خواردنەکە، وەک لە (صحیح مسلم)[1]، هاتوە لە فەرموودەی ئەنەس ﷺ کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر خواردنی خواردبایە سێ پەنجەکەی دەلێسایەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ؛ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الأَذَى، وَلْيَأْكُلْهَا، وَلا يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ}. واتە: ئەگەر یەکێکتان پاروویەک خواردنی لە دەست بەربوویەوە، ئەوا با ئەو شتەی بەریکەوتوەو پێوەی لکاوە لێی بکاتەوەو بیخوات، نەکات بۆ شەیتان جێی بهێڵێی، فەرمانی پێکردین کە قاپەکان هەرچی تێدا دەمایەوە بە دەست پاکی بکەینەوەو بیخۆین، دواتر دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْرُونَ فِي أَيِّ طَعَامِكُمُ البَرَكَة}. واتە: ئێوە نازانن بەرەکەت لە کام بەشەی خواردنەکانتانندایە. یانی: لەوانەیە بەرەکەت هەمووی، یان بەشێکی بکەوێتە ئەوەی کەوا بەدەستەوە نووساوە، یاخود لەو بەشەدایە کە لە نێو قاپەکەدا ماوەتەوە.

بەرەکەتی خواردنیش چەند شتێک دەگرێتەوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کە باسی بەرەکەتی کردوەبە ڕەهایی باسی کردوە، لەوانە: خۆراکدان بە لاشە، پارێزرانی لە زیانی خواردنەکەو بەهێزکردنی لەسەر خواپەرستی و گوێڕایەڵی خوا ﷻ.

پێشەوا نەوەوی ﷺ ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدات: {فَإِنَّكُمْ لا تَدْرُونَ فِي أَيِّ طَعَامِكُمُ البَرَكَة}. دەڵێ: (واتاکەی والله أعلم ئەو خواردنەی مرۆڤ ئامادەی دەبێت بەرەکەتی تێدایە، نازانرێ کە ئەم بەرەکەتە لە کام بەشەی خواردنەکەیەتی، ئایا لەوەدایە کە خواردوویەتی، یان بەوەیە کە بە پەنجەی لکاوە، یاخود لەو بەشەیە کە لە بەشی خوارەوەی قاپەکە ماوەتەوە، یاخود لەو پارووەیە کەوا لە دەستی کەوتۆتە خوار، بۆیە پێویستە مرۆڤ پارێزگاری لە هەموو ئەوانەدا بکات بۆ بەدەستهێنانی بەرەکەتەکە)[2].

---

(١) برقم: ٢٠٣٤.

(٢) شرح صحیح مسلم: ٢٠٦/١٣.

وە جێگەی داخە کە خواردن لەسەر سفرەیەکی پاکوخاوێنی نوێدا بخورێ و، پاشان ئەوەی کە لە (خواردنەکە) بەربۆتەوە نەخورێ و بەجێبهێشترێ بۆ شەیتان، لە کاتێکدا ﷺ فەرموویەتی: {إِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ؛ فَلْيُمِطْ عَنْهَا الأَذَى، وَلْيَأْكُلْهَا} جا چ جای ئەوەی بە هیچ شێوەیەک پیسی بەرنەکەوتوە؟

١٣٨- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَكَلَ طَعَامًا لَعِقَ أَصَابِعَهُ الثَّلَاثَ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خواردنێکی خواردبا سێ پەنجەکەی دەلێسایەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە هەمان مانای فەرموودەی ڕابردووی هەیە، دوو لە ئادابەکەی (خواردنی) ڕابردووی تێدان: نان خواردن بە سێ پەنجان، وە هەروەها لێسانەوەی پەنجەکان لە دوای تەواو بوون لە نان خواردن.

١٣٩- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمَّا أَنَا فَلَا آكُلُ مُتَّكِئًا»[2].

واتە: ئەبو جوحەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڵام من بە پاڵدانەوەو شان دادان خواردن ناخۆم».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودە پێشتر ڕوونکرایەوە لە سەرەتای ئەم بەشەدا، ڕاجیایی هەیە لە مانای (الإتكاء) ڕاکشان و پاڵکەوتن لە کاتی نانخواردن، دەگوترێ: بریتیە لە باش دانیشتن بۆ خواردن، جا بە هەر شێوەیەک بێ، چونکە کاتێک مرۆڤ بە تەواوی دادەنیشێ بۆ خواردن، ئەوەیە وای لێ دەکات کە زۆر بخوات و چڵێسی و تەماعی زیاد دەکات لە خواردنیدا، بۆیەش ئیبراهیمی نەخەعی گوتوویەتی: هاوەڵان خوا ﷺ پێیان ناخۆش بوو بە پاڵکەوتن و شان دادانەوە نان بخۆن لە ترسی ئەوەی زیاد لە پێویست بخۆن و ورگیان گەورە بێ)[3].

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٣٤.

(٢) انظر: (ح ١٣٠).

(٣) مصنَّف ابن أبي شيبة: ١٢٦/٨.



دەشگوترێ: (الإتكاء): بریتیە لەوەی کەوا مرۆڤ لەسەر لاتەنیشتێکی نان بخوات.

دەشگوترێ: (الإتكاء): بریتیە لەوەی مرۆڤ دەستی چەپی لەسەر زەوی دابنێ و خۆی بدات بەسەریداو پاڵی پێوەبداتەوە، بە دەستی ڕاستیشی نان بخوات.

(إبن القيم) رحمه الله لە کتێبی (زاد المعاد)دا[1] گوتوویەتی: ئەم زەم و خراپ باسکردنانەی کە هاتوون لە دەقەکاندا هەموو ئەو سیفەتانە دەگرێتەوە، چونکە بەسەر هەموو ئەوانەدا دەچەسپێ، دەڵێ: (وَالِاتِّكَاءُ عَلَى ثَلَاثَةِ أَنْوَاعٍ، أَحَدُهَا: الِاتِّكَاءُ عَلَى الْجَنْبِ، وَالثَّانِي: التَّرَبُّعُ، وَالثَّالِثُ: الِاتِّكَاءُ عَلَى إِحْدَى يَدَيْهِ وَأَكْلُهُ بِالْأُخْرَى، وَالثَّلَاثُ مَذْمُومَةٌ). واتە: پاڵدانەوەو ڕاکشان سێ جۆرە:

**یەکەم:** پاڵدانەوە لەسەر تەنیشت.

**دووەم:** دانیشتنی چوار مشقی.

**سێیەم:** پاڵدانەوە لەسەر یەکێک لە دەستەکانی و نانخواردن بەویتریان، هەر سێ جۆر سەرزەنشت کراون).

١٤٠- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ الْأَقْمَرِ نَحْوَهُ.

واتە: بەم سەنەدە هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

هەر هەمان مانای فەرموودەکەی ئەبو جوحەیفەی رضي الله عنه هەیە کە پێشتر ڕابرد، بەڵام بە سەنەدێکی دیکە.

١٤١- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ بِأَصَابِعِهِ الثَّلَاثِ وَيَلْعَقُهُنَّ».

واتە: کەعبی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ بە سێ پەنجەی خواردنی دەخواردو، پاشان دەیلێسانەوە».

---

(١) زاد المعاد: ١٤٨/١.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە پێشتر باسکرا لە سەرەتای ئەم بەشەدا.

١٤٢- عَنْ مُصْعَبُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: «أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتَمْرٍ فَرَأَيْتُهُ يَأْكُلُ وَهُوَ مُقْعٍ مِنَ الْجُوعِ»[1].

واتە: موصعەبی کوڕی سولەیم دەڵێ: بیستم ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەیگوت: «پێغەمبەری خوا ﷺ خورمای بۆ هێنرا (بە دیاری)[2]، بینیم دەیخوارد (لە کاتێکدا) لە برسان هەڵتروشکابوو (بە چیچکانەوە بوو)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﵀ کۆتایی ئەم بەشەی هێناوە بە فەرموودەی ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ کە فەرموودەکە لە (المسند)ی پێشەوا ئەحمەدیشدا هاتوە، بەم بێژەیە: {أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ تَمْرٌ فَجَعَلَ يَقْسِمُهُ بِمِكْتَلٍ وَاحِدٍ، وَأَنَا رَسُولُهُ بِهِ حَتَّى فَرَغَ مِنْهُ، قَالَ: فَجَعَلَ يَأْكُلُ، وَهُوَ مُقْعٍ أَكْلًا ذَرِيعاً، فَعَرَفْتُ فِي أَكْلِهِ الْجُوعَ}[3]. واتە: هەندێک خورما بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش بە سەبەتەیەک دابەشی کرد، تا لێ بووەوە، منیش نێردراوی ئەو بووم، خورماکەم بە سەبەتان بۆ شوێنی مەبەست دەبرد، دەڵێ: جا لە خورماکەی دەخواردو لەسەر تەنیشتەکانی پاڵی دابوویەوە، بە شێوازی خواردنەکەیەوە زانیم کە برسیەتی.

پێغەمبەر ﷺ برسیەتی زۆری بۆ هێنابوو، بە دیاری خورمای بۆ هێنرا، یەکسەر دەستی نەکرد بە خواردنی، بەڵکو دەستی کرد بە دابەشکردنی، ئەنەسی خزمەتکاری نارد بۆ ئەوانەی هەژارن و پێویستیان پێ بوو، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی هەمان شت ئەنجام بداتەوە، بەم شێوەیە دووبارەی دەکردەوە هەتا پێغەمبەر ﷺ تەواو بوو لە

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٤٤، دون لفظه: «مِنَ الْجُوعِ» من طريق حفص بن غِياث، عن مصعب، وإن كان يستفاد من الرِّواية الَّتي بعده من طريق سفيان بن عُيَينة، عن مصعب وفيها: «فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْسِمُهُ وَهُوَ مُحْتَفِزٌ يَأْكُلُ مِنْهُ أَكْلًا ذَرِيعًا»، وَفِي رِوَايَةِ زُهَيْرٍ: «أَكْلاً حَثِيثاً»، وهذا الأكل الذريع أو الحثيث إنَّما هو للجوع، قال النَّووي: وكان استعجاله ليقضي حاجتَه منه، ويردَّ الجوعةَ، ثمَّ يذهب في ذلك الشُّغل.

(٢) چونکە صەدەقەو خێری نەدەخواردو وەری نەدەگرت (وەرگێڕ).

(٣) برقم: ١٣٠١٠.





دابەش کردنی خورما بەسەر هەژاران و نەداران، پاشان لە کۆتاییدا پێغەمبەر ﷺ خواردی.

کە دەڵێ: «وَهُوَ مُقْعٍ مِنَ الْجُوعِ»، (الإقعاء): بریتیە لە دانیشتن لەسەر ڕانەکان بەبێ خۆ قایم کردن و دانیشتنی تەواو، یاخود لەسەر (چیچکان) نەک بە چوار مشقی (مشتی) لەسەر سمت، بۆیەش لە هەندێ فەرموودەی تردا هاتوە بەم شێوەیە: (وَهُوَ مُتَحَفِّزٌ) لە جیاتی (وَهُوَ مُقْعٍ)، (المُتَحَفِّز): بریتیە لەو جۆرە دانیشتنە وەک ئەوەی کەسەکە ئامادە بێ بۆ هەڵسانەوە، یەکێک لە شێوەکانی (الإقعاء) ئەوەیە کە سمتەکانی بخاتە سەر پاژنە پێیەکانی و لەسەریان دانیشتبێ، وە لەسەر ئەژنۆکانی. (واتە: لەسەر پەنجەکانی لاقەکانی وەستاوەو هەردوو سمتی دەخاتە سەر پاژنە پێیەکانی و ئەژنۆکانیش دەچەقێنێ).



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی سیفەتی نانی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ خُبْزِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.



دانەر ﷺ، ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی پەیوەستە بە چۆنیەتی سیفەتی نانی پێغەمبەری خوا، دیارە وشەی (خبز) لە کوردی واتە: نان.

١٤٣-عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: «مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ ﷺ مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ يَوْمَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ حَتَّى قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ لێی گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: «خانەوادەی موحەممەد ﷺ دوو ڕۆژ لەسەر یەکتر تێر نەبوون لە (خواردنی) نانی جۆ، هەتا ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووحی کێشراو وەفاتی فەرموو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دایکی بڕواداران عائیشە ﵂ هەموو ژیانی لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ بەڕێکردووەو، یانی ئەو لە هەموو خەڵکی زیاتر ئاگادار بووە بە خواردنی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە ژیانی پێغەمبەر ﷺ، وە بە خواردنی پێغەمبەر ﷺ، هەواڵی داوە نانی جۆیەک کە تەنها مرۆڤ پێی تێر ببێ نەبووە لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەسەر یەکتر، هەتا گیانی بە خوا سپاردو لە دونیا جیابوویەوەو مرد.

ئا لەمەدا ڕوونکردنەوەی ئەوە هەیە، کە پێغەمبەر ﷺ چەندە خواردنی کەم بووە، هەروەها ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە دونیا چەند سووک و کەمە لەلایەن خوا ﷻ، چونکە پێغەمبەر ﷺ گەورەترین و باشترین و بەڕێزترینی بەندەکانی خوایە، کەچی بە برسیەتی دەمێنێتەوە، هیچ شتێکی لەلا نیە کە بیخوات، ئەمەش بەڵگەی کەمی و سووکی و بێنرخی دونیایە لەلای خواوە، چونکە ئەگەر شتێکی گرنگ و گەورە جێی بایەخ بووایە ئەم دونیایە، ئەوە لە دونیادا جوانترین شت، خۆشترین خواردن، وە باشترین پۆشاکی دەبەخشی بە گەورەترین و باشترین بەندەی خۆی کە (موحەممەدە ﷺ).

---

(١) انظر: (ح ١٤٩).

١٤٤- عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ الْبَاهِلِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا كَانَ يَفْضُلُ عَنِ أَهْلِ بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خُبْزُ الشَّعِيرِ»[1].

واتە: سولەیمی کوڕی عامیر دەڵێ: بیستم ئەبو ئومامەی باهیلی ﷺ دەیگوت: «لە نێو خانەوادەی پێغەمبەری خوا ﷺ نانی جۆ زیادی نەدەکرد تا بمێنێتەوە، (واتە: هێندە کەم بووە، هەر ئەوەند بووە بیخۆن)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەمە ئەوەی تێدایە کە خواردنی خاوو خێزانی پێغەمبەر ﷺ زۆر کەم بووە، تا ئەو ئەندازەیەی کە هیچ شتێک لە لایان نەدەمایەوە، بەڵکو ئەوەندەش بوو تەواو تێری نەدەکردن، چ جای ئەوەی شتێک لە خواردنەکە لە لایان بمێنێتەوە.

پێشەوا بوخاری و غەیری ئەویش ﷺ، دەیگێڕنەوە: کە دایکمان عائیشە ﷺ گوتوویەتی: {دَخَلَتِ امْرَأَةٌ، مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا، تَسْأَلُ فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا، غَيْرَ تَمْرَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا، وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ، عَلَيْنَا، فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: مَنِ ابْتُلِيَ مِنْ هذِهِ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ، كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ}[2]. واتە: ئافرەتێک هاتە لام دوو کچی لەگەڵ بوون، داوای خواردنی لێکردم، هیچ شتێکم لەلا نەبوو، جگە لە خورمایەک و پێمدا، ئەویش کردیە دوو لەت و دابەشی کرد لە نێوان کچەکانیدا، خۆی هیچی لێ نەخوارد، پاشان هەڵساو ڕۆیشت، جا کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە لامان، هەواڵم پێدا (دەربارەی ئەوەی کە ڕوویدا بوو)، فەرمووی: خوا هەر کەس تاقی بکاتەوە بەوەی کچی پێ ببەخشێ، دەبنە پەرژین بۆی لە ئاگر (ی دۆزەخ).

١٤٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَبِيتُ اللَّيَالِيَ الْمُتَتَابِعَةَ طَاوِياً هُوَ وَأَهْلُهُ لَا يَجِدُونَ عِشَاءً، وَكَانَ أَكْثَرُ خُبْزِهِمْ خُبْزَ الشَّعِيرِ»[3].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٣٥٩.

(٢) برقم: ١٤١٨.

(٣) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٣٥٩، وفي إسناده هلال بن خبَّاب، وهو صدوقٌ تغيرَّ بأخَرة، وسيأتي في باب عيش النبيِّ ﷺ أحاديث تشهد لمعناه من حيث الجملة.




واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و خانەوادەکەی چەندان شەو لەسەر یەکتر بێ خواردن و بە برسیەتی دەمانەوە (تا بەیانی)، لەبەر ئەوەی خواردنی ئێوارەیان نەبوو (بیخۆن)، وە زۆرترین جۆری خواردنیشیان نانی جۆ بوو!».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «طَاوِيًا»، یانی: خۆی لوول دەکردەوە لە برسان، وە (طَاوِيًا) لە (طَوى) وەرگیراوە یانی: برسیەتی و سک بەتاڵیی، کە دەگوترێ: (رَجلٌ طَاوِي البطن) ئەگەر کەسەکە سکی بە هۆی برسیەتیەوە چووبێتەوە یەک و لاواز بووبێ لە برساندا.

١٤٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رضي الله عنه، أَنَّهُ قِيلَ لَهُ: أَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّقِيَّ؟ - يَعْنِي الْحُوَّارَى فَقَالَ سَهْلٌ: «مَا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ النَّقِيَّ حَتَّى لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَعَالَى»، فَقِيلَ لَهُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ مَنَاخِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: «مَا كَانَتْ لَنَا مَنَاخِلُ»، قِيلَ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِالشَّعِيرِ؟ قَالَ: «كُنَّا نَنْفُخُهُ فَيَطِيرُ مِنْهُ مَا طَارَ ثُمَّ نَعْجِنُهُ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد رضي الله عنه پرسیاری لێکراوەو: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاردی سپی خواردوە؟ سەهل رضي الله عنه گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئاردی سپی نەبینی تا گەیشتەوە خزمەت خوای زاڵی پایەداری بەرز»، جا (دووبارە پرسیار لە سەهل رضي الله عنه کراو) پێی گوترا: ئایا هێڵەک و بێژینگتان هەبووە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتی: «ئەو کات هێلەک و بێژینگمان نەبووە»، وترا: ئەی چیتان لە جۆ دەکرد (بۆ ئەوەی بیخۆن)؟ گوتی: «(لە دوای کوتین) فومان لێی دەکرد، جا بە هۆی فولێکردن هەندێ بەملاولادا دەڕۆیشت، ئەوەی دەمایەوە ئاومان پێدا دەکردو، دەمانشێلا (ئنجا دەمانخوارد)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

(النَّقِيَّ) دەگوترێ: بریتیە لە ئاردی سپی (سفر)، ئەمەش کاتێک دەبێ کە ئاردەکە زیاتر لە جارێک ببێژرێ بە هێڵەک (بێژینگ).

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤١٣، والمصنِّف في جامعه: ٢٣٦٤.



کە دەڵێ: «مَا رَآه»، یانی: سەرباری ئەوەی کە نەیخواردوە (هەر نەشیبینیوە)، وە وێنەی ئەم فەرموودە لە صەحیحی بوخاریدا[1] هاتوە لە قەتادەوە کە گوتوویەتی: (ئێمە دەچووین بۆ خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ نانەواکەشی ڕاوەستابوو، پێی گوتین: بخۆن، نەمزانیوە پێغەمبەر ﷺ ئەستوکێک (کولێرەیەک)ی سپی و تەنکی خواردبێ هەتا گەیشتەوە خزمەت خوا ﷻ.

کە دەڵێ: «هَلْ كَانَتْ لَكُمْ مَنَاخِلُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، (مَنَاخِل) بە کوردی واتە: هێڵەک بێژینگ، (مَنَاخِل) کۆی (مَنخَل)ـە بریتیە لەو ئامێرەی کە ئاردی پێ دەبێژرێت تاکو صاف و بێ خڵتە دەبێ و نەرم دەبێت.

کە دەڵێ: «كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِالشَّعِيرِ»، بە تایبەت پرسیاری جۆی کردوە، لەبەر ئەوەی هەندێک شتی تێدایە ئەگەر کرایە نان ناڕەحەتە، بە پێچەوانەی ئەوەی ئەگەر بێژرایەوە لەوکاتەدا سوکترو ئاسانترە بۆ خواردن.

کە دەڵێ: «كُنَّا نَنْفُخُهُ فَيَطِيرُ مِنْهُ مَا طَارَ ثُمَّ نَعْجِنُهُ»، لە (الجامع الترمذي)دا[2] هاتوە: {كُنَّا نَنْفُخُهُ فَيَطِيرُ مِنْهُ مَا طَارَ، ثُمَّ نُثَرِّيهِ فَنَعْجُنُهُ}. یانی: فوومان پێدادەکرد، ئەوەی دەڕۆیشت، ئەوەی دیکە ئاومان بەسەردا دەکرد هەتا نەرمی دەکردەوە، پاشان دەمانشێلا.

١٤٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «مَا أَكَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ عَلَى خِوَانٍ وَلَا فِي سُكُرَّجَةٍ، وَلَا خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ» قَالَ: فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ: فَعَلَامَ كَانُوا يَأْكُلُونَ؟ قَالَ: «عَلَى هَذِهِ السُّفَرِ»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ خواردنی لەسەر مێزو، لە قاپی بچوک نەخوارد، وە نانی تەنک و نەرمیشی بۆ دروست نەکرا (ڕاوی) دەڵێ: منیش بە قەتادەم گوت: ئەی لەسەر چی نانی دەخوارد؟ گوتی: لەسەر ئەم جۆرە سفرانە، (کە لەسەر زەوی دادەنرێن)».

---

(١) برقم: ٦٤٥٧.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٤١٥، والمصنِّف في جامعه: ١٧٨٨.

(٣) برقم: ٢٣٦٤.



## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «عَلَى خِوَانٍ»، (الخِوان) شتێکی بەرزە خواردنی لەسەر دادەنرێ کە لە تەختە دارو وێنەی ئەوە دروست دەکرێ.

کە دەڵێ: «وَلَا فِي سُكُرَّجَةٍ» (السُّكُرَّجَة): قاپێکی بچووکە شتێکی کەم لە خواردن و پێخۆری تێدایە.

کە دەڵێ: «وَلَا خُبِزَ لَهُ مُرَقَّقٌ» (المُرَقَّق): بریتیە لە نانێکی تەنکی نەرمی جوان.

کە دەڵێ: «عَلَى هَذِهِ السُّفَرِ» (السُّفَر): دەگونجێ پارچەیەک بێت لە پێستە، لەسەر زەوی ڕادەخرێ، پاشان قاپ و قاچاغی خواردنی لەسەر دادەنرێ، سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بوارەدا وەک سەرجەم بوارەکانی دیکەی ژیان مامناوەندیەتی بووە، یانی: نە لەسەر زەوی ڕاستەوخۆ نانی خواردوە، نە لەسەر تەختەو مێزو کورسی، چونکە ئەگەر خواردن لەسەر زەوی دابنرێ، وە خواردنێک بکەوێتە خوارەوە پیس دەبێ، لەسەر مێزیش جۆرێک لە خۆشگوزەرانی تێدایە کەچی خواردن لەسەر سفرە، خواردنێکی سادەو خاکیانەیە، وە ئەوەشی تێدایە ئەگەر خواردنەکە کەوتە سەر زەوی پیس نابێ و پارێزراو دەبێ.

وە خواردن لەسەر تەختەو مێزو کورسی ڕێگاپێدراوەو حەرام نیە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر سادەو خاکی بووە، هەم لە خواردن، هەم لە کاروبارەکانی دیکەی ژیانیدا، وە پێشتریش ئەو قسەی قەتادە کە باسی کرد کە دەڵێ: ئێمە دەچووین بۆ لای ئەنەسی کوڕی مالیک ؓ نانەواکەی ڕاوەستابوو، مێزی نان خواردنی دانرابوو، یانی: شتێکی بەرزی لەلا بوو خواردنی لەسەر دادەنرا، ئەنەس ؓ خۆشی گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە.

١٤٨- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ؓ، فَدَعَتْ لِي بِطَعَامٍ وَقَالَتْ: «مَا أَشْبَعُ مِنْ طَعَامٍ فَأَشَاءُ أَنْ أَبْكِيَ إِلَّا بَكَيْتُ»، قَالَ: قُلْتُ لِمَ؟ قَالَتْ: «أَذْكُرُ الْحَالَ الَّتِي فَارَقَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الدُّنْيَا، وَاللَّهِ مَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَلَحْمٍ مَرَّتَيْنِ فِي يَوْمٍ»[1].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٣٥٦، وإسناده ضعيفٌ؛ لأنَّ فيه مجالدَ بن سعيد ضعيفٌ.



واتە: مەسروق، دەڵێ: چوومە خزمەت عائیشە ﵂، داوای خواردنێکی بۆ کردم، (دوایی) گوتی: «کاتێک تێر دەبم لە خواردنێک گریان زۆرم بۆ دێنێ، مەگەر چۆن دەنا هەر دەگریم»، منیش گوتم: بۆچی؟ گوتی: «ئەو حاڵ و گوزەرانەم بیر دێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا دونیای جێهێشت، (چونکە) سوێند بە خوا تێر نان و تێر گۆشتی نەخوارد دوو جاران لە ڕۆژێکدا».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

مەسروق ﷺ، کاتێک لە دایک بوو پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا مابوو، بەڵام لەبەر ئەوەی مەسروق لە کوفە بوو، پێغەمبەری ﷺ نەبینیوە، (مەسروق) پێشەوایەو لە شوێنکەوتووە هەرە مەزنەکانە، وە دەگوترێ: بۆیە ناوی لێنراوە مەسروق، چونکە بە بچووکی دزرابوو، بەڵام دواتر خانەوادەکەی دۆزیانەوە.

کە دەڵێ: **«مَا أَشْبَعُ مِنْ طَعَامٍ فَأَشَاءُ أَنْ أَبْكِيَ إِلَّا بَكِيتُ»**، یانی: هەر کاتێک خواردنێکم خواردبێ لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ تێربووبم، ئەو ژیانەم وەبیر هاتۆتەوە کە تێیدا ژیاوم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە کەمی خواردن، وە ئەو ﷺ وەفاتی کردو دونیای بەجێهێشت، نە تێر نانی خواردو، نە تێر گۆشتی خوارد، دوو جار لە ڕۆژێکدا.

**١٤٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا شَبِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ يَوْمَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ حَتَّى قُبِضَ»[1].**

واتە: عائیشە ﵂، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕۆژان لەسەر یەکتر تێر نانی جۆی نەخواردو، هەتا ڕووحی کێشراوو وەفاتی فەرموو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لە سەرەتای ئەم بەشەدا ئەم فەرموودە باسکرا، جۆ کە کەمترینی (نزمترینی) خواردنەکانە، ئنجا دوو ڕۆژان لەسەر یەکتر تێری لێ نەخواردوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوو ڕۆژان لەسەر یەکتر تێر نانی نەخواردوە، لەو شتەی

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤١٦، ومسلم: ٢٩٧٠، المصنِّف في جامعه: ٢٣٥٧.




کە باشترە لە نانی جۆ، یانی: ئەگەر نانی جۆ نەبووبێ، کەواتە: خواردنی لەو باشتر هەر نەبووە بە دڵنیایی.

١٥٠- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: «مَا أَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى خِوَانٍ وَلَا أَكَلَ خُبْزاً مُرَقَّقاً حَتَّى مَاتَ»[١].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لەسەر مێز خواردنی نەخواردوە، وە نانی تەنک و نەرمی نەخوارد، هەتا وەفاتی فەرموو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

پێشتر قسە لەسەر ئەم فەرموودەیە کرا[٢].

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٤٥٠، والمنصّف في جامعه: ٢٣٦٣.

(٢) انظر: (ح ١٤٧).



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پێخۆری پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ إِدَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

**الإدام والأُدْم**: بریتیە لە هەر شتێک، کەوا بە نان دەخورێ (پێخۆر)، بۆیەش بەمە ناونراوە، لەبەر ئەوەی وا لە نانەکە دەکات کە بۆ خواردنی مرۆڤ گونجاو بێت و بشێ بۆ خواردن.

بەشەکەی دیکەی پێش ئەم بەشە دەربارەی نانخواردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئەم بەشەش دەربارەی پێخۆرەکەیەتی، وە باسکردنی پێخۆر لە دوای باسکردنی نان لە تەواوی و گونجاوی باسەکەدایە.

**١٥١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﵁، فِي حَدِيثِهِ: «نِعْمَ الْإِدَامُ أَوِ الْأُدْمُ الْخَلُّ»[١].**

واتە: عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین پێخۆر سرکەیە». عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﵁ لە فەرموودەکەی خۆی بەم بێژەی هێناوە: «**نِعْمَ الْإِدَامُ أَوِ الْأُدْمُ الْخَلُّ**» کە هەمان مانای هەیە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «**نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ**»، خەل ناسراوە، وە جیاوازیشە بە پێی جۆری خودی خەلەکان، ئایا زەیتوونە، یاخود گێزەرە، یاخود جگە لەوانەیە.

شتێکی زانراوە لە جۆرەکانی پێخۆر هەیە باشترە لە خەل، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ ئەمەی فەرمووە بە گوێرەی ئەوەی لەو کاتەدا ئەوە هەبووە، هەروەها دڵڕاگرتنی تێدایە بۆ ئەوەش کە بە دڵی خاوخێزانەکەی دادێ لەوەی هەست بە جۆرێک لە کەموکووڕی بکەن، دەربارەی ئەوەی کە میوانێکیان هاتوەو شتێکی وایان نیە کەوا لە پێشی دابنێن و خزمەتی پێ بکەن.

هەروەک هۆکاری گوترانی ئەم فەرموودە، ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە کە پێشەوا موسلیم ﵀ لە کتێبە صحیحەکەیدا[٢]، دەیگێڕێتەوە لە جابرەوە ﵁ کە گوتوویەتی: {أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِي ذَاتَ يَوْمٍ إِلَى مَنْزِلِهِ، فَأَخْرَجَ إِلَيْهِ فِلَقًا مِنْ خُبْزٍ، فَقَالَ : «مَا مِنْ أُدُمٍ؟»

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٥١، والمصنّف في جامعه: ١٨٤٠.

(٢) برقم: ٢٠٥٢.

فَقَالُوا: لَا، إِلَّا شَيْءٌ مِنْ خَلٍّ. قَالَ: «فَإِنَّ الْخَلَّ نِعْمَ الْأُدُمُ». قَالَ جَابِرٌ: فَمَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ. وَقَالَ طَلْحَةُ: مَا زِلْتُ أُحِبُّ الْخَلَّ مُنْذُ سَمِعْتُهَا مِنْ جَابِرٍ}. واتە ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم و بردمیەوە بۆ ماڵی خۆی، جا پارچەیەک نانی بۆ دەرهێناو فەرمووی: «ئایا هیچ شتێک هەیە پێی بخۆین؟» گوتیان: هیچ نیە جگە لە کەمێک خەل، جا (پێغەمبەر ﷺ) ئەو کاتە بوو کە فەرمووی: «خەل باشترین پێخۆرە»، جابر ﷺ دەڵێ: حەز لە خواردنی خەل دەکەم لەو کاتەوە کە لە پێغەمبەری خوام بیستوە ﷺ، تەڵحەش کە لە جابری ﷺ بیستوە دەڵێ: لەو کاتەوە کە لە جابرم ﷺ بیستوە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ وای فەرمووە، حەزم لە خواردنی خەلەو پێم خۆشە.

بۆیە (إبن القیم) ﷺ دەربارەی ئەم فەرموودەیە: «نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ»، گوتوویەتی: (وَهَذَا ثَنَاءٌ عَلَيْهِ بِحَسَبِ مُقْتَضَى الْحَالِ الْحَاضِرِ، لَا تَفْضِيلٌ لَهُ عَلَى غَيْرِهِ، كَمَا يَظُنُّ الْجُهَّالُ، وَسَبَبُ الْحَدِيثِ أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمًا)[1]، ئا ئەوە ستایشکردنی خەلە بە پێی ئەوەی کە ئەوکاتە هەر خەل هەبووە، کە هیچ باشیەکی نیە بەسەر غەیری خۆیەوە، هەر وەک هەندێک لە نەزانان گومان دەبەن، وە هۆکاری فەرموودەکەش وەک پێشتر باسمان کرد دیارە کە پێغەمبەر ﷺ میوانێکی بردەوە ماڵەوەو ....، پێشتر فەرموودەکە باسکرا.

**١٥٢- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ يَقُولُ: «أَلَسْتُمْ فِي طَعَامٍ وَشَرَابٍ مَا شِئْتُمْ؟ لَقَدْ رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ وَمَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ مَا يَمْلَأُ بَطْنَهُ»[2].**

واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەڵێ: بیستم نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەیگوت: «ئایا ئێوە چۆنی بتانەوێ، بە ویستی خۆتان خواردن و خواردنەوە ناخۆن؟ (واتە: بە ئارەزووی خۆتان چی حەز بکەن هەیە بیخۆن)، بە دڵنیایی من پێغەمبەرەکەتانم ﷺ بینیوە، بە جۆرێک کە خورمای خراپیشی دەست نەدەکەوت بیخوات و سکی پێ تێر بکات».

---

(١) زاد المعاد: ٤/٢١٩.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٩٧٧، والمصنّف في جامعه: ٢٣٧٢.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ چاکەو نیعمەتەکانی خوا بیری ئەو هاوەڵانەی کە مابوونەوە لە ژیان و هەندێ لە شوێنکەوتووان دێنێتەوە.

کە دەڵێ: «أَلَسْتُمْ فِي طَعَامٍ وَشَرَابٍ مَا شِئْتُمْ» یانی: هەرچی حەزی لێدەکەن و دڵتان دەیەوێ لە جۆرەها خواردن و خواردنەوە، بۆتان دەستەبەرە.

کە دەڵێ: «لَقَدْ رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ»، کە گوتوویەتی: پێغەمبەرەکەتان، تەنیا مەبەستی ئەوە بوو کە نیعمەت و منەتی خوایان بیر بێنێتەوەو بە شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ و بڕواپێهێنانی، کە ئەو شێوازە دواندنە شایستەترینە بۆ ئامادەکردنی ئەم واتاو مەبەستەی کە بە هۆیەوە بیریان بخاتەوە.

کە دەڵێ: «وَمَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ مَا يَمْلَأُ بَطْنَهُ»، (الدَّقل): بریتیە لە خراپترین جۆری خورما، جا ئەم هاوەڵە ﷺ ویستوویەتی ئەو نیعمەتە مەزن و گەورەیە، ئەم ڕزق و ڕۆزییە فراوانەیان بیر بێنێتەوە، کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون و پێی بەخشیون.

١٥٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَ الْإِدَامُ أَوِ الْأُدْمُ: الْخَلُّ»[1].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین جۆری پێخۆر سرکەیە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودە وەک فەرموودەکەی دایکمان عائیشەیە ﷺ کە پێشتر باسکرا.

١٥٤- عَنْ زَهْدَمٍ الْجَرْمِيِّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ، فَأُتِيَ بِلَحْمِ دَجَاجٍ فَتَنَحَّى رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَقَالَ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُهَا تَأْكُلُ شَيْئًا فَحَلَفْتُ أَنْ لَا آكُلَهَا قَالَ: «ادْنُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ لَحْمَ دَجَاجٍ»[2].

واتە: زەهدەمی جەرمی دەڵێ: ئێمە لە خزمەت ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ دانیشتبووین، گۆشتی مریشکی بۆ هێنرا، پیاوێک لە نێو خەڵکەکە خۆی دوورگرت

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٣٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٥١٧، ومسلم: ١٦٤٩.




و نەیخوارد، (ئەبو مووسا ﷺ) گوتی: ئەوە بۆ وا خۆت دوورگرتوەو نایخۆی؟ کابرا گوتی: پێشتر بینیوومە شتێکی خواردوە، بۆیە منیش سوێندم لێ خواردوە کە لەمەودوا نەیخۆم، (ئەبو مووسا ﷺ) گوتی: «نزیک بەوە، بە دڵنیایی من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە گۆشتی مریشکی دەخوارد».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: **«إِنِّي رَأَيْتُهَا تَأْكُلُ شَيْئاً»**، لە هەندێ ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: {إِنِّي رَأَيْتُهَا تَأْكُلُ نَتناً} واتە: من بینیومە کە شتی بۆگەنی خواردوە، جا باسی نەکردوە شتە پیس و بۆگەنەکە چی بووە، هەتا نەبێتە هۆی ئەوەی ئامادەبووانی سەر سفرەکە قێزو بێزیان لێی بێتەوەو خواردنەکە جێبهێڵن، چونکە مرۆڤ ئەگەر دڵی بۆ خواردنێک نەچوو، حەزی لێ نەکرد ئەوەندە بەسە کە دەڵێ: دڵم بۆ ناچێ و نایخۆم، هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەربارەی بزنـمژ ئەمەی فەرموو، یاخود وێنەی ئەمە بوو، نابێ بە خراپە باسی خواردنەکە بکرێ، لای ئەو کەسەی خواردنەکە دەخوات، خراپ باسکردنی خواردن لە کاتی نان خواردن دەبێتە هۆی ئەوەی هەندێ لە خەڵکی ئەگەر بە خراپ باسی خواردنیان لا بکرێ وازی لێ دەهێنن و نایخۆن.

کە دەڵێ: **«فَحَلَفْتُ أَنْ لَا آكُلَهَا»** دەکرێ ئەو سوێند خواردنەی کە نایخوات لەو کاتەدا بووبێ کە لە حاڵەتێکی زۆر خراپدا (مریشکەکەی بینیوە کە شتە بۆگەنەکەی خواردوە)، وە دەشکرێ ئەم سوێند خواردنەی بۆ ئەوە بووبێ هەتا ناچار نەبێ کە لەمەودوا بیخوات.

کە دەڵێ: **«ادْنُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ لَحْمَ دَجَاجٍ»**، ئا لەمەدا خۆشەویستی هاوەڵان هەیە ﷺ لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردوویەتی لە خۆراکەکان، وە هەروەها ئەمە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە گۆشتی مریشک خواردنی ڕەوایەو حەڵاڵە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردوویەتی، بۆیە پێویست ناکات مرۆڤ لەمەدا هیچ شتێکی لە دڵدا هەبێ لەو بارەوە.

بەڵام ئەگەر مریشک شتی پیس و زیانبەخشی خوارد، شوێنەواری خواردنەکەش




هەبوو بەسەر گۆشتەکەیەوە بوو بە (جلالة)[١]، ئەوە ئەم جۆرە (باڵندەو ئاژەڵانە) نەهی لە خواردنیان کراوە، وەک ئەبو داوودو جگە لەویش لە ئیبنو عومەرەوە ﷺ گێڕاویانەتەوە کە گوتوویەتی: {نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ الجَلالَةِ وَأَلْبَانِهَا}[٢]. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە خواردنی گۆشت و شیری جەلالە، باڵندەو ئاژەڵی جەلالە یەکسانە لەمەدا، ئاژەڵ بێ، یان مریشک بێ، یان هەر شتێکی دیکەو وێنەی ئەوانە.

جا ئەگەر مریشکەکە بەم شێوەیە بوو، ئەوە ناخورێ، بەڵکو بۆ ماوەی سێ ڕۆژان بەند دەکرێ لە خواردنی شتە پیسەکەو، خواردنی پاکی پێ دەدرێ و شلەمەنی پاکی پێ دەدرێ، هەتا گۆشتەکەی پاک دەبێتەوە، پاشان دوای ئەو ماوەیە دەتوانرێ گۆشتەکەی بـخورێ.

**١٥٥- عَنِ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عُمَرَ بْنِ سَفِينَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: «أَكَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَحْمَ حُبَارَى»[٣].**

واتە: ئیبراهیمی کوڕی عومەری کوڕی سەفینە، لە باوکی، لە باپیری ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ گۆشتی حوبارام خواردوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

**الحُبَارَى:** باڵندەیەکی ناسراوە، ڕەنگی خۆڵەمێشیە، ملی درێژەو، درێژییەک لە دەنووکیدا هەیە، وە خاوەن چڕنووک نیە، خواردنی حەڵاڵە بە جۆرێک هیچ شتێک لە شەرعدا نەهاتوە لەسەری کە بەڵگەی حەڕام بوونی بێت، وە فەرموودەی ئەم بەشە چەسپاو نیە.

---

(١) جلالة: بریتیە لەو جۆرە ئاژەڵانەی یان باڵندانەی کەوا شتی پیس دەخۆن، ئاژەڵەکان وەک (گاو مانگا..هتد) یەک هەفتە بەند دەکرێن، مریشک و هاووێنەکانیشی بۆ ماوەی سێ ڕۆژان بەند دەکرێن و خواردن و خواردنەوەی پاکیان پێ دەدرێ، ئنجا دەتوانرێ بخورێ.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٨٢٤، وأبو داود في السُنن: ٣٧٨٥.

(٣) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٧٢٨، وأبو داود في سننه: ٣٧٩٧، وإسناده غير ثابتٍ؛ فإنَّ شيخ المصنِّف الفَضل بن سهل الأعرج صدوقٌ، وإبراهيم بن عُمَر بن سفينة ويلقَّب بـ: (بُرَيْه) مستورٌ، لا يعرف إلاَّ بهذا الحديث، ولم يُتابع عليه؛ قال الحافظ ابن حجر في التَّلخيص الحبير: ٣٨٠/٤ إسناده ضعيفٌ، ضعَّفه العُقيلي وابن حبَّان.

١٥٦- عَنْ زَهْدَمٍ الْجَرْمِيِّ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﷺ قَالَ: فَقُدِّمَ طَعَامُهُ وَقُدِّمَ فِي طَعَامِهِ لَحْمُ دَجَاجٍ وَفِي الْقَوْمِ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَيْمِ اللَّهِ أَحْمَرُ كَأَنَّهُ مَوْلًى قَالَ: فَلَمْ يَدْنُ فَقَالَ لَهُ أَبُو مُوسَى ﷺ: «ادْنُ، فَإِنِّي قَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكَلَ مِنْهُ»، فَقَالَ: إِنِّي رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ شَيْئاً فَقَذِرْتُهُ فَحَلَفْتُ أَنْ لَا أَطْعَمَهُ أَبَداً[1].

واتە: زەهدەمی جەرمی دەڵێ: ئێمە لە خزمەت ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ دانیشتبووین، خواردنی بۆ دانرا، لە خواردنەکەدا گۆشتی مریشکی تێدابوو، لە نێو خەڵکەکەش پیاوێک لە بەنی تەیموڵڵا کە ڕەنگ سوور بوو، هەروەک بەندە وابوو، (چونکە ڕەنگی لە عەرەب نەدەچوو)، بەڵکو لە ڕۆم دەچوو، نزیکی خواردنەکە نەکەوت، ئەبو مووساش ﷺ پێی گوت: «نزیکبەوە، بە دڵنیایی من پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە لەوەی خواردوە (واتە: گۆشتی مریشکی خواردوە)» کابرا گوتی: پێشتر بینیوومە شتی پیس دەخوات، بۆیە منیش سوێندم لێ خواردوە کە بۆ هەمیشە نەیخۆم.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

فەرموودەی ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ کە ڕابرد، لێرەشدا هێناویەتیەوە، بەڵام بە سەنەدێکی دیکە.

١٥٧- عَنْ أَبِي أَسِيدٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ؛ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ»[2].

واتە: ئەبو ئەسید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەیتی زەیتوون بخۆن و خۆتان پێی چەور بکەن، چونکە لە درەختێکی موبارەک و بە پیت و پێزە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «كُلُوا الزَّيْتَ» یانی: بیکەنە پێخۆرو لەگەڵ نان دەخورێ.

کە دەڵێ: «وَادَّهِنُوا بِهِ» یانی: پرچ و پێستتانی پێ چەور بکەن.

---

(١) انظر: (ح ١٥٤).

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٥٢، وفي إسناده رجلٌ من الشّام يقال له: عطاء، مقبولٌ، فلا يحتجُّ بحديثه إلاَّ إذا وُجد له متابعٌ، لكنَّ الحديث يشهد له حديث عُمَر ابن الخطَّاب ﷺ الآيس بعده.

کە دەڵێ: «فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ»، یانی: درەختی زەیتوون پیرۆزەو سوودێکی یەکجار زۆری هەیە، وە ئەوەندە بۆ گەورەیی و فەزڵی زەیتوون بەسە کە خوا سوێندی پێ خواردوە لە قورئاندا، وە دەفەرموێ: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ ①﴾ التين. (سوێند بە هەنجیرو زەیتون). وە بە موبارەک وەسفی کردوە، وەک فەرموویەتی: ﴿يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ ㉟﴾ النور. (-ئەو چرایە- دائەگیرسێت بە -ڕۆنی- درەختێکی زەیتونی بەفەڕو بەرەکەت کە نە ڕۆژهەڵاتی بێت، وە نە ڕۆژ ئاوایی -سێبەر نایگرێ نەکاتی هەڵهاتنی خۆر نەکاتی ئاوابوونی، ڕۆنەکەی ئەوەند پاک بێت-).

پێشەوا (إبن القیم) رحمه الله لە (زاد المعاد)دا[1] دەڵێ: (وَالدُّهْنُ فِي الْبِلَادِ الْحَارَّةِ، كَالْحِجَازِ وَنَحْوِهِ مِنْ آكَدِ أَسْبَابِ حِفْظِ الصِّحَّةِ وَإِصْلَاحِ الْبَدَنِ، وَهُوَ كَالضَّرُورِيِّ لَهُمْ). واتە: وە خۆ چەورکردن بە زەیتی زەیتوون لەو وڵاتانەی کە گەرمن وەک حیجازو وێنەی ئەو لە هۆکارە کاریگەرەکانە بۆ پاراستنی تەندروستی و چاکی لاشە، کە ئەمەش شتێکی زۆر پێویستە بۆیان.

١٥٨- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ؛ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ». قَالَ أَبُو عِيسَى: وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ كَانَ يَضْطَرِبُ فِي هَذَا الْحَدِيثِ فَرُبَّمَا أَسْنَدَهُ، وَرُبَّمَا أَرْسَلَهُ[2].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەیتی زەیتوون بخۆن و خۆتانس پێ چەور بکەن، چونکە لە درەختێکی موبارەک و بە پیت و پێزە». ئەبو عیسا دەڵێ: وە عەبدوڕڕەزاق لەم فەرموودە تێکەڵ و پێکەڵی دەکرد، جاری وابوو بە (متصل)ی دەیگێڕایەوە، جاری واش هەبوو بە مورسەلی.

١٥٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عُمَرَ[3].

---

(١) ٣٠٨/٤.

(٢) أخرجه المصنّف فی جامعه: ١٨٥١، وابن ماجه في السُنن: ٣٣١٩.

(٣) أخرجه عبد الرَّزَّاق في مصنَّفه: ١٩٥٦٨؛ وحديث عُمَر ابن الخطَّاب رضي الله عنه يُروى موصولًا ومرسلًا، وقد ساقة المصنِّف رحمه الله بالوجهين، وهو بمعني حديث أبي أسيد المتقدِّم ومقوٌّ له.




واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرمووده گێردراوەتەوە لە پێغەمبەر ﷺ، بەڵام باسی ناوی عومەری ﷺ تێدا نەهاتوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: جاری وابوو بە (متصل)ی دەیگێڕایەوە، لەوانەیە مەبەستی ئەوەبێ کە وەک دانەر ﷺ هێنای یەکەمجار، وە کە دەشڵێ: جاری واش هەبوو بە مورسەلی هێناویەتی، هەروەکو لە ڕێگای دیکەوە هاتوە کە دەڵێ: «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ وَلَمْ يَذْكُرْ فِيهِ عَنْ عُمَرَ».

**١٦٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الدُّبَّاءُ فَأُتِيَ بِطَعَامٍ، أَوْ دُعِيَ لَهُ فَجَعَلْتُ أَتَتَبَّعُهُ فَأَضَعُهُ بَيْنَ يَدَيْهِ لِمَا أَعْلَمُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ»[1].**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ حەزی لە خواردنی کودی (کولەکە) بوو، خواردنی بۆ هێنرا، یان داوای خواردنی بۆ کرا، جا من (لەسەر سفرەکە) بە دوای کودی (کولەکە) دەگەڕام و ئەملاولام دەکردو لە پێش دەستیم دادەنا، لەبەر ئەوەی دەمزانی حەزی لە خواردنیەتی».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الدُّبَّاءُ»، حەزی لە خواردنی دەکردو پێی خۆش بوو، (الدُّبَّاء) بریتیە لە کودی (کولەکە) بریتیە لەو پێخۆرانەی کە بە نان (یاخود لەگەڵ نان) دەخورێن.

**١٦١- عَنْ حَكِيمِ بْنِ جَابِرٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَرَأَيْتُ عِنْدَهُ دُبَّاءً يُقَطَّعُ فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالَ: «نُكَثِّرُ بِهِ طَعَامَنَا». قَالَ أَبُو عِيسَى: وَجَابِرٌ هُوَ جَابِرُ بْنُ طَارِقٍ وَيُقَالُ: ابْنُ أَبِي طَارِقٍ، وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَا نَعْرِفُ لَهُ إِلَا هَذَا الْحَدِيثَ الْوَاحِدَ، وَأَبُو خَالِدٍ اسْمُهُ: سَعْدٌ[2].**

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٢٨١١.

(٢) أخرجه ابن ماجه في السُّنن: ٣٣٠٤.

واتە: حەکیمی کوڕی جابر لە باوکی ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: چوومە ژوور بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، تەماشام کرد کودی (کولەکەی) لەلایەو لەت دەکرێ، گوتم: ئەمە چیە؟ یان بۆ چیتانە؟ فەرمووی: «خواردنمانی پێ زۆر دەکەین». ئەبو عیسا دەڵێ: جابر کە جابری کوڕی تاریقە ﷺ، دەشگوترێ: کوڕی ئەبو تاریقە، یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، جگە لەم فەرموودە، هیچ فەرموودەیەکی دیکەی نازانین، وە ئەبو خالیدیش ناوی سعەدە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

فەرموودەی جابری کوڕی تاڕیق ﷺ ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ کودی (کولەکە) ی خواردوە، ئەویش لەو پێخۆرانەیە کەوا پێغەمبەر ﷺ شتی پێ دەخواردن.

**١٦٢- عَنِ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ خَيَّاطاً دَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ، قَالَ أَنَسٌ ﷺ: فَذَهَبْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَى ذَلِكَ الطَّعَامِ فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خُبْزاً مِنْ شَعِيرٍ، وَمَرَقاً فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ، قَالَ أَنَسٌ: «فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ» فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ(١).**

واتە: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبو تەڵحە، بیستوویەتی ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەیگوت: بەرگدوورێک پێغەمبەری خوای ﷺ بانگهێشت کرد بۆ خواردنێک کە بۆ ئەو دروستی کردبوو، ئەنەس ﷺ دەڵێ: منیش لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتم بۆ ئەم خواردنە، جا هەندێک نانی جۆو شلەیەک کە کودی (کولەکە)و گۆشتی وشککراوەی تێدابوو خستیە بەردەمی پێغەمبەری خوا، ئەنەس ﷺ دەڵێ: «تەماشام کرد وا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای کودی (کولەکەی) نێو قاپەکەی پێشیدا دەگەڕێ و پێی خۆشە بیخوات»، جا لەو کاتەوە من ئەوەم بینیوە کودی (کولەکەم) پێ خۆشە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: **«إِنَّ خَيَّاطاً دَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَهُ»**، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی بانگهێشتەکەی دایەوە، ئەوەش لە تەواوی سادەیی و خاکیی بوونیەتی.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٣٧٩، ومسلم: ٢٠٤١، والمصنّف في جامعه: ١٨٥٠.




کە دەڵێ: «فَقَرَّبَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، یانی: پێشکەشی کرد، لە جوانی میوانداری ئەوەیە خواردن نزیک بخرێتەوە بۆ بەردەم میوان، هەروەک خوا ﷻ باسی کردوە، دەربارەی ئیبراهیمی خۆشەویستی ﷺ کە چۆن ڕێزی گرتوە لە میوانەکانی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الذاريات. (جا خێرا چوو بۆلای خێزانەکەی ئەمجا گوێرەکەیەکی قەڵەوی -بەبرژاوی بۆ- هێنان ﴿٢٦﴾ وە نزیکی کردەوە لێیان -بەڵام نەیان خوارد- ووتی ئەوە ناخۆن؟ ﴿٢٧﴾).

کە دەفەرموێ: «وَمَرَقاً فِيهِ دُبَّاءٌ وَقَدِيدٌ» (المَرَق): ناسراوە، بریتیە لەوەی کە نانی تێدا دەگوشرێ، (الدُبَّاء): بریتیە لە کودی (کولەکە)، (القَدِيد): گۆشتی پارچەکراوە کە خوێی بەسەردا دەکرێ و لەبەر ڕۆژ وشک دەکرێتەوە، تاکو بۆ ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە.

کە دەفەرموێ: «فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَتَبَّعُ الدُّبَّاءَ حَوَالَيِ الْقَصْعَةِ»، دەگونجێ پێغەمبەریش ﷺ هەر لە لای خۆیەوە بە دوایدا گەڕابێ، نەک لە هەموو لایەکی قاپەکەدا، چونکە بە دڵنیایی خۆی ﷺ نەهی لەمە کردوە، عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە ﷺ دەڵێ: (من منداڵێک بووم لە کۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستم لە نێو قاپەکەدا دەگێڕا (بۆ خواردن)، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: {يَا غُلَامُ! سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ}[1]، واتە: ڕۆڵە گیان! ناوی خوا بێنەو، بە دەستی ڕاستت بخۆو، لە پێش خۆتەوە بیخۆ.

وە دەشگونجێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خزمەتکارەکەی کە ئەنەسی کوڕی مالیکە ﷺ پێکەوە خواردنەکەیان خواردبێ، لەو کاتەشدا بە دوای کولەکە گەڕاوە، چونکە ئەو خواردنەش پێشکەشی خۆی ﷺ و خزمەتکارەکەی کراوە، هیچ کەسی دیکەیان لەگەڵدا نەبووە.

**الْقَصْعَة**: قاپێکی گەورەیە، لە تەختەدار دروست کراوەو خواردنی تێدا دەخورێ، وە قاپەکانی خواردن چەندەها ناویان هەیە بە پێی قەبارەکانیان.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٣٧٦، ومسلم: ٢٠٢٢.

**الثعالبي**: لە ڕیزبەندی جۆری قاپەکاندا[1] گوتوویەتی: (یەکەمیان فەیحەیە وەک قاپێکی بچووکەو، خواردنێکی کەمی تێدەکرێ، پاشان صوحەیفەیە پیاوێک تێر خواردن دەکات، دوایی میئکەلە کە دوو، یان سێ پیاو تێر خواردن دەکات، پاشان صەحفەیە کە چوار، یان پێنج پیاو تێر خواردن دەکات، ئنجا قەصعەیە کە حەوت بۆ دە پیاو تێر خواردن دەکات، پاشان جەفنەیە کە گەورەترینیانە، هەندێکیش پێیان وایە کە دەسیعە گەورەترینیانە).

کە دەڵێ: «فَلَمْ أَزَلْ أُحِبُّ الدُّبَّاءَ مِنْ يَوْمِئِذٍ»، کە حەزی لە خواردنی کولەکە کردووە بە هۆی ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ حەزی لە خواردنی کولەکە کردوە.

١٦٣- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ»[2].

واتە: عائیشە رضي الله عنها، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ حەلواو هەنگوینی پێ خۆش بوو (حەزی لە خواردنیان دەکرد)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە خۆشویستن و حەزکردنی پێغەمبەری ﷺ تێدایە بۆ حەلوا، کە حەلواش خواردنێکی خۆش و شیرینە، هەروەها حەزکردنی لە هەنگوین تێدایە، ئەوەش لەو کۆمەڵە پێخۆرانەیە کە شتی پێ دەخورێ.

١٦٤- أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ، أَخْبَرَهُ أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ، أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا رضي الله عنها: «قَرَّبَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَنْبًا مَشْوِيًّا فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ وَمَا تَوَضَّأَ»[3].

واتە: عەتائی کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە: ئوممو سەلەمە رضي الله عنها هەواڵی پێداوە کە ئەو «لایەک گۆشتی برژاوی مەڕی نزیک خستۆتەوە بۆ بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ، (بۆ ئەوەی بیخوات)، (پێغەمبەریش ﷺ) لێی خواردوە، دوایی هەڵساوە بۆ ئەوەی نوێژ بکات، بێ ئەوەی دەستنوێژ بشۆرێتەوە (واتە: گۆشتی برژاو دەستنوێژ ناشکێنێ)».

---

(١) فقه اللغة: ٩٦٣/١.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٤٣١، ومسلم: ١٤٧٣، والمصنّف في جامعه: ١٨٣١.

(٣) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٢٩.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «قَرَّبَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جَنْبًا مَشْوِيًّا»، یانی: لایەکی مەڕ، یان وێنەی ئەو (لە گۆشتی ئاژەڵی دیکەی برژاو)، ئەوە لە پێخۆری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو.

کە دەڵێ: «فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ وَمَا تَوَضَّأَ»، یانی: دواجار لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو: کە دەستنوێژ نەشۆرێتەوە لە کاتی خواردنی ئەو خواردنانەی کە دەبرژێن، یان کوڵاون و ئاگریان بەرکەوتوە، جگە لە گۆشتی وشتر، کە ئەو هەڵاوێردراوە لە ڕاسترین و پەسندترین قسەی زانایان.

١٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: «أَكَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شِوَاءً فِي الْمَسْجِدِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: «لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتدا گۆشتی برژاومان خوارد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

**الشِّوَاء:** گۆشتی برژاو، کە هەمان مانای فەرموودەی پێشووە کە ئوممو سەلەمە ﷺ گێڕاویەتیەوە.

١٦٦- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: ضِفْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَأُتِيَ بِجَنْبٍ مَشْوِيٍّ، ثُمَّ أَخَذَ الشَّفْرَةَ فَجَعَلَ يَحُزُّ، فَحَزَّ لِي بِهَا مِنْهُ قَالَ: فَجَاءَ بِلَالٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ فَأَلْقَى الشَّفْرَةَ فَقَالَ: «مَا لَهُ تَرِبَتْ يَدَاهُ؟». قَالَ: وَكَانَ شَارِبُهُ قَدْ وَفَى، فَقَالَ لَهُ: «أَقُصُّهُ لَكَ عَلَى سِوَاكٍ» أَوْ «قُصُّهُ عَلَى سِوَاكٍ»[2].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: شەوێک میوان بووم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، جا لایەکی گۆشتی برژاوی بۆ هێنرا، پاشان دەستی دایە چەقۆکەو پارچە پارچەی دەکرد، پارچەیەکی بۆ من لێ بڕی، ئیدی بیلال هات بانگی کردو ئاگاداری کردەوە لە کاتی نوێژ، (پێغەمبەریش ﷺ بۆ خۆشی) فەرمووی: «ئەوە (بیلال) چیەتی دەستی بە خۆڵدا بچێ»، گوتی: موغیرە سمێڵی درێژ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی

---

(١) أخرجه ابم ماجه في السُّنن: ٣٣١١، وفي إسناده بان لهيعة؛ وهو صدوقٌ اختلط بعد احتراق كتبه.

(٢) أخرجه أبو داود في السُّنن: ١٨٨.

فەرموو: «لەسەر سیواکێک بۆت کورت دەکەمەوە»، یاخود فەرمووی: «لەسەر سیواکێک کورتی بکەوە».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «فَأُتِيَ بِجَنْبٍ مَشْوِيٍّ، ثُمَّ أَخَذَ الشَّفْرَةَ فَجَعَلَ يَحُزُّ»، یانی: لایەکی گۆشتی برژاوی سەر ئاگر بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنرا، پێغەمبەر ﷺ چەقۆی وەرگرت و بەم چەقۆیە گۆشتەکەی پارچە پارچە دەکرد.

کە دەڵێ: «فَحَزَّ لِي بِهَا مِنْهُ» واتە: پێغەمبەر ﷺ لە تەواویەتی سۆزو بەزەیی و خاکی و سادەیی و جوانترین هەڵسوکەوتیەدا لەگەڵ هاوەڵانیدا، بە دەستی موبارەکی لە گۆشتەکەی بۆ موغیرە لێکردەوە.

کە دەڵێ: «فَجَاءَ بِلَالٌ يُؤْذِنُهُ بِالصَّلَاةِ»، یانی: بیلال ﷺ هات ئاگاداری بکاتەوە کە کاتی نوێژکردن هاتوە.

کە دەڵێ: «تَرِبَتْ يَدَاهُ»، یانی: دەستەکانی بچێتە نێو خۆڵ و هەژار بکەوێ، ئەم وشەو وێنەی ئەم وشانەیە: (وَيحَک، وعقری، وحلقی .. هتد) کە عەرەب بەکاری دێنن، بێ ئەوەی مەبەستیان حەقیقەتی دووعایەکە بێ.

کە دەڵێ: «وَكَانَ شَارِبُهُ قَدْ وَفَى»، یانی: سمێڵی درێژ بوو، ئەوە ئاوڕدانەوەی تێدایە لەلایەن قسەی قسەکەرەوە، کە دیارە بۆ لای کەسی نادیار، لە (مسند)ی ئیمام ئەحمەددا[١] هاتوە ئەم فەرموودە بە بێژەی: {قَالَ لِـمُغِيْرَةَ: وَكَانَ شَارِبِـي}. واتە: موغیرە گوتی: سمێڵم درێژ بوو.

کە دەڵێ: «فَقَالَ لَهُ: أَقُصُّهُ لَكَ عَلَى سِوَاكٍ أَوْ قُصُّهُ عَلَى سِوَاكٍ»، یانی: سیواک لە ژێر سمێڵی دابنێ پاشان هەرچی زیادە بە مەقەس ببڕێ، لەم فەرموودەیەدا هاندان هەیە لەسەر بوونی سمێڵ، نەک تاشینی.

کورتکردنەوەی سمێڵ لە سوننەتەکانی خاوێنیە، ئەگەر مرۆڤ سروشتی گۆڕدرا، ئەوە شتی خراپی لا باش و جوان دەبێت، بۆیە سمێڵی درێژ دەکات بە شێوەیەکی

---

(١) برقم: ١٨٢١٢.




خراپ، وە شتی جوان و پاکیشی لەلا ناشیرین دەبێ، بۆیە ڕیشی دەتاشێ، بەڵکو جوانی و باشی لەوەدایە کە ڕێک دێتەوە لەگەڵ شەرع و سروشتی مرۆڤ ئەویش بەوەی کە ڕیشی بهێڵێتەوەو سمێڵی کورت بکاتەوە.

١٦٧-عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: «أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ فَنَهَسَ مِنْهَا»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: «(ڕۆژێک) گۆشت هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا باسکێکی بۆ بەرزکرایەوەو دایەنە دەستی، ئەویش ﷺ دەستی کرد بە خواردنی (زۆری) پێ خۆش بوو، بە ددانەکانی لێی دەکردەوەو دەیـخوارد».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ»، یانی: باسکی ئاژەڵەکەی لێ نزیک کرایەوەو پێشکەشی کرا.

کە دەڵێ: «وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ»، واتە: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە خواردنی باسکی ئاژەڵ دەکرد لەبەر خۆشیەکەی، وە لەبەر ئەوەی لە بەشی پێشەوەی لاشەیەتی، کە زووتر پێدەگات و گۆشت دەگرێ، وە لەبەر زۆری سوودەکەی.

قاضي عیاض ﷺ دەڵێ: حەزکردنی لە خواردنی باسکی ئاژەڵ بە هۆی زوو پێگەیشتن و زوو پاکبوونەوە بووە، لەگەڵ چێژی زۆری تامی خۆشی، وە دووری لەو شوێنانەی کە پیسیان پێوەیە[2].

کە دەڵێ: «فَنَهَسَ مِنْهَا»، (النَّهَس): بریتیە لە گرتنی گۆشت بە ددان، وە پارچەکردنی بە ددانەکانی پێشەوە، بە پێچەوانەی (نهش): بریتیە لە پارچەکردنی گۆشت و گەزتنی بە هەموو ددانەکان.

١٦٨- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ» قَالَ: «وَسُمَّ فِي الذِّرَاعِ، وَكَانَ يَرَى أَنَّ الْيَهُودَ سَمُّوهُ»[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٧١٢، ومسلم ١٩٤، والمصنّف في جامعه: ١٨٣٧.

(٢) نقله النووي في شرحه لصحيح مسلم: ٦٥/٣.

(٣) أخرجه أبو داود في السُّنن: ٣٧٨٠، وفي إسناده زهيرٌ، وهو مختلَفٌ فيه، وأبو إسحاق السَّبيعي مدلِّسٌ؛ وقد عنعن، وسعد بن عياض صدوقٌ، وللحديث شواهد يرتقي بها إلى درجه الحسن لغيره.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە خواردنی (گۆشت) حەزی لە باسک بوو»، دەڵێ: «جا (ڕۆژێک لە کاتی بانگهێشت کردنی بۆ نان خواردنی ماڵە جوولەکەیەک) باسکێکیان بۆ ژەهراوی کردبوو، گومانیشی وابوو جوولەکە (ئەو باسکەیان) بۆ ژەهراوی کردبێ و ژەهر خوارد کرا».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ»، وێنەی ئەم فەرموودەیە لە ئەبو هورەیرەوە پێشتر باسکراوە.

کە دەڵێ: «وَسُمَّ فِي الذِّرَاعِ»، یانی: ژەهری بۆ کرا ناوی، کە ئەمە لە غەزوەی خەیبەر (بوو)، جوولەکەیەک باسکەکەی ژەهراوی کردوە، وە ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە حەزی پێغەمبەر ﷺ بۆ باسکی ئاژەڵ شتێکی زانراو بوو.

کە دەڵێ: «وَكَانَ يَرَى أَنَّ الْيَهُودَ سَمُّوهُ» ئیبنو مەسعوود ﷺ بڕوای وابوو جوولەکە ژەهر خواردیان کرد، یان گومانی دەبرد.

بەڵگەی زۆر لەو بارەوە هاتوون کە جوولەکە بوون ئەم ژەهرەیان بۆ لە نێو باسکی ئاژەڵەکە داناوە، بەوەی کە ئافرەتێکیان ڕاسپارد، کە ناوی زەینەبی کچی حاریس بوو خواردنێکی بۆ دروست بکات، ژەهری بۆ لە خواردنەکە بکات، بە مەبەستی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن.

جا دەڵێ: پرسیاری کرد ئایا پێغەمبەر ﷺ چ بەشێکی ئاژەڵی زۆر پێخۆشە؟ گوتیان: باڵی ئاژەڵ، بۆیە ژەهری بەسەر تەواوی مەڕەکەدا کرد، بەشی زۆری بەسەر باڵیدا کرد، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ گازو قەمپاری لە گۆشتەکەدا، بە فەرمانی خوا باسکی ئاژەڵەکە هاتە قسەکردن و هەواڵی بە پێغەمبەر ﷺ دا (کە ئەو ژەهراوی کراوە) لە نێو دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم قسەیەی کرد.

جا دوایی ئەم ئافرەتە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ مسوڵمان بوو، جا کە پێغەمبەر ﷺ داوای لێکرد دان بنێ بەم کارەدا، دانی پێدا هێنا، جا ئافرەتەکە دەڵێ: گوتم: ئەگەر




تۆ پادشایەک بیت، لە کۆڵیان دەبیەوەو لە دەستت ڕزگارمان دەبێ، وە ئەگەریش پێغەمبەرێک بیت ئەوە خوا خۆی دەتپارێزێ، پێغەمبەریش ﷺ هیچ تۆڵەیەکی لێ نەساندەوە، وە بشری کوڕی بەڕاء ﷺ کە گۆشتەکەی خوارد مرد، جا خزم و کەسەکانی داوای تۆڵەی بەشیریان لێ کردەوەو ژنەکەیان کوشت(١).

وە لە صەحیحی بوخاریدا(٢) هاتوە کە عائیشە ﵂ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ لەو نەخۆشیەی کە تێیدا وەفاتی کرد، فەرمووی: {یا عَائِشَةُ! مَا أَزَالُ أَجِدُ أَلَمَ الطَّعَامِ الَّذِي أَكَلْتُ بَخَيْبَرَ، فَهَذا أَوَان وَجَدْتُ انْقِطَاعَ أَبْهَرِي مِنْ ذَلِكَ السُّمِّ}. واتە: ئەی عائیشە! بەردەوام هەست بە ئازاری ئەو خواردنە (ژەهراویە) دەکەم کە خواردم لە خەیبەر، ئێستا کاتی ئەوەیە هەست بە پچڕانی دەماری دڵم بکەم، بە هۆی ئەم ژەهرەوە.

**الأَبْهَر**: دەمارێکە پەیوەستە بە دڵەوە، ئەگەر پچڕا مرۆڤ دەمرێ، جا خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی پاراست لەوەی ئەم ژەهرە بیکوژێ، بەڵام ویستی وابوو شوێنەواری ئەوە بمێنێ کە خستیە دەمیەوە، تا ئەو کاتەی وەفاتی کرد.

**١٦٩- عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ ﷺ قَالَ: طَبَخْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ قِدْراً، وَقَدْ كَانَ يُعْجِبُهُ الذِّرَاعُ فَنَاوَلْتُهُ الذِّرَاعَ ثُمَّ قَالَ: «نَاوِلْنِي الذِّرَاعَ»، فَنَاوَلْتُهُ ثُمَّ قَالَ: «نَاوِلْنِي الذِّرَاعَ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَمْ لِلشَّاةِ مِنْ ذِرَاعٍ فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ سَكَتَّ لَنَاوَلْتَنِي الذِّرَاعَ مَا دَعَوْتُ»(٣).**

واتە: ئەبو عوبەید ﷺ دەڵێ: (ڕۆژێک) مەنجەڵێک گۆشتم بۆ پێغەمبەر ﷺ کوڵاند، حەزی لە گۆشتی باسک بوو، (دەستم درێژ کردو) باسکێکم لە پێش دانا، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «باسکێکم بدەرێ»، دوایی دیسان فەرمووی: «باسکێکم بدەرێ»، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا (بۆ) مەڕ چەند دەستی هەیە؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بە دەستە، ئەگەر قسەت نەکردبایە داوای چەند باسکم کردبا پێت دەدام».

---

(١) ينظر سنن أبي داود: ٤٥١٢ وغيره.

(٢) برقم: ٤٤٢٨.

(٣) إسناده ضعيف؛ فيه شَهر بن حَوشَب، لكن له شواهد ذكرها الشَّيخ الألباني في مختصر الشَّمائل: (ص ٩٦)، وصحَّح الحديثَ بها.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «فَنَاوَلْتُهُ الذِّرَاعَ ثُمَّ قَالَ: نَاوِلْنِي الذِّرَاعَ، فَنَاوَلْتُهُ»، شتێکی زانراوە کە مەڕ دوو باسکی هەن، کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە جاری سێیەم فەرمووی: «نَاوِلْنِي الذِّرَاعَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَمْ لِلشَّاةِ مِنْ ذِرَاعٍ»، واتە: دوو باسکم پێدای، مەڕیش لە دوو باسک زیاتری نین، «فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ سَكَتَّ لَنَاوَلْتَنِي الذِّرَاعَ مَا دَعَوْتُ»، یانی: ئەگەر چووبای بۆ لای مەنجەڵەکە بێ ئەوەی پرسیارم لێ بکەی دەربارەی ئەوەی دوو باسکی مەڕت پێداوم، ئەگەر داوای باسکم کردبا چەندان جاری دیکە (پێمت دەدا)، کە ئەمە لە نیشانەکانی پێغەمبەرایەتیە ﷺ.

١٧٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا كَانَتِ الذِّرَاعُ أَحَبَّ اللَّحْمِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَلَكِنَّهُ كَانَ لَا يَجِدُ اللَّحْمَ إِلَّا غِبًّا، وَكَانَ يَعْجَلُ إِلَيْهَا لِأَنَّهَا أَعْجَلُهَا نُضْجًا»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «باسکی (ئاژەڵ) خۆشترین گۆشت نەبووە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵام گۆشتی دەست نەدەکەوت مەگەر بە کەمی نەبێ (جار جار، ماوە ماوە وا دەهاتە پێش گۆشتی دەستبکەوێ)، جا کاتێکیش لێدەنرا، ئەم بەشەیان بۆ دەبرد (یاخود پەلەی بۆ دەکرد)، چونکە (باسک) زووتر دەکوڵاو پێدەگەیشت».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

وە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ بۆیە حەزی دەکرد لە خواردنی باسکی ئاژەڵ (چونکە هەموو کات گۆشتی نەبوو بۆ خواردن، واتە: ماوە ماوە دەیخوارد)، وە چونکە زووتر ئامادە دەبوو بۆ خواردن، جا ڕواڵەتی ئەم قسەیە پێچەوانەی ئەم فەرموودەی پێشووە کە باسمان کرد، لەوەی کە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە خواردنی باسکی ئاژەڵ دەکرد.

خۆ ئەگەر ئەم فەرموودەیە تەواو بێ، پێدەچێ مەبەستی پاک ڕاگرتنی پلەو مەقامێ بووبێ لەوەی کە مەیلی بۆ لای شتێکی لە جۆرە چووبێت، بەڵام ئەوەی کە فەرموودەکان

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٨٣٨ وقال: هذا حديث حسن، لا نعرفه إلا من هذا الوجه، وإسناده ضعيفٌ؛ فيه فُلَيْح بن سليمان، ليس بالقويِّ كما في الميزان: ٣٦٥/٣، وعبد الوَّهاب بن يحيى قال عنه أبو حاتم: (شيخ) الجرح والتَّعديل: ٧٢/٦.



لەسەرینەو جەختی لێ دەکەنەوە ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ وەک غەریزەی مرۆڤی ئاسایی حەزی لە خواردنی باسکی ئاژەڵ بووە، کە بێگومان ئەم حەزکردنە لە خواردنی (ئەم بەشەی گۆشتی ئاژەڵ) هیچ قەدەغە بوونێک نیە، چونکە ئەوە لە تەواوی مرۆڤ بوونیەوە سەرچاوەی گرتوە، هەروەک حەز کردنی لە بۆنی خۆش، بەڵام ئەوەی قەدەغەیە بۆ تەواویەتی لە پێغەمبەردا ﷺ، هەڵپەکردنی نەفسە بۆ بە دەستهێنانی و لە دەست دانیان، ئەو سیفەتەش بە هیچ شێوەیەک لە پێغەمبەردا ﷺ نەبووە.

١٧١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵄، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَطْيَبَ اللَّحْمِ لَحْمُ الظَّهْرِ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﵄ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بێگومان باشترین و بە تامترین گۆشت، گۆشتی پشتە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

«إِنَّ أَطْيَبَ» واتە: بەتام و چێژترینی، دەگوترێ: (طَابَ الشَّـيءُ يَطيبُ) ئەگەر شتەکە بە تام و چێژ بوو دەگوترێ، بە مانای باشترین دێ، وە دەشگوترێ: پاکترینە، بە هۆی دووری لەو شوێنانەی کە پیسن، مەبەستیش لەمە ئەوەیە کە خۆشترینە، چونکە گۆشتی باڵ لەو بەتامترە، بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هەڵیبژاردوە بۆ خواردن و حەزی لە خواردنی کردوە.

١٧٢- عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «نِعْمَ الْإِدَامُ الْخَلُّ»[(٢)].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «باشترین پێخۆر سرکەیە».

١٧٣- عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَعِنْدَكِ شَيْءٌ؟» فَقُلْتُ: لَا إِلَّا خُبْزٌ يَابِسٌ وَخَلٌّ، فَقَالَ: «هَاتِي، مَا أَقْفَرَ بَيْتٌ مِنْ أُدْمٍ فِيهِ خَلٌّ»[(٣)].

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السنن: ٣٣٠٨، وإسناده ضعيفٌ؛ لأنَّ فيه مبهماً، وهو الشَّيخ الَّذي مِن فَهْم، وجاء في سنن ابن ماجه: لمَّا أورد الحديث قال: وأظُنُّهُ يُسَمَّى محمَّد ابن عبد الله، وهو مقبولٌ لايحتجُّ بحديثه إلاَّ إذا توبع.

(٢) في إسناده سفيان بن وكيع، قال في التقريب: كان صدوقاً، إلاَّ أنَّه ابتلي بورَّاقه فأدخل عليه ما ليس من حديثه، فنُصح فلم يقبل فسقط حديثُه، وعبد الله بن المؤمَّل ضعيفٌ.

(٣) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٨٤١، وفي إسناده أبو حمزة الثُّمالي، وهو ضعيفٌ، لكن الحديث صحيحٌ بشواهده.

واتە: شەعبی دەڵێ: ئوممو هانیٔ ﵄ گوتی: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لام، فەرمووی: «هیچ شتێکت لایە (بۆ خواردن)؟» منیش گوتم: نەخێر، جگە لە نانێکی وشک لەگەڵ سرکە، فەرمووی: «بیهێنە، هیچ ماڵێک بێ پێخۆر نابێ (واتە: خانەوادەکەی بێ خواردن نابن) مادام سرکەی تێدابێ».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئوممو هانیٔ ﵄ کچی ئەبو تاڵیبە، کە دەکاتە کچە مامی پێغەمبەر ﷺ، کە دەڵێ: «أَعِنْدَكِ شَيْءٌ»، یانی: ئایا هیچ خواردنێکت لە لایە؟

کە دەڵێ: «لَا إِلَّا خُبْزٌ يَابِسٌ وَخَلٌّ»، یانی: هیچ شتێکم لەلا نیە بخورێ، جگە لە نانی وشک و سرکە.

کە دەڵێ: «مَا أَقْفَرَ بَيْتٌ مِنْ أُدْمٍ فِيهِ خَلٌّ»، یانی: ئەگەر ماڵێک سرکەی تێدابوو، ئیدی کەواتە خاڵی نیە لە پێخۆر، (واتە: خاوەن ماڵەکە شتێکی هەیە بیخوات).

١٧٤- عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[1].

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «پلەو پێگەی عائیشە ﵂ بەسەر ئافرەتانی دیکەوە، وەک پلەو پێگەی (خواردنی) سەریدە بەسەر هەموو خواردنەکانی دیکەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودە فەزڵ و پێگەی دایکی بڕواداران و هاوەڵی گەورەو ڕێزدار عائیشەی ﵂ تێدایە، کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ، بەسەر هەموو ئافرەتانی دیکەدا.

**الثَّرِيد**: نانی پارچەکراوە، پێخۆری وەک گۆشتاوو هاوشێوەی بەسەردا دەکرێ و نەرم دەبێتەوە، دەکرێ گۆشتی لەگەڵ بێ و، دەشگونجێ بێ گۆشت بێ.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤١٨، ومسلم: ٢٤٣١، والمصنِّف في جامعه: ١٨٣٤.




١٧٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «پلەو پێگەی عائیشە ﷺ بەسەر ئافرەتانی دیکەوە، وەک پلەو پێگەی (خواردنی) سەریدە بەسەر هەموو خواردنەکانی دیکەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لە فەرموودەی ئەبو مووسای ئەشعەریی ﷺ پێشتر باسکرا.

١٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّهُ: «رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ مِنْ أَكْلِ ثَوْرِ أَقِطٍ، ثُمَّ رَآهُ أَكَلَ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو «پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە دەستی شۆردۆتەوە بە هۆی خواردنی پارچە کەشکێک، دوایی بینیوویەتی گۆشتی شانە مەڕێکی دەخواردو کەچی دەستنوێژی نەشۆردەوەو نوێژی کرد».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «أَنَّهُ: رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ تَوَضَّأَ مِنْ أَكْلِ ثَوْرِ أَقِطٍ»، یانی: دەستی شۆردوە بە هۆی خواردنی پارچەیەکی کەشک، پارچەیەک لە کەشک ئەو ناوەی لێنراوە لەبەر ئەوەی ئەو کەرتە لە تەواوو پاشماوەی کەشکەکە جیابۆتەوە.

**الأَقِط**: بریتیە لە شیرێکی وشکی بەستووی بوو بە بەرد، مەبەستیش لە وشەی (وضوء) لێرەدا شۆردنی دەستنوێژ نیە، بەڵکو تەنها مەبەستی شۆردنی دوو دەستەکانە، وەک دوایی لە بەشی دوای ئەمە ڕوونی دەکاتەوە[3]، جا پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی شۆردن بە هۆی خواردنی ئەو پارچە کەشکەوە، «ثُمَّ رَآهُ أَكَلَ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ»، واتە: دوایی بینی گۆشتی شانی مەڕی خواردو پاشان نوێژی کردو دەستنوێژی نەشۆردەوە، چونکە خواردنی گۆشتی مەڕ دەستنوێژ ناشکێنێ.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤٢٨، ومسلم: ٢٤٤٦، والمصنّف في جامعه: ٣٨٧٨.

(٢) أخرجه أحمد في المسند: ٩٠٥٠ و ٩٠٤٩.

(٣) وانظر: (ح ٢٠٩) في الترجمة السّادسة بعد هذه.

لەم فەرموودەیەدا هەردوو واتاکەی (الوضوء) لە ڕووی زمانەوانی و لە ڕووی شەرعیەوە کۆکراوەتەوە (الوضوء)ی یەکەم بۆ واتای زمانەوانیەو (الوضوء)ی دووەم بۆ واتای شەرعیە.

١٧٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «أَوْلَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى صَفِيَّةَ بِتَمْرٍ وَسَوِيقٍ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ (وەک بانگهێشت کردن و میوانداری کردنی خەڵک) لە کاتی گواستنەوەی صەفییەی خێزانیدا، خواردنێکی ئامادەکرد لە خورماو ئارد (دروست کرابوو)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک صەفیەی کچی حوییەی کوڕی ئەختەبی مارەکرد ﷺ «کە لە جەنگ دەستی مسوڵمانان کەوتبوو»، ئازادی کردبوو، ئازاد کردنەکەشی کردە مارەییەکەی، بۆ خواردن و بانگهێشتکردنی خەڵکیش خورماو ئاردی دروست کرد (کە وەک حەلوایە) لە ئاردی گەنم و جۆ دروست دەکرێ.

وە لە فەرموودەی (صحیح)دا[2] هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بە خواردنی حەیس وەلیمەی بۆ کردوە، کە ئەویش خواردنێکە لە خورماو ڕۆن، وە لەگەڵیشیدا کەشک، یان ئارد دروست دەکرێ.

١٧٨- عَنْ سَلْمَى، أَنَّ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ، وَابْنَ عَبَّاسٍ، وَابْنَ جَعْفَرٍ ﷺ أَتَوْهَا فَقَالُوا لَهَا: اصْنَعِي لَنَا طَعَاماً مِمَّا كَانَ يُعْجِبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَيُحْسِنُ أَكْلَهُ. فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ لَا تَشْتَهِيهِ الْيَوْمَ قَالَ: بَلَى اصْنَعِيهِ لَنَا. قَالَ: فَقَامَتْ فَأَخَذَتْ مِنْ شَعِيرٍ فَطَحَنَتْهُ، ثُمَّ جَعَلَتْهُ فِي قِدْرٍ، وَصَبَّتْ عَلَيْهِ شَيْئاً مِنْ زَيْتٍ وَدَقَّتِ الْفُلْفُلَ وَالتَّوَابِلَ فَقَرَّبَتْهُ إِلَيْهِمْ، فَقَالَتْ: «هَذَا مِمَّا كَانَ يُعْجِبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَيُحْسِنُ أَكْلَهُ»[3].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٠٩٥، وأبو داود في السنن: ٣٧٤٤، وابن ماجه في السنن: ١٩٠٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٥١٦٩ من حديث أنس بن مالك ﷺ.

(٣) في إسناده الفُضيل بن سليمان وهو صدوقٌ كثير الأوهام؛ وعُبَيدُ الله بن علي بن أبي رافع مولى رسول الله ﷺ وهو ليِّنُ الحديث.

واتە: سەلما دەڵێ: حەسەنی کوڕی عەلی و ئیبنو عەبباس و ئیبنو جەعفەر ﷺ هاتوونە لای پێیان گوتوە: خواردنێکمان بۆ دروست بکە لەو خواردنانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری پێخۆش بووەو، خواردنی بە باش زانیوە، (سەلمان) گوتوویەتی: ڕۆڵە ئەمڕۆ دڵت بۆی ناچێ (واتە: ئەم خواردنە لەم ڕۆژگارەدا حەزی پێ ناکرێ)، (کوڕەکەش) گوتی: با، بۆمان دروست بکە، جا دەڵێ: ئیدی هەڵساو (هەندێ) جۆی بردو وردی کرد، پاشان خستیە نێو مەنجەڵێک، وە هەندێک زەیتی بەسەردا کرد لەگەڵ هەندێک بیبەرو شتی تر (کە دەخرێنە نێو خواردن) لێی نزیک خستنەوەو لەبەر دەمی دانان، جا گوتی: «ئەوە لەم خواردنانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی خۆش بوو، هەروەها خواردنیشی بە باش دەزانی».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ویستیان خواردنێکیان بۆ دروست بکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لێی بێت، ئەویش گوتی: «يَا بُنَيَّ لَا تَشْتَهِيهِ الْيَوْمَ»، چونکە جۆرەکانی خواردنی خۆش و بە لەززەت لەو سەردەمەدا زیاتر بوون و فەراهەم هێنراو بوون، بەڵام کاتێ پێداگریان کردو سوور بوون، ئەویش هەڵسا کەمێک جۆی هێناو کردی بە ئارد، پاشان خستیە نێو مەنجەڵێکەوە، کەمێک ڕۆنی بەسەردا کرد، بیبەرو بەهاراتی کرد بەسەردا، تاکو تامی خۆش بێ، پاشان پێشکەشی کردن، ئنجا پێی ڕاگەیاندن کە پێغەمبەر ﷺ حەزی لەو خواردنە دەکرد، جا هاوشێوەی ئەم جۆرە خواردنە مرۆڤ لە کاتی خواردنی هەمەجۆرو هەمەڕەنگ و خۆشگوزەرانی ئارەزووی بۆی ناڕوات و حەزی لێ نیە.

١٧٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَتَانَا النَّبِيُّ ﷺ فِي مَنْزِلِنَا فَذَبَحْنَا لَهُ شَاةً، فَقَالَ: «كَأَنَّهُمْ عَلِمُوا أَنَّا نُحِبُّ اللَّحْمَ» وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵمان، ئێمەش مەڕێکمان بۆ سەربڕی، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەی بینی) فەرمووی: «وەک ئەوەی بزانن ئێمە زۆر حەزمان لە خواردنی گۆشتە». لە فەرموودەکەدا بەسەرهاتێکیش هەیە (دیارە بە پێویست نەزانراوە بهێنرێ).




### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیە ڕوونکردنەوەی حەزکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ گۆشت تێدایە، وە هەروەها جۆرێک لە قسەخۆشی و جوان مامەڵەکردنی تێدایە لەگەڵ هاوەڵانی و، ئەوەش کە میوانداری کردوە، هەروەها دڵخۆشکردنی ئەو کەسەش کە میوانداری کردووەو خاوەن خواردنەکەیە، بە گوتنی ئەم وشە کاریگەرو هۆگرکەرانە کە کەسی بەرامبەر دڵخۆشی دەکات.

کە دەڵێ: «وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ»، پێشەوا ئەحمەد[1] گێڕاویەتیەوە، جگە لەویش لە جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: {أَتَيتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي دَينٍ كَانَ عَلى أَبِي، قَالَ: فَقَالَ: «آتيكُم»، قَالَ: فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ لِلمَرْأَةِ: لا تُكَلِّمِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَلاَ تَسْأَلِيهِ، قَالَ: فَأَتَانَا فَذَبَحْنَا لَهُ دَاجِناً كَانَ لَنَا، فَقَالَ: «يَا جَابِرُ! كَأَنَّكُمْ عَرَفْتُمْ حُبَّنَا اللَّحْمَ»، قَالَ: فَلَمَّا خَرَجَ قَالتْ لَهُ المَرْأَةُ: صَلِّ عَلَيَّ وَعَلَى زَوْجِي، أَو صَلِّ عَلَيْنَا، قَالَ: فَقَالَ: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ»، قَالَ: فَقُلْتُ لَهَا: أَلَيْسَ قَدْ نَهَيْتُكِ؟ قَالَت: تَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَدْخُلُ عَلَيْنَا وَلاَ يَدْعُو لَنَا؟!}.

واتە: چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ داوای هاوکاریم لێکرد بۆ قەرزێک کە لەسەر باوکم بوو (وەفاتیشی کردبوو لە جەنگی ئوحوددا) دەڵێ: فەرمووی: (بگەڕێوە) خۆم دێم بۆ لاتان، دەڵێ: منیش گەڕامەوەو گوتمە خێزانم: (کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا) هیچ قسەیەکی لەگەڵ نەکەی و داوای هیچ شتێکی لێ نەکەی، دەڵێ: کە تەشریفی هێنا لامان مەڕێکی دابەستەمان هەبوو بۆمان سەربڕی، فەرمووی: ئەی جابر! وەک بڵێی دەزانن حەزمان لە گۆشتە؟! دەڵێ: کاتێک ویستی بڕوات خێزانەکەم گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) دووعا بۆ خۆم و پیاوەکەم بکە، یان گوتی: دووعامان بۆ بکە، دەڵێ: پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ»، دەڵێ: بە خێزانم گوت: ئەدی نەمگوت داوای هیچی لێ نەکەی؟ خێزانیشم گوتی: دەبینی پێغەمبەری خوا ﷺ بێتە لامان و داوای لێ نەکەین دووعامان بۆ بکات! (واتە: ئەمە دەرفەتێکە ئەگەری دووبارە بوونەوەی زۆر دەگمەنە).

---

(١) أخرجه أحمد: ١٤٢٤٥.

١٨٠- عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ فَدَخَلَ عَلَى امْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فذَبَحَتْ لَهُ شَاةً فَأَكَلَ مِنْهَا، وَأَتَتْهُ بِقِنَاعٍ مِنْ رُطَبٍ، فَأَكَلَ مِنْهُ، ثُمَّ تَوَضَّأَ لِلظُّهْرِ وَصَلَّى ﷺ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَأَتَتْهُ بِعُلَالَةٍ مِنْ عُلَالَةِ الشَّاةِ، فَأَكَلَ ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ»[1].

واتە: جابر ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ چووە دەر، منیش لەگەڵی بووم، جا چووە ماڵی یەکێک لە ئافرەتە ئەنصارییەکان، (ئافرەتەکەش) مەڕێکی بۆ (پێغەمبەر ﷺ) سەربڕی و ئەویش لێی خوارد، وە قاپە خورمایەکی بۆ هێنا، (پێغەمبەر ﷺ) لەویشی خوارد، دوایی (پێغەمبەر ﷺ هەڵساو) دەستنوێژی شۆردو نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئیدی کە سەلامی دایەوە لە نوێژ ئافرەتەکە چوو (دووبارە) هەندێک لە پاشماوە (بەرماوە)ی مەڕەکەی هێناو خستیە بەردەمی، ئەویش خواردی، دوایی (پێغەمبەری خوا ﷺ) نوێژی عەسری ئەنجامداو دەستنوێژیشی نەشۆردەوە (واتە: بە هەمان دەستنوێژی نیوەڕۆ نوێژی عەسری کرد)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ»، ئا لەم شێوازەدا ڕوونکردنەوەی تەواوی ڕەوشت بەرزی هاوەڵانی تێدایە کە قسە لەبارەی پێغەمبەرەوە ﷺ دەکەن، هەندێک وشە دەردەبڕن کە هەست دەکرێ ئەوان شوێنکەوتوون و پێغەمبەریش ﷺ خەڵک شوێنی کەوتوون.

کە دەڵێ: «فَدَخَلَ عَلَى امْرَأَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فذَبَحَتْ لَهُ شَاةً فَأَكَلَ مِنْهَا، وَأَتَتْهُ بِقِنَاعٍ مِنْ رُطَبٍ»، (القِنَاع) بریتیە لە سینیەک (سەبەتەیەک) کە خورمای لەسەر دەخورێ و لە پووشی خورما دروست دەکرێ، سەرەتا مەڕەکەی پێشکەش کردو لێی خوارد، پاشان خورمای پێشکەش کرد لەویشی خوارد، «ثُمَّ تَوَضَّأَ لِلظُّهْرِ وَصَلَّى»، ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە بە هۆی خواردنی گۆشتی مەڕەوە دەستنوێژی شۆردبێتەوە، بەڵکو بە هۆی نەمانی دەستنوێژەوە بووە، یاخود بۆ نوێکردنەوەی دەستنوێژ بووە.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٨٠.

کە دەڵێ: «ثُمَّ انْصَرَفَ»، یانی: دوای نوێژی نیوەڕۆ، کە دەڵێ: «فَأَتَتْهُ بِعُلَالَةٍ مِنْ عُلَالَةِ الشَّاةِ»، (العُلَالَة) ماوەی شتێکە، جا ئەوەی مابووەوە لە مەڕەکە بۆی بردەوە تا بیخوات، «فَأَكَلَ ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ»، ئەمە ڕوون دەکاتەوە کە دەستنوێژ شۆردنی جاری یەکەمی بە هۆی خواردنی گۆشتی مەڕەوە نەبووە، ئەگەرنا دەبووایە جارێکی دیکەش بۆ نوێژی عەسر دووبارە دەستنوێژ بشۆرێتەوە، وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خواردنی گۆشتی هیچ ئاژەڵێک (کە حەڵاڵە) دەستنوێژ پێویست ناکات، جگە لە گۆشتی حوشتر نەبێ.

وە هەروەها ئەوەشی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکدا دوو جار گۆشتی خواردوە، جارێک پێش نوێژی نیوەڕۆ، جارێکیش دوای نیوەڕۆ (پێش نوێژی عەسر) کە بە دڵنیایی ئەوە تێکناگیرێ لەگەڵ فەرموودەی دایکمان عائیشە رضي الله عنها کە دەڵێ: «مَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَلَحْمٍ مَرَّتَيْنِ فِي يَوْمٍ» واتە: (پێغەمبەر ﷺ هیچ ڕۆژێک نەبووە بە تەواوی تێر نان و تێر گۆشتی خواردبێ دووجار لە ڕۆژێکدا)، چونکە ئەمە ئەوەی لێ وەرناگیرێ کە پێغەمبەر ﷺ خواردبی تا بە تەواوی تێر بووبێ، بەڵکو کەمێکی خواردوە پێش نوێژی نیوەڕۆ، ئنجا کە نوێژی کردووە هەندێک کە ماوەتەوە پێشکەشیان کردوەو ئەویش کەمێکی لێ خواردوە.

١٨١- عَنْ أُمِّ الْمُنْذِرِ رضي الله عنها، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَمَعَهُ عَلِيٌّ، وَلَنَا دَوَالٍ مُعَلَّقَةٌ، قَالَتْ: فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ وَعَلِيٌّ مَعَهُ يَأْكُل، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَلِيٍّ: «مَهْ يَا عَلِيُّ، فَإِنَّكَ نَاقِهٌ»، قَالَتْ: فَجَلَسَ عَلِيٌّ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ، قَالَتْ: فَجَعَلْتُ لَهُمْ سِلْقاً وَشَعِيراً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِعَلِيٍّ: «مِنْ هَذَا فَأَصِبْ فَإِنَّ هَذَا أَوْفَقُ لَكَ»(١).

واتە: ئوممو مونزیر رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لام و عەلی رضي الله عنه لەگەڵ دابوو، هێشووەک خورمای هەڵواسراومان هەبوو، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ و عەلی پێکەوە لێیان دەخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: «وازبێنە لە خواردن عەلی، چونکە تۆ تازە چاک بوویەوەو نەخۆشیت نەماوە». (واتە: زۆر خواردن بۆ چاک بوونەوەی دوای نەخۆشی باش نیە)، ئوممو مونزیر رضي الله عنها دەڵێ: بۆیە عەلی رضي الله عنه

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٠٣٧، وقال: حسنٌ غريبٌ، لانعرفه إلاّ من حديثٍ فليح.

دانیشت و پێغەمبەریش ﷺ دەیخوارد، (ئوممو مونزیر ﵂) دەڵێ: منیش هەڵسام سڵق و جۆم بۆ کردنە چێشت، ئنجا پێغەمبەر ﷺ بە علی فەرموو: «لەو (چێشت)ـە بخۆ، ئەمە بۆ تۆ باشە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئوممو مونزیر ﵂، دەڵێن: یەکێک بووە لە پلکەکانی پێغەمبەر ﷺ (واتە: خوشکی دایکی) پێغەمبەر ﷺ بووە، گوتوویەتی: «وَلَنَا دَوَالٍ مُعَلَّقَةٌ»، (دَوَال) کۆی (دالية)یە، (دَوَال) هێشووی خورمای تەڕو تازە پێگەییوە، فەریکە خورمایان هەڵدەواسی، پاش ئەوەی کە پێدەگەیشت لێیان دەخوارد.

کە دەڵێ: «فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْكُلُ وَعَلِيٌّ مَعَهُ يَأْكُلُ»، یانی: پێغەمبەری خوا ﷺو عەلی ﵁ لێیان دەخوارد، «فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَلِيٍّ: مَهْ يَا عَلِيُّ»، یانی: واز لە خواردن بێنەو بوەستە، «فَإِنَّكَ نَاقِهٌ»، واتە: لە کاتێکدا وا تازە چاکبوویەوە لە نەخۆشی، (نَاقِهٌ) ئەو کەسەیە کە تازە لە نەخۆشی چاکبووبێتەوە، بەڵام تەواو نەکەوتبێتە سەرپێ و تەندروستی تەواو باش بووبێ.

کە دەڵێ: «فَجَلَسَ عَلِيٌّ وَالنَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ، قَالَتْ: فَجَعَلْتُ لَهُمْ سِلْقاً وَشَعِيراً»، سڵق ڕووەکێکی ناسراوەو لە جەرجیر دەچێ و بە زۆری بە کوڵاوی دەخورێ، ئوممو مونزیر ﵂ جۆو سڵقی بۆ کوڵاندبوو، هەندێک لە زانایان باسی ئەوەیان کردووە کە کاتێک جۆ بکوڵێنرێ لەگەڵ سڵقدا ئەوە سوودێکی یەکجار زۆری هەیە بۆ نەخۆش، بە تایبەتی لە کاتی کۆتایی هاتنی نەخۆشیەکەو سەرەتای کەوتنە سەر پێی نەخۆشەکە.

«فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِعَلِيٍّ: مِنْ هَذَا فَأَصِبْ فَإِنَّ هَذَا أَوْفَقُ لَكَ»، لەمەدا سوودێکی باش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بۆ کەسی تازە چاکبووەوە لە نەخۆشی خواردنی جۆی بۆ دروست بکرێ، چونکە سوودەکانی هەموو تێدا کۆبوونەتەوە، ئارامی دەروون و یارمەتی دانی لەسەر تەواوی چاکبوونەوەی لە نەخۆشیەکە پێدەبەخشێ، جا ئەگەر سڵقیشی لەگەڵ بێ سوودەکەی زیاتر دەبێ، وە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ موبارەکە بۆ چاکی و بەرژەوەندی دین و دونیای مرۆڤی تێدایە، هەم بۆ لاشەی هەم بۆ هەموو کاروبارەکانی.

**١٨٢- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْتِينِي فَيَقُولُ: «أَعِنْدَكِ غَدَاءٌ؟» فَأَقُولُ: لَا. قَالَتْ: فَيَقُولُ: «إِنِّي صَائِمٌ». قَالَتْ: فَأَتَانِي يَوْمًا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ قَالَ: «وَمَا هِيَ؟» قُلْتُ: حَيْسٌ قَالَ: «أَمَا إِنِّي أَصْبَحْتُ صَائِمًا» قَالَتْ: ثُمَّ أَكَلَ[1].**

واتە: عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دایکی بڕواداران دەڵێ: (جاری وابوو) پێغەمبەر ﷺ دەهاتە لام، جا دەیفەرموو: «ئایا خواردنی بەیانیت لایە (هیچ شتێک هەیە بیخۆم)»، منیش دەمگوت: نەخێر، دەیفەرموو: «مادام من بەڕۆژووم (واتە: ڕۆژوو دەگرم ئەمڕۆ)»، جا عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لام، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دیاریەکیان بۆ هێناوین، فەرمووی: «چیە؟» گوتم: (چێشتی) خورماو ڕۆن و کەشک، یاخود لەگەڵ ڕۆن و ئارد، فەرمووی: «هەرچەندە کاتێک بەیانیم کردەوە بەڕۆژوو بووم»، (واتە: ڕۆژووی سوننەت) دەڵێ: دوایی خواردی (واتە: ڕۆژووەکەی شکاند).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: **«فَيَقُولُ: أَعِنْدَكِ غَدَاءٌ؟»** (الغَدَاء): بریتیە لە خواردنی بەیانی (ئەوەیە کە لە سەرەتای ڕۆژدا دەخورێ).

کە دەڵێ: **«فَأَقُولُ: لَا»**، یانی: نانی بەیانیمان نیە، **«فَيَقُولُ: إِنِّي صَائِمٌ»**، لەو کاتەوە نیەتی بەڕۆژوو بوون دێنێ، ڕۆژووی سوننەت مەرج نیە لە شەودا نیەتی بۆ بهێنرێ، مرۆڤ ئەگەر بەیانی کردەوەو هیچی نەخواردبوو، وە هیچیشی نەخواردبوویەوە، پاشان لە سەرەتای ڕۆژدا بڕیاریدا بەڕۆژوو بێ بۆی هەیە ڕۆژوو بگرێ، بە پێچەوانەی ڕۆژووی فەرز کە مەرج تێیدا ئەوەیە نیەت لە شەو بهێنرێ بۆ، وەک پێشەوا دارقوتنی[2] و جگە لەویش گێڕاویانەوە لە فەرموودەی عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ قَبْلَ طُلُوعِ الفَجْرِ؛ فَلاَ صِيَامَ لَه}. واتە: هەر کەس پێش بانگی بەیانی نیەتی بە ڕۆژوو بوون نەهێنێ، ڕۆژووی بۆ نیە.

---

(١) أخرجه مسلم: ١١٥٤، والمصنّف في جامعه: ٧٣٤.

(٢) في سننه: ٢٢١٣.




کە دەڵێ: «فَأَتَانِي يَوْمًا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ قَالَ: وَمَا هِيَ؟ قُلْتُ: حَيْسٌ» (الحَيْس): خواردنێکە پێک دێت لە خورماو ڕۆن و کەشک، یاخود ڕۆن و ئارد.

کە دەڵێ: «أَمَا إِنِّي أَصْبَحْتُ صَائِمًا، قَالَتْ: ثُمَّ أَكَلَ»، لە ڕستەی پێشەوەدا ئەوەی ڕوونکردەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاتوە هیچ نەبووە بیخوات، پێشتریش نیەتی نەبووە بەڕۆژوو بێ، بۆیە لەو کاتەدا نیەتی بەڕۆژوو بوونی هێناوە، بەڵام لێرەدا نیەتی هێناوەو پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵ بینیویەتی خواردن هەیە، ڕۆژووەکەی شکاندوە، ئا لەوەدا بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسەی ڕۆژووی سوننەتی گرتوە، بۆی هەیە لە هەر کاتێکی ڕۆژدا بیشکێنی، چونکە جڵەوی کاری خۆی بە دەستی خۆیەتی.

١٨٣- عَنْ يُوسُفَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَخَذَ كِسْرَةً مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ فَوَضَعَ عَلَيْهَا تَمْرَةً وَقَالَ: «هَذِهِ إِدَامُ هَذِهِ وَأَكَلَ»[1].

واتە: یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام ﷺ دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی پارچەیەک نانی جۆی هەڵگرت، ئنجا خورمایەکی لەسەر دانا، پاشان فەرمووی: «ئەوە پێخۆری ئەمەیە (واتە: خورما پێخۆری نانە)، ئنجا خواردنی».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَخَذَ كِسْرَةً مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ» پارچە نانێکی جۆی وشکە.

کە دەڵێ: «هَذِهِ إِدَامُ هَذِهِ وَأَكَلَ» یانی: ئەم خورمایە پێخۆری ئەم نانەیە.

١٨٤- عَنْ أَنَسٍ ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُعْجِبُهُ الثُّفْلُ»[2] قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: «يَعْنِي مَا بَقِيَ مِنَ الطَّعَامِ».

واتە: ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: «کە پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی نیشتووی (بنکڕ) پێخۆش بوو»، عەبدوڵڵا (ڕاوی فەرمووده) دەڵێ: «واتە: ئەوەی ماوەتەوە لە خواردن».

---

(١) أخرجه أبو داود في سننه: ٣٢٦٠، وهو حديثٌ ضعيفٌ؛ لجهالة يزيد بن أميّة الأعور الرّاوي عن يوسف.

(٢) أخرجه أحمد في المسند: ١٣٣٠٠.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

دانەر ﷫ بەم فەرموودە کۆتایی بەم بەشە هێناوە، ئەنەسی کوڕی مالیک ﷜ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ «كَانَ يُعْجِبُهُ الثُّفْلُ» واتە: حەزی لە خواردنی بن مەنجەڵ بوو، هەروەها دانەری کتێب دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڕڕەحمان وشەی (ثُفْل)ی وا مانا کردوە: بریتیە لەو خواردنەی کە لە بنی مەنجەڵ دەمێنێتەوە، لە گۆشت یان ئارد، وە جگە لەوانەش، ئەوەش بەوە جیادەکرێتەوە کە زیاتر پێگەیشتوەو کوڵاوە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی دەست شۆردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی خواردن



بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ وُضُوءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ الطَّعَامِ.

دانەر ﷺ ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ لە شۆردنی دەستەکاندا لە کاتی نانخواردن دا، وە (وُضُوء) بە ڕەهایی دوو مانای هەن: مانای زمانەوانی و مانای شەرعی، یەکەمیان مەبەست پێی شۆردنی دەستەکان و خاوێنکردنەوەیانە لە هەرچی پیسی و خۆڵ و شتێک کە پێیانەوە دەنووسێ، هەیە لە زانایان پێی وایە دەبێ پێش و پاش خواردن بشۆردرێن، وە هەشیانە دەڵێ: پێویست ناکات، مەگەر دەست شتێکی پێوە بێ لاببرێ، جا پێش خواردن بێ، یان دوای خواردن، لەبەر گشتیەتی ئەو بەڵگانەی هاتوون دەربارەی پاک و خاوێنی.

ئەوەی دووەمیان کە مانای شەرعیە، مەبەست پێی خواپەرستیە، بە شۆردنی ڕووخسارو دەستەکان و مەسحی سەرکردن و شۆردنی پێیەکان، کە ئەوە پێویست نیە بۆ خواردن ئەنجام بدرێ، تەنها ئەگەر مرۆڤ گۆشتی وشتری خوارد، ئەو کاتە پێویستە لەسەری بەم شێوازە دەستنوێژ بشۆرێ پێش نوێژ کردن.

١٨٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ مِنَ الْخَلَاءِ فَقُرِّبَ إِلَيْهِ الطَّعَامُ فَقَالُوا: أَلَا نَأْتِيكَ بِوَضُوءٍ؟ قَالَ: «إِنَّمَا أُمِرْتُ بِالْوُضُوءِ إِذَا قُمْتُ إِلَى الصَّلَاةِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرئاو هاتەدەر، دوایی خواردنی لێ نزیک خرایەوەو لە بەردەمی دانرا، جا گوتیان: ئایا ئاوی دەستنوێژت بۆ نەهێنین (دەستنوێژ بشۆری؟ پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «من تەنیا ئەو کاتە فەرمانم پێکراوە دەستنوێژ بشۆرم کە هەڵسام بۆ ئەنجامدانی نوێژ، (واتە: نان خواردن دەستنوێژ شۆردنی ناوێ)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَلَا نَأْتِيكَ بِوَضُوءٍ»، (الوَضُوء) -بە فەتحەی واوەکە- بریتیە لەو ئاوەی کە دەستنوێژی پێ دەشۆرێ.

کە دەڵێ: «إِنَّمَا أُمِرْتُ بِالْوُضُوءِ إِذَا قُمْتُ إِلَى الصَّلَاةِ»، (الوُضُوء) -بە زەممەی واوەکە- بریتیە لە کرداری دەستنوێژ شۆردنەکە، جا بە پێغەمبەر ﷺ یان گوت: ئایا ئاوی دەستنوێژت

---
(١) أخرجه المصنف في جامعه: ١٨٤٧، وأبو داود في سننه: ٣٧٦٠.




بۆ ئامادە نەکەین؟! پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دانەوەو فەرمووی: دەستنوێژ شۆردن تەنها لەسەر کەسێکە کە دەیەوێ نوێژ بکات، نەک لەسەر ئەو کەسەی کە دەیەوێ نان بخوات، لێرەدا مەبەست لە (الوُضُوء) دەستنوێژ شۆردنە.

١٨٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْغَائِطِ فَأُتِيَ بِطَعَامٍ، فَقِيلَ لَهُ: أَلَا تَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ: «أَأُصَلِّي فَأَتَوَضَّأُ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرئاو هاتەدەر، ئیدی خواردنی بۆ هێنرا، جا پێی گوترا: ئایا دەستنوێژ ناشۆری؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «ئایا من نوێژ دەکەم تاکو دەستنوێژ بشۆرم!».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَأُصَلِّي فَأَتَوَضَّأُ»، یانی: ئایا ویستم نوێژ بکەم تاکو دەستنوێژ بشۆرم؟ یانی: دەستنوێژ بۆ ئەوە ناشۆردرێ کاتێک مرۆڤ خواردن دەخوات، بەڵکو دەستنوێژ بۆ نوێژکردن دەشۆردرێ.

١٨٧- عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: قَرَأْتُ فِي التَّوْرَاةِ أَنَّ بَرَكَةَ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ بَعْدَهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، وَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَرَأْتُ فِي التَّوْرَاةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ»[2].

واتە: سەلمان دەڵێ: من لە تەورات خوێندوومەتەوە (نووسراوە) بەرەکەتی خواردن لەوە دایە دوای (خواردنەکە) دەست بشۆردرێ، ئەوەم باسکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ، وە هەواڵیشم پێدا دەربارەی ئەوەی لە تەوراتدا خوێندبوومەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەرەکەتی خواردن لەوە دایە هەم لە پێش، هەم لە دوای نان خواردن دەستنوێژ بشۆردرێ».

---

(١) أخرجه مسلم: ٣٧٤.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٨٤٦، وأبو داود في سننه: ٣٧٦١، وهو حديثٌ ضعيفٌ، وعلَّته قَيس بن الرَّبيع، وقد سئل الإمامان أحمد وأبو حاتم عن هذا الحديث فقالا: إنَّه منكر، انظر العلل لابن أبي حاتم ٥٤١/١.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «قَرَأْتُ فِي التَّوْرَاةِ»، وا پێدەچێ ئەم خوێندنەوەی تەوراتە پێش مسوڵمان بوونی بووبێ، لەبەر ئەوەی مسوڵمان بۆی دروست نیە، نە تەورات و، نە ئینجیل بخوێنێتەوە، وە نە کتێبەکانی دیکەی جگە لەوانیش کە نەسخ بوونەتەوە بە قورئان.

پێشەوا ئەحمەد ﵀ لە عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەگێڕێتەوە: کە ئەو چووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێک لە کتێبی جوولەکەو گاورەکانی دەستکەوتووەو هێناویەتی بۆ پێغەمبەری ﷺ خوێندۆتەوە، پێغەمبەریش ﷺ تووڕە بووەو فەرموویەتی: {أَمُتَهَوِّكُونَ فِيهَا يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ جِئْتُكُمْ بِهَا بَيْضَاءَ نَقِيَّةً، لَا تَسْأَلُوهُمْ عَنْ شَيْءٍ فَيُخْبِرُوكُمْ بِحَقٍّ فَتُكَذِّبُوا بِهِ، أَوْ بِبَاطِلٍ فَتُصَدِّقُوا بِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ مُوسَى ﷺ كَانَ حَيًّا مَا وَسِعَهُ إِلَّا أَنْ يَتَّبِعَنِي}(١).

واتە: ئەی کوڕی خەتتاب! بە گومانی لە قورئان (تا پەنا ببەی بۆ کتێبی خاوەن کتێبەکان) سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بە دەستە، ئەو پەیامەی کە بۆتانم هێناوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، پرسیاریان لێ مەکەن دەربارەی هیچ شتێک، ئەوان هەواڵتان پێ بدەن بە ڕاست و ئێوەش بە درۆیان دابنێن، یان هەواڵتان پێبدەن بە درۆو ئێوەش بە ڕاستیان دابنێن، سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بە دەستە، ئەگەر مووسا ﵇ زیندوو بووایە شوێنی من دەکەوت.

وە کاتێک لە کۆتایی دونیادا عیسا ﵇ دادەبەزێ و دێتە خوار تەنها کار بە قورئان دەکات، نەک بە ئینجیل، چونکە بە دڵنیایی قورئان نەسخکەرەوەی هەموو کتێبەکانی پێش خۆیەتی، بۆیە دروست نیە (کتێبەکانی دیکە) بخوێندرێنەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زانایەکی ڕۆچوو و شارەزا، ئەگەر پێویست بکات تەماشای تەورات، یان ئینجیل بکات، بۆ وەڵامدانەوەی گومانێک و لابردنی شتێکی پووچ، یاخود ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕێکی خراپ، ئەوە بۆی هەیە ئەم کارە بکات.

کە دەڵێ: «أَنَّ بَرَكَةَ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ بَعْدَهُ»، واتە: یەکێک لە هۆکارەکانی بەرەکەتی خواردن بریتیە لەوەی کە مرۆڤی مسوڵمان دوای خواردنەکە دەستەکانی بشۆرێ،

---

(١) مسند الإمام أحمد: ١٥١٥٦.




مەبەست لێی شۆردنی دەستنوێژ نیە، جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ هەواڵیدا دەربارەی ئەو کەسەی کە تەوراتی خوێندۆتەوە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «بَرَكَةُ الطَّعَامِ الْوُضُوءُ قَبْلَهُ وَالْوُضُوءُ بَعْدَهُ»، واتە: بەرەکەتی خواردن ئەوەیە کە دەستی بشوات پێش خواردن و دوای خواردن.

واتە: لە هۆکارەکانی پیت و فەڕی خۆراک ئەوەیە کە پێش و پاش نان خواردن، مرۆڤ دەستەکانی بشۆرێ.



# بابەت: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی پێش خواردن و دوای تەواوبوونی



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي قَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَبْلَ الطَّعَامِ وَبَعْدَمَا يَفْرُغُ مِنْهُ.




دانەر ﷺ ئەم بەشەی داناوە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی پێش دەستکردن بە خواردن، هەروەها دەربارەی ئەوەش کە دەیفەرموو لە دوای تەواوبوون لە خواردن.

١٨٨- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمًا، فَقُرِّبَ إِلَيْهِ طَعَامٌ، فَلَمْ أَرَ طَعَامًا كَانَ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْهُ، أَوَّلَ مَا أَكَلْنَا، وَلَا أَقَلَّ بَرَكَةً فِي آخِرِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ هَذَا؟ قَالَ: «إِنَّا ذَكَرْنَا اسْمَ اللَّهِ حِينَ أَكَلْنَا، ثُمَّ قَعَدَ مَنْ أَكَلَ وَلَمْ يُسَمِّ اللَّهَ تَعَالَى فَأَكَلَ مَعَهُ الشَّيْطَانُ»[1].

واتە: ئەبو ئەییوبی ئەنصاری ﷺ دەڵێ: ئێمە ڕۆژێک لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین، خواردنێکی لێ نزیک خرایەوە، پێشتر هیچ خواردنێکم نەبینیبوو لەو خواردنە بەرەکەتی مەزنتر بووبێ، لەسەرەتای ئەوەی دەستمان کرد بە خواردنی، وە کەمترین بەرەکەتی هەبێ لە کۆتاییەکەیدا، بۆیە گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە چۆن بوو (ئەو حاڵەتە)؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئێمە کە دەستمان بە خواردن کردو ناوی خوامان لێ هێنا (واتە: ئەمە هۆکاری زۆری و گەورەیی بەرەکەتەکە بوو)، ئنجا دوایی ئەو کەسەی هات دانیشت و خواردی و ناوی خوای بەرزی لەسەر خواردن نەهێنا، شەیتان لەگەڵی خوارد».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ يَوْمًا»، ئەو شێوازەو وێنەی کە هەستی شوێنکەوتەیی تێدایە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕەوشت بەرزیی و ئەدەبی هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ.

کە دەڵێ: «فَقُرِّبَ إِلَيْهِ طَعَامٌ»، واتە: پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کراو لێی نزیک خرایەوە، کە ئەمە جوانترین و باشترینە لە ڕێزلێگرتن و سەخاوەتمەندیدا کە خواردن لە میوان نزیک بخرێتەوەو بخرێتە بەردەمی.

کە دەڵێ: «فَلَمْ أَرَ طَعَامًا كَانَ أَعْظَمَ بَرَكَةً مِنْهُ، أَوَّلَ مَا أَكَلْنَا، وَلَا أَقَلَّ بَرَكَةً فِي آخِرِهِ»، ئەبو ئەییوب ﷺ تێبینی ئەوەی کردووە لە خواردنەکە کە خواردوویانە، لە سەرەتا بەرەکەتەکەی

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٢٣٥٢٢ وفي إسناده عبد الله بن لهيعة وهو سَيِّئُ الحفظ، وفيه أيضًا راشد بن جَندل اليَّافعي، قال عنه الحافظ في التقريب: ٢٠٤/١: ثقة، لكن الأقرب -والله أعلم بمراجعة ترجمته في تذهيب الكمال- أنَّه مجهولٌ، وشيخه حبيب ابن أوس كذلك مجهولٌ؛ فالإسناد ضعيفٌ، لكنَّ الحديث صحيح المعنى للشواهد الَّتي تقدَّم بَعضُها، وسيأتي كذلك شيءٌ منها.



زۆر بووەو پاشان کەمێک کەمی کردووە لە کۆتاییەکەی، هەستیان بەمە کردووە کە هۆیەکی هەیە (پرسیاریان لە هۆکارەکەی کردوە)، «فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ هَذَا»، واتە: ئەوە چۆنە لە سەرەتا ئەم بەرەکەتە مەزنە هەبوو، پاشان لە کۆتاییەکەی کەمی کرد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «إِنَّا ذَكَرْنَا اسْمَ اللَّهِ حِينَ أَكَلْنَا، ثُمَّ قَعَدَ مَنْ أَكَلَ وَلَمْ يُسَمِّ اللَّهَ تَعَالَى فَأَكَلَ مَعَهُ الشَّيْطَانُ»، واتە: ئەوان لە سەرەتای دەست پێکردنی خواردنەکە ناوی خوایان هێناوە بۆیە شەیتان هیچ ڕێگایەکی نەبووە لەگەڵیان دانیشێ، کاتێک کە خواردن ناوی خوای لەسەر دێ شەیتان ڕێگای لێ دەگیرێ، پاشان کە یەکێک لەگەڵ ئەو کۆمەڵە دانیشتووەو ناوی خوای نەهێناوە، شەیتان بواری بۆ ڕەخساوە بۆ ئەوەی لەگەڵی بخوات، فەرمووی: «فَأَكَلَ مَعَهُ الشَّيْطَانُ»، نەیفەرموو: لەگەڵ وان، چونکە ئەوان پێشتر ناوی خوایان هێنابوو.

هەر لەبەر ئەوەیە لە فەرموودەی جابر ﷺ کە لەلای موسلیم[1] و جگە لەویش هەیە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ: لا مَبِيتَ لَكُمْ وَلا عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ المَبِيتَ، فَإِذَا لَمْ يَذْكُرِ اللهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ: أَدْرَكْتُمُ المَبِيتَ وَالعَشَاءَ}. واتە: ئەگەر پیاو چووە نێوماڵەوەو یادی خوای کرد، (بِسْمِ اللَّهِ)ی کرد لە کاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی نان خواردنیدا، شەیتان (بە هاوەڵانی) دەڵێ: نە شوێنی مانەوەتان بۆ هەیە، نە خواردن، وە ئەگەر (پیاو) چووە نێو ماڵەوەو یادی خوای نەکردو (بِسْمِ اللَّهِ)ی نەکرد لە کاتی چوونە ژوورەوەیدا، ئەوە شەیتان (بە هاوەڵانی) دەڵێ: شوێنی مانەوەتان دەستکەوت، وە ئەگەر لە کاتی نان خواردنیشدا یادی خوای نەکردو (بِسْمِ اللَّهِ)ی نەکرد، ئەوە شەیتان دەڵێ: شوێنی مانەوەو خواردنیشتان دەستکەوت.

ئا ئەوە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە مسوڵمان دەبێ سووربێ لەسەر ئەوەی کە زیکری خوا لە کاتی نانخواردن و خواردنەوەو چوونە نێو ماڵی بکات بۆ ئەوەی شەیتان لە هیچ شتێک لەگەڵی بەشدار نەبێ، بە دڵنیایی شەیتان دێ بۆ لای مرۆڤ وای لێ دەکات دەستی بخاتە سەر خواردنەکە بێ ئەوەی ناوی خوای لەسەر بێنێ بۆ ئەوەی لەگەڵی بەشدار بێ.

---

(١) برقم: ٢٠١٨.




لە (صحيح مسلم)[١] لە حوزەیفە ﷺ هاتوە کە گوتوویەتی: ئێمە کاتێک لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەسەر خواردنێک دادەنیشتین، دەستمان بە خواردن نەدەکرد، هەتا پێغەمبەر ﷺ دەستی پێدەکرد، جارێک ئێمە لە خزمەتی بووین لەسەر نان خواردن، کچۆڵەیەکی بچووک هات، وەک ئەوەی پاڵی بدەن هات دەستی بخاتە نێو خواردنەکە، پێغەمبەریش ﷺ دەستی گرت، پاشان دەشتەکیەک وەک ئەوەی پاڵی پێوە بنێن و (بکەوێتە سەر نان خواردنەکە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {إِنَّ الشَّيْطَانَ يَسْتَحِلُّ الطَّعَامَ أَن لا يُذْكَرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَإِنَّهُ جَاءَ بِهَذِهِ الجَارِيَةِ لِيَسْتَحِلَّ بِهَا فَأَخَذْتُ بِيَدِهَا، فَجَاءَ بِهَذَا الأَعرَابِيِّ لِيَسْتَحِلَّ بِهِ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ يَدَهُ فِي يَدِي مَعَ يَدِهَا}. واتە: بە دڵنیایی شەیتان لە خواردنی ئەو خواردنەی بۆ مسۆگەر دەبێ کە ناوی خوای لەسەر ناهێندرێ، شەیتان لەگەڵ ئەم کچۆڵە هات و پاڵیدا بۆ ئەوەی خواردنەکە مسۆگەر بکات، منیش دەستیم گرت، پاشان لەگەڵ ئەو پیاوە دەشتەکیە هات و پاڵیدا بۆ ئەوەی خواردنەکە مسۆگەر بکات، منیش دەستیم گرت، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە دەستی لە نێو دەستی مندا بوو لەگەڵ دەستی کیژۆڵەکەدا.

لەبەر ئەوەیە واجبە لەسەر مسوڵمان کە دژایەتی و دوژمنایەتی شەیتان بۆ نەوەی ئادەم ڕوون بکاتەوەو ئەوانیش وەک دوژمن تەماشای بکەن، بۆ ئەوەی بەشدار نەبێت لە ماڵەکانیان و لە خواردن و خواردنەوەکانیان، هەروەها (فێریان بکات) ناو نەهێنانی خوا لەسەر خواردن و خواردنەوە لە هۆکاری نەمانی بەرەکەتە، وە لە هۆکاری بەشداربوونی شەیتانە لەگەڵ مرۆڤ لە خواردن و خواردنەوەکەی.

١٨٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَنَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اللَّهَ تَعَالَى عَلَى طَعَامِهِ فَلْيَقُلْ: بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ»[٢].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی خوارد، لە بیری چوو ناوی خوای بەرز بێنێ لە سەرەتای دەست کردن بە خواردنەکە، ئەوە با بڵێ: بە ناوی خوا لە سەرەتاو کۆتایی دا».

---

(١) برقم: ٢٠١٧.

(٢) وفي إسناده أمُّ كلثوم اللَّيثيَّة، وهي مجهولةٌ، لكنَّ المتن صحيحٌ بشواهده؛ انظر (ح ١٩٣).




**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

هەر کەسێک خواردنێکی خواردو لە سەرەتا تووشی بێ ئاگایی و لەبیرچوون بوو، لەوەی ناوی خوا بێنێ، پاشان لە کاتی نان خواردنەکەدا بیری هاتەوە کە لەبیری چووە ناوی خوا بێنێ لە سەرەتادا، ئەوە لەسەریەتی ئا لەو کاتەدا بڵێ: «بِسْمِ اللَّهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ»، یانی: بە ناوی خوا لە سەرەتاو کۆتایی دا، چونکە ئەگەر ئەمەی گوت بە مۆڵەتی خوا بەرەکەتەکەی بۆ مسۆگەر دەبێ، ئا ئەوەش لە زیادە بەخشش و بەزەیی پەروەردگارەوەیە.

١٩٠- عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدَهُ طَعَامٌ فَقَالَ: «ادْنُ يَا بُنَيَّ فَسَمِّ اللَّهَ تَعَالَى وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ»[1].

واتە: عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە: کە ئەو چۆتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ (لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ) خواردنی لە بەردەست بووە، پێی فەرمووە: «ئەی ڕۆڵە گیان نزیک بەوە، ئنجا ناوی خوای بەرز بێنەو بە دەستی ڕاستت بـخۆ، وە لە بەردەم خۆتەوە بیخۆ».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

پێشتر ئەم فەرموودەیە هێنراو باسکرا لە ڕووێکی دیکەوە، وە لەم بەشەدا هێناویەتی لە پێناو ئەم بڕگەیەیە کە (بسم الله)ی تێدایە.

پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیەدا سێ ئادابی خواردنی کۆکردوونەوە ئەوانیش: ناوی خوا هێنان لە سەرەتای نان خواردن، وە خواردن و خواردنەوە بە دەستی ڕاست، وە خواردن لە پێش دەستی بـخۆر.

کە دەڵێ: «ادْنُ يَا بُنَيَّ»، ئەوە خۆش گوفتاری و ڕەفتاری پێغەمبەری خوای ﷺ تێدایە لە مامەڵەو هەڵسوکەوت کردنیدا، چونکە ئەگەر تۆ بە کەسێک بڵێی: ڕۆڵە گیان و ئەویش ڕۆڵەی تۆ نەبێ، ئەوە ئەو کەسە هەست بە خۆش گوفتاری و سۆزو بەزەیی تۆ دەکات بەرامبەر خۆی.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٥٧، وان ماجه في السُّنن: ٣٢٦٥.




وە ئەمە بەڵگەشە لەسەر دروستیەتی ئەوەی کەسێک بەم بێژەو تەعبیرە کەسانێک بدوێنێ کە منداڵی خۆی نین، کاتێک کە بە منداڵێکی بچووک دەڵێ: ئەی ڕۆڵە! (یان کوڕی خۆم، یان کوڕە جوانەکەم ... هتد) لە ڕوانگەی خۆش گوفتاری و هۆگرکردنەوە، بۆیەش پێشەوا بوخاری لە کتێبی (الأدب مفرد)دا بەشێکی تەرخان کردووە بە ناوونیشانی: (قول الرَّجل للصَّغير: يَا بُنَيَّ!)[1] یانی: قسەی کەسێک کە بە منداڵێکی بچووک دەڵێ: ئەی ڕۆڵە، یان کوڕی خۆم.

١٩١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا فَرَغَ مِنْ طَعَامِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە خواردن تەواو دەبوو، دەیفەرموو: «ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشین و لە مسوڵمانانی گێڕاوین».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَجَعَلَنَا مُسْلِمِينَ»، واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منەتی لەسەر کردین بە (پێدانی) ئەم خواردنەو ئەم خواردنەوەیە، وە ئێمەی گێڕاوە بە بەندەیەکی مسوڵمان، ئا ئەم نیعمەتە زۆر گەورەیە، کە کەسێک بەندەیەکی مسوڵمان بێت و، لە نێو ئەم دینە مەزنەدا بێ، وە خواردنێکی لەلا بێ کە برسیەتی نەهێڵێ و خواردنەوەیەکی لەلا بێ کە تینوویەتی بشکێنێ، وە بێگومان چەند شێوەیەک لە سوپاسکردنی دوای نان خواردن هاتوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە مسوڵمان لە دوای تەواو بوونی لە خواردن دەیڵێ، هەتا ئەگەر لە دوای خواردن و خواردنەوە تەنها بڵێ: (الحمد لله) ئەوەندەی بەسە وەک دواتر ڕوونی دەکەینەوە، بەڵام باشتر وایە کام لەم زیکرانەی کە هاتوون ئاسانە لەسەری لەبەریان بکات و هەندێک جار گۆڕانکاریان تێدا بکات، جارێک ئەم زیکرە بخوێنێ و، جارێکی دی زیکرێکی دی.

---

(١) ١/٨٤.

(٢) أخرجه أبو داود في السُّنن: ٣٨٥٠، والمصنِّف في جامعه: من طريقٍ آخر ٣٤٥٧، وفي إسناده إسماعيل بن رياح مجهولٌ.



١٩٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رُفِعَتِ الْمَائِدَةُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ يَقُولُ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدَاً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكَاً فِيهِ غَيْرَ مُودَعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا»[1].

واتە: ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک (لە خواردن تەواو دەبوو)، سفرەی ژێر دەستی هەڵدەگیرایەوەو لادەبرا دەیفەرموو: «هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ خوا، سوپاسێکی زۆرو پاک و پوخت و بەرەکەتێکی زۆر، (پەروەردگارمان) وازی لێ ناهێنرێ و کەس بێ پێویست نیە لێی، وە هەمووان پێویستیان پێیەتی».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «إِذَا رُفِعَتِ الْمَائِدَةُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ»، واتە: ئەگەر تەواوبوون لە خواردن و، دەستیان کرد بە هەڵگرتن و کۆکردنەوەی سفرەی خواردن لە ژێر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ سوپاسی خوا ﷻ دەکات، وە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لە کاتی تەواوبوون لە خواردن سفرە هەڵدەگیرێتەوەو بەجێناهێڵرێ.

کە دەڵێ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدَاً كَثِيراً طَيِّباً»، ستایش بۆ خوا، ستایشێک کە زۆر وەسف کراوە بە زۆر پاک و پوختی، پاکیەک کە لێرەدا هەست دەکرێ دوور لە ڕیاو ناوبانگ، هیچ مەبەستێک لە گوتنیدا نیە جگە لە نزیک بوونەوە لە خوای گەورە، کە دەڵێ: «مُبَارَكَاً فِيهِ»، (البَرَكة) یانی: بەردەوام بوونی ئەم چاکەیەی کە هەیە، وە هەروەها گەشەکردنی و زیاد بوونی.

کە دەڵێ: «غَيْرَ مُودَعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبَّنَا»، ئەم ستایشە هەر بەردەوام بێت، وە کەس لێی بێ نیاز نابێت.

١٩٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ الطَّعَامَ فِي سِتَّةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ سَمَّى لَكَفَاكُمْ»[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤٥٨، والمصنّف في جامعه: ٣٤٥٦.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٥٨؛ وفي إسناده أُمّ كلثوم اللَّيثيَّة مجهولة، لكن له شاهد عند أبي يعلى في المسند: ٧١٥٣ بلفظ: «أمَا إنَّه لو قَال: باسْم الله، لوَسِعَكُم».

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ شەش لە هاوەڵانی خواردنی دەخوارد، ئیدی لەو کاتەدا پیاوێکی دەشتەکی هات، بە دوو پاروو (هەموو خواردنەکەی) خوارد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر ناوی خوای لەسەر هێنابا ئەوە (خواردنەکە) بەشی هەمووتانی دەکرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ الطَّعَامَ فِي سِتَّةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ»، واتە: بەشداربوون لەگەڵی لە نان خواردن، «فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَأَكَلَهُ بِلُقْمَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ سَمَّى لَكَفَاكُمْ»، لەبەر ئەوەی ناو نەهێنانی خوا لەسەر خواردن لە هۆکارەکانی نەمانی بەرەکەتە، کەمێک لە خواردن ئەگەر بەندە ناوی خوای لەسەر بێنێ بۆی زیاد دەبێ و بەرەکەتی تێدەکەوێ، وە خواردنێکی زۆریش ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنرێ، دەبێتە هۆی بێ بەرەکەت بوونی خواردنەکە.

١٩٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الْأَكْلَةَ، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا ڕازی دەبێ لەو بەندەیەی کە خواردنێک دەخوات، یان خواردنەوەیەک دەخواتەوە، جا ستایشی (خوای) لەسەر دەکات (چونکە وەک نیعمەتی خوا تەماشای دەکات)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

**الْأَكْلَةَ**: بریتیە لە ژەمە خواردنێک، وەک نانی بەیانی، یاخود ئێوارە، ئەم فەرموودە ئەوەشی تێدایە کە سوننەتە سوپاس و ستاییشی خوا بکرێ لە دوای خواردن و خواردنەوە.

دانەری کتێب ئەم فەرموودەی دواخستوە بۆ کۆتایی ئەم بەشە، چونکە پاداشتی سوپاس و ستایشکردنی خوای تێدایە لەسەر خواردن و خواردنەوە، ئەوەش

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٧٣٤، والمصنّف في جامعه: ١٨١٦.



سەرکەوتن و سەرفراز بوونە بە گەیشتن بە ڕەزامەندیی خوا ﷻ، بێگومان چەندان شێوەی سوپاس و ستایشکردن هاتوون، هەندێکیان باسکرا، وە ئەگەر (شێوازو جۆرەکانی) کورت بکرێتەوە لە (الحمد لله) ئەوە سوونەتەکە جێبەجێ کراوەو پاداشتەکەی بە دەست هاتوە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی پەرداخی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي قَدَحِ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ.




**القدح**: كۆیەكەی (أَقْدَاح)ـە، وەک (السَّبَب) كە كۆیەكەی (أَسْبَاب)ـە، ئەو شتەیە كە خواردنەوەو شلەمەنی تێیدا دەخورێتەوە، مەبەست لە باسكردنی ئەو جام و پەرداخەیە كە پێغەمبەر ﷺ خواردنەوەی تێدا دەخواردەوە، وەک ئاو، گوشراوی ترێ و خورما، هەنگوین، شیرو جگە لەوانەش.

**١٩٥- عَنْ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: أَخْرَجَ إِلَيْنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، قَدَحَ خَشَبٍ غَلِيظاً مُضَبَّباً بِحَدِيدٍ، فَقَالَ: «يَا ثَابِتُ، هَذَا قَدَحُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].**

واتە: سابت ﷺ دەڵێ: ئەنەس قاپێكی بۆ دەرهێناین، (قاپەكە) لە دارێكی ئەستوور دروستكرابوو، كە بە ئاسنێكی پان بەسترابوویەوە، جا پێی گوت: «ئەی سابت! ئەمە قاپی پێغەمبەری خوایە ﷺ».

### شەرح و ڕوونكردنەوە:

باسی پەرداخی پێغەمبەری خوای ﷺ تێدایە، كە پەرداخێک بوو لە دار دروست كرابوو، ئەستوور بووەو بە ئاسن بەستراوەتەوە، (الضَّبَّة) ئاسنێكی پانە، دار پێكەوە كۆدەكاتەوەو دەیبەستێتەوە، هەندێكی پاڵدەداتە لای هەندێكی و پێكەوە پەیوەستی دەكات، هیچ بۆشاییەک ناهێڵێ كە ئاوی لێ بێتە دەرو دزە بكات.

**١٩٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: «لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِهَذَا الْقَدَحِ الشَّرَابَ كُلَّهُ، الْمَاءَ وَالنَّبِيذَ وَالْعَسَلَ وَاللَّبَنَ»[2].**

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: «بێگومان من بەم پەرداخە هەموو جۆرە خواردنەوەكانی (وەک:) ئاوو شەربەت و هەنگوین و شیرم داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ».

---

(١) في إسناده حسين بن الأسود البغدادي، وهو صدوقٌ يخطئ كثيرًا، وفيه عيسىَ بن طَهمان، وهو صدوقٌ، وقد رواه البخاري في صحيحه: ٥٦٣٨ عن عاصم الأحول قال: «رَأَيْتُ قَدَحَ النَّبِيِّ ﷺ عِنْدَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ وَكَانَ قَدِ انْصَدَعَ، فَسَلْسَلَهُ بِفِضَّةٍ؛ قَالَ: وَهُوَ قَدَحٌ جَيِّدٌ عَرِيضٌ مِنْ نُضَارٍ، قَالَ: قَالَ أَنَسٌ: لَقَدْ سَقَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَا الْقَدَحِ أَكْثَرَ مِنْ كَذَا وَكَذَا».

(٢) أخرجه مسلم: ٢٠٠٨.



## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە هەر بەم پەرداخە جۆرەها خواردنەوەی خواردۆتەوە وەک: ئاو، گیراوەی ترێ و خورما، هەروەها هەنگوین و شیر.

**النَّبِيذ**: ئاوێکە خورما، یان ترێ و، وێنەی ئەوانەی دەخرێتە نێو لە شەودا، دەمێنێتەوە لە نێو ئاوەکەدا تا بەیانی، تامی ئاوەکە زۆر خۆش دەکات، تامی خورما، یان ترێی لێ دێت.

وە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا خوای گەورە ئامێرەکانی تێکەڵکردن و گوشینی میوەکان و گرتنی ئاوەکانی ئاسان کردوە، جا ئەگەر مرۆڤ پێویستی بە ئاوێکی تێکەڵ بە شەربەتی سێو، یان پڕتەقاڵ، یان جگە لەوە بێت، ئەوە ئاوەکە دەخاتە نێو ئامێرەکەو لەگەڵ شتێک لەو میوانەی کە خۆی دەیەوێ بە ماوەیەکی کەم تێکەڵیان دەکات و خۆشاوو شەربەتێکی خۆش و شیرینی بۆ بەرهەم دێنێ و دەیخواتەوە، کە بێگومان ئەوەش فەزڵ و چاکەی خوای پەروەردگارە، وە هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ ئەوە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی میوەی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي فَاكِهَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.



**الفَاكِهَة**: بریتیە لەو خواردنەی کە تام وچێژی لێ دەبینرێ، جا تەڕ بێت، یاخود وشک بێت، وەک: هەنجیرو گندۆرەو شوتی و مێوژو خورماو هەنارو، خوای بەرزیش (لەوبارەوە فەرموویەتی:) ﴿فِيهِمَا فَٰكِهَةٞ وَنَخۡلٞ وَرُمَّانٞ ٦٨﴾ الرحمن. (لەو دوو -باخەدا لەهەموو جۆرە- میوەو دارخورماو هەنارێکیان تێدایە).

زانایانی زمانزان دەڵێن: کە تەنیا ناوی ئەوانەی هێناوە، ئەمە وەک ڕەچاوکردنی عادەتی عەڕەبە کە بە گشتی باسی شتەکان دەکەن، دواتر تایبەتی دەکەن بەوەی ناوی دەهێنن، وەک ئاگاداریەک لەسەر ئەو تایبەتمەندیی و چاکەی کە تێیدایە.

**١٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ»[١].**

واتە: عەبدوڵلا ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ تەرۆزی (کالیار) بە خورمای تازە پێگەیشتووی دەخوارد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

**القثاء**: واتە: تەرۆزی، کە لە خەیار دەچێ و لە ڕووی قەبارەوە لە خەیار گەورەترە، (رُطَبِ)یش دیارە واتە: خورمای تازە پێگەیشتووە، جا پێغەمبەر ﷺ تەرۆزی بە خورمای تازە پێگەیشتووی دەخوارد، دواتریش فەرموودەی دیکە دێن، کە باسی ئەوە دەکات پێغەمبەر ﷺ خورمای تازە پێگەیشتوو و گندۆرە (کاڵەکی) پێکەوە خواردوە، وە هەروەها لەگەڵ شوتی دەیخوارد.

حیکمەتیش لە پێکەوە کۆکردنەوەو خواردنی ئەم دوو جۆرە میوەیە ئەوەیە کە خورمای تازە پێگەیشتوو گەرمیەکی تێدایە کە ساردی گندۆرە (کاڵەکەکە)و شوتی و کالیار ئەم گەرمیەی دەشکێنێ و بەم شێوە خواردنەکە هاوسەنگ دەبێ و (تام و چێژێکی زۆر خۆش دەبەخشێ).

**١٩٨- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَأْكُلُ الْبِطِّيخَ بِالرُّطَبِ»[٢].**

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٤٤٠، ومسلم: ٢٠٤٣، والمصنّف في جامعه: ١٨٤٤.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٤٣، وأبو داود في السُنن: ٣٨٣٦.




واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ شوتی بە خورمای تازە پێگەیشتووی دەخوارد»[١].

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

هەمان مانای فەرموودەی پێشترە، لەبەر ئەوەی خورمای تازە پێگەیشتوو گەرمەو شوتیش ساردە، جا بە گەرمیەکەی ئەم، ساردیەکەی ئەو دەشکێ، هەروەها (إبن القيم) ﵀ لە کتێبی (زاد المعاد)دا[٢] دەڵێ: دەربارەی شوتی ژمارەیەک فەرموودە گێڕدراوەتەوە هیچ کامێکیان صەحیح نین، جگە لەم فەرموودەیە، مەبەستیش لێی شوتیە، کە ڕەنگی سەوزە.

١٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الْخِرْبِزِ وَالرُّطَبِ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی گندۆرە (واتە: کاڵەک)و خورمای تازە پێگەیشتووی پێکەوە دەخوارد».

ئەم فەرموودە ئەوەی تێدایە کە (ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁) پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە گندۆرە (واتە: کاڵەک)و خورمای تازە پێگەیشتووی پێکەوە خواردوە، مەبەستیش لە (الْخِرْبِزِ) کاڵەکە، واتە: زەردەکە.

٢٠٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ الْبِطِّيخَ بِالرُّطَبِ»[٤].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ شوتی بە خورمای تازە پێگەیشتووی دەخوارد».

فەرموودەکەی دایکمان عائیشە ﵂ پێشتر باسکرا.

٢٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّاسُ إِذَا رَأَوْا أَوَّلَ الثَّمَرِ جَاءُوا بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَإِذَا أَخَذَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثِمَارِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا

---

(١) البطيخ: شوتيه، الكربز: كاڵەكە. قثاء: تەرۆزی و كاليارە.

(٢) ٢٨٧/٤.

(٣) أخرجه أحمد في المسند: ١٢٤٦٠ و ١٢٤٤٩.

(٤) انظر: (ح ١٩٨)، وفي، إسناده محمَّد بن عبد العزيز الرَّملي، وهو صدوقٌ يهم، وفيه أيضًا عبد الله بن يزيد بن الصَّلت، وهو ضعيفٌ، وفيه كذلك محمَّد بن إسحاق، وهو مدلِّسٌ وقد عنعن، لكنَّ الحديث يتقوَّى بما تقدَّم.

وَفِي مُدِّنَا، اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنِّي عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنَّهُ دَعَاكَ لِمَكَّةَ، وَإِنِّي أَدْعُوكَ لِلْمَدِينَةِ بِمِثْلِ مَا دَعَاكَ بِهِ لِمَكَّةَ وَمِثْلِهِ مَعَهُ» قَالَ: ثُمَّ يَدْعُو أَصْغَرَ وَلِيدٍ يَرَاهُ فَيُعْطِيهِ ذَلِكَ الثَّمَرَ[١].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: کاتێک خەڵک یەکەم بەرهەمی کشتوکاڵیان پێگەیشتبا دەیانهێنا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، جا (پێغەمبەریش ﷺ) وەری دەگرت، دەیفەرموو: «خوایە بەرەکەت بـخە نێو بەروبوومان، وە بەرەکەت بـخە نێو شارەکەمان، وە بەرەکەت بـخە نێو پێوان و کێشانمان، ئەی خوایە ئیبراهیم بەندەو دۆست و پێغەمبەری تۆیە، منیش بەندەو پێغەمبەری تۆم، وە ئەو لێت پاڕایەوە بۆ مەککە، منیش لێت دەپاڕێمەوە بۆ مەدینە، بە وێنەی ئەو پاڕانەوەی ئەو کردی و داوای لێت کرد بۆ مەککەو دوو هێندەی پاڕانەوەی ئەو»، (ئەبو هورەیرە) دەڵێ: پاشان بانگی بچوکترین منداڵی دەکرد کە لەوێ دەیبینی، ئنجا ئەو بەربوومە تازە پێگەیشتووەی پێ دەدا.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

بەڵگەی تێدایە کە ئەوان بە یەکەم بەری خورما زۆر دڵخۆش دەبوون، چونکە خورمای تەڕو تازەیان چنگ نەدەکەوت، مەگەر لەکاتی پێگەیشتنی خورما، پاشان دوای ئەوە هەرچی دەمایەوە دەبوو بە خورمای قەسپ، ئیدی تا ساڵ دەهاتەوە خورمای تەڕیان نەدەبینی، بە پێچەوانەی ڕۆژگاری ئێمە، خوای پەروەردگار کارئاسانی بۆ کردووین بەهۆی ئامێری ساردکەرەوە، وەک سەلاجەو موجەمیدە، دەتوانین بەدرێژایی ساڵ خواردنەکانمانی تێدا بپارێزین.

جا هاوەڵان ﷺ کە یەکەم بەریان دەبینی دەیانهێنا بۆلای پێغەمبەر ﷺ کە ئەویش وەری دەگرت ئەم دوعایە موبارەکەی دەکرد: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثَمَرِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا، وَفِي مُدِّنَا، اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنِّي عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنَّهُ دَعَاكَ لِمَكَّةَ، وَإِنِّي أَدْعُوكَ لِلْمَدِينَةِ بِمِثْلِ مَا دَعَاكَ بِهِ لِمَكَّةَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ».

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٣٨، والمصنّف في جامعه: ٣٤٥٤.

کە دەڵێ: «اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ، وَإِنِّي عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ»، ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی تەوەسولی ڕێگاپێدراو کە ئەویش تەوەسولە بۆ لای خوا بە پەرستش و خۆ زەلیل کردن و خۆ هەژار بینین، پاشان پێغەمبەر ﷺ دوعا دەکات بۆ مەدینە وەک چۆن ئیبراهیم ﷺ دوعای کرد بۆ مەککە، خوا پاداشتی بداتەوە لە بەرامبەر هەوڵ و کۆششی لەگەڵ ئومەتەکەی بە باشترین پاداشت.

پاشان بە دڵنیایی ئەوە لە تەواوی خۆ ڕەفتاری و نەرم و نیانی و بەزەیی نواندنی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە بچوکترین منداڵ دیاری دەکات کە لەوێ ئامادەن ئەم خورمایە تەڕو تازەی پێ دەبەخشێ لەبەر ئەوەی دڵی منداڵ زیاتر پێیەوە پەیوەستە، ئەمەش ئەوە دەخوازێ کە بەزەیی و مامەڵەی جوانی لەگەڵ بنوێنرێ بەوە کە ئەمەی پێشکەش بکرێ، لەبەر ئەوەی زیاتر لە خەڵکی دی پێی دڵخۆشتر دەبێ.

٢٠٢-عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ ﷺ، قَالَتْ: بَعَثَنِي مُعَاذُ بْنُ عَفْرَاءَ بِقِنَاعٍ مِنْ رُطَبٍ وَعَلَيْهِ أَجْرٌ مِنْ قِثَّاءِ زُغْبٍ، «وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ الْقِثَّاءَ، فَأَتَيْتُهُ بِهِ وَعِنْدَهُ حِلْيَةٌ قَدْ قَدِمَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْبَحْرَيْنِ، فَمَلَأَ يَدَهُ مِنْهَا فَأَعْطَانِيهِ»[١].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەوویزی کوڕی عەفڕاء ﷺ گوتوویەتی: موعازی کوڕی عەفڕاء سینیەک خورمای تازە پێگەیشتووی لەسەر بوو لەگەڵ هەندێک تەرۆزی توکداری (تازە پێگەیشتووی) بچوک، پێیدانادرم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، «زۆر تەرۆزی پێخۆشبوو، منیش بۆیم برد، (بینیم) کۆمەڵێک خشڵی لەلا بوو، لە بەحرەین بۆی هاتبوو (ڕەنگە هی باج، یان دەستکەوت، یان زەکات بووبێ)، دەستی خۆی لێ پڕ کردو پێی بەخشیم».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ أَجْرٌ مِنْ قِثَّاءِ زُغْبٍ»، (أجر) کۆیەکەی (جَرْوٍ) یە، کە بریتیە لە بچوکی هەر شتێک، جا ئاژەڵ بێت یا جگە لە ئاژەڵ، وە لێرەدا مەبەست لە (قِثَّاء)ـە، هەروەک بە (مِن)ی ڕوونکراوەتەوە، (الزُّغْب) نۆبەرەی بەروبوومە تازە پێگەیشتووەکە.

---

(١) إسناده ضعيفٌ، فيه محمَّد بن حميد الرَّازي، وهو ضعيفٌ، وشيخه إبراهيم بن المختار صدوقٌ، وشيخه محمَّد بن إسحاق مدلِّسٌ، وقد عنعن، وشيخه أبو عبيدة محمَّد بن عمَّار مقبولٌ.



کە دەڵێ: «وَعِنْدَهُ حِلْيَةٌ قَدْ قَدِمَتْ عَلَيْهِ مِنَ الْبَحْرَيْنِ»، واتە: لە ژێر دەستی پێغەمبەریان ﷺ دادەنا، ئەویش ﷺ دەستەکانی پڕ دەکردن جا بەخشی بەو ئافرەتە ﵂ شتێکی گونجاو بوو، چونکە ئافرەت زێڕو خشڵ بەکاردەهێنن.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەمە ڕێگایەکی ترە بۆ ئەم فەرموودەی ڕابورد بە بێژەیەکی کورت تر.

٢٠٣- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ ﵂، قَالَتْ: «أَتيتُ النَّبِيَّ ﷺ بِقِنَاعٍ مِنْ رُطَبٍ وَأَجْرٍ زُغْبٍ، فَأَعْطَانِي مِلْءَ كَفِّهِ حُلِيًّا» أَوْ قَالَتْ: ذَهَبًا[١].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەوویزی کوڕی عەفراء ﵂ گوتوویەتی: «چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە سینیەک کە خورمای تازە پێگەیشتووی لەسەر بوو لەگەڵ هەندێک تەرۆزی توکداری (تازە پێگەیشتووی) بچوک، (پێغەمبەریش ﷺ) پڕ بە لەپی دەستی خشڵ» یان گوتوویەتی: زێڕی پێ بەخشیم (ڕاوی لە زێڕ و خشڵ دوو دڵ بووە کە ئایا کامیانە!).

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٢٧٠٢٠، وفي الإسناد شريكٌ، يخطئ كثيرًا، أمَّا أكل النَّبيِّ ﷺ القثَّاء بالرُّطب، فهو ثابتٌ، كما سبق في صدر هذا التَّرجمة من حديث عبد الله بن جعفر ﵄

ئەو بەشە بۆ ڕوونکردنەوەو باسکردنی ئەو شتانەیە کە پێغەمبەر ﷺ خواردوویەتیەوە، هەروەها باسی چۆنیەتی خواردنەوەشی بەدوادا دێت.

٢٠٤- عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «كَانَ أَحَبَّ الشَّرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْحُلْوُ الْبَارِدُ»[1].

عوڕوە دەگێڕێتەوە، لە عائیشەوە رضي الله عنها گوتوویەتی: «خۆشەویسترین جۆری خواردنەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بریتی بوو لە (خواردنەوەی) شیرینی سارد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیەدا باسی ئەو خواردنەوانە دەکات، کەوا لە لای پێغەمبەر ﷺ خۆش بوون، ئەویش ئەو خواردنەوانەن کەوا دوو سیفەتیان تێدابوون: شیرینی و ساردیەتی، کە دەفەرموێ: «الْحُلْوُ» ئاوی شیرین دەگرێتەوە، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ ئاوی زوڵاڵ و شیرینی بۆ دەستەبەر دەکرا، هەروەها ئەو ئاوەش دەگرێتەوە کەوا شیرینی تێکراوە، یان ئەو شتەی شیرینەکەی زیاد دەکات، وەکو: خۆشاو، هەروەها ئەو ئاوەش دەگرێتەوە، کەوا کەمێک هەنگوینی تێکەڵ کراوەو بە هۆیەوە ئاوەکە تامی بە شیرینی هەنگوین شیرین بووە، ئەو جۆرە ئاوانە هەموویان دەکرێت لە ژێر ناوی «الْحُلْوُ» جێگایان ببێتەوە.

کە دەفەرموێ: «الْبَارِدُ» واتە: ساردییەکی مامناوەند، جا ئەو ئاوەی کە هەم ساردەو، هەم شیرینە، لە بە سوودترین و پاکترینی ئەو شتانەیە کە بۆ جەستە بە سوودن.

٢٠٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَا وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ عَلَى مَيْمُونَةَ فَجَاءَتْنَا بِإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَشَرِبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عَلَى يَمِينِهِ وَخَالِدٌ عَلَى شِمَالِهِ، فَقَالَ لِي: «الشَّرْبَةُ

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٩٥.

قَالَ أَبُو عِيسَى: هَكَذَا رَوَى سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، هَذَا الْحَدِيثَ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ. وَرَوَاهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارِكِ، وَعَبْدُ الرَّزَّاقِ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مُرْسَلاً وَلَمْ يَذْكُرُوا فِيهِ «عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ»، وَهَكَذَا رَوَى يُونُسُ وَغَيْرُ وَاحِدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مُرْسَلاً. قَالَ أَبُو عِيسَى: إِنَّمَا أَسْنَدَهُ ابْنُ عُيَيْنَةَ مِنْ بَيْنِ النَّاسِ. (أي تنفّر ابن عيينة برواية الحديث مسندًا بينما رواه عبد الله بن المبارك وعبد الرَّزّاق، وغير واحدِ عن معمر، عن الزُّهري عن النَّبِيِّ ﷺ فجعلوه من مراسيل الزُّهري ومرادُ المصنّف رحمه الله بهذا إعلالَ الحديث بالإرسال، وهذا قال في كتابه الجامع: والصَّحيحُ ما رُوِيَ عن الزُّهري، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مرسلاً، وقال أبو زرع ٥٦٧/١: المرسل أشبه، وقال الدَّارقطني في العلل: ١١٩/١٤ المرسل أشبه بالصَّواب، ولم يتابع ابن عيينة على ذلك).




لَكَ، فَإِنْ شِئْتَ آثَرْتَ بِهَا خَالِداً» فَقُلْتُ: مَا كُنْتُ لِأُوثِرَ عَلَى سُؤْرِكَ أَحداً، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ أَطْعَمَهُ اللَّهُ طَعَاماً، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَأَطْعِمْنَا خَيْراً مِنْهُ، وَمَنْ سَقَاهُ اللَّهُ ﷻ لَبَناً، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مَكَانَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ غَيْرُ اللَّبَنِ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: من و خالیدی کوڕی وەلید لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین و چووین سەردانی مەیمونەمان کرد (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، (مەیمونە) قاپێک شیری بۆ هێناین، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خواردەوە، من لە لای دەستی ڕاستی بووم، خالیدیش لە لای دەستی چەپی بوو، (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرمووم: «نۆرەی تۆیە (یان مافی تۆیە) بـخۆیتەوە، ئەگەریش دەتەوێ خالید بەسەر خۆت هەڵبژێرەو ئەو مافەی خۆتی پێبدە»، منیش گوتم: ئەم مافەی خۆم بە کەس نادەم کە (خواردنەوەیە) لە بەرماوەی خواردنەوەکەی جەنابت، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر خوا ﷻ خواردنی بە هەر کەسێکدا با (ئەو کەسە) بڵێ: خوایە بەرەکەت بخەیە نێو ئەو خواردنەمان، وە خواردنی لەوەش چاکترمان پێ ببەخشە، وە هەر کەسێکیش خوا ﷻ شیری دەرخواردداد، با (ئەو کەسە) بڵێ: خوایە بەرەکەت بخەیە نێوی بۆمان و، زیاتری بکەی بۆمان»، ئنجا ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «جگە لە شیر، هیچ شتێکی دیکە جێگەی خواردن و خواردنەوە ناگرێتەوە (پێکەوە)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە شیرەکەی خواردەوە، بە ئیبنو عەبباسی ﷺ فەرموو: «الشَّرْبَةُ لَكَ» واتە: نۆرەی تۆیە بۆ خواردنەوەی شیرەکە، چونکە لە لای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ بوو، بۆیە هەر کەسێک لە لای ڕاستی ئەو کەسە بوو کە خواردنەوەیەک دەخواتەوە،

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٤٥٥، وأبو داود في السنن: ٣٧٣٠، والإسناد هنا ضعيفٌ، فعُمَر بن أبي حَرملة مجهولٌ، وعليُّ بن زيدٍ -وهو ابن جُدعان- ضعيفٌ، لكن ورد ما يشهد له ويقويه؛ ينظر السَّلسلة الصَّحيحة: ٢٣٢٠.

قَالَ أَبُو عِيسَى: وَمَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ هِيَ خَالَةُ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ، وَخَالَةُ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَخَالَةُ يَزِيدَ بْنِ الْأَصَمِّ، وَاخْتَلَفَ النَّاسُ فِي رِوَايَةِ هَذَا الْحَدِيثِ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدِ بْنِ جُدْعَانَ، فَرَوَى بَعْضُهُمْ عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي حَرْمَلَةَ، وَرَوَى شُعْبَةُ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ زَيْدٍ، فَقَالَ: عَنْ عَمْرِو بْنِ حَرْمَلَةَ؛ وَالصَّحِيحُ عُمَرُ بْنُ أَبِي حَرْمَلَةَ.




ئیتر لەو کەسەوە دەست پێدەکرێ، «فَإِنْ شِئْتَ آثَرْتَ بِهَا خَالِدَاً»، واتە: بە مانای ئەگەر چاکە بکەی و خالید پێش خۆت بخەی و نۆرەی خۆتی پێ بدەی، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە کەسی لای ڕاست دەتوانێ و دەگونجێ کەسی لای چەپ بەسەر خۆیدا پێش بخات و نۆرەی خۆی بداتێ، بەڵام ئەوەندە هەیە کە عەبدوڵڵا گوتی: «مَا كُنْتُ لِأُوثِرَ عَلَى سُؤْرِكَ أَحَدَاً»، واتە: ڕێگا بە خۆم نادەم هیچ کەسێک بۆ خواردنەوەی بەرماوەی تۆ پێش خۆم بخەم، «سُؤْرِكَ»، بە مانای ئەو زیادەیە دێت کە لەبەر کەسێک دەمێنێتەوە.

هاوشێوەی ئەو باسە لە ڕیوایەتی بوخاریدا[١] هاتوە، کە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ: {أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِقَدَحٍ فَشَرِبَ مِنْهُ، وَعَنْ يَمِينِهِ غُلَامٌ أَصْغَرُ الْقَوْمِ، وَالْأَشْيَاخُ عَنْ يَسَارِهِ، فَقَالَ: «يَا غُلَامُ، أَتَأْذَنُ لِي أَنْ أُعْطِيَهُ الْأَشْيَاخَ؟» قَالَ: مَا كُنْتُ لِأُوثِرَ بِفَضْلِي مِنْكَ أَحَدًا يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ}. واتە: قاپێک خواردنەوەیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لێی خواردەوە، لەو کاتەدا گەنجێک لە لای ڕاستی بوو کە لە هەموان گچکەتر بوو، خەڵکە بە تەمەنەکانیش لە لای چەپی بوون، بۆیە فەرمووی: «ڕۆڵە گیان، مۆڵەتم پێ دەدەی کەوا قاپەکە بدەم بەو کەسانە کە بە تەمەنترن؟» ئەویش گوتی: هیچ کەسێک پێش خۆم ناخەم دەمەوێ بەرماوەی خواردنەوەکەی تۆ بخۆمەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش قاپەکەی پێیداو خواردیەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «مَنْ أَطْعَمَهُ اللَّهُ طَعَامَاً، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ»، بە مانای ئەی خوایە بەرەکەت بخەیە ئەو خواردنەوەمان، پیت و فەڕو بەرەکەتیش، لێرەدا چەند شتێک دەگرێتەوە، لەوانە: سوود گەیاندن بە جەستە بە خۆراک پێدانی، وە سەلامەتی جەستە لەو زەرەرو زیانانەی کە هەندێک جار بە هۆی هەندێک خواردنەوە پەیدادەبن، ئەو فەرمایشتەش «وَأَطْعِمْنَا خَيْرَاً مِنْهُ»، واتە: کارئاسانیمان بۆ بکە بۆ دەستبەرکردنی خواردنێکی دیکە کە لەو خواردنە باشتر بێت، فەرمایشتەکەی: «وَمَنْ سَقَاهُ اللَّهُ ﷻ لَبَنَاً، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِيهِ وَزِدْنَا مِنْهُ»، واتە: خودایە پیت و فەڕ بخەیە ئەو شیرەی کە پێمانتداو بۆمان زیاد بکە، نەیفەرمووە:

---

(١) برقم: ٢٣٥١.

کارئاسانیمان بۆ بکە بۆ دەستخستنی باشتر هەروەکو بۆ خواردنەوەکە وای فەرمووە، بەڵکو فەرمووی: بۆمان زیاد بکە، حیکمەتەکەش ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێداوە بە فەرمایشتەکەی کە دەفەرموێ: «لَيْسَ شَيْءٌ يُجْزِئُ مَكَانَ الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ غَيْرُ اللَّبَنِ»، چونکە شیر لەو شتانەیە کە بۆ خواردنەوەو پاراو بوونی کەسی تینو، هەروەها کەسی برسی و تێرکردنی دەست دەدات و، هەردوو سیفەتی: پاراوکردن و تێرکردنی تێدا هەیە.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی شێوەی خواردنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ



ئەو باسە دەربارەی چۆنیەتی ئاو خواردنەوەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، کە بە دانیشتنەوە، یان بە پێوە خواردوویەتیەوە، هەروەها جامێک ئاوی بە چەند هەناسەدان خواردۆتەوە، وە هەروەها...

٢٠٦- عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ شَرِبَ مِنْ زَمْزَمَ وَهُوَ قَائِمٌ»[1].

واتە: شەعبی، دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما کە گوتوویەتی: «بە دڵنیایی پێغەمبەر ﷺ لە (ئاوی) زەمزەمی خواردەوە لە کاتێکدا ئەو بە پێوە وەستا بوو».

ئەو فەرموودەیە ئەوەی لێوەردەگیرێ کەوا پێغەمبەر ﷺ ئاوی زەمزەمی بە پێوە خواردۆتەوە، کە ئەویش بە پێچەوانەی عادەتی هەمیشەییەتی، بەڵام ئەوەیان دیارە کە لە کاتێکی وادا بووە کە پێویست بووە بە پێوە ئاو بخواتەوە، (إبن القيم) رحمه الله لە کتێبی (زاد المعاد) گوتوویەتی: خواردنەوەی ئاو بە دانیشتنەوە لە ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، وە بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کە ئاو خواردنەوەی بە پێوە قەدەغە کردوە، هەروەها بە صەحیحی هاتوە کە فەرمانی بەو کەسە کردوە کە بە پێوە دەخواتەوە بڕشێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە بە صەحیحی هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بە پێوە ئاوی خواردۆتەوە.

جا هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەو ئاو خواردنەوە بە پێوە، قەدەغەکردنەکەی هەڵدەوەشێنێتەوە، هەندێک گوتوویانە: نەخێر، بەڵکو ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە قەدەغە کردنەکە بۆ حەڕام کردن نیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کەوا ئەگەر بە دانیشتنەوە ئاو بخورێتەوە باشترە، هەندێکی دیکەش گوتوویانە: هەرگیز لە نێوان ئەو دوو فەرموودەیەدا دژیەکی نیە، چونکە بێگومان کاتێک بە پێوە ئاوی خواردۆتەوە، لەبەر پێویستی بووە، چونکە هاتوە بۆ سەر ئاوی زەمزەم و لەو کاتەدا ئاویان داوە بە خەڵکی، ئەویش داوای ئاوی کردوەو دۆڵچەیەکیان بۆ هێناوەو ئەویش هەر بە پێوە لێی خواردۆتەوە، چونکە ئەو شوێنە بەو جۆرە پێویستی کردوە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٦١٧، ومسلم: ٢٠٢٧، والمصنِّف في جامعه: ١٨٨٢.




٢٠٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ قَالَ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَشْرَبُ قَائِماً وَقَاعِداً»[١].

واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب، لە باوکی، ئەویش لە باپیری ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوام ﷺ بینی (خواردنەوەی وەک: شیر، ئاو، ماستاو، ...)ی دەخواردەوە، هەم بە پێوەو، هەم بە دانیشتنەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەو فەرموودەیە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِی کوڕی عاصیش ﷺ ڕیوایەت کراوە، کە تێیدا هاتوە کەوا پێغەمبەری ﷺ بینیوە جارێک بە دانیشتنەوە ئاوی خواردۆتەوە، وە جاریتریش بینیویەتی کە بە پێوە ئاوی دەخواردەوە، وە نەسائیش[٢] بە هەمان شێوە فەرموودەیەک لە عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە.

٢٠٨- عَنِ الشَّعْبِيِّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «سَقَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ مِنْ زَمْزَمَ فَشَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ».

واتە: شەعبی دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەبباس ﷺ گوتوویەتی: «لە ئاوی زەمزەمم دا بە پێغەمبەر ﷺ، بە ڕاوەستانەوە لێی خواردەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەو فەرموودەیەی لە سەرەتای باسەکەدا هاتوە، لێرەش بە ڕێگایەکی دیکە هێناویەتی.

٢٠٩- عَنِ النَّزَّالِ بْنِ سَبْرَةَ قَالَ: «أُتِيَ عَلِيٌّ، بِكُوزٍ مِنْ مَاءٍ وَهُوَ فِي الرَّحْبَةِ فَأَخَذَ مِنْهُ كَفًّا فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَمَسَحَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ وَرَأْسَهُ، ثُمَّ شَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ»، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَمْ يُحْدِثْ، هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَعَلَ»[٣].

واتە: نەززالی کوڕی سەبرە دەڵێ: «عەلی ﷺ لە شوێنێکی فراوان بوو، گۆزەیەک ئاوی هێنا، دەستی پڕ ئاو کرد، دەستەکانی شۆردن و ئاوی لە دەمی وەردا دوایی

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٨٣، وأبو داود في السنن: ٦٥٣، وإبن ماجه في السنن: ٩٣١.

(٢) السنن الصغرى: ١٣٦٢.

(٣) أخرجه البخاري: ٥٦١٥.



فڕەیدا، وە ئاوی لە لووتی وەرداو دوایی فنی کرد، وە دەستەکانی بە ڕووخساری داهێناو مەسحی سەری کردو دەستی تەڕی پێداهێنا، دوایی هەر بە پێوە وەستابوو ئاوی لێ خواردەوە»، پاشان گوتی: «ئەمە دەستنوێژ شۆردنی کەسێکە تووشی لەشگرانی نەبووبێ، پێغەمبەری خواشم ﷺ بینیوە بەم شێوەیەی کردوە (کە باسم کردو ئەنجامم دا)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

«الرَّحْبَةِ» یان بەو شوێنە دەگوترێ: کە لە کوفە ناسراوەو زانراوە، یان مەبەستی فراوانی ناو مزگەوتەکەیە، یان هەر شوێنێکی دیکە، چونکە شوێنێک کە فراوان بێت، ئەوە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ: «الرَّحْبَةِ».

کە گوتوویەتی: «ثُمَّ شَرِبَ وَهُوَ قَائِمٌ»، ئەوە بەڵگەیە بۆ سەرە باسەکە.

کە گوتوویەتی: «ثُمَّ قَالَ: هَذَا وُضُوءُ مَنْ لَمْ يُحْدِثْ» واتە: کەسێک کە مەبەستی نەبێت دەستنوێژ هەڵبگرێت لەبەر بێ دەستنوێژی، بەڵکو تەنها مەبەستی پاک و خاوێنی بێت، چونکە لێرەدا «الوُضُوءُ» بە مانای ئەو دەستنوێژە نیە کە لە شەرعدا هاتوە، بەڵکو مەبەستی مانا زمانەوانیەکەیە کە بە شوشتنی دەست و پەل دەگوترێ، لەبەر شۆردن و خاوێن ڕاگرتنیان.

٢١٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: «كَانَ يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنَاءِ ثَلَاثًا إِذَا شَرِبَ، وَيَقُولُ: هُوَ أَمْرَأُ وَأَرْوَى»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ سێ جاران هەناسەی دەدا لەو جام (و پەرداخەی) کە شتی تێدا دەخواردەوە، وە دەشیگوت: ئا بەم شێوە هەم خواردنەوە باش دەخورێتەوەو، هەم ئاوەکە تینوویەتی دەشکێنێ».

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٠٢٨، والمصنّف في جامعه: ١٨٨٤.




### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێک ئاوی بە جامێک بخواردبایەوە، ئەوە بە یەک جار نەیدەخواردەوە، بەڵکو بە چەند جارو بە سێ هەناسەو سێ جار دەیخواردەوە.

هەروەها باسی سوودو قازانجی ئەو شێوازە ئاو خواردنەوەشی کردوە کە فەرموویەتی: «هُوَ أَمْرَأُ»، واتە: بۆ خواردنەوە بەو جۆرە تەندروستترو خۆشترو باشترو ئاسانترە، وە فەرمووی: «وَأَرْوَى»، واتە: زۆر باشترە بۆ پاراو بوون، تامکردن لە خواردنەوەی ئاوەکە، هەر ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو دینە چەندە تێرو تەواوو گەورەیە، بە جۆرێک لە هەموو وردو درشتی ئەو شتانەی کە بۆ کاروباری دونیاو دین و جەستەو ساغ و سەلامەتی باشە، هەمووی بۆ بەندەکانی باسکردوەو ڕێگای نیشانداون، کەواتە: ئەوە دینێکە ڕێنیشاندەرە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ لە هەموو کاروبارییاندا تێرو تەواوو دامەزراو بن.

٢١١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا شَرِبَ تَنَفَّسَ مَرَّتَيْنِ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: (جاری وا بووە) «پێغەمبەر ﷺ کە شتی بخواردبایەوە دوو جاران هەناسەی دەدا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە بە دەق ئەژمار نیە، لەسەر ئەوەی کە تەنها دوو جار هەناسە دانەو بەس، لە کاتی ئاو خواردنەوەدا، چونکە دەکرێ بە سێ جار خواردبێتیەوەو، لە نێوان جاری یەکەم و دووەمدا هەناسەی دابێ، لە نێوان دووەم و سێیەمیشدا هەناسەی دابێ، هەردووکیشیان لەو فەرموودەیەدا باسکراون، بەڵام لە هەناسەدان و نەفەسدانی سێیەم بێدەنگ بووەو باسی نەکردوە، چونکە ئەویان ناچارییە بە کردەیی، واتە: دوای خواردنەوەی سێیەم جار، هەناسەدان حەتمییەو باسکردنی ناوێ.

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٨٨٦، وإبن ماجه في السنن: ٣٤١٧، وفيه رشدين ابن كُرَيب ضعيفٌ.

٢١٢- عَنْ كَبْشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَشَرِبَ مِنْ قِرْبَةٍ مُعَلَّقَةٍ قَائِمًا، فَقُمْتُ إِلَى فِيهَا فَقَطَعْتُهُ»[1].

واتە: کەبشە رضي الله عنها، دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لام، لە دەمی کوندەیەکی هەڵواسراو بە پێوەو (بە ڕاوەستاوی) ئاوی خواردەوە، منیش هەڵسام شوێنی دەمیم لە کوندەکە بڕیەوە (وەک پیت و بەرەکەت)».

شەرح و ڕوونکردنەوە:

کەبشەی ئەنصاڕی خوشکی حەسانی کوڕی سابیتە رضي الله عنها، کە گوتوویەتی: «فَشَرِبَ مِنْ قِرْبَةٍ مُعَلَّقَةٍ»، «قِرْبَةٍ»: بە کونەیەک دەڵێن: کە لە پێستەی خۆشکراو دروست دەکرێ، کە گوتویەتی: «قَائِمًا»، لەبەر ئەوەیە کە ئاو خواردنەوەکەی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا ڕوون و ئاشکرایە کە بەو شێوەیە پێویست بووە، چونکە لە دەمی کوندەیەکی هەڵواسراو ئاوی خواردۆتەوە.

کە گوتوویەتی: «فَقُمْتُ إِلَى فِيهَا فَقَطَعْتُهُ»، واتە: هەڵسام و چووم دەمی کوندەکەم بڕی ئەو شوێنەی کە پێغەمبەر ﷺ ئاوی پێخواردەوەو، دەمی پیرۆزی لێداوە، بۆ ئەوە بڕیویەتی تاکو لای خۆی هەڵیبگرێ و بیپارێزێ وەکو فەڕو بەرەکەت، چونکە ئەوان تف و دەم و سەرجەم شوێنەوارەکانی پێغەمبەریان ﷺ بە مایەی خێرو فەڕ دەزانی (کە بێگومان هەر وایە).

٢١٣- عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رضي الله عنه، يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنَاءِ ثَلَاثًا، وَزَعَمَ أَنَسٌ، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَنَفَّسُ فِي الْإِنَاءِ ثَلَاثًا»[2].

واتە: ثومامەی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه کاتێک (ئاو یان هەر شتێکی دی) دەخواردەوە سێ جاران هەناسەی دەدا لە کاتی خواردنەوەکەدا، (ثومامە) دەڵێ: وا بزانم ئەنەس گوتی: «پێغەمبەر ﷺ کاتێک (ئاو یان هەر شتێکی دی) دەخواردەوە، سێ جاران هەناسەی دەدا لە کاتی خواردنەوەی ئەوەی لە قاپەکەیدا هەبوایە».

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٨٩٢، وإبن ماجه في السنن: ٣٤٢٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٦٣١، ومسلم: ٢٠٢٨، والمصنّف في جامعه: ١٨٨٤.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەی لەو فەرموودەیە وەردەگیرێ ئەوەیە کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چەندە سوور بوون لەسەر پابەند بوون بە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ، چەندە هەوڵیانداوە خۆیان بە سیفەتەکانی ئەو برازێننەوە.

٢١٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَى أُمِّ سُلَيْمٍ ﵂، وَقِرْبَةٌ مُعَلَّقَةٌ فَشَرِبَ مِنْ فَمِ الْقِرْبَةِ وَهُوَ قَائِمٌ، فَقَامَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ ﵂، إِلَى رَأْسِ الْقِرْبَةِ فَقَطَعَتْهَا»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چووە بۆ لای ئوممو سولەیم ﵂ و کوندەیەکی هەڵواسراو لە وێ بوو، جا (پێغەمبەر ﷺ) بە پێوە (بە ڕاوەستاوی) لە دەمی کوندەکە ئاوی خواردەوە، ئیدی ئوممو سولەیم ﵂، وەک (پیت و بەرەکەت) هەڵساو چوو سەری کوندەکە (کە دەکاتە شوێن دەمی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ)ی بڕیەوە (هەڵیگرتوە لای خۆی، وەک چۆن هەندێک لە هاوەڵانی دی وەک تەبەڕڕوک مووی موبارەکیان هەڵگرتوە)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە هاووێنەی فەرموودەکەی کەبشەیە ﵂ کە ڕابورد.

٢١٥- عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهَا ﵁، «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَشْرَبُ قَائِمًا»[2].

واتە: عائیشەی کچی سەعدی کچی ئەبی وەقاص دەگێڕێتەوە لە باوکی ﵁ کە گوتوویەتی: «پێغەمبەر ﷺ بە پێوە (ڕاوەستاوی) ئاوی دەخواردەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

بەو فەرموودەیە کۆتایی بەو بابەتە هێناوەو، درێژەی ئەو بابەتە لە لای ئیبنو قەیم ﵀ لەسەر ئەو مەسەلەیە باسکرا پێشتر.

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٢١٨٨؛ وفي الإسناد عنعنة ابن جُريجٍ، وفيه أيضًا الراء ابن زيدٍ، وهو مقبولٌ.

(٢) في إسناد عُبيدة بنت نائلٍ، وهي مجهولةٌ.




دانەر ﵀ ئەو باسەی تایبەت کردوە بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خۆ بۆن خۆشکردن، (إبن القيم) ﵀ لە کتێبەکەیدا: (زاد المعاد)[1] گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ حەزی بە بۆنی خۆش دەکرد، وە بەردەوام بۆنی خۆشی هەبووە، وە بۆنی خۆی لە خۆشترین بۆنەکان بووە، وە ئارەقەکەشی بۆنخۆشترین بۆن بووە.

پێشەوا ئەحمەد لە ئەنەسەوە ﵁ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {حُبِّبَ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا: النِّسَاءُ، والطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ}[2]. واتە: لە نازو نیعمەتەکانی دونیا ئافرەت و بۆنی خۆشم لەلا خۆشەویست کراوە، وە چاو ڕۆشنی منیش لە نوێژ کردندا داندراوە.

وە ئەوە سەلمێنراوەو جێگیربووە کە پێغەمبەر ﷺ بۆنی میسکی بەسەر هەموو بۆنەکاندا هەڵبژاردوە، دانەر ﵀ لە کتێبەکەیدا بە ناوی: (الجامع)، وە غەیری دانەریش لە ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕنەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَطْيَبُ الطِّيبِ المِسْكُ}[3]. واتە: خۆشترین بۆن بۆنی میسکە.

٢١٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: «كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ سُكَّةٌ يَتَطَيَّبُ مِنْهَا»[4].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ قوتوویەک بۆنی هەبوو، (هەموو جار) خۆی پێ بۆنخۆش دەکرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

«سُكَّةٌ»، دەگوترێ: شتێک بووە کە بۆنی تێکراوە بۆ پاراستن، گوتراویشە: «سُكَّةٌ»: جۆرە بۆنێکە کە لە چەند جۆر بۆن تێکەڵ کراوە، بەڵام مانای یەکەم نزیکترە.

٢١٧- عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﵁، لَا يَرُدُّ الطِّيبَ، وَقَالَ أَنَسٌ: «إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ»[5].

---

(١) ٤/٢٣٩.

(٢) المسند: ١٢٢٩٤.

(٣) الجامع: ٩٩١، وأخرجه النّسائي: ١٩٠٥، وأحمد: ١١٣١١.

(٤) أخرجه أبو داود: ٤١٦٢.

(٥) أخرجه البخاري: ٥٩٢٩، والمصنّف في جامعه: ٢٧٨٩.



واتە: ثومامەی کوڕی عەبدوڵلا دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ که بۆنی (بۆ دەهات بە دیاری) ڕەتی نەدەکردەوە، جا ئەنەس ﷺ دەیگوت: «پێغەمبەر ﷺ بۆنی ڕەت نەدەکردەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە گوتوویەتی: «كَانَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ»، ئەوە وەکو شوێنکەوتنی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ وایکردوە، لەوەشیاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ چەندە بە شێوەیەکی جوان و ڕێک و پێک، خۆیان بە سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕازاندۆتەوە، بۆنیش خۆی لە خۆیدا هەڵگرتنی ئاسانەو سادەیە، بۆنیشی خۆشە، جا لەبەر ئەوە لەو شتانە نیە کە ڕەت بکرێتەوە.

٢١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثٌ لَا تُرَدُّ: الْوَسَائِدُ، وَالدُّهْنُ، وَاللَّبَنُ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ شت ڕەت ناکرێنەوە (لای میوان کاتێک خاوەن ماڵ پێشکەشی دەکات، چونکە کەمترین دیاری و خەڵاتن وەک ڕێزگرتنی میوانەکە) ئەوانیش: سەرین و بۆن و شیر».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە فەرموویەتی: «ثَلَاثٌ لَا تُرَدُّ»، واتە: سێ شت هەیە کاتێک پێشکەشی مرۆڤ کرا ڕەتیان ناکاتەوە، ئەوانیش: یەکەم: «الْوَسَائِدُ»، هەر کاتێک کەسێک پشتی، یان سەرینیان بۆ هێنا بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بداتەوە، ئەوە ڕەتی ناکاتەوە، «الدُّهْنُ»، مەبەستی پێ بۆنی خۆشە، «وَاللَّبَنُ»، شیری خواردنەوەش ڕەت ناکرێتەوە، کە لە پێشوودا باسی ئەو سیفەتە باشانەی شیرمان کرد کە پەیوەندیان بە شیرەوە هەیە، کە بریتی بوو لەوەی کە خواردنە بۆ کەسی برسی و بۆ کەسی تینووش تینوێتی دەشکێنێ.

٢١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طِيبُ الرِّجَالِ مَا ظَهَرَ رِيحُهُ وَخَفِيَ لَوْنُهُ، وَطِيبُ النِّسَاءِ مَا ظَهَرَ لَوْنُهُ وَخَفِيَ رِيحُهُ»[2].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٧٩٠.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٧٨٧، وأبو داود في السنن: ٢١٧٤.

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه گوتوویەتی: پێغەمبەر خوای ﷺ فەرموویەتی: «(چاکترین جۆری) بۆنی پیاو، ئەوەیە بۆنەکەی دەرکەوێ و ڕەنگی شاراوە بێ (وەک: میسک)، وە (چاکترین جۆری) بۆنی ئافرەتان، ئەوەیە ڕەنگی دەرکەوێ و بۆنی شاراوە بێ (وەک: زەعفەران)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

بۆنی گونجاو بۆ پیاوان ئەو بۆنەیە کە بۆنەکەی بڵاو بێ و بۆن بکرێت، بۆنێک بۆنی بڕوات و ڕەنگی نەبێ، چونکە ڕەنگ لەو شتانەیە کە بۆ خۆ ڕازاندنەوەو خۆ جوان کردن بەکاردێ، ئەو جۆرە شتانەش تایبەتن بە ئافرەتان، نەک پیاوان، چونکە ئەوە ئافرەتانن خۆیان دەڕازێننەوەو خۆیان جوان دەکەن بە ڕەنگەکان و شتەکانی خۆڕازاندنەوەو ئەو جۆرە شتانە، لەبەر ئەوەیە بۆنی گونجاو بۆ ئافرەتان ئەو بۆنەیە کە ڕەنگی هەبێت و، بۆنەکەشی بۆنێکی سووک و کەم بێ.

جا ئەگەر ئافرەت پێویستی بە دەرچوون بوو، ئەوە با بۆنێک بەکاربێنێ کە ڕەنگی هەبێ و بۆن نەکرێ لە دوورەوە، وە پێویستە کە بۆنەکەی بە عەباکەی داپۆشێت، مانای فەموودەکە ئەوە دەگەیەنێت کە باسکرا.

بەڵام ئەگەر هەر لەناو ماڵدا بوو، مێردەکەی لە لای بوو، ویستی چوونە دەری نەبوو، ئەوە با بە بۆنێک خۆی بۆنخۆش بکات، کەوا بۆنی هەیەو بۆنی دەڕوات.

لە (صحيح مسلم)دا[1] هاتوە لەو فەرموودەی کە ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُورًا فَلَا تَشْهَدْ مَعَنَا الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ}. واتە: هەر ئافرەتێک بۆنی لە خۆیدا وەکو بخور، (یان هەر بۆنێک کە بۆنی بڕوات) با نوێژی خەوتنان لەگەڵ ئێمە ئامادەی نوێژ نەبێت.

**٢٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ بِمَعْنَاهُ[2].**

---

(١) برقم: ٤٤٤.

(٢) تقدَّم هذا الحديث، لكنَّ المصنِّف رحمه الله ساقه من طريقٍ أخرى، والإسناد هنا ضعيفٌ؛ لأنَّ الطُّفاويَّ لا يعرف.



واتە: لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە هەمان شێوەی ئەم فەرموودەی پێشەوەی فەرمووە.

٢٢١- عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُعْطِيَ أَحَدُكُمُ الرَّيْحَانَ فَلَا يَرُدُّهُ، فَإِنَّهُ خَرَجَ مِنَ الْجَنَّةِ»[1].

واتە: ئەبو عوسمانی نەهدی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان ڕەیحانی (بە دیاری) پێدرا، ئەوە با ڕەتی نەکاتەوە، چونکە (ڕەیحان کە مەبەست پێی گیایەکی بۆنخۆشە) لە بەهەشت هاتۆتە دەر».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

«الرَّيْحَانَ»، بە هەر جۆرە ڕووەکێک دەڵێن: کە بۆنێکی خۆشی هەبێ، فەرموویەتی: «فإِنَّهُ خَرَجَ مِنَ الْجَنَّةِ»، فەرموودەکە لاوازە، خۆ ئەگەر صەحیحیش بێ، مانای وایە لە بنچینەدا لە بەهەشتەوەیە، وە لە (صحیح مسلم)دا[2] هاتوە لەو فەرموودەی ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ رِيْحَانٌ، فَلَا يَرُدَّهُ فَإِنَّهُ خَفِيفُ المَحْمِلِ، طَيِّبُ الرِّيحِ}. واتە: (هەر کەسێک ڕەیحانی خۆشی بۆ پێشنیار کرا، با ڕەتی نەکاتەوە، چونکە هەم هەڵگرتنی قورس نیەو، هەم بۆنی خۆشە)، واتە: هەڵگرتنەکەی هیچ قورسایی ناخاتە سەر مرۆڤ و ناڕەحەتی ناکات، لە هەمان کاتیشدا بۆنێکی خۆش و پاکی هەیە، قازی عیاز گوتوویەتی: من پێم وایە کە لەو فەرموودەیەدا گریمانەی هەموو بۆنێکی خۆش دەکرێت و هەمووان دەگرێتەوە.

لەو فەرموودەیەدا لە لای ئەبو داوود[3] و غەیری ئەویش هاتوە کە بۆ پێغەمبەر ﷺ بەرزکراوەتەوە کە دەفەرموێ: {مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ رِيْحَانٌ فَلا يَرُدَّهُ، فَإِنَّهُ طَيِّبُ الرِّيحِ، خَفِيفُ المَحْمِلِ}. واتە: هەر کەسێک پێشنیاری بۆنێکی خۆشی بۆ کرا با ڕەتی نەکاتەوە، چونکە هەم بۆنی خۆشەو هەمیش هەڵگرتنی ئاسانە.

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٧٩١ عن أبي عثمان النَّهدي ﷺ، وكان إسلامه في عهد النَّبيِّ ﷺ لكنَّه لم يَلقَه؛ فهو ثقةٌ حديثُه مرسلٌ، وحَنانٌ الأسدي الَّذي يروي الحديث مقبولٌ، والمقبول لا يُحتجُّ بحديثه إلاَّ إذا وجد مَن يتابعه عليه.

(٢) برقم: ٢٢٥٣.

(٣) برقم: ٤١٧٢ من حديث أبي هريرة ﷺ.




ئەوەوی ﷺ گوتوویەتی: لەو فەرموودە ئەوە وەردەگیرێ کەوا ناپەسندە کەسێک بۆنی خۆشی بۆ پێشنیار بکرێت و ڕەتی بکاتەوە، مەگەر پاساوێکی هەبێ[١]، واتە: ئەگەر مرۆڤ بەهانەیەکی هەبێ وەکو نەخۆش بێ، نەتوانێ بۆنی خۆش بەکار بێنێ، یان خودی بۆنەکە قورس و گران بێ، ئەو کاتە بۆی هەیە بە شێوەیەکی جوان ڕەتی بکاتەوەو لەسەری پێویست نیە وەریبگرێ.

٢٢٢- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عُرِضْتُ بَيْنَ يَدَيْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَأَلْقَى جَرِيرٌ رِدَاءَهُ وَمَشَى فِي إِزَارٍ، فَقَالَ لَهُ: خُذْ رِدَاءَكَ. فَقَالَ عُمَرُ لِلْقَوْمِ: «مَا رَأَيْتُ رَجُلاً أَحْسَنَ صُورَةً مِنْ جَرِيرٍ إِلَّا مَا بَلَغَنَا مِنْ صُورَةِ يُوسُفَ ﷺ»[٢].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: ڕانوێنرانێکم پێکرا لە پێش عومەری کوڕی خەتتاب، (ڕاوی دەڵێ:) جا جەریر عەباکەی فڕێداو تەنیا بە ئیزارەکە (واتە: ئەو پۆشاکەی بەشی خوارەوە دادەپۆشی) دەڕۆیشت، بۆیە عومەر ﷺ گوتی: عەباکەت هەڵبگرەوە، دوایی عومەر ﷺ بە خەڵکەکەی گوت: «هیچ پیاوێکم نەبینیوە جوانتر بێ لە جەریر، جگە لەوەی پێمان گەیشتووە دەربارەی جوانی شێوەی (پێغەمبەر) یوسف ﷺ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ ئەم بابەتەی بە فەرموودەی جەریر ﷺ کۆتایی پێهێناوە کە خوای گەورە جوانیەکی زۆری پێ بەخشی بوو، بە جۆرێک لە جوانیدا نموونەی پێ دەهێنرایەوە، ئەوەش ڕوونە کە ئەو فەرموودە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە بابەتەکەوە نیە، مەگەر بە شێوەیەکی زۆرلە کردن (التَّكلُّف) وەکو ئەوەی بگوترێ: جوانی ڕەنگ و ڕوخسار زۆرجار بۆنی خۆشیشی لە باراندایە، بۆیە هەندێک ئاماژەی دووری بۆ بۆنخۆشکردن تێدایە.

---

(١) المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج: ١٥/١٠.

(٢) إسناده ضعيفٌ؛ لأنَّ شيخ المصنِّف عُمَر بن إسماعيل متروكٌ.



## ئاگاداریەک:

سوننەتەو پەسندە کە هەمیشە مرۆڤی مسوڵمان بۆنی خۆش بێ، وە لەسەریەتی کە هەمیشە ئەو شتانەی کە بە جەستەیەوە دەبنە هۆی بۆنی ناخۆش لایانبەرێ، یان ئەگەر بۆنی دەمی ناخۆشە بە هۆی جگەرە خواردن و هاوشێوەکانی، ئەگەر هەر دەیخوات[1] با بۆنی نەهێڵێ، وە خۆ بۆنخۆشکردن و نەهێشتنی بۆنی ناخۆش بۆ کاتی ئامادەبوون بۆ نوێژی هەینی و، نوێژی بە کۆمەڵ و، نوێژی جەژنەکان و، لە کاتی ئیحرامداو، لە کاتی ئاهەنگ و کۆبوونەوەکاندا، زیاتر پێویستە.

(إبن القيم) ﷺ لە کتێبی (زاد المعاد)دا[2] گوتوویەتی: بۆنی خۆش تایبەتمەندییەکی هەیە ئەویش ئەوەیە کە فریشتەکان پێیان خۆشەو شەیتانەکانیش لێی ڕادەکەن و ڕقیان لێیە، خۆشەویسترین شت لای شەیتانەکان بۆنی ناخۆش و بۆگەنە، بۆیە ڕووحە پاکەکان بۆنی خۆشیان پێ خۆشەو، ڕووحە پیسەکان حەز بە بۆنی ناخۆش دەکەن، کەواتە: هەر ڕووحێک ئارەزووی ئەو شتە دەکات کە بۆی گونجاوەو لەگەڵیدا دێتەوە.

---

(١) بەڵکو واجبە کە بە تەواوی وازی لێ بهێنرێ، چونکە لە ڕاستیدا هەر کەس وردبیتەوە و سەرنجی یاسا شەرعیەکان و بەڵگەکانی قورئان سوننەت بدات هیچ گومانی لەوەدا نابێت و پشت هەڵناکات لە نەبەزاندنی کێشانیدا، بێگومان جگەرە کێشان کارەساتێکی ترسناک و گوناهو تاوانە بۆ ئەو کەسەی دەیکێشێ، بۆیە پێویستە کەسی جگەرە کێش تەقوای خوا بکات و تەوبە بکات لێی، بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ﷻ ئەویش بەوە کە لێی دووربکەوێتەوە بە جۆرێک هەرگیز نەگەڕێتەوە سەر کێشانی.

(٢) ٢٧٩/٤.




دانەر ﷺ ئەو بەشەی تایبەت کردوە بۆ باسکردنی چۆنیەتی گفتوگۆو قسەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بێگومان زمان پاراوترین دروستکراوەکانی خوای گەورە بووە، وە لە هەمووان قسە شیرینتر بووە، لە هەمووان خێراتر گەیاندوویەتی، لە هەمووان قسە شیرینتر بووە، بە جۆرێک کە قسەکانی دڵەکانی کۆدەکردەوە، ڕووحەکانی پەلکێش دەکرد، دوژمنیش شاهێدی ئەوەی بۆ دەدا، وە کاتێک قسەی دەکرد بە شێوەیەک قسەی دەکرد کە ڕستەکانی لە یەک جیادەکردەوەو بە شێوەیەکی ڕوون و ڕەوان قسەی دەکرد، ئەگەر کەسێک قسەکانی بژماردایە دەیتوانی بیانژمێرێ، بە جۆرێک قسەی نەدەکرد کە بە پەلە پەل و خێرا قسە بکات و قسەکانی وەرنەگیرێن و لەبەر نەکرێن، وە بەو جۆرەش پچڕ پچڕ قسەی نەدەکرد کرچ و کاڵی بە قسەکانیەوە دیاربێ، لە نێوان وەستان و نێوان وشەکانییدا، بەڵکو شێوازەکەی جوانترین و ئەداترین شێواز بوو، دایکمان عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو جۆرە قسەی نەدەکرد کە قسەکانی بە خێرایی و بەسەر یەکدا بێ، بەڵکو بە جۆرێک قسەی دەکرد کە وشەکانی ڕوون بوون و، ڕستەکانی نێوانیان هەبوو، هەر کەسێک کە لە خزمەتیدابایە دەیتوانی قسەکانی لەبەر بکات، جاری وابوو سێ جار قسەکەی دووبارە دەکردەوە، تاکو بەرانبەرەکەی تێبگات، وە کاتێک سەلامی دەکرد سێ جار سەلامی دەکرد، وە زیاتر بێ دەنگ بوو، ئەگەر پێویست نەبایە قسەی نەدەکرد.

هەمیشە بە جۆرێک قسەی دەکرد کە قسەکانی کەم و ماناکەیان زۆرو ڕوون بوون، ڕستەکانی لە یەک جیادەکردەوە، نە درێژەی پێدەداو، نە کورتی دەکردەوە بە جۆرێک ناڕوون بێ، هەرگیز لە سەر شتێک قسەی نەدەکرد کە پەیوەندی بە ئەوەوە نەبووایە، وە هەمیشە بەو جۆرە قسەی دەکرد کەوا قسەکەی جێی خۆی بگرتبایە، وە قسەیەکی دەکرد چاوەڕوانی پاداشتی لێ بکرایە[1].

---

(١) زاد المعاد لابن القيّم: ١/١٨٢.



٢٢٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ هَذَا، وَلَكِنَّهُ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ بَيِّنٍ فَصْلٍ، يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ»[١].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ وەک ئێوە بە خێرایی قسەکانی ڕێز نەدەکردن، بەڵکو بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا قسەکانی دەکردن، کە ئەو کەسەی لەلای دانیشتبایە لەبەری دەکرد (لەبەر ئەوەی زۆر بە لەسەرخۆیی دەیفەرموون)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْرُدُ سَرْدَكُمْ هَذَا»، واتە: بە جۆرێک قسەی نەدەکرد کە بە پەلەپەل و بەسەریەکدا بێ، «وَلَكِنَّهُ كَانَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ بَيِّنٍ فَصْلٍ»، شێوازەکەی وابووە، کە لە قسەکردنیدا وشەکانی بە دوای یەکدا بوون و بە ئارامی قسەی دەکرد، وە قسەکانیشی ڕوون و ڕاشکاو بوون؛ بە پێچەوانەی هەندێ کەسەوە کە کاتێ قسە دەکەن قسەکانیان ڕوون نین و، هەندێک جار لەگەڵ قسەکردنی خێرادا هەندێک پیت ون دەبن، جار هەیە وشەش ون دەبێ، «يَحْفَظُهُ مَنْ جَلَسَ إِلَيْهِ»، ئەوەش لەبەر ئەوەی زمان پاراو و قسە ڕوون بووە، وە لەبەر ئەوەی بە دوای یەکدا بە ڕیز قسەکانی کردوە، نەک بە پەلەپەل و بەسەر یەکتردا.

٢٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعِيدُ الْكَلِمَةَ ثَلَاثًا لِتُعْقَلَ عَنْهُ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ (کاتێک فەرمایشتی دەفەرموو) سێ جاران وشەی دووبارە دەکردەوە، بۆ ئەوەی وەک خۆی لێی تێبگەن».

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٦٣٩، وهذا الإسناد فيه حُميد بن مسعَدة، وهو صدوقٌ، وحُميد بن الأسود، وهو صدوقٌ يهم قليلًا، وأسامة بن زيد، صدوقٌ يهم، لكنَّ الحديث أصله في الصَّحيحين: البخاري: ٣٥٦٨، ومسلم: ٢٤٩٣ بلفظ: «لَمْ يَكُنْ يَسْرُدُ الْحَدِيثَ كَسَرْدِكُمْ»، وفيهما البخاري: ٣٥٦٧، ومسلم: ٢٤٩٣ أيضًا بلفظ: «كَانَ يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لَأَحْصَاهُ».

(٢) أخرجه البخاري: ٦٢٤٤، والمصنّف في جامعه: ٣٦٤٠.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە پێغەمبەر ﷺ سێ جار قسەکانی دووبارە دەکردەوە، تاکو ئەوەی کە لە خزمەتیدایە تێبگات، وە لە هەموو قسەکردنێکدا بەو جۆرە نەبووە، بەڵکو تەنها ئەو کاتانە وابووە کە شوێنەکەو مەجلیسەکە ئاوای خواستووە، وەکو دڵنیاکردنەوەو پێداگری کردن لەسەر هەندێک شت، یان لەبەر گرنگیدان بەو شتە، چونکە دووبارەکردنەوەی قسە چەندین مەبەستی تێدایە، لەوانە: تێگەیشتنی گوێگر، یان تێگەیاندنی، وە بۆ ئەوەی وەک خۆی لەبەری بکات، بۆیە ئەنەس ﷺ گوتی: بۆ ئەوەی تێبگەن «لِتُعْقَلَ عَنْهُ».

٢٢٥- عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ خَالِي هِنْدُ بْنُ أَبِي هَالَةَ، وَكَانَ وَصَّافاً، فَقُلْتُ: صِفْ لِي مَنْطِقَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُتَوَاصِلَ الْأَحْزَانِ، دَائِمَ الْفِكْرَةِ لَيْسَتْ لَهُ رَاحَةٌ، طَوِيلُ السَّكْتِ، لَا يَتَكَلَّمُ فِي غَيْرِ حَاجَةٍ، يَفْتَتِحُ الْكَلَامَ وَيَخْتِمُهُ بِاسْمِ اللَّهِ تَعَالَى، وَيَتَكَلَّمُ بِجَوَامِعِ الْكَلِمِ، كَلَامُهُ فَصْلٌ، لَا فُضُولَ وَلَا تَقْصِيرَ، لَيْسَ بِالْجَافِي وَلَا الْمُهِينِ، يُعَظِّمُ النِّعْمَةَ، وَإِنْ دَقَّتْ لَا يَذُمُّ مِنْهَا شَيْئاً غَيْرَ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَذُمُّ ذَوَّاقاً وَلَا يَمْدَحُهُ، وَلَا تُغْضِبُهُ الدُّنْيَا، وَلَا مَا كَانَ لَهَا، فَإِذَا تُعُدِّيَ الْحَقُّ لَمْ يَقُمْ لِغَضَبِهِ شَيْءٌ حَتَّى يَنْتَصِرَ لَهُ، وَلَا يَغْضَبُ لِنَفْسِهِ، وَلَا يَنْتَصِرُ لَهَا، إِذَا أَشَارَ أَشَارَ بِكَفِّهِ كُلِّهَا، وَإِذَا تَعَجَّبَ قَلَبَهَا، وَإِذَا تَحَدَّثَ اتَّصَلَ بِهَا، وَضَرَبَ بِرَاحَتِهِ الْيُمْنَى بَطْنَ إِبْهَامِهِ الْيُسْرَى، وَإِذَا غَضِبَ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ، وَإِذَا فَرِحَ غَضَّ طَرْفَهُ، جُلُّ ضَحِكِهِ التَّبَسُّمُ، يَفْتَرُّ عَنْ مِثْلِ حَبِّ الْغَمَامِ»[1].

واتە: حەسەنی کوڕی عەلـی ﷺ دەڵێ: دەربارەی وەسفی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خاڵم (هیندی کوڕی ئەبی هالە)م پرسی، کە زۆر باش وەسفی دەکرد، گوتم: باسی قسەکردنی پێغەمبەری خوام ﷺ بۆ بکە، گوتی: «پێغەمبەری خوا زۆربەی کات خەمبار بوو (بۆ هیدایەتدانی خەڵک)، هەمیشە لە بیـرکردنەوەدا بوو (بۆ گەردوون و دروستکراوەکانی خوا ﷻ)، ئیسراحەتی نەبوو، زۆربەی کات بێدەنگ بوو، بە گوێرەی پێویست نەبووایە قسەی نەدەکرد، بە ناوی خوای بەرز فەرمایشتەکانی دەست پێدەکردو، هەر بە ناوی خوا کۆتایی پێدەهێنا، لە قسەکردنیدا وشەی وای بەکاردەهێنان کۆکـەرەوەی ماناو مەبەستی زۆر بوون (وشەی کەمی مانادار)،

---

(١) انظر: (ح ٨).




قسەکانی ڕوون بوون، نە زۆر و بۆر بوون، نە کەم و کورت بوون، کەسێکی وشک و قسە ڕەق نەبوو، سووکایەتی بە هیچ کەس نەدەکرد، نیعمەتی (خوای) بە گەورە دەگرت، هەرچەند کەمیش بووایەو، ڕەخنەی لێ نەدەگرت، وە هەروەها وەسفی خواردنی خۆشیشی نەدەکرد (چونکە نەوسن نەبووەو زۆر بە تەنگ خواردنەوە نەبووە)، هیچ شتێکی دونیا تووڕەی نەدەکرد، ئەگەر کەسێک ستەمێکی بکردایە تووڕە دەبوو، (هەتا مافی لێوەردەگرتەوەو) هەقی سەردەخست، وە لەبەر نەفسی خۆی تووڕە نەدەبوو، نەفسی خۆشی سەرنەدەخست، کاتێک ئاماژەی بکردایە بە هەموو ناو لەپی ئاماژەی دەکرد، وە کاتێکیش شتێکی پێ خۆش بووایە ناو لەپی هەڵدەگێڕایەوە (هاوەڵان لەو ئاماژانە تێدەگەیشتن)، کاتێکیش قسەی بکردایە بە دەستی لە ناو لەپی دەستی چەپی دەدا (بۆ ئەوەی بێ ئاگا بە ئاگا بێتەوە)، وە کاتێکیش تووڕە بووایە، ڕووی وەردەگێڕا، کاتێک شتێکی پێ خۆش بووایە دەگەشایەوە، زۆربەی پێکەنینەکانی تەنها زەردەخەنە بوو، کە زەردەخەنەی دەکرد، ددانی وەک دەنکی تەرزە دەردەکەوتن (زۆر صاف و سپی بوون)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوە بەشێکە لە فەرموودەیەکی درێژ کە بەشێکی ڕابورد، باسی ئەوەش کرا کە ئەو فەرموودەیە جێگیر نیە، کە دەڵێ: «مُتَوَاصِلَ الأَحْزَانِ» (إبن القيم) ﷺ لە (مدارج السالكين)دا[1] گوتوویەتی: گێڕانەوەی هیندی کوڕی ئەبو هالە دەربارەی خەسڵەت و سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ کە دەڵێ: «أَنَّهُ كَانَ مُتَوَاصِلَ الأَحْزَانِ» ئەو فەرموودەیە جێگیر نیە، لە سەنەدەکەیدا کەسێکی نەناسراو هەیە، ئاخر چۆن دەکرێ و دەبێ کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە دڵتەنگ بووبێ لە کاتێکدا کە خوای گەورە لە ناڕەحەتی و ناخۆشی و دڵتەنگی دونیاو هۆکارەکانی پاراستوویەتی؟!

وە نەهیشی کردوە لەوەی کە بۆ بێبڕوایان دڵتەنگ بێ، وە لە گوناهی ڕابردوو و، داهاتووی خۆش بووە، دەی ئەو دڵتەنگییە لە کوێوە دێت؟ نەخێر، بەڵکو هەمیشە گەشبین و دڵخۆش بووەو، دەم بە خەندە بووە.

---

(١) ٤١٢/١.




شێوازی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی پێکەنیندا شێوازێکی مامناوەند بووە، وەکو هەموو شتەکانی دیکەی، هەموو پێکەنینی ئەو زەردەخەنە بووە، خۆ ئەگەر بە دەنگیش پێبکەنیایە ئەوە بە قاقا نەبووە، بەڵکو تەنها ئەوانەی کە لێی نزیک بوونە، گوێیان لە دەنگی بووە.

٢٢٦- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: «كَانَ فِي سَاقَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُمُوشَةٌ، وَكَانَ لَا يَضْحَكُ إِلَّا تَبَسُّمًا، فَكُنْتُ إِذَا نَظَرْتُ إِلَيْهِ قُلْتُ: أَكْحَلُ الْعَيْنَيْنِ وَلَيْسَ بِأَكْحَلَ»[١].

واتە: جابری کوڕی سەموڕە ﷺ دەڵێ: «لە قاچی پێغەمبەری خوادا ﷺ باریکیەکی گونجاو هەبوو، وە (بە دەنگ) پێنەدەکەنی تەنها زەردەخەنەی دەکرد، جا من کە تەماشام دەکرد (لە دڵی خۆم) دەمگوت: چاوەکانی ڕشتوون، کەچی ڕەشی نەکردبوون و کلیشی بەکارنەهێنابوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ فِي سَاقَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حُمُوشَةٌ»، واتە: باریکی و ڕێکیەکی گونجاو لەگەڵ جەستەیدا هەبوو، وەکو تەواوی ئەندامەکانی تری جەستەی، ئەو ڕێکی و باریکییە لەو جۆرەیە کە شایەنی پیاهەڵدان و پەسند کردنە.

کە دەڵێ: «وَكَانَ لَا يَضْحَكُ إِلَّا تَبَسُّمًا»، واتە: لە زۆربەی کاتەکاندا، ئەوەش ناگەیەنێ کە دژ یەکە لەگەڵ ئەوەی کە هەندێک جار بە دەنگێکی نزم پێکەنیوە، چونکە بێگومان فەرموودەی ئاوامان هەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جار هەبووە بە دەنگێکی نزم پێکەنیوە.

کە دەڵێ: «فَكُنْتُ إِذَا نَظَرْتُ إِلَيْهِ قُلْتُ: أَكْحَلُ الْعَيْنَيْنِ وَلَيْسَ بِأَكْحَلَ»، ئەو هاوەڵە ﷺ سەرەتا ئەوەی سەلماند کە چاوەکانی ڕشتبن، پاشان ئەوەی نەفی کرد. ئەوە سەلمێنراوە کە پێغەمبەر ﷺ چاوەکانی ڕشتووە، پاشان نەیکردوە، یاساو ڕێسا لەو حاڵەتەدا بەو جۆرەیە کەوا ئەو شتەی نەفی لێکراوە هەمان ئەو شتە نیە کەوا سەلمێنراوە، وەکو

---

(١) أخرجه والمصنّف في جامعه: ٣٦٤٥. وهو ضعيف الإسناد؛ ففيه ابن الحجّاج وهو صدوقٌ كثير الخطأ والتّدليس وقد عنعن؛ وشيخه سِماك صدوق وقد تغيّر بأخرة.




فەرمایشتی خوای خاوەن دەسەڵات کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴿١٧﴾﴾ الأنفال. (وەکاتێ کە -مشتێ خۆڵ و زیخت ڕوو بەکافران- هاوێشت بەتەنها تۆ نەتهاوێشت بەڵکو خوا هاوێشتی و -لێیدان-).

مانای فەرموودەکە بەو جۆرەیە کە مووی پێڵوە چاوەکانی (برژانگەکانی) لە بنچینەدا ڕەش بوونە، ڕەشێکی سروشتی، وەکو ئەوەی کە بە (کل) ڕەشکرابن، لە کاتێکدا ئەو چاوەکانیشی بە کل نەڕشتووە.

٢٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: «مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: «هیچ کەسێکم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر زەردەخەنەدارتر بووبێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێ کەوا پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەی زۆر بوو، ئەوەش لەبەرئەوەی کە لە ڕەوشت و ئاکارە جوانەکاندا تێرو تەواوترین بووە، وە هەمیشە ئاسایی بووەو بە شێوەیەکی جوان هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا کردوە، هەمیشە عادەتی وابووە کە بە ڕوویەکی کراوەو درەوشاوەو زەردەخەنەوە بە خەڵک گەیشتوە.

وەکو زانراویشە زەردەخەنەی کەسێکی مسوڵمان بەرانبەر براکەی، بە چاکە ئەژماردەکرێ و چاکەیە لەگەڵیدا دەیکات، چونکە بەو ڕووخۆشی و زەردەخەنە، خۆشی دەخاتە دڵیەوە، هانیدەدات حەز بکات گوێی لێ بگرێت و، هۆگرو خۆشحاڵ بێ و لەگەڵی دانیشێت.

٢٢٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ ﷺ قَالَ: «مَا كَانَ ضَحِكُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِلَّا تَبَسُّمًا»[2].

---

(١) في إسناد عبد الله بن لهيعة، يروية عنه قتيبة بن سعيدٍ، وأحاديثه عنه صحيحةٌ كما قرّره الذهبي في سير أعلام النُّبلاء: ١٥/٨، ورواه البيهقي في شعب الإمان: ٢٥١/٦، وغيره من طريق ابن المبارك، عن ابن لهيعة به، المبارك كذلك ممّن روى عنع قبل الاختلاط، فالحديث ثابتٌ.

(٢) أخرجه أخرجه المصنّف في جامعه: ١٤٦٣، وقال: هذا حديثٌ حصيحٌ غريبٌ، لا نعرفه من حديث ابن سعيدٍ إلاّ من هذا الوجه.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس ﷺ دەڵێ: «پێکەنینی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها زەردەخە بوو، (دەیخستە سەر لێوی موبارەکی)».

٢٢٩- عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ أَوَّلَ رَجُلٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ وَآخَرَ رَجُلٍ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ، يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ: اعْرِضُوا عَلَيْهِ صِغَارَ ذُنُوبِهِ وَيُخَبَّأُ عَنْهُ كِبَارُهَا، فَيُقَالُ لَهُ: عَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا، وَهُوَ مُقِرٌّ لَا يُنْكِرُ، وَهُوَ مُشْفِقٌ مِنْ كِبَارِهَا فَيُقَالُ: أَعْطُوهُ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ عَمِلَهَا حَسَنَةً، فَيَقُولُ: إِنَّ لِي ذُنُوباً مَا أَرَاهَا هَهُنَا، قَالَ أَبُو ذَرٍّ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»[1].

واتە: ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «یەکەم کەس دەناسم کە دەچێتە بەهەشت و دوا کەسیش دەناسم کە لە دۆزەخ دێتە دەر، (واتە: ئاگاداری حاڵیانم)، لە ڕۆژی دوایی پیاوێک دەهێنرێ و پێی دەگوترێ: گوناهە بچووکەکانی پێشان بدەن، گوناهە گەورەکانیشی لێ پەنهان دەکرێ، جا بەو پیاوە دەگوترێ: ئایا لەو ڕۆژەدا ئەوەو ئەوەو ئەوەت ئەنجام نەدا؟ ئەویش دانی پێدادەنێ و نکووڵی ناکات، (چونکە) هەر ترسی لە گوناهە گەورەکانی هەیە، بەڵام چاوەڕێی بەزەیی پێداهاتنەوەشە، دوایی دەگوترێ: لە شوێنی هەر کردەوەیەکی خراپ، کردەوەیەکی چاکی پێبدەن، ئەویش دەڵێ: من گوناهانێکم هەن لێرەدا بە دیان ناکەم، ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێ: تەماشام کرد، دەبینم پێغەمبەری خوا ﷺ (لە کاتی گێڕانەوەی ئەم بڕگەدا) پێدەکەنی تا کاکیلەکانی بە دەرکەوتن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ أَوَّلَ رَجُلٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ»، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کەس خۆیەتی، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەم کەسە کە دەچێتە بەهەشت و دەرگای بەهەشت دەکاتەوە، یەکەم کەسیشە دەچێتە نێوی.

کە دەڵێ: «وَآخَرَ رَجُلٍ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ»، ئەو کەسەش کۆتا کەسە کە دەچێتە بەهەشت، ئیتر جگە لەو کەسانەی کە بۆ هەمیشە دەمێننەوە لە دۆزەخدا، کەسیتر دوای ئەو کەسە نامێنێ، کە کۆتا کەسە دێتە بەهەشت، ئەوانەی لە دۆزەخدا دەمێننەوە

(١) أخرجه مسلم: ١٩٠، والمصنّف في جامعه: ٢٥٩٦.

کافرانن، هەروەکو خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعْمَلُۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾﴾ فاطر. (ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوانەیە بێ باوەڕ بوون بڕیاری مردن نادرێت بەسەریاندا تا بمرن هەروەها هەندێ لەسزای -دۆزەخ- یان لێ سووک ناکرێت ئا بەو جۆرە تۆڵە ئەسێنین لە هەموو بێ باوەڕێک ﴿٣٦﴾ وە ئەوانە لەدۆزەخدا هاوار دەکەن -دەڵێن- ئەی پەروەردگارمان -لە دۆزەخ- دەرمان بهێنە تا کردەوەی چاک بکەین جیاواز لەوەی دەمان کرد -لە دونیادا-، -وەڵام دەدرێنەوە- ئایا تەمەنمان درێژ نەکردن ئەوەندەی ئەوەی دەیەوێ بیر بکاتەوە تیایدا بیر بکاتەوە وە ترسێنەرتان بۆ نەهات دەی -ئەو سزایە- بچەژن چونکە هیچ یاریدەدەرێک بۆ -بێ باوەڕە- ستەمکارەکان نیە ﴿٣٧﴾).

ئەو مانەوە هەمیشەییە لە دۆزەخدا شایەنی کافرەکانە، ئەوانەشی تەنها خوایان ناسیوەو پەرستوویانە، بەڵام تاوانبارن و سەرپێچیان کردووەو بە هۆی تاوانەکانیانەوە چوونەتە دۆزەخ و تاوانەکەشیان هاوبەش بۆ خوادانان نیە، ئەوە ئەو کەسانە پۆل پۆل دێنەدەر لە دۆزەخ، وەکو لە (صحیح مسلم)دا[1] هاتوە، لە ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُهَا، فَإِنَّهُمْ لَا يَمُوتُونَ فيها وَلَا يَحْيَوْنَ، وَلَكِنْ نَاسٌ أَصَابَتْهُمُ النَّارُ بِذُنُوبِهِمْ - أَوْ قَالَ: بِخَطَايَاهُمْ - فَأَمَاتَهُمْ إِمَاتَةً، حَتَّى إِذَا كَانُوا فَحْمًا، أُذِنَ بِالشَّفَاعَةِ، فَجِيءَ بِهِمْ ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ، فبُثُّوا عَلَى أَنْهَارِ الجَنَّةِ، ثُمَّ قِيلَ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ! أَفِيضُوا عَلَيْهِمْ، فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الحِبَّةِ تَكُونُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ}.

واتە: (بێگومان خەڵکی دۆزەخ ئەوانەن کە شایستەی ئاگرن و ئەوانەن لە نێو دۆزەخدا نە دەمرن و، نە دەژین، بەڵام کەسانێک هەن کە بە هۆی تاوانەکانیان تووشی دۆزەخ و ئاگر دەبن، ئنجا جۆرە مردنێک دەمرێنرێن هەتاوەکو دەبنە خەڵوز، ئنجا مۆڵەتی تکایان بۆ دەدرێت، بۆیە پۆل پۆل دەهێنرێن و لەسەر ڕووبارەکانی بەهەشت بڵاودەکرێنەوە، پاشان دەگوترێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئاویان بەسەردا

---

(١) برقم: ١٨٥.




بکەن، ئنجا وەکو دەنکە تۆوی کەناری خڕو دۆڵەکان سەوز دەبنەوە).

کە دەڵێ: «ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ»، واتە: پۆل پۆل، هۆکاری ئەوەش کە پۆل پۆل دەهێنرێن ئەوەیە کە گوناهەکانیان جیاوازن، بۆیە هەموو بەیەکجار لە دۆزەخ دەرناهێنرێن.

کە دەفەرموێ: «يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ: اعْرِضُوا عَلَيْهِ صِغَارَ ذُنُوبِهِ وَيُخَبَّأُ عَنْهُ كِبَارُهَا، فَيُقَالُ لَهُ: عَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا، وَهُوَ مُقِرٌّ لَا يُنْكِرُ، وَهُوَ مُشْفِقٌ مِنْ كِبَارِهَا فَيُقَالُ: أَعْطُوهُ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ عَمِلَهَا حَسَنَةً، فَيَقُولُ: إِنَّ لِي ذُنُوبًا مَا أَرَاهَا هَهُنَا»، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾﴾ الفرقان، (بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێت کاروکردەوەی چاکیشی کردبێ، ئا ئەوانە خوا خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێ بە چاکە، وە خوا هەمیشە لێبووردەی بەبەزەییە). کەواتە: بەندە ئەگەر تۆبەی کردو لەگەڵ تۆبەکەشیدا خواپەرستی کردو نەگەڕایەوە سەر تاوانەکەی، ئەوە خوای گەورە خراپەکانی بۆ بە چاکە دەگۆڕێ.

ئایەتەکە لەسەر ئەوانەیە کە لە دونیا بە جوانترین شێوە تەوبەیان کردوە، فەرموودەکەش بۆ ئەوانەیە کە لەسەر گوناهو تاوان مردوون، بە ئاگر سزا دەدرێن، پاشان خوا لێیان خۆش دەبێ، خوای گەورەش لێبووردەو بە بەزەییە.

کە دەڵێ: «قَالَ أَبُو ذَرٍّ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»، لێرەدا پێکەنینەکەی هەست کردنە بە فەزڵ و گەورەیی و بەزەیی و منەتی خوا بەسەر بەندەکانیەوە.

٢٣٠- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ وَلَا رَآنِي إِلَّا ضَحِكَ»[1].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێ: «لەو ڕۆژەی مسوڵمان بووم (تا ئێستا) هیچ کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگای چوونە ژوورەوەی لێ نەگرتووم، وە هیچ کاتێ منی نەبینیوە مەگەر بەڕوومدا پێکەنیوە».

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٠٣٥، ومسلم: ٢٤٧٥، والمصنّف في جامعه: ٣٨٢٠.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا جەریر ﷺ ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لەو ڕۆژەوەی مسوڵمان بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری نەکردوە، کە بچێتە خزمەتی، وە هەر کاتێک سەردانی کردبێت، ئەوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ دەم بە خەندە بووە، مەبەستی جەریر کە دەڵێ: هەرکات چووە بۆ خزمەتی پێکەنیوە، مەبەست لە پێکەنین زەردەخەنەیە، بۆیە دانەر ﷺ هەمان فەرموودەی لە ڕێگایەکی تر بە دوای ئەم فەرموودەیەدا هێناوە بە ژمارە (٢٣١)، بە باسکردنی زەردەخەنە بۆیە فەرموویەتی:

٢٣١- عَنْ قَيْسٍ، عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: «مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَا رَآنِي مُنْذُ أَسْلَمْتُ إِلَّا تَبَسَّمَ»[1].

قەیس دەڵێ: جەریر ﷺ گوتی: «(لەو ڕۆژەی مسوڵمان بووم تا ئێستا) هیچ کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگای چوونە ژوورەوەی لێ نەگرتووم، وە (لەوکاتەشی مسوڵمان بووم)، هیچ کات نەیبینیوم مەگەر زەردەخەنەی کردوە بە ڕوومدا».

٢٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْرِفُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجاً، رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنْهَا زَحْفاً، فَيُقَالُ لَهُ: انْطَلِقْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ: فَيَذْهَبُ لِيَدْخُلَ الْجَنَّةَ، فَيَجِدُ النَّاسَ قَدْ أَخَذُوا الْمَنَازِلَ، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، قَدْ أَخَذَ النَّاسُ الْمَنَازِلَ، فَيُقَالُ لَهُ: أَتَذْكُرُ الزَّمَانَ الَّذِي كُنْتَ فِيهِ، فَيَقُولُ: نَعَمْ»، قَالَ: فَيُقَالُ لَهُ: تَمَنَّ، قَالَ: فَيَتَمَنَّى، فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ الَّذِي تَمَنَّيْتَ وَعَشَرَةَ أَضْعَافِ الدُّنْيَا، قَالَ: فَيَقُولُ: تَسْخَرُ بِي وَأَنْتَ الْمَلِكُ، قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کۆتا کەس لە دەرچووانی خەڵکی دۆزەخ دەناسم، پیاوێکە بە خۆخشاندن دێتەدەر، پێی دەگوترێ: ڕابکەو برۆ بەهەشت، دەڕوات بۆ ئەوەی بچێتە بەهەشت و دەبینێ خەڵک هەر کەسە شوێنی خۆیان گرتوە (وا دەزانێ هیچ شوێنێک بۆ ئەو نەماوە) دەگەڕێتەوە (بۆ لای خوا) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، خەڵکی هەموو شوێنەکانیان

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٨٢١.

(٢) أخرجه البخاري: ٦٥٧١، ومسلم: ١٨٦، والمصنّف في جامعه: ٢٥٩٥.





گرتوە لە بەهەشت، جا پێی دەگوترێ: ئایا لە یادتە ئەو ڕۆژگارەی کە تێیدا بووی (لە ژیانی دونیا) دەڵێ: بەڵێ، جا پێی دەگوترێ: ئەمەی حەزت لێیەتی بە ئاواتی بیخوازە، جا ئەویش بە ئاواتی دەخوازێ، (کە ئەوەندەو ئەوەندەی پێ بدرێت)، جا پێی دەگوترێ: بە دڵنیایی بۆت هەیە ئەوەی خواستت و دە هێندەی دیکەش بە ئەندازەی دونیا، پیاوەکە دەڵێ: (ئەی پەروەردگارم) ئایا گاڵتەم پێ دەکەی، لە کاتێکدا تۆ پادشاو فەرمانڕەوایی؟! (ڕاوی واتە: گێڕەرەوەی فەرموودەکە) دەڵێ: تەماشام کرد، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێدەکەنی تا ددانەکانی (کاکیلەی) بە دەرکەوتن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَتَذْكُرُ الزَّمَانَ الَّذِي كُنْتَ فِيهِ»، واتە: ئایا شتە باشەکانی ئەو ڕۆژگارەت لەبیرە لەگەڵ ئەو نازو نیعمەت و خۆزگە و ئاوات و حەزانەی کە لە سەردەمی خۆتدا لە دونیادا هەتبوون؟

کە دەڵێ: «فَإِنَّ لَكَ الَّذِي تَمَنَّيْتَ وَعَشَرَةَ أَضْعَافِ الدُّنْيَا»، ئیتر ئەو کەسە شتەکەی بەلاوە زۆر گەورەیە، بۆیە بە خەیاڵیشیدا نەهاتوە، کە دونیاو، دە هێندەی دونیاش بۆ ئەو بێت، «فَيَقُولُ: تَسْخَرُ بِي وَأَنْتَ الْمَلِكُ»، بۆیە ئەو قسەیە دەکات لەبەر گەورەیی ئیشەکەو سەرسووڕمانی خۆی دەردەبڕێ.

ئا ئەو بەخشندەیی و بەزەییە لە فراوانی فەزڵ و بەخششی خوایەو لە گەورەیی منەتی خوایە، چونکە بێگومان خوای گەورە خاوەنی چاکەو خێرێکی فراوانە منەتی بەسەر بەندەکانییەوە گەورەو زۆرەو، خاوەنی بەخشندەییەکی بێ پایان و زۆرە.

کە دەڵێ: «فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»، ئەو بەشەی فەرموودەکە پەیوەستە بەو باسەو، بەڵگەیە بۆ بابەتەکە.

٢٣٣- عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: شَهِدْتُ عَلِيًّا ﷺ، أُتِيَ بِدَابَّةٍ لِيَرْكَبَهَا فَلَمَّا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الرِّكَابِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، فَلَمَّا اسْتَوَى عَلَى ظَهْرِهَا قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، ثُمَّ قَالَ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ الزخرف، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ ثَلَاثًا، وَاللَّهُ أَكْبَرُ ثَلَاثًا، سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي، فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، ثُمَّ ضَحِكَ.



فَقُلْتُ لَهُ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَنَعَ كَمَا صَنَعْتُ ثُمَّ ضَحِكَ فَقُلْتُ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «إِنَّ رَبَّكَ لَيَعْجَبُ مِنْ عَبْدِهِ إِذَا قَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرُكَ»[1].

واتە: عەلی کوڕی ڕەبیعە دەڵێ: لەگەڵ عەلی ﷺ بووم، وڵاخێکی بۆ هێنرا بۆ ئەوەی بەکاری بێنێ بۆ سوار بوون، کاتێک پێی لەسەر ئاوزینگەکە دانا، گوتی: بە ناوی خوا، کاتێک ڕێک دانیشت لەسەر پشتی وڵاخەکە گوتی: ستاییش بۆ خوا، پاشان گوتی: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ الزخرف. (پاک و بێگەردی بۆ ئەو -خوایە-ی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین کە پێشتر ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو ﴿١٣﴾ وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ﴿١٤﴾)، دوایی عەلی ﷺ سێ جاران فەرمووی: (الحمد لله، الله أكبر)، خوای پاک و بێگەرد من ستەمێکی زۆرم لە خۆم کردوە، وە هیچ کەسیش نیە لە گوناهان ببورێ جگە لە تۆ (لێم خۆشبە)، پاشان پێکەنی، منیش گوتم: ئەی ئەمیری بڕواداران بە چ پێدەکەنی؟ گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئەوەی کرد، کە من کردم، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) پێکەنی، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە چ پێکەنی؟ فەرمووی: «پەروەردگارت سەیری دێت لە بەندەی خۆی کاتێ دەڵێ: خوایە لە گوناهەکانم خۆشبە، چونکە هیچ کەسێک (مافی لێخۆشبوون) لە گوناهانی نیە، جگە لە تۆ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «فَلَمَّا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الرِّكَابِ»، (الرِّكَابِ): ئەو شوێنەیە کە کاتێک مرۆڤ سەردەکەوێتە سەر پشتی وڵاخ (ئەسپ) ئەوە پێی دەخاتە نێوی، لە کوردییدا (ئاوزەنگی) پێدەگوترێ.

کە دەڵێ: «قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ»، ماناکەی بەو جۆرەی دێت: بە ناوی خوا سواری ئەسپەکە، یان سەیارەکە، یان فڕۆکەکە دەبم.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٤٤٦.




پێویستە لەسەر هەر بەندەیەکی خوا، کاتێک پێی دەخاتە نێو ئاوزینگ بۆ سواربوون، یان کاتێک پێدەنێتە نێو سەیارە، یان فڕۆکەوە ناوی خوا بێنێ، وەکو داوای یارمەتی لە خوا، وە هەروەها بۆ فەڕو پیرۆزی ناوی خوای گەورە.

کە دەڵێ: «فَلَمَّا اسْتَوَى عَلَى ظَهْرِهَا قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ»، واتە: کاتێک لەسەر پشتی ئەسپەکە، یان پاسکیلەکەی، یان سەیارە، یان فڕۆکە جێگیر دەبێ و دادەمەزرێ، سوپاسی خوا دەکات، ئەو خوایەی کەوا منەتی بەسەردا کردووەو ئەو هۆکاری سواری و گواستنەوەیەی داوەتێ، وە کارئاسانی بۆ کردوە بۆ گواستنەوە، پاشان دەڵێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ الزخرف، (پاک و بێگەردی بۆ ئەو -خوایە-ی کە ئەمەی بۆ ڕام هێناوین کە پێشتر ئێمە توانامان بەسەریدا نەبوو ﴿١٣﴾ وە بەڕاستی ئێمە بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە ﴿١٤﴾) ئەوەش بۆ پاک و بێگەردی خوای گەورە لە هەر شتێک کە شایستەی زاتی ئەو نەبێ، لە نمونەی ئەوەی کە هاووێنەی هەبێت، یان نوقسانی و عەیبەکان، کە خوای گەورە دوورە لەو شتانە، وە خاوەنی هەرچی سیفاتی تەواوەو گەورەیی و ڕێزو شکۆییە، تەنهاو تەنها شایستەی خوای پەروەردگارە.

هەروەها داننانە بە نیعمەتەکانی خوای گەورە، کە ئەو هۆکاری گواستنەوەی بۆ فەراهەم هێناوە، چونکە ئەگەر خوای گەورە بۆمان ڕام نەکات، ئەوە ئێمە تواناو دەسەڵاتمان بەسەریاندا نیە.

هەروەها یادکردنەوەو بیرخستنەوەی ئەوەی کە ئێمە هەمووومان دەگەڕێینەوە بۆ لای خوای میهرەبان، چونکە بێگومان ئەوەی سواری وڵاخەکەی دەبێ و گەشت دەکات، لە خۆی دڵنیانیە کە ئاخۆ دەگەڕێتەوە، یان دەمرێ، بە هۆی ئەو ڕووداوانەی کە نزیکە تووشیان ببێ؟!

پاشان گوتی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ ثَلَاثًا، وَاللَّهُ أَكْبَرُ ثَلَاثًا، سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي، فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ»، باسکردنی ستەم لە نەفس و لەو شوێنەداو، داوای لێخۆشبوون کردن لەگەڵ ئامادەبوونی ئەو نازو نیعمەتە گەورەیە، بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ هەست بە کەمتەرخەمی دەکات لە ئاست پەروەردگاری پاک و بێگەرد لەگەڵ ئەو هەموو نازو نیعمەتە کە پێیداوە، بۆیە گونجاوو لەبارە کە داوای لێخۆشبوون لە خوا بکات.

کە دەڵێ: «ثُمَّ ضَحِكَ فَقُلْتُ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنَّ رَبَّكَ لَيَعْجَبُ مِنْ عَبْدِهِ إِذَا قَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، إِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرُكَ»، پێکەنینی پێغەمبەر ﷺ لەبەر هەست کردن بووە بە فەزڵ و چاکەی خوای گەورەو گەورەیی سۆزو بەزەیی و منەتەکانی بەسەر بەندەکانیەوە.

٢٣٤- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: قَالَ سَعْدٌ ﷺ: لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ ضَحِكَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ. قَالَ: قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ؟ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مَعَهُ تُرْسٌ، وَكَانَ سَعْدٌ رَامِياً، وَكَانَ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا بِالتُّرْسِ يُغَطِّي جَبْهَتَهُ، فَنَزَعَ لَهُ سَعْدٌ بِسَهْمٍ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ رَمَاهُ فَلَمْ يُخْطِئْ هَذِهِ مِنْهُ، يَعْنِي جَبْهَتَهُ، وَانْقَلَبَ الرَّجُلُ، وَشَالَ بِرِجْلِهِ: «فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»، قَالَ: قُلْتُ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكَ؟ قَالَ: مِنْ فِعْلِهِ بِالرَّجُلِ[1].

واتە: عامیری کوڕی سەعد، دەڵێ: سەعد ﷺ گوتی: لە ڕۆژی خەندەقدا بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی، تا ددانە خرێکانی (کاکیلەی) دەرکەوتن، عامر دەڵێ: پێم گوت: چۆن بوو پێکەنی؟ سەعد ﷺ دەڵێ: پیاوێک قەڵغانێکی بەدەستەوە بوو، سەعدیش تیرهاوێژێکی دەست ڕاست بوو، پیاوەکە دەیگوت: ئاواو ئاوا، بە قەڵغانەکە ڕووی خۆی دادەپۆشی، سەعدیش ﷺ تیرێکی بۆ دەرهێنا کە سەری بەرزکردەوە بۆی هاوێشت و لێی بەهەڵەدا نەچوو (واتە: نێوچەوانی پێکا) پیاوەکە سەربەرەو خواربۆوەو قاچەکانی بەرزبۆوە، بۆیە «پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا ددانە خرێکانی (کاکیلەی) دەرکەوت». عامیر دەڵێ: گوتم: بە چ پێدەکەنی؟ سەعد گوتی: بەوەی بە پیاوەکە کردی.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «ضَحِكَ يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ»، واتە: تاوەکو ددانە خڕینەکانی دەرکەوتن کە دەڵێ: «كَيْفَ كَانَ»، واتە: ئەو شتە چی بوو، کە بووە هۆی ئەو پێکەنینەی پێغەمبەر ﷺ، «قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مَعَهُ تُرْسٌ، وَكَانَ سَعْدٌ رَامِياً»، (تُرْسٌ): ئەو شتەیە کە کەسی جەنگاوەر خۆی پێ دەپارێزێ لە تیرو ڕم و ئەو شتانە، کە دەڵێ: «وَكَانَ يَقُولُ كَذَا وَكَذَا بِالتُّرْسِ يُغَطِّي جَبْهَتَهُ»، واتە: ئەو هاوبەش دانەرەی کە مەتاڵەکەی پێ بوو، لە

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٦٢٠، فيه محمَّد بن محمَّد بن الأسود، وهو مجهول الحال.




پێش خۆی دەیهێناو دەیبرد خۆی پێ دەپاراست لە تیرو شت، کە دەڵێ: «فَنَزَعَ لَهُ سَعْدٌ بِسَهْمٍ، فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ رَمَاهُ فَلَمْ يُخْطِئْ هَذِهِ مِنْهُ، يَعْنِي جَبْهَتَهُ»، واتە: تیرەکە بەر نێوچاوانی کەوت، کە دەڵێ: «وَانْقَلَبَ الرَّجُلُ»، واتە: بە پشتدا کەوت و لە هەمان چرکەو کاتدا مرد، «وَشَالَ بِرِجْلِهِ»، واتە: لاقی بەرزکرد، دەگوترێ: (شالَتِ النَّاقةُ بذَنَبِها أشالَتِه)، واتە: بەرزی کرد، «فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ».

ئەو فەرموودەیە زەعیفە (لاوازە)، بەڵام لە (صحيح مسلم)دا[1] هاتوە {عَنْ بُكَيْرِ بْنِ مِسْمَارٍ، عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ لَهُ أَبَوَيْهِ يَوْمَ أُحُدٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ أَحْرَقَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي». قَالَ: فَنَزَعْتُ لَهُ بِسَهْمٍ لَيْسَ فِيهِ نَصْلٌ، فَأَصَبْتُ جَنْبَهُ، فَسَقَطَ، فَانْكَشَفَتْ عَوْرَتُهُ، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، حَتَّى نَظَرْتُ إِلَى نَوَاجِذِهِ}. واتە: لە بوکەیری کوڕی میسمار، لە عامیری کوڕی سەعدەوە لە باوکیەوە: کەوا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحددا باوک و دایکی کۆکردنەوەو ناوی هێناون بۆ سەعد. جا گوتی: پیاوێک لە هاوبەشدانەرەکان زۆر توندو تیژ بوو لە جەنگدا وەکو ئاگر کەوتبووە گیانی بڕواداران، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بە سەعدی فەرموو: تیر بارانیان بکە دایک و باوکم فیدات بن، سەعد گوتی: منیش تیرێکم هاویشت بۆ ئەو کە نووکە تیژەکەی پێوە نەبوو، ئیتر تیرەکەم بەر تەنیشتی کەوت و یەکسەر کابرا کەوت و لەشی دەرکەوت، ئیتر پێغەمبەر ﷺ (لە خۆشی ئەوەی کابرام پێکا دڵخۆش بوو) پێکەنی بە جۆرێک کە تەماشام کرد ددانەکانی دەرکەوتبوون.

کە دەڵێ: «أَحْرَقَ المُسْلِمِينَ»، گەرم داهاتبوو لەناو بڕواداراندا، واتە: ئەو موشریکە وەکو ئاگر کەوتبووە گیانیان بە لێدان و کوشتنیان.

کە دەڵێ: «فَضَحِكَ رَسُولُ الله ﷺ حَتَّى نَظَرْتُ إِلى نَوَاجِذِهِ»، واتە: لە خۆشی کوژرانی کابرای هاوبەشدانەری دوژمن کە بە هیلاک چوو، نەک لەبەر ئەوەی کابرا عەورەتی دەرکەوت.

---

(١) برقم: ٢٤١٢.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی گاڵتەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ مِزَاحِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ




**المِزاح** یان **المُزاح**: بریتیە لە گاڵتەکردن، مەبەست لەو کارەش بریتیە لە دڵخۆشکردنی خەڵکی و، زیاتر بە یەکتر ئاشنابوون و خۆشەویستی ئەو شتانەی کە ماناو مەبەستەکەیان گەورەو ئامانجداربن، هەر لەبەر ئەوەشە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵانیدا جارجار گاڵتەو گەپی دەکرد، بەڵام گاڵتەو گەپەکەی کە بە پێی پێویست و بە ئەندازەی دەستەبەرکردنی مەبەست بووبێ، وە هەرگیز لە گاڵتەکردنیشدا جگە لە هەق هیچی دیکەی نەفەرمووەو نەکردوە.

وە پێویستە گاڵتەکردن لە قسەکردندا، هەروەکو خوێ بێ لە نێو خواردندا، چونکە ئەگەر خواردن بێ خوێ بێ، یان خوێی تێدا نەبێ، ئەوە قبوڵکراو نیەو تامی نیە، هەر وەکو چۆن ئەگەر تێرخوێ بێ و زیاد لە پێویست خوێی تێ بکرێ، دەبێتە هۆکاری ئەوەی زیان بە خواردنەکە بگەیەنێ و، ئەسڵەن هەر ناشخورێ، سوعبەت کردنیش بە هەمان شێوەیە.

بۆیە پێویستە مرۆڤ لە سوعبەتکردندا مامناوەند بێ، نە هەموو سوعبەتکردنێک بکات، نە هەمووشی واز لێ بێنێ، هەروەها درۆو قسەی ناڕاست لەگەڵ سوعبەتەکەی تێکەڵ نەکات و، جگە لە هەق و ڕاستی هیچی تر نەڵێ، وە خۆشی بپارێزێ لە گاڵتەو سوکایەتی کردن بە ئەوانی دیکە.

پێشەوا نەوەوی ﷬ دەڵێ: زانایان گوتوویانە: ئەو سوعبەتکردنەی کە نەهی لێکراوە، ئەوەیە کە زێدەڕۆیی تێدابێ و کابرا بەردەوام هەر خەریکی سوعبەتکردن بێ، چونکە سوعبەتکردن و زۆر پێکەنین دڵ ڕەق دەکات، وە مرۆڤ لە یادی خوا دووردەخاتەوە، فکرو هزر لەسەر گرنگیەکانی دین لادەبات، زۆرجار بەرەو ئەزیەتدان و ئازاردانی بەرانبەر سەردەکێشێ، وە بوغزو کینە بەرهەم دێنێ، شکۆو ڕێز ناهێڵێت، بەڵام ئەگەر سوعبەتکردنەکە ئەوانەی تێدا نەبوو، ئەوە حەڵاڵەو گوناه نیە، هەمان سوعبەتکردنە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی[1].

---

(١) كتاب الأذكار: ١/٣٢٧.



**٢٣٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «يَا ذَا الْأُذُنَيْنِ». قَالَ مَحْمُودٌ: قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: يَعْنِي يُمَازِحُهُ**[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: «ئەی خاوەن دوو گوێچکە»، مەحمود دەڵێ: ئەبو ئوسامە (کە ڕاوی فەرموودەکەیە) گوتوویەتی: واتە: (پێغەمبەر ﷺ) گاڵتەو گەپی لەگەڵ کردوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی لەگەڵ ئەنەسدا رضي الله عنه گاڵتە و گەپ بکات، بۆیە پێی فەرموو: خاوەنی دوو گوێچکە، هەر لەبەر ئەوەشە دانەر رحمه الله لە مامۆستای مامۆستاکەی گێڕاویەتیەوە کە مەحمودە، گوتوویەتی: ئەبو ئوسامە گوتی: واتە: گاڵتەی لەگەڵ ئەنەس رضي الله عنه کردوە.

وە هیچ ڕێگریەکیش نیە کە ئەو وشەیە بۆ مەدح و پیاهەڵدان بێ بۆ ئەنەس رضي الله عنه، بە واتای ئەوەی کە خاوەنی دوو گوێچکە بووە پێی بیستوە، بە هەردووک گوێیەکانی فەرمانبەرداریی پێغەمبەری خوای ﷺ کردوەو، هۆشی لە هەموو ئەوانە بووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی.

پاشان ئەنەس رضي الله عنه خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، ئەوەش ڕێگر نەبووە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ سوعبەتی لەگەڵدا بکات، لەگەڵ ئەوەی هەندێک لە خەڵکیتر پێیان عەیب و کەمییە، کەوا سوعبەت لەگەڵ خزمەتکارو شوفێرەکەیاندا بکەن، بە بیانووی ئەوەی کە پێیان وایە ئەو کارە لە شان و شەوکەتیان کەم دەکاتەوە، کە ئەوەش ڕێک پێچەوانەی ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، وە پێچەوانەی خاکی بوون و ڕێزی بەرانبەرە کە لەسەر هەموو مسوڵمانێک پێویستە خاکی و ڕێزدار بێت.

**٢٣٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى يَقُولَ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»**[2].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٩٩٢، وأبو داود في السنن: ٥٠٠٢، وفي إسناده شريكٌ القاضي، وهو صدوقٌ يخطئ كثيرًا.

(٢) أخرجه البخاري: ٦١٢٩، ومسلم: ٢١٥٠، والمصنِّف في جامعه: ١٩٨٩.



قَالَ أَبُو عِيسَى: وَفِقْهُ هَذَا الْحَدِيثِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُمَازِحُ وَفِيهِ أَنَّهُ كَنَّى غُلَامًا صَغِيرًا فَقَالَ لَهُ: يَا أَبَا عُمَيْرٍ. وَفِيهِ أَنَّهُ لَا بَأْسَ أَنْ يُعْطَى الصَّبِيُّ الطَّيْرَ لِيَلْعَبَ بِهِ. وَإِنَّمَا قَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟» لِأَنَّهُ كَانَ لَهُ نُغَيْرٌ يَلْعَبُ بِهِ فَمَاتَ، فَحَزِنَ الْغُلَامُ عَلَيْهِ فَمَازَحَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟».

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ تێکەڵاومان دەبوو، تا ئەو ئەندازەی من برایەکی بچووکم هەبوو (بێچوە باڵندەیەکی هەبوو لێی مرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ) پێی دەفەرموو: «ئەی ئەبو عومەیر! بێچووە باڵندەکە چی لێهات؟».

ئەبو عیسا (پێشەوا الترمذي ﷺ) دەڵێ: ئەو فەرموودە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ گاڵتەو گەپی کردوە، وە هەروەها کونیەی بۆ منداڵێکی بچووک داناوەو پێی فەرمووە: ئەبو عومەیر، ئەوەشی لێوەردەگیرێ کەوا ئاساییە منداڵ باڵندەی پێ بدرێ و یاری لەگەڵدا بکات، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەی ئەبو عومەیر! بێچووە باڵندەکە چی لێهات؟» لەبەر ئەوەی بووە ئەم منداڵە باڵندەیەکی هەبووەو لێی مرداربۆتەوە، ئەم منداڵەش دڵتەنگ بووە لەسەر مردنەکەی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ وەک دڵدانەوەو گاڵتەو قسەی خۆش لەگەڵ کردنی پێی فەرمووە: «ئەی ئەبو عومەیر! بێچووە باڵندەکە چی لێهات؟».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «إِنْ كَانَ لَيُخَالِطُنَا»، یەکێک لە ماناکانی سوعبەتکردنە، دەگوترێ: (خَالِطَة): کاتێک کە سوعبەتی لەگەڵدا بکات، کەواتە: ماناکەی بەو جۆرەیە: پێغەمبەر ﷺ گاڵتەو گەپی لەگەڵدا دەکردین.

«حَتَّى يَقُولَ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ»، ئەو برایەی برای دایکی بووە، «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»، ئەبو عومەیر باڵندەیەکی هەبوو یاری لەگەڵدا دەکرد، یاریکردن لەگەڵ باڵندە حەڵاڵە بە مەرجێک ئازارو زیانی پێنەگات، بەڵام ئەگەر لەناو قەفەسدا بەند بکرێت، یان بە جۆرێک گاڵتەی پێ بکرێت کە ئازاری پێبگات ئەوە دروست نیە.




جا کاتێک ئەبو عومەیر باڵندەکەی مرد پەرۆشی بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ویستی دڵنەوایی بکات و دڵتەنگییەکەی نەهێڵێت، بۆیە بە سوعبەتەوە پێی فەرموو: ئەی ئەبو عومەیر نوغەیر چی لێهات؟ لەو فەرموودەدا ڕێزی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ڕوون دەبێتەوە، وە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە لە ئاکارو ڕەفتاردا کامڵترین بووەو سوعبەتی لەگەڵ منداڵان کردوەو هۆگریان بووەو دڵی خۆشکردوون.

ئەم فەرموودەیە سوود گەلێکی زۆری تێدایە کە دانەر ﷺ لە پێشتر هەندێکیانی هێناوە، ئەبو عەبباس ئەحمەدی کوڕی ئەبو ئەحمەدی تەبەڕیی کە بە ئیبنو قاصی فەقیهی شافیعی بە ناوبانگە، هەموو سوودەکانی کۆکردۆتەوە، کە خاوەنی چەند دانراوێکە لە بەشێکدا سوودەکانی کۆکردۆتەوە، کە گەیاندوونی بە شەست سوود، ئنجا لە ئیبنو حەجەر هاتوە پوختی کردوون لە کتێبەکەی خۆیدا (فتح الباري)[1]، وە چەند دانەیەکی دیکەشی بۆ زیادکردوون.

٢٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا قَالَ: «إِنِّي لَا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا جەنابت گاڵتەو گەپمان لەگەڵ دەکەی (واتە: قسەی خۆش و سوعبەتمان لەگەڵ دەکەی کەچی پێغەمبەریشی)؟ فەرمووی: «بێگومان من جگە لە قسەی هەق، هیچ قسەیەکی دیکە ناڵێم».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «إِنِّي لَا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا»، واتە: هەتا لە گاڵتەو سوعبەتیشدا ئەوەی ڕاست و هەق نەبێ نایڵێم، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی سوعبەتی دەکرد، بەڵام ئەوەی هەق نەبووایە لە کاتی سوعبەتیشدا نەیدەفەرموو، واتە: سوعبەتەکەشی هەمووی هەق و ڕاستی بووە.

---

(١) ١٠/٥٨٢.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٩٩٠.

٢٣٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ رَجُلاً اسْتَحْمَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنِّي حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟ فَقَالَ ﷺ: «وَهَلْ تَلِدُ الْإِبِلَ إِلَا النُّوقُ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، کە سواری وڵاخێکی بکات، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «سواری بەچکە حوشترێکت دەکەم!» گوتی: ئەی پێغەمبەری خـوا! جا چی لە بەچکـە حوشتـر بکەم؟ ئەویش فەرمووی: «ئەدی حوشتـری گەورەش هەر بەچکە حوشتـر نیـە؟!».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەنەس ﵁ کە دەڵێ: «أَنَّ رَجُلاً اسْتَحْمَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»، واتە: داوای ئەوەی لێکرد کە حوشترێکی پێ بدات، تاکو بۆ سواری بەکاری بێنێ، بۆیە فەرمووی: «إِنِّي حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ»، ئیتر پیاوەکە وا تێگەیشت کەوا پێغەمبەر ﷺ بێچووە حوشترێکی پێدەدات کە بۆ سواری ناشێت، «فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ؟»، بۆیە گوتی: ئەگەر بێچووە حوشترم پێ بدەی، چۆن بۆ سواری سوودی لێ ببینم؟ ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «وَهَلْ تَلِدُ الْإِبِلَ إِلَا النُّوقُ»، (وَلَدِ النَّاقَةِ): بەکاردەهێنرێ بۆ بێچووی حوشتر، جا گەورە بێ، یان گچکە، پێغەمبەریش ﷺ ویستی حوشترێکی پێ بدات کە بۆ سواری شیاو بێ، بەڵام پێش ئەوەی حوشترەکەی پێبدات ویستی گاڵتەو سوعبەتێکی لەگەڵ بکات.

٢٣٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁، أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ كَانَ اسْمُهُ زَاهِراً وَكَانَ يُهْدِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ هَدِيَّةً مِنَ الْبَادِيَةِ، فَيُجَهِّزُهُ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ زَاهِراً بَادِيَتُنَا وَنَحْنُ حَاضِرُوهُ» وَكَانَ ﷺ يُحِبُّهُ وَكَانَ رَجُلاً دَمِيماً، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَوْماً وَهُوَ يَبِيعُ مَتَاعَهُ فَاحْتَضَنَهُ مِنْ خَلْفِهِ وَهُوَ لَا يُبْصِرُهُ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ أَرْسِلْنِي. فَالْتَفَتَ فَعَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ فَجَعَلَ لَا يَأْلُو مَا أَلْصَقَ ظَهْرَهُ بِصَدْرِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ عَرَفَهُ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يَشْتَرِي هَذَا الْعَبْدَ» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِذاً وَاللَّهِ تَجِدُنِي كَاسِداً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَكِنْ عِنْدَ اللَّهِ لَسْتَ بِكَاسِدٍ» أَوْ قَالَ: «أَنْتَ عِنْدَ اللَّهِ غَالٍ»[2].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٩٩١، وأبو داود في السنن: ٤٩٩٨.

(٢) أخرجه أحمد في المسند: ١٢٦٦٩.



واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پیاوێکی بیابانشین ناوی زاهیر بوو، (جا کە دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ) شتی لای خۆیانی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیاری دەهێنا، جا هەر کاتێک (زاهیر ﷺ) ویستبای دەربچێ پێغەمبەریش ﷺ شت و مەک و کەل و پەلی بۆ ئامادە دەکردو دەیفەرموو: «سوود لە شتە بیابانیەکانی زاهیر وەردەگرین و شتەکانی (مەدینەی) بۆ ئامادە دەکەین»، لەگەڵ ئەوەی ئەو پیاوێکی ناشیرین بوو (لە هەمان کاتدا ڕووح سووک بوو)، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشی دەویست، جا ڕۆژێک (زاهیر ﷺ) خەریکی فرۆشتنی کەل و پەلەکانی خۆی بوو، پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ لای و لە پشتەوە لە ئامێزی گرت، زاهیر نەیدەبینی و نەیدەزانی کێیە؟! هەر دەیگوت: ئەوە کێیە؟ وازم لێ بێنە، کاتێک ئاوڕی دایەوەو زانی پێغەمبەری خوایە، چەندی توانی لاشەی لکاند بە لاشەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «ئایا کێ ئەم کۆیلەیە دەکڕێ؟» زاهیریش ﷺ دەیگوت: ئایا نازانی بە خوا کەس منی ناوێ و نامکڕێ، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «بەڵام لە لای خوا تۆ بازاڕت هەیەو (خۆشەویستی)»، یان فەرمووی: «تۆ لای خوا زۆر بە نرخیت».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَكَانَ يُهْدِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ هَدِيَّةً مِنَ الْبَادِيَةِ»، واتە: هەر کات دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەو کەل و پەلانەی بیابانشینی بۆ بە دیاری دەهێنا، وەک: کەشک و ڕۆن و، ئەو جۆرە شتانەی کە لە لادێ دەست دەکەون و لە شاردا کەمن.

کە دەڵێ: «فَيُجَهِّزُهُ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ»، واتە: پێغەمبەر ﷺ بە ئەندازەی دیاری کابراو، زیاتریش ئامادەی دەکردو پێی دەدا، هەر کات زاهیر ﷺ بیویستبا بگەڕێتەوە بۆ بیابان.

کە دەڵێ: «إِنَّ زَاهِراً بَادِيَتُنَا وَنَحْنُ حَاضِرُوهُ»، کەواتە: ئەوەی بیابانشینە پێویستی بەو کەسەیە کە لە شاردا دەژین، وە بابای شارستانیش پێویستی بە بیابانشینە، چونکە هەر یەکێکیان تەواوکاری ئەویترە، بەوەی کە هەریەکەیان خوا نیعمەتێکی جیاوازی پێداون.




کە دەڵێ: «وَكَانَ ﷺ يُحِبُّهُ وَكَانَ رَجُلاً دَمِيماً»، دەگوترێ: (رَجُل دَمِيم)، بە نوسینی پیتی دال، هەروەها دەشگوترێ: (ذَمِيم) بە پیتی (ذ)، جیاوازی (دَمِيم و ذميم) ئەوەیە: (دَمِيم) واتە: ناشیرین لە شێوەو دیمەندا، بەڵام (الذمامة)، ناپەسندیە لە خووڕەوشتدا، جا هەرچی دەمیمییە جێگای تانەو تەشەرو عەیبە نیە، چونکە بە دەستی خۆی نیە، بەڵام (ذميم)ی لۆمەی دەکرێ، چونکە بەرهەمی ڕەفتارو کرداری خۆیەتی.

کە دەڵێ: «فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَوْماً وَهُوَ يَبِيعُ مَتَاعَهُ فَاحْتَضَنَهُ مِنْ خَلْفِهِ وَهُوَ لَا يُبْصِرُهُ»، واتە: لە خۆشەویستیدا پێغەمبەر ﷺ بە سینگی خۆیەوە گوشی، زاهیریش ﷺ ئەو کەسەی نەدەدیت کە باوەشی لێداو نەیدەزانی کێیە، «فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ أَرْسِلْنِي»، واتە: ئەوە کێیە منی گرتوە! وازم لێ بێنە، ئەوەش جۆرێکە لە سوعبەتکردن، کە ئەوەی لێوەردەگیرێت سوعبەت هەر بە قسەکردن نیە، بەڵکو دەکرێ بە ڕەفتارو کردەوەش بێت، ئەگەر ئەو سوعبەتە ببێتە جێگای دڵخۆشی بەرانبەرو زەرەرو زیانی پێنەگات. «فَالْتَفَتَ فَعَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ»، جا کاتێ زاهیر ﷺ ئاوڕی دایەوە زانی ئەوەی گاڵتەی لەگەڵ دەکات پێغەمبەر گیانە ﷺ زۆر دڵخۆش بوو، ئەوەندە دڵخۆش بوو گوێی پێنەدا چەندە بگەڕێتە دواوەو پشتی بنێ بە سنگی پێغەمبەرەوە ﷺ، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لەو گاڵتەکردنە دڵخۆشکردنی زاهیر بوو.

کە دەڵێ: «فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يَشْتَرِي هَذَا الْعَبْدَ»»، ئەوەی بە سوعبەت و گاڵتە فەرمووە، «فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِذاً وَاللَّهِ تَجِدُنِي كَاسِداً»، (التجارة كَاسِدة): واتە: ئەو کەل و پەلەی کە ڕەواجی نیەو، خەڵکی لێی داناهێنن، مەبەستی زاهیر ﷺ ئەوە بووە کە هیچ کەسێک نایکڕێت، هەر بۆیەش ئەنەس ﷺ لە گێڕانەوەکەیدا لە پێشوودا ئەوەی هێناوەو دەڵێ: «وَكَانَ رَجُلاً دَمِيماً»، وەکو پێشەکیەک و ڕێخۆشکردنێک بۆ قسەکەی زاهیر ﷺ کە گوتی: «إِذاً وَاللَّهِ تَجِدُنِي كَاسِداً».

«فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَكِنْ عِنْدَ اللَّهِ لَسْتَ بِكَاسِدٍ» أَوْ قَالَ: «أَنْتَ عِنْدَ اللَّهِ غَالٍ»»، ئا لێرەدا پلەو ڕێزی ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەردەکەوێت، هەروەکو چۆن ڕوونکردنەوەی تێدایە بۆ ئەو فەرموودەیەی کە ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ، دەیگێڕێتەوە کە لە (صحيح



مسلم)دا[١] هاتوه، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ}. واته: بێگومان خوا تەماشای وێنەو ڕوخسارو ماڵ و سامانتان ناکات (بۆ ڕێز لێنان)، بەڵکو تەماشای دڵ و نیەت و کردەوەکانتان دەکات.

کەواتە: ئەوەی حیسابی بۆ دەکرێت پارێزکاری (تەقوایە)، هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات. (ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێرو مێیەک، وە کردوومانن بە چەند گەل و هۆزێکەوە، تاکو یەکتری بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا، ئەو کەسەتانە زیاتر لە خوا دەترسێ، بێگومان خوا زانا و ئاگادارە).

٢٤٠- عَنِ الْحَسَنِ ﷺ قَالَ: أَتَتْ عَجُوزٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُدْخِلَنِي الْجَنَّةَ، فَقَالَ: «يَا أُمَّ فُلَانٍ، إِنَّ الْجَنَّةَ لَا تَدْخُلُهَا عَجُوزٌ» قَالَ: فَوَلَّتْ تَبْكِي فَقَالَ: «أَخْبِرُوهَا أَنَّهَا لَا تَدْخُلُهَا وَهِيَ عَجُوزٌ» إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ ﴾ الواقعة[٢].

واتە: حەسەنی بەصریی ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیرەژنێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوام بۆ لە خوا بکە بـمخاتە بەهەشتەوە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «ئەی دایکی فلان بەڕاستی پیرەژن ناچنە بەهەشت»، دەڵێ: پیرەژنەکەش ڕووی وەرگێڕاو دەگریا، دوایی (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «هەواڵی پێبدەن، بێگومان ئەو ناچێتە بەهەشت بە پیرەژنیی (بەڵکو گەنجە) وەک خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ﴿٣٥﴾ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴿٣٧﴾ ﴾ الواقعة.(ئێمە حۆریەکانی بەهەشتمان دروستکردوە بە دروستکردنێکی زۆر جوان ﴿٣٥﴾ وە گێڕاومانن بە حۆریانی هەمیشە کچ -واتە : هەرچەند هاوسەرەکانیان بچنە لایان خوا بۆیان دەکاتەوە بە کچ- ﴿٣٦﴾ هاوسەرەکانیان زۆر خۆشدەوێ و هاوتەمەنیانن)».

---

(١) برقم: ٤٦٥١ من حديث أبي هريرة ﷺ.

(٢) الحديث مرسلٌ أرسله الحسنُ البصريُّ، وفي إسناده أيضًا المبارك بن فَضَالة، وهو صدوقٌ يدلِّس ويُسوِّي، وقد عنعن، وله شاهدٌ عند الطَّبراني في الأوسط: ٥٥٤٥.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەفەرموێ: «إِنَّ الْجَنَّةَ لَا تَدْخُلُهَا عَجُوزٌ»، مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو، کە پیرەژن لە ڕۆژی قیامەتدا جارێکیتر سەر لە نوێ دروست دەکرێتەوە، وەکو کچێکی سی و سێ ساڵی لێ دێتەوە، واتە: گەنج دەکرێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، هەروەکو لە گێڕانەوەکەی موعازدا رضي الله عنه هاتوە، کە پێشەوا ئەحمەد رحمه الله ڕیوایەتی کردوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ جُرْدًا مُرْدًا مُكَحَّلِينَ بَنِي ثَلَاثِينَ أَوْ ثَلَاثٍ وَثَلَاثِينَ}[1]. واتە: خەڵکی بەهەشت کاتێک دەچنە بەهەشتەوە، لە هەرەتی گەنجیەتدان و بێ موون، بە چاوی ڕەشی جوانەوەن، کە لە تەمەنی سی، یان سی و سێ ساڵیدان دەچنە بەهەشتەوە.

**جُرْد:** کەسێکە مووی نەبێت.

**مُرْد:** کەسێکە کە هێشتا ڕیشی نەهاتبێت.

کەواتە: مەبەستی پێ هەرەتی گەنجییە.

---

(١) في المسند: ٢٢١٠٦.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی سیفەتی ئاخاوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هۆنراوەدا



---

بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ كَلَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الشِّعْرِ.




باس و خواس دەربارەی هۆنراوە، هەروەکو باس و خواس وایە دەربارەی قسەی ئاسایی، چونکە هۆنراوەش هەر قسەیە، بەڵام کێش و سەروای هەیە، بۆیە هەر هۆنراوەیەک وشەو ماناکەی ڕاست و جوان بێت، ئەوە گوتن و نووسین و خوێندنەوەی دروستە[١] وە گوێ لێگرتنی حەڵاڵە، خۆ ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو، ئەوە گوتن و بیستنی حەڕام و قەدەغەیە، پێشەوا بوخاری ﷺ ڕیوایەتی کردوە لە (الأدب المفرد)دا[٢] لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﷺ، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {الشِّعرُ بِمَنْزِلَةِ الكَلَامِ، حَسَنُهُ كَحَسَنِ الكَلَامِ، وَقَبِيحُهُ كَقَبِيحِ الكَلَامِ}. واتە: هۆنراوەش هەروەکو قسەی ئاساییە، جا ئەوەی جوان بێ وەکو قسەی جوان وایە، ئەوەی ناشیرین و بێ مانا بێ، وەکو قسەی ناشیرین و بێ مانا وایە.

ئیبنو ماجە[٣] وە غەیری ئەویش لە ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ ڕیوایەت دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ لَحِكْمَةً». واتە: هەندێ هۆنراوە وەک حیکمەت و پەندو ئامۆژگاری وان. کەواتە هەندێکی وانیە.

ئنجا هۆنراوەش چەند جۆرێکی هەیە، بە گوێرەی تێڕوانین و بۆچوونی شاعیرەکە، کەسی وا هەیە لەسەر هەق و ڕاستی و هیدایەتە، کەسی واش هەیە لەسەر کوفرو بێبڕوایی هۆنراوە دەڵێ.

هۆنراوەی واش هەیە پڕیەتی لە ئەفسانەو داهێنانی بێ شەرعی، وە هەشە لەسەر بەدکاری و بێ ڕەوشتی دانراوەو گوتراوە.

٢٤١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: قِيلَ لَهَا: هَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَمَثَّلُ بِشَيءٍ مِنَ الشِّعْرِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ ابْنِ رَوَاحَةَ، وَيَتَمَثَّلُ بِقَوْلِهِ: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»[٤].

واتە: عائیشە ﷺ، لێی گێڕدراوەتەوە: کە پرسیاری لێکراوە: ئایا پێغەمبەر ﷺ هیچ کاتێک هۆنراوەی بۆ وێنەو نموونە هێناوەتەوە؟ گوتوویەتی: وێنەی بە هۆنراوەی

---

(١) المرد بالإنشاد إلقاؤه بصوتٍ جَزل جيّدٍ، أمَّا إلقاؤه بالصَّوت الرَّقيق والتَّكسرُ في إلقائِه ومحاكاة أهل الفِسق والمجُون، وإضافة المؤثِّرات الصَّوتيَّة تشبُّهًا بهم، فكُلٌّ لا يجوز.

(٢) برقم: ٨٦٥.

(٣) برقم: ٣٧٥٥.

(٤) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٨٤٨.




ئیبنو ڕەواحە دەهێنایەوەو، نموونەی بەو قسەیەی دەهێناوە، دەیفەرموو: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ» واتە: کەسانێک خۆیان هەواڵت بۆ دێنن، بێ ئەوەی تۆ بیاننێری بۆ هێنانی هەواڵ.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «هَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَمَثَّلُ بِشَيْءٍ مِنَ الشِّعْرِ؟»، واتە: ئایا هیچ کات هۆنراوەی خوێندۆتەوە؟ دەگوترێ: فڵان کەس نموونەی بەو دێڕە هۆنراوە هێناوە، وە ئەو هۆنراوەی کردە نموونە بە واتای ئەوە.

کە دەڵێ: «كَانَ يَتَمَثَّلُ بِشِعْرِ ابْنِ رَوَاحَةَ»، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی ﷺ مەبەستە، کە هاوەڵێکی بەڕێز بووەو لە ئەنصارەکان بووەو خەزرەجی بووە، کە یەکێک بووە لە شاعیرەکانی پێغەمبەر ﷺ، لە (إبن سيرين) ڕیوایەت کراوە کە گوتوویەتی: شاعیرەکانی پێغەمبەر ﷺ بریتی بوون لە: حەسسانی کوڕی سابیت و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەو کەعبی کوڕی مالیک[1].

کە دەڵێ: «وَيَتَمَثَّلُ بِقَوْلِهِ: وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»، ڕاناوەکە بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ دەگەڕێتەوە لەگەڵ ئەوەی کە هۆنراوەکە هی تەڕەفەی کوڕی عەبدە، لە موسنەددا[2] هاتوە لە عائیشەوە ﷺ کە گوتوویەتی: هەر کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە هەواڵێک بە پەلە نەبووایە، ئەوە نموونەی بەو پارچە هۆنراوە دەهێنایەوە کە هی تەڕەفەیە: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»، ئەو پارچە هۆنراوە لە موعەللەقەی تەڕەفەی کوڕی عەبددا هاتوە کە دەقەکەی بەو جۆرەیە:

سَتُبْدِي لَكَ الأَيَّامُ مَا كُنْتَ جَاهِلاً     وَيَأْتِيكَ بِالأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ

واتە: ڕۆژگار هەموو ئەو شتانەت بۆ ڕووندەکاتەوە کە نایانزانی، وە کەسێک هەواڵت بۆ دێنێ کە تۆ ڕاتنەسپاردووەو هیچت پێنەداوە.

---

(١) سير أعلام النُّبلاء: ٥٢٥/٢.

(٢) برقم: ٢٤٠٢٣.





وە ئەو دەقە لە (جامع الترمذي)دا هاتوە کە دەڵێ: گوتی: بە هۆنراوەی کوڕی ڕەواحە ﷺ نموونەی دەهێنایەوەو دەیفەرموو: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»، وە ئەو هۆنراوە بە ڕاستەوخۆ پاڵنادرێتە لای ئیبنو ڕەواحە ﷺ، ئەوەشیان ڕاسترە، خۆ گریمان ئەگەر دەقی سەرەتاشی پاڵبدرێتە لای عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ﷺ لە ڕاستیشدا وابێ، ئەوە دەگونجێ کە بەشەکەیتر هی تەرەفە بێ و، لەگەڵ هۆنراوەکەی ناواخنی کردبێ.

٢٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَصْدَقَ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ، وَكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕاستترین وشەیەک کە شاعیر گوتبێتی، ئەم وشەیەی لەبیدی شاعیرە، کە دەڵێ: ئاگاداربن هەموو شتێک جگە لە خوا پووچە، زۆر نزیک بوو ئومەییەی کوڕی ئەبو صەڵت ئیمان بێنێ (لە کاتی بیستنی دا)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ»، واتە: هەرچی نازو نیعمەتی دونیایە، بێگومان کۆتایی دێت، پێغەمبەر ﷺ شایەدی بۆ ئەو وتەیە داوە کە ڕاستترین شتێکە کە شاعیر گوتوویەتی، چونکە لە ڕاستیدا لەگەڵ بیرو باوەڕی هەقدا دێتەوە، بۆیە شیعریش لە ڕاستی و دروستیدا پلە پلەیە، هەیەتی ڕاستەو، هەیەتی ڕاسترینە، هەروەها هەشیەتی ئەسڵەن هەر درۆیە، کە بەشێکی زۆری شیعر لەو جۆرەن، نەک هەر ئەوە بەڵکو گوتراوە: جوانترین و خۆشترین شیعر ئەوەیە کە درۆی زیاتر تێدا بێ و درۆترینیان بێ (هەڵبەت دەکرێ ئەو قسەیە بەوە تەفسیر بکرێ کە مەبەست ئەوەیە هۆنراوە مەجازی زۆر تێدا بەکاربهێنرێ، ئەو کات هاوسەنگی زیاتر تێدا دەبێ).

کە دەڵێ: «وَكَادَ أُمَيَّةُ بْنُ أَبِي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ»، واتە: ئومەییە زۆر لە ئیسلام و مسوڵمان بوون نزیک ببوویەوە، چونکە لە سەردەمی نەفامیشدا پەرستشی دەکردو بڕواشی بە زیندووبوونەوە هەبوو، بە ئیسلامیش گەیشت، بەڵام مسوڵمان نەبوو.

---

(١) انظر: (ح ٢٤٨).




٢٤٣- عَنْ جُنْدُبِ بْنِ سُفْيَانَ الْبَجَلِيِّ قَالَ: أَصَابَ حَجَرٌ أُصْبُعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَدَمِيَتْ، فَقَالَ: «هَلْ أَنْتِ إِلَّا أُصْبُعٌ دَمِيتِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ»[1].

واتە: جوندوبی کوڕی سوفیانی بەجەلیی ﷺ دەڵێ: بەردێک بەر پەنجەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت (برینداری کردو) و خوێنی لێهات، (پێغەمبەر ﷺ، بە شێوەی هۆنراوە) فەرمووی: «تۆ تەنها پەنجەیەک نیت خوێنت لێهاتوە، لە ڕێگای خوادا ئەوەت تووش بووە».

٢٤٤- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ، عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ جُنْدُبِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ، نَحْوَهُ.

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَصَابَ حَجَرٌ أُصْبُعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَدَمِيَتْ»، لێرەدا مەبەست لە پەنجە، پەنجەی پێیە، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ بەڕێدا دەڕۆیشت، ئیتر بەردێک بەر پێی کەوت و خوێنی لێهات، «فَقَالَ: هَلْ أَنْتِ إِلَّا أُصْبُعٌ دَمِيتِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ»، پرسیارەکە لێرەدا نەرێنیە، واتە: تۆ تەنها پەنجەیەک نیت و خوێنت لێ بچۆڕێت، لە کاتێکدا کە لە پێناو خوایە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر شتێک تووشی مسوڵمان دەبێ، ئەوە بێگومان خێرو پاداشتی لەسەر وەردەگرێ.

٢٤٥- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَفَرَرْتُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَا أَبَا عُمَارَةَ؟ فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ مَا وَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَكِنْ وَلَّى سَرَعَانُ النَّاسِ تَلَقَّتْهُمْ هَوَازِنُ بِالنَّبْلِ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى بَغْلَتِهِ، وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ آخِذٌ بِلِجَامِهَا، وَرَسُولُ اللَّهِ يَقُولُ: «أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ»[2].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پیاوێک لێی پرسیم: (لە جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمندا) ئایا ئێوە هەڵاتن و پێغەمبەری خواتان جێهێشت ئەی ئەبو

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٨٠٢، ومسلم: ١٧٩٦، والمصنّف في جامعه: ٣٣٤٥.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٨٢٤، ومسلم: ١٧٧٦، والمصنّف في جامعه: ١٦٨٨.




عوماره؟ (بەڕائیش ﷺ) گوتی: نا سوێند بە خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای نەکردو پشتی هەڵنەکرد، بەڵکو ئەو خەڵکانەی بە پەلە بوون ڕایان کردو هەڵاتن، کاتێ هۆزی هەوازن بە تیر ڕووبەڕوویان بوونەوە، پێغەمبەر خواش ﷺ لەسەر هێسترەکەی بوو، ئەبو سوفیانی کوڕی حاریسەی کوڕی عەبدولموتەڵیب جلەوی هێسترەکەی گرتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ (بە شێوەی هۆنراوە) دەیفەرموو: «من پێغەمبەرم و ناهەقی ناڵێم، من نەوەی عەبدولموتەڵیبم».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

«أَفَرَرْتُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَا أَبَا عُمَارَةَ؟»، واتە: ئایا ڕاتانکردو هەڵاتن لە ڕۆژی حونەیندا لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ؟ «فَقَالَ: لَا وَاللَّهِ مَا وَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَلَكِنْ وَلَّى سَرَعَانُ النَّاسِ»، واتە: بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە شوێنی خۆی نەجوڵاو پاشەکشەی نەکرد، هەروەها هاوەڵانیش لە دەوری بوون، تەنها هەندێک خەڵکی بە پەلەپەل نەبێ، ئەوان هەڵاتن.

«تَلَقَّتْهُمْ هَوَازِنُ بِالنَّبْلِ»، واتە: بە تیر ڕووبەڕوویان بوونەوە، (هَوَازِن): خەڵکی تائیف بوون، کە لە تیر هاوێشتن و گرنگی پێدانیدا زۆر شارەزا بوون.

کە دەڵێ: «وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى بَغْلَتِهِ»، هێستر بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمندا پەسند نیە، جا بە تایبەتی بەو هەموو زۆریەی هێزی دوژمن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بۆیە بە سواری هێستر ڕۆیشت، چونکە متمانەی تەواوی بە خوا هەبوو، لەوەی کە سەریان دەخات بەسەر دوژمندا.

کە دەڵێ: «وَأَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ آخِذٌ بِلِجَامِهَا»، ئەبو سوفیان کوڕی مامی پێغەمبەر ﷺ بوو، وە برای شیریشی بوو، لە ساڵی ڕزگارکردنی مەککەدا بە جوانترین شێوە ئیسلامی وەرگرت و مسوڵمان بوو.

کە دەڵێ: «وَرَسُولُ اللَّهِ يَقُولُ: أَنَا النَّبِيُّ لَا كَذِبْ، أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ»، لەو فەرموودەیەدا مەبەستمان لەسەر ئەو بڕگەیەتی کە بە شێوەی کێش و سەروا فەرمووی: من پێغەمبەرم و نێردراوی خوام و بەڕاستی، وە بێگومان خوای گەورە بەڵێنی بە پێغەمبەرەکانی




داوە کەوا سەریاندەخات، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ ﴾ غافر. (بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە سەردەخەین لە ژیانی دونیاداو لە دوارۆژیشدا کە شایەدەکان هەڵدەستن -بۆ شایەدیی دان-).

٢٤٦- عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ فِي عُمْرَةِ الْقَضَاءِ، وَابْنُ رَوَاحَةَ يَمْشِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَهُوَ يَقُولُ:

خَلُّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهْ ... الْيَوْمَ نَضْرِبُكُمْ عَلَى تَنْزِيلِهْ

ضَرْباً يُزِيلُ الْهَامَ عَنْ مَقِيلِهْ ... وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهْ

فَقَالَ لَهُ عُمَرُ ﷺ: يَا ابْنَ رَوَاحَةَ، بَيْنَ يَدِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي حَرَمِ اللَّهِ تَقُولُ الشِّعْرَ، فَقَالَ ﷺ: «خَلِّ عَنْهُ يَا عُمَرُ، فَلَهِيَ أَسْرَعُ فِيهِمْ مِنْ نَضْحِ النَّبْلِ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە مەککە بۆ ئەوەی عومرەی قەزاکردنەوە ئەنجام بدات، ئیبنو ڕەواحە لە پێشی دەڕۆیشت و دەیگوت:

خَلُّوا بَنِي الْكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهْ ... الْيَوْمَ نَضْرِبُكُمْ عَلَى تَنْزِيلِهْ

ضَرْباً يُزِيلُ الْهَامَ عَنْ مَقِيلِهْ ... وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهْ

عومەر ﷺ گوتی: ئەی ئیبنو ڕەواحە لە پێش پێغەمبەری خواو لە نێو ماڵی خوا هۆنراوە دەڵێی؟! ئیدی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەی عومەر، وازی لێ بێنە، چونکە (ئەم هۆنراوەیە) لە تیر باران کردنیان بۆیان ناخۆشترەو قورسترە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «ضَرْباً يُزِيلُ الْهَامَ عَنْ مَقِيلِهْ»، (الْهَامَ): واتە: سەر، (مَقِيلِ): واتە: شوێن، واتە: لێدانێک کەوا سەر لە شوێنی خۆی لادەبات، «وَيُذْهِلُ الْخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهْ»، واتە: عەقڵ لادەبات و خۆشەویست لە خۆشەویست دەکات لە ترسناکی ئەو هەڵوێستە.

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٨٤٧.




پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: «خَلِّ عَنْهُ يَا عُمَرُ، فَلَهِيَ أَسْرَعُ فِيهِمْ مِنْ نَضْحِ النَّبْلِ»، واتە: وازی لێ بێنە با شیعرەکەی بڵێت، چونکە یەکجار زۆر کاریگەری هەیە لە ترساندنی دوژمن و تۆقاندنی، بەڵگەشە لەسەر بەهێزکردنی خەڵکی بڕوادار بۆ بەرگری کردن لە ئاینی خوای باڵادەست و بەرپەرچدانەوەی هاوبەشدانەران.

٢٤٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: «جَالَسْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ مَرَّةٍ وَكَانَ أَصْحَابُهُ يَتَنَاشَدُونَ الشِّعْرَ وَيَتَذَاكَرُونَ أَشْيَاءَ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ وَهُوَ سَاكِتٌ وَرُبَّمَا تَبَسَّمَ مَعَهُمْ»[1].

واتە: جابری کوڕی سەمورە ﷺ دەڵێ: «زیاتر لە سەد جار لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتووم، هاوەڵاکانی هۆنراوەیان بۆ یەکدی دەخوێندەوە، جا هەندێک جار باسی هەندێ کردەوەی ڕۆژگاری نەفامییان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە، (پێغەمبەریش ﷺ) بێ دەنگ بوو، تەنانەت هەندێک جاریش لەگەڵیان زەردەخەنەی دەکرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «جَالَسْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ مَرَّةٍ»، کە ئەو ژمارە زۆرە دەڵێ: لە کۆڕو مەجلیسەکانی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوەیە کە سەرنجی بیسەر بۆ ئەو شتە ڕاکێشێ کە دەیەوێ بیلێ، کە دەڵێ: «وَكَانَ أَصْحَابُهُ يَتَنَاشَدُونَ الشِّعْرَ وَيَتَذَاكَرُونَ أَشْيَاءَ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ»، مانای ئەوەیە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ هەر کەسەو ئەو شتەی لەبەر بووایە لە شیعر دەیگوت: «وَهُوَ سَاكِتٌ وَرُبَّمَا تَبَسَّمَ مَعَهُمْ»، بێدەنگبوونی پێغەمبەر ﷺ نیشانەی ئەوەیە کە ڕازی بووە بە قسەکانیان، چونکە هەرگیز پێغەمبەر ﷺ لەسەر شتی بەتاڵ و ناهەق بێدەنگ نابێت.

٢٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَشْعَرُ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَتْ بِهَا الْعَرَبُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلَا اللَّهَ بَاطِلٌ»[2].

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٨٥٠، وفي إسناده شريك، وهو القاضي، لكن يتقوّى بمتابعة زُهير بن معاوية عند النَّسائي في سننه: ١٣٥٩ بلفظ: «إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ جَلَسَ فِي مُصَلَّاهُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَيَتَحَدَّثُ أَصْحَابُهُ يَذْكُرُونَ حَدِيثَ الْجَاهِلِيَّةِ وَيُنْشِدُونَ الشِّعْرَ وَيَضْحَكُونَ وَيَتَبَسَّمُ ﷺ».

(٢) أخرجه البخاري: ٣٨٤١، ومسلم: ٢٢٥٦، والمصنِّف في جامعه: ٢٨٤٩، وتقدَّم في أوائل التَّرجمة (ح ٢٤٢)، وإن كانَ في الإسناد هنا شريكُ القاضي إلاَّ أنَّه توبع عليه.




واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «باشترین هۆنراوە کە عەرەب قسەی پێکردبێ قسەی لەبیدی شاعیرە، کە دەڵێ: ئاگاداربن هەموو شتێک جگە لە خوا پووچە».

٢٤٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ فَأَنْشَدْتُهُ مِائَةَ قَافِيَةٍ مِنْ قَوْلِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ الثَّقَفِيِّ، كُلَّمَا أَنْشَدْتُهُ بَيْتاً قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «هِيهْ» حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةً «يَعْنِي بَيْتاً»، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ كَادَ لَيُسْلِمُ»[1].

واتە: عەمری کوڕی شەرید دەگێڕێتەوە کە باوکی گوتوویەتی: من سواری وڵاخێک بووم لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ، سەد قافیە لە هۆنراوەکانی ئومەییەی کوڕی ئیبنو ئەبی سەڵتی سەقەفیم خوێندەوە، جا هەر جارێک دێڕێکم بۆ دەخوێندەوە، پێی دەفەرمووم: «زیاتر»، هەتا سەد دێڕم بۆ گوت، جا فەرمووی: «خەریک بوو (ئومەییە) مسوڵمان ببێ». (واتە: هۆنراوەکانی ئەوەندە لە ئیسلامەوە نزیک بوون).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

«كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ ﷺ»، واتە: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوو لەسەر وڵاخەکەی - لە ڕاستیدا ژمارەیەک لە هاوەڵان لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ لەسەر وڵاخێک بەیەکەوە سەرکەوتوون، ئەبو زەکەریا یەحیای بەنو مەندە لەو بارەوە بەشێکی نوسیوە کە ناوی ئەو کەسانەی تێدا کۆکردۆتەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بە یەکەوە لەسەر وڵاخێک سوار بوونە، کە ژمارەیان بە نزیکی چل کەس دەبن -.

«فَأَنْشَدْتُهُ مِائَةَ قَافِيَةٍ»، واتە: لە شیعر، «مِنْ قَوْلِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ الثَّقَفِيِّ»، شاعیرێکی سەردەمی نەفامی بووە، لە شیعرەکانیدا[2] مەدح و سەنای خوای کردوە، باسی زیندووبوونەوەو ئەو شتانەشی کردوە:

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٢٥٥.

(٢) ديوان أميَّة بن أبي الصَّلت: (ص ٧٠ و ٧١).




مَجِّدوا اللَهَ فَهوَ لِلمَجدِ أَهلُ ... رَبُّنا في السَّماءِ أَمسى كَبيراً

ذَلِكَ المُنشِئُ الحِجارَةَ ... وَالموتى وَأَحيَاهُم وَكانَ جَديراً

بالبَناءِ العَالي الَّذي سَبَقَ الناسَ ... وَسَوَّى فَوقَ السَماءِ سَريراً[١]

شَرْجعاً[٢] لا يَنالُهُ بَصَرُ ... العَيْن تَرى دونَهُ المَلائِكَ صُوَراً[٣]

«كُلَّمَا أَنْشَدْتُهُ بَيْتاً قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «هِيهْ»»، واتە: زیاتر، «حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةً «يَعْنِي بَيْتاً»»، ئەوەش ژمارەیەکی کەم نیە، «فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنْ كَادَ لَيُسْلِمُ»، بێگومان بانگەوازەکەی پێغەمبەری ﷺ پێگەیشتبوو، نزیک بوو لە مسوڵمان بوون، بەڵام لەسەر کوفرو بێبڕوایی مرد، هەموو کارو فەرمانێک لە پێشووترو لە دواتریش هەر بۆ خوایە.

٢٥٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَضَعُ لِحَسَّانَ بْنِ ثَابِتٍ مِنْبَراً فِي الْمَسْجِدِ يَقُومُ عَلَيْهِ قَائِماً يُفَاخِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَوْ قَالَ: يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» وَيَقُولُ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُؤَيِّدُ حَسَّانَ بِرُوحِ الْقُدُسِ مَا يُنَافِحُ أَوْ يُفَاخِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٤].

واتە: عائیشە ﵂ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو مزگەوت مینبەرێکی بۆ حەسسان دادەناو ئەویش لەسەری دەوەستا، بە هۆنراوە شانازی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، یان دەڵێ: بەرگری، دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) دەیفەرموو: «بێگومان خوا بە جیبریل پشتگیری لە حەسسان دەکات، هەتا ئەو بەرگری یان شانازی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «يُفَاخِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَوْ قَالَ: يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، گومانەکە لەو کەسەیە کە گێڕاویەتیەوە، مانای: (يُفَاخِرُ): واتە: شانازی پلەوپایە بەرزەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ باس دەکرد، (المُنَافَحَة): واتە: بەرگری کردن و بەرپەچدانەوەی ناهەقی لە دژی پێغەمبەر ﷺ.

---

(١) السرِّير: هو العرش في اللُّغة.

(٢) الشرّع: هو العالي المنيف.

(٣) صُور: جمع أصوَر، وهو المائل العنُق لنظره إلى العلو.

(٤) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٨٤٦، وقال: حسنٌ صحيحٌ، وأبو داود في السنن: ٥٠١٥.




کە دەڵێ: «وَيَقُولُ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ يُؤَيِّدُ حَسَّانَ بِرُوحِ الْقُدُسِ مَا يُنَافِحُ أَوْ يُفَاخِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، (رُوح الْقُدُس): مەبەست جیبریلە، بۆیە ناونراوە بەو ناوە، چونکە وەحی هێناوە، وەحیش ژیان و ژینی دڵەکانە.

٢٥١- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ مُوسَى، وَعَلِيُّ بْنُ حُجْرٍ، قَالَا: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﵂، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ.

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرمووده گێردراوەتەوە.

السَّمر: واتە: شەونخونی و نەنووستن دوای ئەوەی کە شەو دەزرینگێتەوە (دوای خەوتنان) بێگومان لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕداوەتەوە کە نەهی کردوە لە شەونخونی، بەڵام دانیشتن و شەونخونی پیاو لەگەڵ ژنەکەی هەڵاواردوە.

شەونخونی لەو سەردەمەی ئێمەدا، بەڵایەکی گەورەیە، کە لە ڕاستی بۆتە هۆی تاوان و گوناهباریەکی زۆر بۆ خەڵکی ئەو ڕۆژگارەی ئێمە، لە گەورەترین کێشەو بەڵایەکانی فەوتاندن و نەکردنی نوێژی بەیانییە، کە ئەوەش بێگومان بەڵایەکی گەورەو ماڵ وێرانکەرە، چونکە ئەگەر مرۆڤ بخەوێت لە کاتی نوێژی بەیانییداو نوێژەکەی بفەوتێ و نەیکات، ئەوە تاوانێکی گەلێک گەورەی لەو ڕۆژەدا ئەنجامداوە.

(إبن القيم) ﷺ گوتوویەتی: سەرەتای ڕۆژ بۆ مرۆڤ وەکو سەردەمی گەنجیەتی و کۆتایی ڕۆژیش وەکو سەردەمی پیریەتی، ئا ئەوەش بە ئەزموون سەلمێنراوە[1]. هەرکەس بە گەنجی چۆن بێ لەسەر ئەوە پیر دەبێ، جا ئەگەر مرۆڤ بە گەنجی دەست بە گەنجیەتی و سەرەتای ڕۆژ بکات و لە دەستی نەدات، ئەوە هەرگیز لە بەشەکانی دیکەی ڕۆژدا پاشەکشە ناکات، جا ئەگەر بە چووست و چالاکی دەستی پێکرد، ئەوە هەروا بەردەوام دەبێ تا کۆتایی ڕۆژ، خۆ ئەگەر بە تەمبەڵی و تەوەزەلی دەستی پێکرد، ئەوە تا کۆتایی ڕۆژەکە هەروا دەبێت.

٢٥٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ نِسَاءَهُ حَدِيثاً، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ: كَأَنَّ الْحَدِيثَ حَدِيثُ خُرَافَةَ فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا خُرَافَةُ؟ إِنَّ خُرَافَةَ كَانَ رَجُلاً مِنْ عُذْرَةَ، أَسَرَتْهُ الْجِنُّ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَمَكَثَ فِيهِمْ دَهْراً، ثُمَّ رَدُّوهُ إِلَى الْإِنْسِ فَكَانَ يُحَدِّثُ النَّاسَ بِمَا رَأَى فِيهِمْ مِنَ الْأَعَاجِيبِ، فَقَالَ النَّاسُ: حَدِيثُ خُرَافَةَ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێک بەسەرهاتێکی بۆ هاوسەرەکانی گێڕایەوە، یەکێک لە هاوسەرەکانی گوتی: ئەمە لەبەسەرهاتی خوڕافە

---

(١) مفتاح دار السّعادة: ٢/٢١٦.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٥٢٤٤، في إسناده مجالد بن سعيد، وهو ليس بالقويّ، قال الحافظ ابن كثير ﷺ في كتابه البداية والنّهاية: ٦/٥٤ عندما أورد الحديث: وهو من غرائب الأحاديث، وفيه نكارةٌ، ومجالد بن سعيد يتكلّمون فيه، فالحديث مِن حيث الإسنادُ ضعيفٌ؛ لأنَّ فيه مجالدًا، ومِن حيث المتنُ فيه نكارةٌ؛ لأنّه لا يمكنُ لإحدى زوجاتِ النّبيِّ ﷺ أن تقول لحديثه ﷺ: «كَأَنَّ الْحَدِيثَ حَدِيثُ خُرَافَةَ».



دەچێ، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «ئایا دەزانن خوڕافە چیە؟ (دوایی باسی کردو) فەرمووی: پیاوێک بوو لە هۆزی عوزرە، لە ڕۆژگاری نەفامیی دا لەلایەن جنەکانەوە بە دیل گیرابوو، بۆ ماوەیەک لە نێویاندا مایەوە، دوایی گەڕاندیانەوە بۆ لای مرۆڤەکان، ئیدی ئەوەی بینیبووی لە شتە سەیرو سەمەرەکانی نێو جنەکان بۆ خەڵکی باسی دەکردن، ئیدی لەوەوە خەڵک گوتوویانە: بەسەرهاتی خوڕافە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «إِنَّ خُرَافَةَ كَانَ رَجُلاً مِنْ عُذْرَةَ، أَسَرَتْهُ الْجِنُّ...»، واتە: خوڕافە ناوی پیاوێکی هۆزی عوزری بووە، جنەکان بە دیل گرتوویانە لە سەردەمی نەفامیدا، پاشان گێڕاویانەتەوە بۆ نێو خەڵکی، جا ئەوەیش هەواڵ و زانیاری سەیرو سەمەرەو نەبیستراوو نەبینراوی بۆ خەڵکەکە باسکردوە، کە خەڵکی پێشتر ئەو شتانەیان نەبیستبوو، وە نەشیان دیتبوو، بۆیە سەریان لێی سوڕمابوو، «فَقَالُوا: حَدِيثُ خُرَافَةَ»، ئیتر بوو بە نموونەو نموونە هێنانەوە، بۆ هەر شتێک کەوا جێگای باوەڕی خەڵکی نەبووایە، ئەوەندەی هەیە ئەو فەرموودە جێگرو جێی متمانە نیە، چونکە مەتنەکەی شتی نەخوازراوی تێدایە (منكر)ـە.

## فەرموودەی ئوممو زەرع[1]

٢٥٣- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: جَلَسَتْ إِحْدَى عَشْرَةَ امْرَأَةً فَتَعَاهَدْنَ وَتَعَاقَدْنَ أَنْ لَا يَكْتُمْنَ مِنْ أَخْبَارِ أَزْوَاجِهِنَّ شَيْئاً: فَقَالَتِ الْأُولَى: زَوْجِي لَحْمُ جَمَلٍ غَثٌّ عَلَى رَأْسِ جَبَلٍ وَعْرٍ، لَا سَهْلٌ فَيُرْتَقَى، وَلَا سَمِينٌ فَيُنْتَقَلُ، قَالَتِ الثَّانِيَةُ: زَوْجِي لَا أَبُثُّ خَبَرَهُ، إِنِّي أَخَافُ أَنْ لَا أَذَرَهُ، إِنْ أَذْكُرْهُ أَذْكُرْ عُجَرَهُ وَبُجَرَهُ. قَالَتِ الثَّالِثَةُ: زَوْجِي الْعَشَنَّقُ، إِنْ أَنْطِقْ أُطَلَّقْ، وَإِنْ أَسْكُتْ أُعَلَّقْ. قَالَتِ الرَّابِعَةُ: زَوْجِي كَلَيْلِ تِهَامَةَ، لَا حَرٌّ وَلَا قُرٌّ، وَلَا مَخَافَةَ وَلَا سَآمَةَ، قَالَتِ الْخَامِسَةُ: زَوْجِي إِنْ دَخَلَ فَهِدَ، وَإِنْ خَرَجَ أَسِدَ، وَلَا يَسْأَلُ عَمَّا عَهِدَ. قَالَتِ السَّادِسَةُ: زَوْجِي إِنْ أَكَلَ لَفَّ، وَإِنْ شَرِبَ اشْتَفَّ، وَإِنِ اضْطَجَعَ الْتَفَّ، وَلَا يُولِجُ الْكَفَّ لِيَعْلَمَ الْبَثَّ. قَالَتِ السَّابِعَةُ: زَوْجِي عَيَايَاءُ أَوْ غَيَايَاءُ طَبَاقَاءُ كُلُّ دَاءٍ لَهُ دَاءٌ، شَجَّكِ، أَوْ فَلَّكِ أَوْ جَمَعَ كُلًّا لَكِ. قَالَتِ الثَّامِنَةُ: زَوْجِي الْمَسُّ مَسُّ أَرْنَبٍ وَالرِّيحُ رِيحُ زَرْنَبٍ. قَالَتِ التَّاسِعَةُ: زَوْجِي رَفِيعُ الْعِمَادِ طَوِيلُ النِّجَادِ عَظِيمُ الرَّمَادِ قَرِيبُ الْبَيْتِ مِنَ النَّادِ. قَالَتِ الْعَاشِرَةُ:

---

(١) حَدِيثُ أُمِّ زَرْعٍ




زَوْجِي مَالِكٌ وَمَا مَالِكٌ مَالِكٌ خَيْرٌ مِنْ ذَلِكِ، لَهُ إِبِلٌ كَثِيرَاتُ الْمَبَارِكِ، قَلِيلَاتُ الْمَسَارِحِ، إِذَا سَمِعْنَ صَوْتَ الْمِزْهَرِ أَيْقَنَّ أَنَّهُنَّ هَوَالِكُ. قَالَتِ الْحَادِيَةَ عَشْرَةَ: زَوْجِي أَبُو زَرْعٍ وَمَا أَبُو زَرْعٍ؟ أَنَاسَ مِنْ حُلِيٍّ أُذُنَيَّ، وَمَلَأَ مِنْ شَحْمٍ عَضُدَيَّ، وَبَجَّحَنِي فَبَجَحَتْ إِلَيَّ نَفْسِي، وَجَدَنِي فِي أَهْلِ غُنَيْمَةٍ بِشِقٍّ فَجَعَلَنِي فِي أَهْلِ صَهِيلٍ وَأَطِيطٍ وَدَائِسٍ وَمُنَقٍّ، فَعِنْدَهُ أَقُولُ فَلَا أُقَبَّحُ، وَأَرْقُدُ فَأَتَصَبَّحُ وَأَشْرَبُ فَأَتَقَمَّحُ، أُمُّ أَبِي زَرْعٍ فَمَا أُمُّ أَبِي زَرْعٍ، عُكُومُهَا رَدَاحٌ، وَبَيْتُهَا فَسَاحٌ، ابْنُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا ابْنُ أَبِي زَرْعٍ، مَضْجَعُهُ كَمَسَلِّ شَطْبَةٍ، وَتُشْبِعُهُ ذِرَاعُ الْجَفْرَةِ، بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا بِنْتُ أَبِي زَرْعٍ، طَوْعُ أَبِيهَا وَطَوْعُ أُمِّهَا، مِلْءُ كِسَائِهَا، وَغَيْظُ جَارَتِهَا، جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ، فَمَا جَارِيَةُ أَبِي زَرْعٍ، لَا تَبُثُّ حَدِيثَنَا تَبْثِيثاً، وَلَا تُنَقِّثُ مِيرَتَنَا تَنْقِيثاً، وَلَا تَمْلَأُ بَيْتَنَا تَعْشِيشاً، قَالَتْ: خَرَجَ أَبُو زَرْعٍ وَالْأَوْطَابُ تُمْخَضُ، فَلَقِيَ امْرَأَةً مَعَهَا وَلَدَانِ لَهَا، كَالْفَهْدَيْنِ، يَلْعَبَانِ مِنْ تَحْتِ خَصْرِهَا بِرُمَّانَتَيْنِ، فَطَلَّقَنِي وَنَكَحَهَا، فَنَكَحْتُ بَعْدَهُ رَجُلاً سَرِيّاً، رَكِبَ شَرِيّاً، وَأَخَذَ خَطِّيّاً، وَأَرَاحَ عَلَيَّ نَعَماً ثَرِيّاً، وَأَعْطَانِي مِنْ كُلِّ رَائِحَةٍ زَوْجاً، وَقَالَ: كُلِي أُمَّ زَرْعٍ، وَمِيرِي أَهْلَكِ، فَلَوْ جَمَعْتُ كُلَّ شَيْءٍ أَعْطَانِيهِ، مَا بَلَغَ أَصْغَرَ آنِيَةِ أَبِي زَرْعٍ. قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُنْتُ لَكِ كَأَبِي زَرْعٍ لِأُمِّ زَرْعٍ»[1].

واتە: لە عائیشەوە ﵂ گێردراوەتەوە گوتویەتی: یازدە ئافرەت دانیشتن و پەیمانیان بەست کە هیچ لە هەواڵی هاوسەرەکانیان نەشارنەوەو (بە ڕاستگۆیی بۆ یەکدی باسی بکەن).

**ئافرەتی یەکەم** گوتی: هاوسەرەکەم گۆشتی حوشتری لاوازە، لەسەر چیایەکی سەختە، نە چیایەکە ئاسانە تا مرۆڤ بتوانێ بچێتە سەری، نە گۆشتەکەش قەڵەوەو ئەوە دێنێ مرۆڤ خۆی بدات لە سەختی چیاکەو بۆی بچێ.

### ڕوونکردنەوە:

هاوسەرەکەی بەم جۆرە وێنا کردوە ڕوونیکردۆتەوە کە لەگەڵیدا کەم سوودو کەم چاکەیە، جا وێنای کردوە بە گۆشتی حوشتر، چونکە گۆشتی حوشتر چیڕترە لە گۆشتی مەڕو ئاژەڵی دیکە، جا لەگەڵ ئەوەشدا گۆشتەکە لاواز بێ و نەخورێت لە لاوازی و چیڕیان و لەسەر چیایەکی سەختیش بێ، ئاسان نەبێ تا مرۆڤ بچێتە سەری، وە گۆشتەکەش قەڵەو نەبێت تا بۆی بکەوێتەڕێ و، گوێ بە سەختی ڕێگاکە نەدات، چونکە ئەگەر گۆشتێکی قەڵەوی چاک بێ دەکرێ سەختی بەسەر

---

(١) أخرجه البخاري: ٥١٨٩، ومسلم: ٢٤٤٨.




هەڵگەڕانی چیاکە بەرگە بگیرێ، (بەمە) ئاماژەی کرد بۆ کەمی چاکەی پیاوەکەی لەگەڵی، وە سەختی و ناخۆشی سروشت و ڕەوشتی و مامەڵە کردنی لەگەڵی، وە زبری و توندیەکەی.

**ئافرەتی دووەم** گوتی: باسی وردەکاری هاوسەرەکەم ناکەم، من دەترسم هیچی بۆ نەهێڵمەوە، ئەگەر باسی بکەم، ئەوە دەبێ باسی هەموو شتی بکەم (بە خراپە).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەمە ئافرەتی دووەمە، وەسفی هاوسەرەکەی دەکات بە زۆری عەیب و کەم و کوڕیی، جا ئەگەر دەرگای قسەکردن بکاتەوە لەسەر عەیب و کەموکووڕیەکانی، ئەوە قسە درێژە دەکێشێ، لەبەر ئەوە دەڵێ: (ئەگەر باسی بکەم، ئەوە دەبێ باسی هەموو شتی بکەم)، واتە: ئەگەر ئەم بابەتە بکەمەوەو باسی گشت شتێکتان بۆ بکەم، ئەوە قسە درێژە دەکێشێ، بۆیە بەو کورتییە وازی هێنا (بە کورتی گوتی: پیاوەکەم هیچ چاکەیەکی نیە).

**ئافرەتی سێیەم** گوتی: هاوسەرەکەم درێژێکی ناڕێکە، ئەگەر قسە بکەم (لە بەرانبەری) ئەوە تەڵاق دەدرێم، وە ئەگەر بێ دەنگبم، ئەوە بە هەڵواسراوی دەمێنمەوە.

**ڕوونکردنەوە:**

ئافرەتی سێیەم گوتوویەتی: هاوسەرەکەم درێژێکی ناڕێک و بێ عەقڵە، بێ ویقارەو کەم کەسایەتیە، ئەگەر باسی خراپەی کاروبارو مامەڵەکانی بکەم تەڵاق دەدرێم (لێم قبوڵ ناکات)، وە ئەگەر بێ دەنگبم، ئەوە بێ دەنگ دەبم بە زۆرلێکراوی و دەستبەسەری، وە لەلای دەبم بەو ئافرەتە هەڵواسراوەی کە هاوسەرەکەی تەڵاقی نەداوە تا مێردێکی تر بکاتەوە، وە ناشبم بەو ئافرەتەی کە پیاوەکەی لای خۆی دەیهێڵێتەوە بە جێبەجێ کردن و پێدانی مافەکانی.

**ئافرەتی چوارەم** گوتی: هاوسەرەکەم وەک شەوی تیهامەیە، نە گەرمەو نە ساردە، نە ترسی هەیە، نە بێزاری.

**ڕوونکردنەوە:**

تیهامە ناوچەیەکی نزمە لە نێوان دەریای سور و چیای حیجاز و یەمەن دایە، هاوسەرەکەی وێناکردوە بە شەوی تیهامە، جا سیفەتی شەوی تیهامە چیە؟ گوتویەتی: نە گەرمە و نە ساردە، بەڵکو مامناوەندە، بە هەمان شێوە هاوسەرەکەشی ئاوایە، مامناوەندە لە هەڵسوکەوت و مامەڵە کردن لەگەڵیدا، وە لەلایەن ئەوەوە ترسم نیە، لە هیچ شتێکی ناترسم، وە هیچ بێزاریەکم بۆ دروست نابێت، بەهۆی مامناوەندیەکەیەوە.

**ئافرەتی پێنجەم** گوتی: هاوسەرەکەم کاتێ دێتەماڵەوە پڵنگە، وە کاتێ دەردەچێت لە ماڵەوە شێرە، وە پرسیار ناکات لەوەی جێی هێشتووە (لە ماڵەوە، لە پارەو پول، بەو ئەندازەیە سەخیە، هەر چەندی خەرج بکەم گوێی پێ نادات).

**ڕوونکردنەوە:**

هاوسەرەکەی وەسف کردوە بەوەی کاتێک دێتەوە ماڵەوە وەک هاتنەوەی پڵنگ، وە دەردەچێ لە ماڵەوە وەک دەرچوونی شێر، جا هەندێک لە لێکدەرەوانی ئەم فەرموودەیە ئەو وەسفکردنەیان بە مەدح و سەنا داناوە، وەک ئەوەی وێنای هاوسەرەکەی کردوە لە کاتی هاتنەوەی بۆ ماڵەوە بە پڵنگ، لە ڕووی ڕێزلێنان و چاکەو چاک مامەڵەکردنەوە، وە لە کاتی دەرچوونیشی وێنای کردوە بە شێر، لە ڕووی ئازایەتی، وە پرسیار لە هیچدا ناکات لەوەی هەبووە، لەبەر زۆر چاوپۆشی کردنی، جا زۆربەی لێکدەرەوەکان لەسەر ئەو لێکدانەوەیەن.

وە هەندێکیشیان بەشێک لە قسەکانیان بە مەدح و سەنا و بەشێکیش بە زەم لێکداوەتەوە، بەوەی لە شێر دەچێ لە ئازایەتی کاتێ دەردەچێ، وە لە پڵنگ دەچێت کاتێ دێتە ماڵەوە، ئەوە زەمە، گوتوویانە: پڵنگ کاتێ دەچێتەوە کولانەکەی هیچ ناکات جگە لە خەوتن، وە لەوەی هیچ تێبینی ماڵەکەی ناکات، تاوەکو کەموکووڕی و پێویستیەکانی بزانێت، کە ئەوە زەمێکی ترە.

**ئافرەتی شەشەم** گوتی: هاوسەرەکەم کاتێ خواردن دەخوات خواردنەکەی لول دەدات، وە کاتێ خواردنەوە دەخواتەوە هیچ ناهێڵێتەوە، کاتێکیش پاڵدەکەوێ و




دەچێتە سەر جێگا بەتانی و پێخەف لە خۆی لول دەدات، وە دەست نابات تا هەست بە خەم و پەژارەی خێزانەکەی بکات.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەوەیان زەمی هاوسەرەکەی دەکات، بەوەی کاتێ دێتە ماڵەوە خەمی هیچی نیە، جگە لە ورگی، بۆیە دەڵێ: کاتێ بۆ خواردن دادەنیشێت ئەوەی لە پێشیەتی لە خواردن لولی دەدات و تەواوی دەکات و هیچ ناهێڵێتەوە، کاتێکیش خواردنەوە دەخواتەوە، هیچ خواردنەوەیەک ناهێڵێتەوەو تەواوی دەکات، وە کاتێ پاڵدەکەوێ تا بخەوێت، ئەوە بە تاقی تەنیا پێخەف و لێف لە خۆی لول دەدات لە گۆشەیەکی ماڵەکەو، هەر لە خێزانی ناپێچێتەوە، وە بە دوای خێزانی ناگەڕێت و دڵخۆشی ناکات و دەستگەمەی لەگەڵ ناکات، تاوەکو خەم و پەژارەی ناخی بزانێت و بۆی برەوێنێتەوە.

**ئافرەتی حەوتەم** گوتی: هاوسەرەکەم شەڕانگێزە، یان خراپ و گومڕایە، گەمژەیەکی تەواوە، هەموو دەردێک هی ئەوە، سەر دەشکێنێ و لێ دەدات، یان هەردووکیان پێکەوە ئەنجام دەدات.

**ڕوونکردنەوە:**

(عياياء) لە (عي) هاتوە، کە بریتیە لە ڕۆچوون لە شەڕ و خراپە، یان (غياياء) لە (غي) هاتوە، کە بریتیە لەو کەسەی ڕێنمایی ناکرێ، وە (طبقاء) واتە: گێلە گێلێکی تەواوە، (كل داء له داء) واتە: هیچ دەردو زەم و عەیبێک نیە کە لە پیاواندا هەبێت و بە خەیاڵتان دادێت حەتمەن سیفەتە بۆ هاوسەرەکەم، (شجك)، (شج): بریتیە لە سەر شکاندن، یان (فلك)، (فل): بریتیە لە بڕینی جەستە، وەسفی هاوسەرەکەی دەکات بەوەی لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵی لێی دەدات بە توندی، جارێک سەری دەشکێنێ، جارێک جەستەی بریندار دەکات، (أو جمع كلا لك) واتە: هەندێ جاریش هەردووکی بەیەکەوە ئەنجام دەدات: سەرو جەستەی بریندار دەکات.

**ئافرەتی هەشتەم** گوتی: هاوسەرەکەم دەست لێدانی، وەک دەست لێدانی کەروێشکە، بۆنیشی بۆنی زەڕنەبە.




## ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: (دەستلێدانی وەکو کەروێشکە)، واتە: جەستەی نەرمەو بەردەوام پاک و خاوێنە، (بۆنیشی بۆنی زەڕنەبە)، زەڕنەب جۆرە ڕووەکێکە بۆنی خۆشە، واتە هاوسەرەکەی بۆنی خۆشە، جا ئەو ئافرەتە جگە لە مەدح و سەنا کردن هیچی باس نەکرد، ئەم مەدح و سەنایەش مامەڵە چاکی و ڕەوشت چاکی لە خۆ دەگرێت.

**ئافرەتی نۆیەم** گوتی: هاوسەرەکەم دینگەی بەرزە، کێلانی شمشێرەکەی درێژە، خۆڵەمێشی زۆرە، ماڵی نزیکە لە شوێنی دانیشتنی گەلەکەی.

## ڕوونکردنەوە:

دینگە (العماد): بریتیە لەو شتەی ڕەشماڵی پێ بەرز دەکرێتەوەو ڕادەگیرێ، جا کە دینگە بەرز بێت، ئەوە بەڵگەیە لەسەر فراوانی و گەورەیی ڕەشماڵەکە، ئافرەتەکە ئاماژە بەوە دەکات هاوسەرەکەی میوان دۆستەو ماڵەکەی فراوان کردوە بۆ پێشوازی کردن لە میوانان، نەجادی درێژە: نەجاد بریتیە لەو کێلانەی شمشێری تێدایە، جا ئەگەر درێژ بێت، ئەوە بەڵگەیە بۆ درێژی پیاوەکە، چونکە کەسی باڵا کورت شمشێری درێژ نابەستێ بە خۆیەوە (شمشێرەکە بەر زەوی دەکەوێ)، وە ئەم وەسفە دیسان بەڵگەیە لەسەر ئازایەتی، خۆڵەمێشی زۆرە: خۆڵەمێش پاشماوەی ئەو دارانەیە کە بە هۆی بەردەوام سوتاندنیان لە ماڵەوە پەیدادەبن بۆ (ئامادەکردنی خواردن) و ڕێزلێنانی میوان، جا (بەم شێوەیە) وەسفی هاوسەرەکەی کرد بە سەخاوەت، بەوەی ئاگر بەردەوام هەڵدەکرێ لە ماڵدا لەبەر نەبڕانەوەی میوان، وە گوتی: (قريب البيت من الناد)، واتە: ماڵەکەی لە نزیک دانیشتگاو شوێنی کۆبوونەوەی گەلەکەی دامەزراندوە، تاوەکو گشت وەفدێک ببینن، جا گشت وەسفەکان مەدح و سەنایە بۆ ئەو هاوسەرە.

**ئافرەتی دەیەم** گوتی: هاوسەرەکەم خاوەن موڵکە، چ خاوەن موڵکێکە! خاوەنی شتانێکە زۆر چاکترە لەوەی بە خەیاڵتاندادێ، حوشتری زۆری هەن لە مۆڵگەدا مۆر بوون، کاتێ گوێبیستی دەنگی تەپڵ دەبوون دڵنیا دەبوون لەناوچوون.




**ڕوونکردنەوە:**

گوتی: هاوسەرەکەم خاوەن موڵکە، واتە: شتانێکی زۆری هەیە خاوەنداریەتیان دەکات، جا خاوەنداریەتی چی دەکات؟ خاوەنداریەتی شتانێک دەکات چاکترە لەوەی لە هزرتان دێت و دەچێت، یان موڵکەکەی چاکترە لەوەی من باسی دەکەم دەربارەی پیاوەکەم، یان موڵکەکەی چاکترە لەوەی ئێستا بۆتانی باس دەکەم، وەک ئەوەی ئاماژە بکات بەوەی شتی چاکی یەکجار زۆرە، جا ئەو تەنها یەکێکی باس دەکات (کە بریتیە لەوە): حوشتری زۆری هەن مۆرکەوتوون، کەمیان لە مەساریحن، مەساریح: ئەو شوێنەیە کە حوشتر بۆی دەچێت تا بلەوەڕێت، جا وەسفەکەی بۆ حوشترەکان کە دەڵێ: کەمیان لە لەوەڕگان، ئاماژەیە بەوەی پیاوەکە میوانی زۆرە، بۆیە حوشتری زۆر دەهێڵێتەوە لە مۆڵگە تاوەکو ئەوەی چاکە بژاردەیان بکات و سەریان ببڕێت بۆ میوانەکانی، جا کاتێ حوشترەکان گوێیان لە دەنگی (مِزْهَرِ) دەبێ دڵنیا دەبن لەناوچوون، (مِزْهَرِ): ئامێرێکە لە ئامێرەکانی کەیف و سەیف (کە بریتیە لە تەپڵ)، زۆر جار بەکار دەهات لەلایەن پیاوەکەوە لە کاتی هاتنی میواندا، جا مانای ڕستەکە ئاوایە: ئەم حوشترانە کاتێ گوێبیستی دەنگی ئەو تەپڵە دەبوون دڵنیا دەبوون هەندێکیان حەتمەن سەردەبردرێن بۆ ڕێزلێنان و چێشتی میوانەکان.

**ئافرەتی یازدەم** گوتی: هاوسەرەکەم ئەبو زەرعە، جا ئەبو زەرع کێیە؟ دوو گوێچکەکانی بە خشڵ لەراندوومەتەوە، وە باسکەکانی بە بەز پڕ کردووم، وە دڵخۆشی کردووم و دڵم خۆشە، منی بینی لە نێو خانەوادەیەکی کەم مەڕو ماڵات، وە لە ژیانێکی سەختدا بووم، جا کردمی بە خاوەنی ئەسپ و پشتەباری حوشتر، وە خزمەتکاری دروێنەکارو پاککەرەوەی دانەوێڵەی هەیە، جا لەلای ئەو قسەو بۆچونی خۆم دەردەبڕم و بێ ڕێزی و خراپەم بەرانبەر ناکات، (لەسەر قسەکانم)، وە دەخەوم و بەیانی دەکەمەوە (بە دڵخۆشی)، وە خواردنەوە دەخۆمەوەو حەزی خواردنەوەم تێر دەکەم.

ئوممو ئەبی زەرع، جا ئوممو ئەبی زەرع کێیە! بوخچەکانی گەورەن، وە ماڵەکەی فراوانە.

کوڕی ئەبو زەرع، جا کوڕی ئەبو زەرع کێیە! شوێنی خەوتنی وەک خەت و چیلکەی پەلکی دارخورمایە، وە گۆشتی باسکی کاریلەیەک تێری دەکات.

کچی ئەبو زەرع، جا کچی ئەبو زەرع کێیە! گوێڕایەڵی باوکی و گوێڕایەڵی دایکیەتی، جەستەی کراسەکەی پڕ دەکات و مایەی قینی دراوسێکەیەتی.

جاریەی ئەبو زەرع، جا جاریەی ئەبو زەرع کێیە! قسەی ئێمە بڵاو ناکاتەوە، وە شتەکانی ئێمە ناکۆڵێتەوەو نایانبات، وە ماڵەکەمان پڕ ناکات لە پوش و پەڵاش و پیسی.

ئوممو ئەبو زەرع دەڵێ: (جا جارێکیان) ئەبو زەرع دەرچوو لە کاتێکدا ئاژەڵەکان گوانیان پڕی شیر بوو، جا گەیشت بە ئافرەتێک دوو کوڕی لەگەڵدا بوون وەک پڵنگ بوون، یاریان دەکرد لە ژێر کەلاکەی یاریان بە ئەندامی سینگی دایکیان دەکرد، جا (سەرەنجی ڕاکێشا)و منی تەڵاقداو ئەو ئافرەتەی خواست.

جا منیش لە دوای ئەو شووم کرد بە پیاوێکی ڕێزدار، سواری ئەسپی مەزن دەبوو و ڕمی هەڵدەگرت، جا بەخششی زۆری بەسەردا ڕشتم، وە لە گشت شتێکدا دووانی پێ بەخشیم، گوتی: بخۆ ئوممو زەرع، وە ببەخشە بە خزمەکانت، جا هەموو ئەو شتانەی ئەم هاوسەرە پێی بەخشیوم ناگاتە بچوکترین قاپە بەخششی ئەبو زەرع، عائیشە ڕضي الله عنها گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: من بۆ تۆ وەکو ئەبو زەرع وام، بۆ ئوممو زەرع.

**ڕوونکردنەوە:**

بە کونیەی ئەبو زەرع باسی هاوسەرەکەی کرد، تا ئاماژە بێ بۆ زۆری شتە چاکەکانی پیاوەکە، کە دواتر باسیان دەکات، گوتی: جا ئەبو زەرع کێیە!، ئەم شێوازی باسکردنە، وەک پێشەکیەک وایە بۆ ئەوەی دواتر باسی دەکات، گوتی: (أَنَاسَ مِنْ حُلِيٍّ أُذُنَيَّ)، (أَنَاسَ) لە (النَّوس)ـەوە هاتوە، کە بریتیە لە لەرینەوەی شتێکی شۆڕبویەوە، دەگوترێ: (أناسَ) کاتێ شتێک دەجوڵێنێ، واتە: پیاوەکەی خشڵی پێ دەبەخشێت کە دەیخاتە گوێچکەکانی، جا لەمەدا ئاماژە هەیە بۆ جۆرەها خشڵ کە بەسەریدا دەڕشت لە سەخیەتیان، کە دەڵێ: باسکەکانی پڕ کردووم لە بەز، واتە: هاوسەرەکەی ڕێزی



لێ گرتوەو خواردنی باشی پێ بەخشیوە، تاوەکو بووە خاوەن جەستەیەکی ساغ و دەوڵەمەند لە کانـزا، جا بە تایبەت باسی باسکی کردوە، چونکە یەکەم شتە کە چاوو سەرنجی دەکەوێتە سەر، جا کاتێ باسک قەڵەو بوو، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جەستەش ئاوایە.

کە دەڵێ: (وبجحني فبجحت إلي نفسي)، واتە: دڵخۆشی کردم و بەخششەکانی لەسەر فراوان کردم و تەڕفیهی پێدام لەماڵەوەدا.

کە دەڵێ: (وجدني في أهل غنيمة بشق)، واتە: کاتێ پیاوەکە ئەوی بینی لە نێو خانەوادەکەی خۆی (پێش ئەوەی بیێتە خێزانی) هیچیان نەبوو، تەنها کەمێک مەڕ و بزن نەبێ، بەڵکو لە زەحمەتی و ماندووبوونێکی زۆردا بوون.

کە دەڵێ: (فجعلني في أهل صهيل)، واتە: منی گواستەوە لە حاڵەکەی پێشوو تاوەکو بووم بە کەسانی خاوەن ئەسپ.

کە دەڵێ: (هەروەها کردمی بە خاوەنی): (أطيط)، کە بریتیە لە بارەپشتی حوشتر، کە بەڵگەیە لەسەر زۆری ئەو بەخشش و خێروبێرانەی حوشترەکە هەڵیگرتوە.

کە دەڵێ: (دائس)ی هەیە، واتە: کەسانێکی لەلایە کە دانەوێڵەی وەک: گەنم و گەنمەشامی و جۆو شتی دیکەی بۆ دەدورنەوە، وە دەڵێ: (منقی) هەیە، واتە: هەروەها کەسانێکی هەیە دەنکە دانەوێڵەکانی بۆ پاڵفتە دەکات، کەواتە: خزمەتکارو کرێکاری زۆری هەن.

وە دەڵێ: (عنده أقول فلا أقبح) واتە: من پلەوپایەییێکم هەیە، (وارقد فأتصبح) واتە: دەخەوم و بەیانی دەکەمەوە لە نێو کاروباری چاک و خۆش، (وأشرب فأتقمح) واتە: هەر خواردنەوەیەکی حەز بکەم دەخۆمەوە تا حەزی خواردنەوەم تێر دەکەم.

کە گوتی: ئوممو ئەبی زەرع، جا ئوممو ئەبی زەرع کێیە! ئەو بوخچە و شتومەکانەی کەلوپەلیان تێدا دادەنێ فراوانن، جا ئەوە بەڵگەیە بۆ زۆری شتومەکەکانی، کە دەڵێ: (بيتها فساح) واتە: ماڵەکەی فراوانە.

وە کە دەڵێ: (ابن أبي زرع، فما ابن أبي زرع؛ مضجعه كمسل شطبة)، (الشطبة): واتە: ئەو شەقەیە کە لە لاسکی گەڵای دار خورمادا دەکرێ، کە دەکاتە گەڵاکەی، واتە: شوێنی

پاڵکەوتنی کە تیایدا دەخەوێ، لە بچووکیدا وەک لەتێکی لاچکی دارخورمایە، کە دەڵێ: (وتشبعه ذراع الجفرة) بریتیە لە کاریلەی مێیینەی بزن، واتە: کەمخۆرە، جا عەرەب بەو سیفەتە مەدحی دەکەن.

کە دەڵێ: (کچی ئەبو زەرع، جا کچی ئەبو زەرع کێیە! گوێڕایەڵی باوکی و دایکیەتی) واتە: کچێکی گوێڕایەڵە، خورەوشتی چاک و جوانە، گوێڕایەڵی باوک و دایکیەتی، (پڕ بە جلەکانیەتی) واتە: لاواز نیە، بۆیە جلەکانی پڕ دەکات، چونکە لە خۆشگوزەرانی دایە، (مایەی قینی هاوسێکەیەتی) لەبەر ئەو خێرو بێرو خۆشگوزەرانیەی بەسەریدا ڕژاوە.

کە دەڵێ: جاریەو خزمەتکاری ئەبو زەرع، جا جاریەو خزمەتکاری ئەبو زەرع کێیە! قسەو هەواڵی ئێمە بڵاوناکاتەوە واتە: خزمەتکارەکەی ئەبو زەرع سیفەتی چاکن و ڕەوشتی جوانە، هەواڵی ماڵ و نهێنیەکانی بڵاوناکاتەوە، (شتەکانمان ناکۆڵێتەوە) واتە: ناچێتە گژ کەلوپەل و پێویستیەکانمان و نایکۆڵێتەوەو هیچ شتێکی لێ نابات، (وە ماڵەکەمان پڕ لە پیسایەتی ناکات) واتە: گرنگیەکی زۆر دەدات بە پاک و خاوێنی ماڵ و ڕێکخستنی.

کە دەڵێ: (ئەبو زەرع دەرچوو لە کاتێکدا حوشترو ئاژەڵەکان گوانیان پڕی شیر بوو) واتە: ئەبو زەرع ڕۆژێک لە ڕۆژان دەرچوو لە کاتێکدا شیر لە گوانی ئاژەڵەکاندا زۆر بوو، (جا گەیشت بە ئافرەتێک دوو کوڕی لەگەڵدا بوون وەک پڵنگ بوون، یاریان دەکرد (لە ژێر کەلاکەی یاریان بە ئەندامی سینگی دایکیان دەکرد)، واتە: گەیشت بە ئافرەتێکی جەستە پڕ و دوو منالی لە ژێر کەلاکەی دانیشتبوون و، یاریان بە ئەندامی سینگی دایکیان دەکرد، جا ئافرەتەکە کاریگەری تێکردو بە دڵیەوە نووسا، (جا منی تەڵاقداو ئەوی مارە کرد) واتە: لە دوای ئەوەی من لەو خۆشگوزەرانیەدا ژیام، تەڵاقیدام کاتێ کاریگەر بوو بەو ئافرەتەو، ئەوی کردە خێزانی خۆی.

جا ئوممو زەرع لەبەر خۆشەویستی بۆ ئەبو زەرع ـ دوای ئەوەی تەڵاقدراویشە ـ بە هیچ جۆرێک باسی ئەبو زەرعی نەکرد تەنها بە وەسفی جوان نەبێت، زۆر جار زۆرێک لە تەڵاقدراوان سیفەتە چاکەکانی هاوسەرانیان لەیاد دەچێ، باسی هیچ ناکەن جگە لە لایەنە خراپەکان.




وە کە دەڵێ: (جا لە دوای ئەو شووم کرد بە پیاوێکی سەری) واتە: خاوەن شکۆ، (سواری شەری دەبوو) شەری ئەسپی مەزنە، (خطيّ) هەڵدەگرت، خەتیی بریتیە لە ڕم، کەواتە ئازا بووە لە جەنگ و ڕووبەڕووبونەوە، (وە نیعمەتی زۆری بەسەردا باراندووم)، واتە: ڕێزی لێنام بە چاکترینی شتەکان، (وە لە هەر شتێکی خۆش و چاکدا دوانی پێ بەخشیم) واتە: ڕێزی لێگرت و چاکەی لەگەڵ دەکردو لە هیچ شتێکدا کەمتەرخەم نەبوو بەرانبەری، (گوتی: بخۆ ئوم زەڕع) واتە: بخۆ ئەوەی حەز دەکەیت لە خواردن، (وە ببەخشە بە خزمەکانت) واتە: هەروەها ببەخشە بە خانەوادەو خزمەکانت، جا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەگەڵی بە سەخاوەتەو چاکەکارە لەگەڵ خۆی و خانەوادەو خزمەکانی، (جا ئەگەر گشت ئەوانەی پێی بەخشیوم کۆیبکەمەوە ناگات بە بچوکترین قاپی ئەبو زەڕع) واتە: ئەگەر گشت ئەو شتانەی ئەم هاوسەرەی دووەمم پێی بەخشیوم، ناگات بە کەمترینی ئەوەی پێمگەیشت لە خۆشگوزەرانی لەلایەن ئەبو زەڕعەوە، جا ئەوە سەنایەکی یەکجار زۆرە بۆ ئەبو زەڕع، وە مەدحێکی گەورەیە بۆی.

عائیشە ﵂ گوتی: پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووم: «من بۆ تۆ وەکو ئەبو زەڕعم بۆ ئوممو زەڕع».

### ڕوونکردنەوە:

پێغەمبەری خوا ﷺ لێرەدا قسە لەسەر لایەنێکی دیاریکراو دەکات: کە بریتیە لەو حاڵەتە چاکە لە ڕێزگرتن و سەخاوەت و چاکەو جوان مامەڵە کردن و، ئەو پلەی ئافرەتە کە هەیبوو لەلای ئەبو زەڕع بەر لەوەی تەڵاقی بدات، بۆیە فەرمووی: من بۆ تۆ وەکو ئەبو زەڕعم بۆ ئوممو زەڕع.

دانەر ﵀ ئەم فەرموودەیەی لێرەدا هێنا، بۆ ڕوونکردنەوەو دڵخۆشکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاوسەرەکانی، جا بە قسەکردن بێ لەگەڵیان، بە شتێک کە دڵخۆشیان دەکات، یان بە گوێگرتن بێ بۆ قسەکانیان، یان بە لێدوانێکی جوانی دڵخۆشکەر بێ لەسەر قسەکانیان.




نوستن: یەکێکە لەو نیشانەو بەڵگانەی کەوا بەڵگەیە لەسەر یەکتایی خوای گەورەو ئەوپەڕی بە توانایی خوای گەورەو، ڕێکخستن و سەرپەرشتی کردنی خوا بۆ سەرجەم گەردوون و بوونەوەر، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبْتِغَآؤُكُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الروم. (وە لە نیشانەکانی ئەوە، خەوتنتان بە شەو و ڕۆژدا و هەوڵدانتان -لە ڕۆژدا- بۆ بەهرە وەرگرتن لە بەخششی -ڕۆزی- خوا بەڕاستی لەوەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ کۆمەڵێک ببیستن)، بێگومان خەوو نوستن یەکێکە لە نازو نیعمەت و سۆزی خوای پەروەردگار بۆ بەندەکانی و، منەتی خوایە بەسەر بەندەکانییەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾ القصص. (لە بەزەیی ئەو -خوایە- کە شەوو ڕۆژی بۆ دروستکردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە -شەو- داو، بۆ ئەوەی بگەڕێن بە دوای ڕۆزی و فەزڵی خوا -لە ڕۆژدا-، وە بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن -لەسەر ئەو نیعمەتانەی-).

٢٥٤- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ الْأَيْمَنِ، وَقَالَ: «رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ»[1].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچووە سەر جێگەی خەوتنی، دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی، ئنجا دەیفەرموو: «خوایە بمپارێزە لە سزاکەت، لەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە».

٢٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ، مِثْلَهُ وَقَالَ: «يَوْمَ تَجْمَعُ عِبَادَكَ».

واتە: بەم سەنەدە ئەم بێژەیەش هاتوە، کە دەفەرموێ: «(خوایە بمپارێزە لە سزاکەت) لەو ڕۆژەی بەندەکانت کۆدەکەیتەوە».

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٨٦٧٢.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە سێ ئەدەبی نوستنی تێدان، بۆ ئەو کەسەی کەوا دەچێتە سەر جێگەکەی:

**یەکەم**: لەسەر لای ڕاستی ڕاکشێت.

**دووەم**: دانانی دەستی ڕاست لە ژێر ڕوومەتی ڕاست.

**سێیەم**: ئەوجار بڵێ: «رَبِّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ»، واتە: ئەی پەروەردگارم! داوات لێدەکەم کەوا لەو ڕۆژەدا بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە لە سزای خۆت بمپارێزە.

ئا ئەو پاڕانەوەیە، بۆ ئەو شوێنە، ئەوپەڕی گونجاوو شایستەیە، چونکە نوستن مردن بە بیر مرۆڤ دەخاتەوە، بەڵکو نوستن جۆرە مردنێکە، دواتر لە فەرموودەیەکی دیکەدا دێ، کە کاتێک پێغەمبەر ﷺ لە خەو هەڵساوەو فەرموویەتی: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَاناً بَعْدَمَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»، لە دوای مردن زیندووبوونەوە هەیە، هەروەها حەشرو حیساب و پاداشت هەیە، بۆیە مردن هەموو ئەوانە بەبیری مرۆڤ دەخاتەوە، بۆیە ئەو دووعایە بۆ ئەو کاتە گونجاوە.

٢٥٦- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: «اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا»، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَمَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»[1].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچووایە سەر جێگای خەوتنی دەیفەرموو: «خوایە بە ناوی تۆ دەمرم و دەژیم، وە ئەگەر بە ئاگاهاتبایە لە خەو دەیفەرموو: ستایش بۆ ئەو خوایەی ژیانی پێ بەخشینەوە دوای ئەوەی مراندینی، زیندووبوونەوەو گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا»، (اللَّهُمَّ): واتە: ئەی خوایە! ئەو پیتەی کە بۆ داواکردن دیاریکراوە، لێرەدا لابراوە کە پیتی (یا)یە، لە کۆتایی وشەکە بە پیتێکی

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٣١٢، والمصنّف في جامعه: ٣٤١٧.

شەدەدار جێگرەوەی بۆ دانراوە، بۆیە ناکرێ شتێک لە بری شتێک هاتبێ، لەگەڵ هەمان شتیشدا کۆبکرێتەوە، بۆیە ناگوترێ: (یا اللَّهُمَّ)، کە دەفەرموێ: (بِاسْمِكَ) پیتی یا، لێرەدا بۆ داواکردنی یارمەتیە، کە پیتەکەو ئیشەکە هەردووکیان پەیوەستن بە: (أَمُوتُ وَأَحْيَا)، واتە: ئاوایە ژیان و مردنم، ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ ﴾ الأنعام. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بڵێ: بێگومان نوێژو -بەندایەتی-و قوربانی و، ژیان و، مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانییانە).

لەو فەرموودەیەدا ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ کە مرۆڤ هەمیشەو لە هەموو سات و کاتێکدا پێویستی بە یادی خوا هەیە، نموونەی ئەو کاتانە: کاتی نوستن دەبێ مرۆڤ بە ناوو یادی خوا بخەوێت، هەروەها کاتێک کە هەڵدەستێت پێویستە یادی خوا بکات، وەکو سوپاسگوزارییەک، چەندین کەس هەبووە، کە نوستوەو ئیتر هەڵنەستاوەتەوە، کە دەفەرموێ: «وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»، (النُّشُور): واتە: زیندووبوونەوە، بەیەکەوە گونجانی ماناو مەبەستی هەڵسان لە خەوو زیندووبوونەوەی دوای مردن بۆ حیساب، ڕوون و ئاشکرایە، هەر لەبەر ئەوەشە کەوا دووعاکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو کاتانە زۆر گونجاون کە بگوترێ.

٢٥٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ فَنَفَثَ فِيهِمَا، وَقَرَأَ فِيهِمَا قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا رَأْسَهُ وَوَجْهَهُ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَصْنَعُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو شەوێکدا ئەگەر بچووایە سەر جێگای خەوتنی دەستەکانی کۆدەکردنەوەو، فووی پێدا دەکردن، سوورەتەکانی: ئیخلاص و فەلەق و ناسی تێدا دەخوێندن، پاشان دەستەکانی بە جەستەی دادەهێناو ئەوەندەی دەستی بگەیشتبایە، سەرەتا دەستی بە سەرو ڕووخسارو پێشەوەی لەشی دادەهێناو ئەو کارەشی سێ جاران دووبارە دەکردەوە».

---

(١) أخرجه البخاري ٥٠١٧، والمصنّف في جامعه: ٣٤٠٢.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كُلَّ لَيْلَةٍ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەسەری بەردەوام بووە، بە جۆرێک هەتا ئەو کاتەش کە پێغەمبەر ﷺ نەخۆش کەوت، نەخۆشی لەسەری قورس و گران بوو، فەرمانی بە عائیشە ﵂ کرد، ئەو دووعاو زیکرانەی بۆ بکات، وەکو هاوکاری وەرگرتن و فەرامۆش هاتن و خۆپاراستن بە هۆی ئەو زیکرە بە پیت و پیرۆزانەوە.

کە دەڵێ: «جَمَعَ كَفَّيْهِ»، واتە: لەپە دەستێکی بە لەپە دەستەکەی ترەوە جووت کرد، لەگەڵ بە یەک لکاندنی لەپە دەستەکان و پەنجەکان، پاشان دەستی بە خوێندنی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ دەکرد، دواتر فووی بە نێو دەستەکانیدا دەکرد، ئنجا ئەوەندەی بۆی کرابایە دەستی بە جەستەیدا دەهێنا، کە سەرەتا بە سەرو ڕوخساری و پێشەوەی جەستەی دەستی پێدەکرد، ئەوەشی سێ جار ئەنجام دەدا، سەرەتا لە سەرەوەی سەرییەوە دەستی پێدەکردو دادەبەزی بۆ ڕوخساری، پاشان بۆ خوارتر، وە لای پێشەوەی سنگ و بەرەو خوار دەستی پێدا دەهێنا، ئنجا بەرەو لای پشت و شان دەگەڕایەوە، هەوڵی دەدا کە دەستی بە تەواوی جەستەیدا بێنێت بە پێی توانا، لە فەرموودەیەکی دیکەدا کە پێشەوا بوخاری[1] ڕیوایەتی کردوە، هاتوە: {وما بَلَغَتْ يَدَاهُ مِن جَسَدِهِ}. واتە: تا ئەو شوێنەی دەستی بگەیشتایە لاشەی دەستی پێدا دەهێنا، ئەوەشی سێ جار جێبەجێ دەکرد.

ئا ئەو دەست پێداهێنانەو مەسح کردنە، وەکو بەرەکەت و فەڕ وایە بۆ جەستە، دەبێتە هۆی ئەوەی کە شەیتان نەتوانێ لە هیچ لایەکەوە بۆی بێت، چونکە بە هۆی ئەو ئایەتانەوە پارێزراوە لە هەموو ڕووەکانەوە، هەروەها پارێزراو دەبێت لە هەموو گیانەوەرێکی زیانبەخش.

هەروەها وا جوان و باشترە، کە مسوڵمان لە مانای ئایەتەکانیش ڕابمێنێ، هەروەها مەبەستی ئایەتەکانیش کە لە کتێبی تەفسیردا هاتوەو ڕوونکراوەتەوە، وەکو تەفسیری (ابن السعدي) ﵀، یان تەفسیری (ابن كثير) ﵀، ئەوەیان زیاتریش کاریگەری هەیە،

---

(١) البخاري: ٥٧٤٨.

وە باشترە بۆ سوود وەرگرتن، چونکە کەسێک کە ئەو سوورەتانە بخوێنێ و لە ماناکەشیان تێبگات جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو کەسەی کە دەیانخوێنێ و لێیان تێناگات.

٢٥٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَامَ حَتَّى نَفَخَ، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ، فَقَامَ وَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ» وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ[1].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: کە «پێغەمبەری خوا ﷺ (شەوێک خەوت) هەتا پرخەی هات، وە عادەتی وا بوو، ئەگەر خەوتبایە پرخەی هەبوو، جا بیلال هاتە خزمەتی و بانگی کرد بۆ نوێژ، جا هەڵساو دەستنوێژی نەگرتەوە»، ئەم فەرموودەیە بەسەرهاتێکی تێدایە (کە دانەر رحمه الله بە پێویستی نەزانیوە بیهێنێ).

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «نَامَ حَتَّى نَفَخَ»، (نَفَخَ): لێرەدا بە مانای ئەو دەنگە دێ کە کەسی نوستوو لە کاتی خەودا دەریدەبڕێ، کە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەسەکە لە خەوێکی قوڵدایە.

کە دەڵێ: «فَأَتَاهُ بِلَالٌ فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ»، واتە: پێی ڕاگەیاند کە کاتی بانگەو، بانگی کرد بۆ نوێژ، «فَقَامَ وَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ»، ئەوە کە دەستنوێژی نەگرتۆتەوە، زانایان ڕوونیان کردۆتەوە کە ئەوە لە تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر ﷺ بووە، کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی پێغەمبەران عليهم السلام، فەرموویەتی: «إنَّا مَعْشرَ الأنْبياءِ تَنامُ أعيُنُنا ولا تَنامُ قلوبنا»، واتە: ئێمەی کۆمەڵەی پێغەمبەران چاوەکانمان دەخەوێ، بەڵام دڵەکانمان ناخەوێ[2].

کە دەڵێ: «وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ»، ئەوە دانەر رحمه الله لە باسی دواتر دەیهێنێ.

٢٥٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا، وَسَقَانَا، وَكَفَانَا، وَآوَانَا، فَكَمْ مِمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُؤْوِيَ»[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ١٣٨، المصنّف في جامعه: ٢٣٢.

(٢) طبقات ابن سعد: ٢٠٤/٤.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٧١٥، المصنّف في جامعه: ٣٣٩٦.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچووبا سەر جێگاکەی دەیفەرموو: «ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشین، وە هەر خۆی بوو پێداویستیەکان و شوێن و جێگەی بۆ دابین کردین، زۆر کەس هەن کە پێداویستی و شوێنیان بۆ دابین نەکراوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەفەرموێ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا، وَسَقَانَا»، واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە منەتی کردوە بەسەرماندا بەوەی کە ئەو خواردنەی پێداوین کە بۆتە مایەی خۆراک بۆ جەستە، وە بەوەی کە ئاوی پێداوین کە بۆتە مایەی پاراو بوون لە تینویەتی «وَكَفَانَا»، واتە: دەستەبەری هەموو ئەو شتانەی بۆ کردووین کەوا بەدەستهێنانیان بۆمان گرنگە و هەوڵی بۆ دەدەین، هەروەها دەستەبەری سەلامەتی بۆ کردووین لە شەڕو خراپەو دەستدرێژی و ستەمی دوژمن و ستەمکاران، «وَآوَانَا»، هەروەها منەتی ئەوەی بەسەرمانەوە هەیە کە پەناگەی پێداوین، چونکە هەر کەسێک بچێتە نێو ماڵەکەی و، دەرگا دابخات و، بەبێ خەم لێی بخەوێت، ئەوە لە نازو نیعمەتێکی فراوان و گەورە دایە، مادام حاڵی وەکو حاڵی ئاژەڵە کێوییەکان نیە، کە بە پەرش و بڵاوی لە دەرو دەشت بەبێ پەردە لێی دەخەون، لەبەر ئەوە فەرموویەتی: «فَكَمْ مِمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُؤْوِي»، وشەی (كَمْ): لێرەدا بە مانای زۆری دێت، واتە: زۆری ئەوانەی حاڵیان ئاوایە.

٢٦٠- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا عَرَّسَ بِلَيْلٍ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، وَإِذَا عَرَّسَ قُبَيْلَ الصُّبْحِ نَصَبَ ذِرَاعَهُ، وَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى كَفِّهِ»[1].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بە شەو بیویستایە بخەوێ ئەوە بەلای ڕاستیدا پاڵی دەدایەوە، وە ئەگەر پێویستبا لە کاتی پێش بەیانیدا باسکی دەچەقاندو سەری دەخستە سەر لەپی دەستی».

(١) أخرجه مسلم: ٢٧١٥.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ إِذَا عَرَّسَ بِلَيْلٍ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ»، واتە: هەر کات شەوانە دەچوو بۆ سەر جێگاکەی، وە کاتەکەش بۆ خەوتن فراوان و زۆر بوو، وە بۆ ئاسوودەیی بەس بوو، ئەوە ئەوکات لەسەر تەنیشتنی ڕاستی دەخەوت، وەکو باسمان کرد لە پێشوو، بەڵام: «وَإِذَا عَرَّسَ قُبَيْلَ الصُّبْحِ نَصَبَ ذِرَاعَهُ، وَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى كَفِّهِ»، واتە: ئەگەر پێویست بووایە کەمێک پێش نوێژی بەیانی نوستبایەو، کاتەکە کەم بووایەو بەشی نوستنی تەواو نەبووایە، ئەوە باسکێکی دەچەقاندو سەری دەخستە سەر لەپی دەستی، لەبەر گرنگیدانی بە نوێژی بەیانی و چاوەڕێ کردنی، چونکە ئەگەر مرۆڤ بەو جۆرە بخەوێت ناچێتە ناو خەوی قوڵەوە، حەیف و مەخابن بۆ کەسانێک کەوا درەنگانی شەو بە ئاسوودەیی سەردەخەنە سەر سەرین و، هیچ گوێ نادەن بە گرنگی و گەورەیی نوێژی بەیانی، خوا یارمەتیدەری هەموو لایەک بێت.



# بابەت: هاتوە دەربارەی چۆنیەتی عیبادەتی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي عِبَادَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ



**العبادة**: لە زمانەوانیدا بە مانای ملکەچ و ڕام بوون دێ، دەگوترێ: (طريق معيد): واتە: ڕێگایەک کە زەلیلکرابێ تا بەکاربهێنرێ و پێویست کرابێ، لە شەریعەتیشدا بە مانای ئەوپەڕی ملکەچیی و گوێڕایەڵی دێ بۆ خوای گەورە، لەگەڵ خۆشویستن و ملکەچ بوون و ڕەزامەندی بۆ خوای بەرز، ئەو بابەتە گشتییە، بەڵام تەنها ئەو فەرموودانەی هێناوە کە تایبەتن بە شەونوێژەوە.

٢٦١- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ فَقِيلَ لَهُ: أَتَتَكَلَّفُ هَذَا وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً»[1].

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (هێندە شەو) نوێژی کرد هەتا پێیەکانی ئاوسان، جا پێی گوترا: بۆ ئاوا زۆر لە خۆت دەکەی، لە کاتێکدا خوا لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە؟ ئەویش فەرمووی: «ئایا نابێ منیش بەندەیەکی سوپاسگوزار بم».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ»، واتە: هێندە نوێژی دەکرد تاکو پێیەکانی دەئاوسان بە هۆی زۆر ڕاوەستانەوە لە نوێژدا، جار هەبووە لە یەک ڕکاتدا سوورەتی (البقرة)و، سوورەتی (النساء)ی خوێندوە.

کە دەڵێ: «فَقِيلَ لَهُ: أَتَتَكَلَّفُ هَذَا»، واتە: بەو جۆرە خۆت ناڕەحەت دەکەی تاکو پێیەکانت بە هۆیەوە دەئاوسێن، «وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟»، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢﴾ الفتح. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان پێدایت -کە ڕێکەوتنی حودەیبیەیە- ﴿١﴾ تا خوا خۆش ببێت لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت، وە نیعمەتی خۆی بە تەواوی بڕێژێت بەسەرتدا، وە ڕێگای ڕاستت نیشان بدات -بەردەوامت بکات- ﴿٢﴾ ).

کە فەرموویەتی: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً»، واتە: لێخۆشبوونی خوای گەورە بۆ گوناهی

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٣٠، ومسلم: ٢٨١٩، المصنّف في جامعه: ٤١٢.



ڕابردوو و داهاتووم نازو نیعمەت و منەتی خوایە بەسەرمەوە، کە پێویست دەکات سوپاسی خاوەن نیعمەت بکرێ، سوپاسگوزاریش دەبێ بە دڵ بێت، بەوەی کە دان بنێت بە نیعمەتەکەداو، بە زاریش سوپاس و ستایشی خاوەنەکەی بکات و، بە ئەندامەکانیش پەرستشی خوای گەورە بکات.

لێرەدا باسی دوو پێگەو شوێنی کردوە: پێگەو شوێنی پەرستش و، پێگەو شوێنی سوپاسگوزاریی، وە بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەردووکیانی بەوپەڕی تەواوی بە جێگەیاندوە، بە باشترین شێوە کە بێگومان بە تەقواترین کەس بووەو، زۆرترین پەرستشی کردوە، پێغەمبەر ﷺ پێشەوای سوپاسگوزارو پێشەنگی ستایشکارانە.

پاشان شەونوێژکردن و بە پێوە وەستان هەتاکو پێیەکانی دەئاوسێن، بەو مانایە دێت کەوا بەندە نابێت تووشی بێ تاقەتی و بێزاری و وەڕەزی ببێ، ئەگەرنا نابێ بەو جۆرە پەرستش بکات، لەبەر ئەو فەرموودەی کە عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: {خُذُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ؛ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَأَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مَا دُووِمَ عَلَيْهِ، وَإِنْ قَلَّتْ، وَكَانَ إِذَا صَلَّى صَلَاةً دَاوَمَ عَلَيْهَا}[1]. واتە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر کارێک دەکەن بە پێی توانا جێبەجێی بکەن، چونکە خوای گەورە هەرگیز ڕووتان لێ وەرناگیرێ، تاکو ئێوە ڕوو وەرنەگێڕن و بێزار نەبن، وە خۆشەویسترین نوێژ لە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو نوێژە بوو، کە بەردەوام بووایە لەسەری ئەگەرچی کەمیش بێ، بۆیە ئەگەر نوێژێکی دەکرد بەردەوام دەبوو لەسەر ئەنجامدانی.

(إبن حجر) رحمه الله دەربارەی ئەم فەرموودەیە گوتوویەتی: (وَمَحَلّ ذَلِكَ مَا إِذَا لَمْ يُفْضِ إِلَى الْمَلَال، لِأَنَّ حَال النَّبِيّ ﷺ كَانَتْ أَكْمَلَ الْأَحْوَال، فَكَانَ لَا يَمَلّ مِنْ بَادَة رَبّه وَإِنْ أَضَرَّ ذَلِكَ بِبَدَنِهِ، بَلْ صَحَّ أَنَّهُ قَالَ: وجُعِلَت قُرَّةُ عَيني فِي الصَّلاةِ). واتە: نابێت ئەو بەردەوامییە ببێتە مایەی سەرکێشان بۆ بێزاری، چونکە حاڵ و شێوازی پێغەمبەر ﷺ تەواوترین بووە، هەرگیز لە پەرستشی خوا بێ تاقەت نەبووە، هەرچەند بەردەوامییەکەی بۆ جەستەشی زەرەرێکی هەبووایە، بەڵکو بە صەحیحی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: نوێژکردن و چوونە ناو نوێژ بۆ من بۆتە مایەی ڕۆشنایی و چاو ڕوونی، هەروەکو نەسائی[2] لە

---

(١) أخرجه البخاري: ١٩٧٠.

(٢) برقم: ٣٩٤٩ و ٣٩٥٠.

ئەنەس دەگێڕێتەوە، بەڵام غەیری پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کەسێک هەستی بە بێتاقەتی کرد، نابێ زۆری لە خۆی بکات، لەسەر ئەو واتایە ئەو فەرمووەیەش لێکدەدرێتەوە کە دەفەرموێ: {خُذُوا مِنَ الأعْمَالِ ما تُطِيقُونَ، فإنَّ اللَّهَ لا يَمَلُّ حتَّى تَمَلُّوا}[١].

٢٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي حَتَّى تَرِمَ قَدَمَاهُ قَالَ: فَقِيلَ لَهُ: أَتَفْعَلُ هَذَا وَقَدْ جَاءَكَ أَنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً».

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (زۆر شەو) نوێژی دەکرد، هەتا پێیەکانی ئاوسان، جا پێی گوترا: بۆ ئاوا دەکەی، لە کاتێکدا بە دڵنیایی هەواڵت بۆ هاتوە خوا لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: «ئایا نابێ منیش بەندەیەکی سوپاسگوزار بم».

٢٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُومُ يُصَلِّي حَتَّى تَنْتَفِخَ قَدَمَاهُ فَيُقَالُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَفْعَلُ هَذَا وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْداً شَكُوراً»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ (شەو) هەڵدەستا نوێژی دەکرد، هەتا پێیەکانی پوفکەی دەکردن، جا پێی گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە کاتێکدا ئاوا خۆت ماندوو دەکەی، کەچی دڵنیاشی خوا لە گوناهەکانی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە، (واتە: هۆکاری ئەم کارەت چیە)؟ ئەویش فەرمووی: «ئایا نابێ منیش بەندەیەکی سوپاسگوزار بم».

٢٦٤- عَنِ الْأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِاللَّيْلِ؟ فَقَالَتْ: «كَانَ يَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ ثُمَّ يَقُومُ، فَإِذَا كَانَ مِنَ السَّحَرِ أَوْتَرَ، ثُمَّ أَتَى فِرَاشَهُ، فَإِذَا كَانَ لَهُ حَاجَةٌ أَلَمَّ بِأَهْلِهِ، فَإِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ وَثَبَ، فَإِنْ كَانَ جُنُباً أَفَاضَ عَلَيْهِ مِنَ الْمَاءِ، وَإِلَّا تَوَضَّأَ وَخَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ»[٣].

---

(١) فتح الباري: ١٥/٣.

(٢) أورد ﷺ هذا الحديث عن أبي هريرة ﷺ من طريقين، وفي كلّ منها ملانٌ يسيّر: ففي الأوّل محمّد بن عمرو بن علقمة، وهو صدوقٌ له أوهامٌ، وفي الثّاني عيسى بن عثمان - شيخ المصنّف -، وهو صدوقٌ، ويحيى بن عيسى الرّملي، صدوقٌ يخطئ لكنّ كلاًّ من الإسنادين يتقوّى بالآخر، ويشهد له حديث المغيرة الّذي قبله.

(٣) أخرجه البخاري: ١١٤٦، ومسلم: ٧٣٩.





واتە: ئەسوەدی کوڕی یەزید دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ دەربارەی شەونوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەویش گوتی: «سەرەتای شەو دەخەوت، پاشان هەڵدەستا، لە کاتی پارشێودا ویتری دەکردو دەهاتەوە شوێنی خەوتنی، ئەگەر پێداویستیەکی هەبووایە دەچوو بۆ لای هاوسەرەکەی، کاتێکیش گوێبیستی بانگ بووایە بە پەلە دەردەچوو بۆ نوێژ، ئەگەریش لەشگران بووایە ئاوی بەسەر خۆیدا دەکرد، ئەگەرنا تەنیا دەستنوێژی دەشۆردو، دەچوو بۆ نوێژ کردن».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

پرسیاری ئەسوەد دەربارەی شەونوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر گرنگیدانی پێشین بە شارەزابوونی و زانینی چۆنیەتی نوێژەکانی لە شەودا، چونکە شوێنکەوتنی سوننەت لەسەر زانینی سوننەت وەستاوە.

کە دەڵێ: «كَانَ يَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ»، سەرەتای شەو بە کاتی ڕۆژئاوابوون دەست پێدەکات، بەڵام لێرەدا مەبەستی دوای نوێژی خەوتنانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نوستنی پێش نوێژی خەوتنانی بەلاوە پەسند نەبووە، هەروەکو چۆن شەونخونی و دانیشتنی بێ هۆی دوای نوێژی خەوتنانی پێ پەسند نەبووە، بۆیە ڕاستەوخۆ دوای نوێژی خەوتنان دەخەوت.

کە دەڵێ: «ثُمَّ يَقُومُ»، ئەو هەڵسانەوەیە لە دوای نیوەی شەو بووە، هەروەکو لە فەرموودەی هەردوو صەحیحدا[1] هاتوە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﵄ کەوا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: {أَحَبُّ الصَّلَاةِ إِلَى اللَّهِ صَلَاةُ دَاوُدَ ﵇، وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا}. واتە: خۆشەویسترین نوێژ بەلای خواوە نوێژی داوود ﵇ بووە، وە خۆشەویسترین ڕۆژوو لە لای خواوە ڕۆژووی داوودە ﵇، کە نیوەی شەو دەخەوت و سێیەکی بە خەبەر دەبوو، شەشیەکی دەخەوتەوە، هەروەها ڕۆژێک نا ڕۆژێک بە ڕۆژوو دەبوو. شەوی دەکردە شەش بەش، سێ لەسەر شەشی یەکەمی دەخەوت، دوو لەسەر شەشی چوارەم و پێنجەم هەڵدەستایەوە، پاشان شەشیەکی کۆتایی دەخەوت، ئەوەش بۆ ئەوەبوو چالاکتر بێ بۆ نوێژی بەیانی.

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٣١، ومسلم: ١١٥٩.

کە دەڵێ: «فَإِذَا كَانَ مِنَ السَّحَرِ أَوْتَرَ»، واتە: کاتێک شەشیەکی شەوی دەما نوێژە ویترەکەی دەکرد، «ثُمَّ أَتَى فِرَاشَهُ، فَإِذَا كَانَ لَهُ حَاجَةٌ أَلَمَّ بِأَهْلِهِ»، واتە: ئەگەر بیویستایە لەگەڵ خێزانی کۆبێتەوە کەوا لەو کاتەدا سەرجێیی لەگەڵ دەکرد. «فَإِذَا سَمِعَ الْأَذَانَ وَثَبَ»، واتە: بەو پەڕی چالاکیەوە هەڵدەستاو بە هیممەت بەرزییەوە ڕادەپەڕی، (الوَثوب): بۆ شتێکە کە مرۆڤ زۆر حەزی لێی بێت، جا ئەگەر لە گەڕان بووایە خۆی دەشۆرد، وە ئەگەرنـا تەنها دەستنوێژی دەگرت و دەڕۆیشت بۆ نوێژ.

٢٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄، «أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ وَهِيَ خَالَتُهُ قَالَ: «فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ، فَاسْتَيْقَظَ، رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَجَعَلَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِيمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي ثُمَّ أَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى فَفَتَلَهَا فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ قَالَ مَعْنٌ: سِتَّ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: «کە ئەو لای مەیموونەی پووری خەوتوە شەوێک، دەڵێ: بە پانایی ڕایەخەکە پاڵم دایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە باری درێژی ڕاکشا، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ خەوی لێکەوت، تا شەو نیوەی ڕۆیشت، یاخود پێش ئەوەی کەمێکی بمێنێ، یان کەمێک زیاتر لە نیوەی لێی ڕۆیشت، ئیدی بێدار بووەوەو دەستی بە ڕووخساری داهێناوە بۆ نەمانی خەوەکە، دە ئایەتی کۆتایی لە سوورەتی ئالی عیمران خوێند، پاشان هەڵسا لە کوندەیەکی هەڵواسراو دەستنوێژێکی جوانی شۆردو، دوایی هەڵسا نوێژی کرد، هەر ئیبنو عەبباس دەڵێ: منیش هەڵسام چوومە تەنیشتی و ڕاوەستام، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم، دوایی گوێی گرتم سووڕاندی (وەک خۆش ڕەفتار لەگەڵ کردن و خۆشویستن)، پاشان دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان دوو ڕکات، دوو ڕکات، دوو ڕکات، دوو ڕکات، دوو ڕکات، مەعن (کە یەکێکە لە ڕاویەکان) گوتوویەتی: شەش جاران، پاشان نوێژی

---

(١) انظر: (ح ٢٥٨).

ویتری کرد، دوایی ڕاکشاو پاڵیدایەوە، تا بانگبێژ هات بۆ خزمەتی، ئیدی هەڵساو دوو ڕکاتی سووک نوێژی ئەنجامداو، پاشان چووە دەرەوە نوێژی بەیانی ئەنجامدا».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ وَهِيَ خَالَتُهُ»، سوور بووە لەسەر ئەوەی کە بۆ خۆی بە چاوی خۆی نوێژکردنەکەی پێغەمبەر ﷺ و پەرستنەکەی بە شەوانە ببینێ.

کە دەڵێ: «فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ»، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەسەر یەک سەرین خەوتوە، ئەو سەری لەسەر باری پانی سەرینەکە داناوە، ئەوپەڕی هەوڵیداوە بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی شەونوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ ببینێ، لە هەندێک گێڕانەوەدا هاتوە کە داوای لە پوری کردوە کە هەر کات پێغەمبەر ﷺ هەڵسایەوە بۆ شەونوێژ ئەویش خەبەری بکاتەوە، ئەگەر بە خەبەر نەهات، بەڵام دیارە کە بۆ خۆی خەبەری بۆتەوەو هەڵساوە.

کە دەڵێ: «وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي طُولِهَا»، واتە: پێغەمبەر ﷺ و مەیمونەی خێزانی لەسەر باری درێژی سەرینەکە خەوتوون، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەوپەڕی خاکی بووەو سوور بووە لەسەر ئامۆژگاری و تێگەیاندنی بەرامبەر، چونکە کاتێک کە دەزانێ ئەو گەنجە سوورە لەسەر وەرگرتنی زانیاری دەربارەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ و ئارەزووی زۆری بۆ تێگەیشتن هەیە، ئەوە ڕێگای پێدەدات کە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەسەر سەرینێک بخەوێت.

کە دەڵێ: «فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ»، ئەوە بە هەمان شێوەی دوو فەرموودەکەی عائیشەو عەبدوڵڵای کوڕی عەمرە ﷺ کە پێشتر باسکران، کە دەڵێن: «فَاسْتَيْقَظَ، رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَجَعَلَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ»، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە بۆ هەڵسانەوە چالاکتر بێ، چونکە مرۆڤ کاتێک لە خەو هەڵدەستێ و دەست بە ڕوخساریدا دێنێت هەست بە جۆرێک لە چالاک بوون و خەو ڕۆیشتن دەکات.

کە دەڵێ: «ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِيمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ»، ئەو ئایەتانە بریتین لەوانەی کە مانای زۆرو گەورەو گرنگیان لە خۆگرتوون، هەروەها بیرکردنەوەو بە گەڕخستنی بیری مرۆڤ لە خۆ دەگرن لە دروستکراوەکانی، هەروەها چۆنیەتی




دووعاو پاڕانەوەو ئەو شتەی کە دووعای بۆ دەکرێت و، ئەو بەڵێنانەی کە خوای گەورە لە پاداشت بە بەندەکانی داوە، ئەوانە هەموو لە خۆ دەگرن، هەروەکو چۆن باسی سزاو تۆڵەی خوای گەورەشیان تێدایە بۆ کەسێک سەرپێچی بکات، ئەوەش بۆ ئەوەی کە بەندەکانی لە پەرستندا چالاک بن.

کە دەڵێ: «ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقٍ»، واتە: لەسەر جێگەکەی هەڵساو پاش خوێندنی ئەو ئایەتانە چوو بۆ لای ئەو کوندە ئاوەی کە هەڵواسرابوو، (الشَّنُّ): کوندەیەکە لە پێستی ئاژەڵ دروست دەکرێ، بۆ ئەوەش ئاو لەو کوندەیە دەکەن، چونکە کەمێک ساردو فێنکی دەکات، دیارە کە ئاوی ساردیش بۆ چالاک بوونی دوای خەو باشترینە.

کە دەڵێ: «فَتَوَضَّأَ مِنْهَا، فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي ثُمَّ أَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى فَفَتَلَهَا»، واتە: بە دەستی کەمێک گوێچکەی عەبدوڵڵای جوڵاند، لە هەندێک گێڕانەوەدا هاتوە کە عەبدوڵڵا دەڵێ: بۆیە وایکرد تاکو لەو تاریکیەی شەودا هەست بە بوونی پێغەمبەر ﷺ بکەم و هەست نەکەم کە تەنیام، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جوڵەیەکی کەم لە نوێژدا هیچ زەرەر بە نوێژەکە ناگەیەنێت.

کە دەڵێ: «فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ»، واتە: دوازدە ڕکاتی کردوە بە شەش جار سەلامدانەوە، (واتە: دوو ڕکات، دوو ڕکات سەلامی داوەتەوە).

«قَالَ مَعْنٌ: سِتَّ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَوْتَرَ»، ئەوە ڕاوی فەرموودەکە بۆ دڵنیاکردنەوەی ژمارەکان ئەمەی گوتوە، «ثُمَّ اضْطَجَعَ»، ئەو ڕاکشانە لە شەشیەکی کۆتایی شەودا بووە، بۆ ئەوەی نوێژی بەیانی بتوانێ بە چالاکییەوە هەڵبستێ، «حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ»، واتە: بیلال، «فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»، سوننەتی پێش نوێژی بەیانییە لە دوای بانگ، سوننەت وایە، سوننەتەکە کورت و پوخت بێت، وە سووڕەتەکانی: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١﴾ و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ی تێدا دەخوێندن، ئەوەش بۆ ئەوەی سەرەتای ڕۆژ بە یەکتاپەرستی دەستپێدەکات، یەکتاپەرستی کردەیی بە سووڕەتی (الْكَافِرُونَ)، وە یەکتاپەرستی عیلمی بە سووڕەتی (الإخلاص)، هەروەها شەویش بە خوێندنی ئەو



دوو سوورەتە دەستی پێدەکرد، ئەوەش لەو دوو ڕکاتە کورت و پوختەی کە لە دوای نوێژی شێوان دەیکردن.

**٢٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً»[1].**

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما گوتوویەتی: «پێغەمبەر ﷺ لە شەو (نوێژدا) سێزدە ڕکات نوێژی دەکرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیە ئەوە وەردەگیرێ کەوا پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕکات شەونوێژی کردوە، دواتر فەرموودەکەی عائیشە رضي الله عنها دێت، کەوا پێغەمبەر ﷺ یازدە ڕکاتی کردوە، هەر لە گێڕانەوەکەی عائیشەدا رضي الله عنها هاتوە شەو هەبووە نۆ ڕکاتی کردوە، ئەوەش زانایان بەو جۆرە لێکیانداوەتەوە کە کاتەکان جیاواز بوونە، پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕکاتی کردوە، جاریش هەبووە کەمتری کردوە، ئەوەش دیارە لەبەر چەند هۆکارێک بووە، کەواتە تێکگیران لە فەرموودەکاندا نیە، یان ئەوەی کە دەڵێ: یازدە ڕکاتی کردوە، دیارە کە دوو ڕکاتە کورتەکەی دەسپێکی شەونوێژەکانی نەژماردوون.

**٢٦٧- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا لَمْ يُصَلِّ بِاللَّيْلِ مَنَعَهُ مِنْ ذَلِكَ النَّوْمُ، أَوْ غَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً»[2].**

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە، «پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شەوێک شەونوێژی ئەنجام نەدابووایە، خەوتن ڕێگربووایە، یاخود چاوەکانی خەو زۆری بۆ هێنابان، ئەوە لە ڕۆژدا دوازدە ڕکات نوێژی دەکرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە ڕۆژ نوێژی ویتری نەکردوە، جا هەر کاتێک نوستن ڕێی لێ گرتبێ لە شەونوێژ، ئەوە دوازدە ڕکاتی چێشتەنگاوی کردوە، چونکە ئەگەر بە شەو نوێژی کردبایە یازدە ڕکاتی دەکرد،

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٣٨، ومسلم: ٧٦٤، والمصنّف في جامعه: ٤٤٢.

(٢) أخرجه مسلم: ٧٤٦، المصنّف في جامعه: ٤٤٥.

کەواتە: بە ڕۆژ نوێژی ویتری نەکردوە، بەڵکو نوێژی ڕۆژی جووت جووت بوونە.

ئەو فەرموودەیە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە هەر کەسێک خەوی لێکەوت بە شەو، ئەوە لە نێوانی ڕۆژهەڵات تاکو نیوەڕۆ دەتوانێ قەرەبووی بکاتەوە، کە کاتی چێشتەنگاوە، جا ئەگەر عادەتی وابوو بە شەو حەوت ڕکاتی دەکرد، ئەوە لە ڕۆژدا دەیانکات بە هەشت، ئەگەر نۆ ڕکاتی بە شەو دەکرد، ئەوە لە ڕۆژدا دەیانکات بە دە ڕکات، ئەگەر یازدە ڕکاتی دەکرد بە شەو، ئەوە لە چێشتەنگاودا دەیانکات بە دوازدە ڕکات، جا هەر کەس ئەوەی کرد ئەوە وەکو ئەوە وایە شەونوێژەکەی ئەنجامدابێ.

٢٦٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَفْتَتِحْ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان لە شەودا هەڵسا بۆ ئەنجامدانی نوێژی سوننەت، با نوێژەکەی بە دوو ڕکاتی سووک دەست پێبکات».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هەر کەسێک ویستی شەو هەڵسێتەوە بۆ شەونوێژ کردن، ئەوە با دوو ڕکات نوێژی کورت و پوخت بکاتە دەستپێکی شەونوێژەکانی، چونکە ئەو دوو ڕکاتە دەبێتە مایەی خەو ڕەواندن و چالاک بوون و خەواڵویی ناهێڵێ، وە پێغەمبەریش ﷺ وای کردوە.

٢٦٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: لَأَرْمُقَنَّ صَلَاةَ النَّبِيِّ ﷺ، فَتَوَسَّدْتُ عَتَبَتَهُ، أَوْ فُسْطَاطَهُ «فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، طَوِيلَتَيْنِ، طَوِيلَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ أَوْتَرَ فَذَلِكَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً»[2].

---

(١) أخرجه مسلم: ٧٦٨.

(٢) أخرجه مسلم: ٧٦٥.




واتە: زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنیی ﷺ دەگێڕێتەوە، تەماشای (شەو) نوێژی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، بۆیە لەگەڵی لە چادرەکەو لە شوێنی نوستنەکەی لەگەڵی خەوتم و چاودێریم کرد، جا دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەی بە دوو ڕکاتی سووک دەست پێکرد، پاشان دوو ڕکاتی زۆر درێژی، درێژی، درێژی کردن، دوایی دوو ڕکاتی دیکەی کردن کە کورتتر بوون لەوەی پێشێ، ئنجا دوو ڕکاتی دیکەی کرد، کورتتر بوون لەو دوو ڕکاتەی پێشێ، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی کرد کورتتر بوون لەو دوو ڕکاتەی پێشێ، پاشان دوو ڕکاتی دیکەی کرد کورتتر بوون لەو دوو ڕکاتەی پێشێ، ئنجا نوێژی ویتری ئەنجامداو، ئەوە بوو بە سێزدە ڕکات».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَأَرْمُقَنَّ صَلَاةَ النَّبِيِّ ﷺ»، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تا چەندە تامەزرۆو سوور بوون لەسەر شارەزابوونی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺو، چۆنیەتی هەڵسانەوەی بۆ شەونوێژ، «فَتَوَسَّدْتُ عَتَبَتَهُ، أَوْ فُسْطَاطَهُ»، (الفُسْطَاطَه): واتە: خەیمەو چادر، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە چاودێری کردنەکەی بۆ چۆنیەتی نوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ لە شەودا لە گەشتدا بووە، نەک لە ماڵەوە، وە هیچ لە خێزانەکانیشی لەگەڵدا نەبووە، چونکە ئەگەر وانەبووایە، دیارە کە زەید ﷺ وای نەدەکرد.

کە دەڵێ: «فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ»، هەمان ئەو دوو ڕکاتەیە کە لە فەرموودەکەی پێشتردا کە ئەبو هورەیرە ﷺ ڕیوایەتی کردوە، ئاماژەیان پێکراوە کە لەو فەرموودەدا گوتی: «إذا قامَ أحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَلْيَفْتَتِحْ صَلاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ».

کە دەڵێ: «ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، طَوِيلَتَيْنِ، طَوِيلَتَيْنِ»، سێ جار دووبارەی کردۆتەوە، بۆ ئەوەی ڕوون بێ کە دوو ڕکاتەکە زۆر درێژ بوونە، پێغەمبەر ﷺ زۆر لە نوێژدا ڕادەوەستا بۆ قورئان خوێندن، هەروەکو لەمەودوا دێ، ئەو دوو ڕکاتە درێژترین نوێژەکانیەتی لە شەونوێژدا، «ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دَونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ أَوْتَرَ فَذَلِكَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً»، زەید ﷺ باسی ئەوە دەکات کەوا پێغەمبەر




ﷺ سێزدە ڕکات شەونوێژی کردوە کە بە دوو ڕکاتی کورت دەستی پێکردوون، لە شێوەی هەمان گێڕانەوەی ڕابورد کە ئیبنو عەبباس ﷺ باسیکرد، کۆکردنەوەو کۆککردنی ئەو فەرموودانەو فەرموودەکەی عائیشە ﷺ کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزانداو لە غەیری ڕەمەزانیشدا لە یازدە ڕکات زیاتر شەونوێژی نەکردوە، ئەوە ئەو یازدە ڕکاتە دوو ڕکاتە کورت و پوختەکەی سەرەتای دەسپێکی شەونوێژی لەگەڵ هەژمار نەکراوە.

٢٧٠- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ﷺ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﷺ، كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيَزِيدَ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعاً لَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعاً لَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثاً، قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ ﷺ، إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي»[1].

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پرسیاری کردوە لە دایکمان عائیشە ﷺ دەربارەی چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەمەزاندا؟ ئەویش گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزاندا لە یازدە ڕکات نوێژی زیاتر نەدەکرد، چوار ڕکاتی سەرەتا دەکردن (بە هیچ شێوەیە) لە جوانی و ڕێک و پێکیان پرسیارم لێ مەکە (واتە: زۆر زۆر بە جوانی ئەنجامی دەدان)، دوایی (دیسان) چوار ڕکاتی دەکردن (بە هیچ شێوەیە) لە جوانی و ڕێکی و درێژیان پرسیارم لێ مەکە (واتە: زۆر زۆر بە جوانی ئەنجامی دەدان)، ئنجا سێ ڕکاتی دەکردن، جا دایکمان عائیشە ﷺ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا پێش ئەنجامدانی نوێژی ویتر دەخەوی؟ (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرمووم: «ئەی عائیشە! چاوەکانم دەخەون و دڵم ناخەوێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِيَزِيدَ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً»، ئەوە ئەو دوو ڕکاتەی دەستپێکی شەونوێژەکانی نەژماردوە کە دوو ڕکاتی کورتترن

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٤٧، ومسلم: ٧٣٨، والمصنّف في جامعه: ٤٣٩.




لەوانیتر، چونکە بەو قسەیەی ڕوونی دەکاتەوەو دەڵێ: «يُصَلِّي أَرْبَعاً لَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثاً»، کەواتە هیچ تێکگیرانێک نیە لە نێوان ئەو فەرموودەو ئەوەش کە ڕابرد، کەوا پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕکاتی کردوە.

کە دەڵێ: «يُصَلِّي أَرْبَعاً لَا تَسْأَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثاً»، ئەوە چوارەکەی دواتر کورتتر بوونە لە چوار ڕکاتی یەکەم، هەروەکو زەید ﷺ لە گێڕانەوەکەی خۆیدا باسیکردوەو ڕوون کرایەوە، کە گوتی: «وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا».

کە دەڵێ: «إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلَا يَنَامُ قَلْبِي»، واتە: پێغەمبەر ﷺ هەرچەند چاوەکانی نوستبن، بەڵام دڵی بە ئاگاو بێدار بووە.

٢٧١- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، فَإِذَا فَرَغَ مِنْهَا اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ»[1].

واتە: دایکمان عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا یازدە ڕکات نوێژی دەکردن، بە یەک ڕکات کۆتایی دەهێنا بە نوێژەکە، جا کە لە نوێژ تەواو دەبوو، لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشاو درێژ دەبوو».

٢٧٢- حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، نَحْوَهُ (ح) وَحَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، عَنْ مَالِكٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، نَحْوَهُ.

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ ئەم فەرموودەیەیی لە سێ ڕێگاوە هێناوە، کە هەر هەموویان لە مالیکەوە ئەویش لە ئیبنو شیهابەوە ئەویش لە عورووەوە ئەویش لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، ماناکەشی هەمان مانای فەرموودەی پێشووترە، کە دەڵێ: «أَنَّه رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً».

هەندێک لە زانایان شتێکی وردو جوانیان لەو فەرموودانەدا ئاماژە پێکردوە، ئەویش ئەوەیە کەوا ژمارەی ڕکاتەکانی پێغەمبەر ﷺ کە بە شەو ئەنجامی داون یەکسان

(١) أخرجه البخاري: ٩٩٤، ومسلم: ٧٣٦، والمصنّف في جامعه: ٤٤٠.

بوونە بە ژمارەی ئەو ڕکاتانەی کە لە نوێژە فەڕزەکانی ڕۆژدا هەیە، نوێژی نیوەڕۆو عەسرو شێوان.

ئەوە ئەمەیان، هەروەها پێشەوا بوخاریی[١]، وە غەیری ئەویش دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نوێژی شەو دوو ڕکات دوو ڕکاتن، جا ئەگەر یەکێکیان ترسی ئەوەی هەبوو ڕۆژ ببێتەوە، ئەوە ڕکاتێک بکات و ژمارەی ڕکاتەکانی دەبێتە تاک، (واتە: کۆتایی نوێژەکان دەبێتە نوێژی ویتر) ئەو فەرموودەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا ژمارەی ڕکاتەکانی شەونوێژ دیاری کراو نین، هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ لەسەر تەواوترین و کامڵترین ژمارەیان بەردەوام بووە، بەڵام ئەوەی هەیە کە هیچ ڕێگرییەک نیە کە زیاتر لەو ژمارەیە بکرێت.

کە دەڵێ: «فَإِذَا فَرَغَ مِنْهَا اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ»، واتە: کاتێک ویترەکەی دەکرد لەسەر لای ڕاست پاڵیدەدایەوە، ئیبنو حەجەر ﷺ دەڵێ: (ئەو فەرموودەی کەوا موسیلم لە مالیک لە زوهری لە عوروە ﷺ لە عائیشەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ لە دوای ویتر پاڵیداوەتەوەو ڕاکشاوە، هاوڕێکانی زوهری[٢] جیاوازن لەگەڵیدا کە لە عوروە دەگێڕنەوە، چونکە ئەوان دەڵێن: لە دوای بەیانی بووە، ئەوەشیان زانراوترەو جێگیرترە، بۆیە هەر کەسێک پاڵدانەوەکە بە سوننەت نەزانێ ئەوە نەی پێکاوە).

٢٧٣- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ»[٣].

واتە: دایکمان عائیشە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا (جاری وا بوو) نۆ ڕکات نوێژی ئەنجام دەدا».

٢٧٤- حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ غَيْلَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ آدَمَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، عَنِ الْأَعْمَشِ، نَحْوَهُ.

واتە: ئەم فەرموودە بەم سەنەدەش گێڕدراوەتەوە.

---

(١) برقم: ٩٩٠.

(٢) كشُعيبٍ عن الزُّهري - مثلًا - عند البخاري: ٩٩٤.

(٣) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٤٤٣، وابن ماجه في السنن: ١٣٦٠.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ تِسْعَ رَكَعَاتٍ»، ئەوە لەگەڵ ئەو فەرموودانەی کە باسمان کردن هیچ دژیەکیەکی نیە، کە پێغەمبەر ﷺ یازدە ڕکاتی کردوە، یان سێزدە ڕکاتی کردوە، کە لە پێشووتردا ئەوەمان ڕوون کردۆتەوە.

٢٧٥- عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ ﷺ، أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: فَلَمَّا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ ذُو الْمَلَكُوتِ وَالْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ» قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ الْبَقَرَةَ، ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعَهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ وَكَانَ يَقُولُ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ» ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَانَ قِيَامُهُ نَحْواً مِنْ رُكُوعِهِ، وَكَانَ يَقُولُ: «لِرَبِّيَ الْحَمْدُ، لِرَبِّيَ الْحَمْدُ» ثُمَّ سَجَدَ فَكَانَ سُجُودُهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ، وَكَانَ يَقُولُ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى» ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَكَانَ مَا بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ نَحْواً مِنَ السُّجُودِ، وَكَانَ يَقُولُ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي» حَتَّى قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ وَالنِّسَاءَ وَالْمَائِدَةَ أَوِ الْأَنْعَامَ «شُعْبَةُ الَّذِي شَكَّ فِي الْمَائِدَةِ وَالْأَنْعَامِ»[1].

واتە: حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەگێڕێتەوە، کە ئەو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ شەونوێژی کرد، کاتێک (پێغەمبەر ﷺ الله أكبر) نوێژی دابەستاو تەکبیری کرد، پاشان گوتی: «اللَّهُ أَكْبَرُ ذُو الْمَلَكُوتِ وَالْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ»، دوایی (تەواو بوونی فاتیحە) دەستی کرد بە خوێندنی سوورەتی بەقەڕە، پاشان چووە ڕکووع، بە ئەندازەی ڕاوەستانەکەی لە ڕکووع مایەوەو دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، دوایی سەری بەرز کردەوەو ئیدی بە ئەندازەی مانەوەی لە ڕکووعەکەی وەستایەوەو دەیفەرموو: «لِرَبِّيَ الْحَمْدُ، لِرَبِّيَ الْحَمْدُ»، پاشان کڕنووشی بردو بە ئەندازەی مانەوەی لە وەستانەکەی لە کڕنووش مایەوەو دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»، پاشان سەری بەرز کردەوە، ئیدی بە ئەندازەی مانەوەی لە کڕنووشی لە نێوان دوو کڕنووشەکان مایەوەو دەیفەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي»، بەردەوام هەتا سوورەتەکانی بەقەڕەو ئالی عیمران و نیسائو مائیدەو ئەنعامی تێدا خوێند، شوعبە (کە ڕاوی فەرموودەکەیە) گومانی هەبوو (لە خوێندنی، سوورەتەکانی مائیدەو ئەنعام).

---

(١) قَالَ أَبُو عِيسَى: وَأَبُو حَمْزَةَ اسْمُهُ: طَلْحَةُ بْنُ يَزِيْدَ، وَأَبُو جَمْرَةَ الضُّبَعِيُّ اسْمَهُ: نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ، أخرجه أبو داود: ٨٧٤، وفي إسناده مبهمٌ، وهو الرَّجل الَّذي من بني عبس، وجاء في رواية الطَّيالسي ٣٣٢/١ للحديث التَّصريحٌ بأنَّه صِلة بن زُفَر، وهو ثقةٌ؛ فالإسناد صحيحٌ.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «فَلَمَّا دَخَلَ فِي الصَّلَاةِ قَالَ: «اللَّهُ أَكْبَرُ ذُو الْمَلَكُوتِ وَالْجَبَرُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ»، ئا ئەو سیفەتانە هەموویان سیفەتن بۆ بە گەورەگرتنی خوا، چونکە تەنها خوای گەورە خاوەنی هەموو موڵک و شتێکە، هەر خوای گەورە خاوەنی دەسەڵات و گەورەیی و شکۆو مەزنییە، کەواتە: هەر خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێک و دەسەڵاتدارترینە بەسەر هەموو شتێکدا.

«ثُمَّ قَرَأَ الْبَقَرَةَ»، واتە: هەموو سوورەتەکە، «ثُمَّ رَكَعَ رُكُوعَهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ»، ئەوە دەگەیەنێ کە ڕکووعەکەی دوورو درێژ بووەو، بۆ بە گەورەدانان و دانونان بە گەورەیی خوای بەرز ئەوەی دووبارە کردۆتەوەو فەرموویەتی: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، چونکە ڕکووع ئەو شوێنەیە کە داننانە بە گەورەیی و شکۆی خوای پەروەردگار، بە جۆرێکیش ڕکووعەکەی درێژبووە بە نزیکەیی وەستانەکەی بۆ فاتیحەو سوورەتی بەقەرە.

«ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَكَانَ قِيَامُهُ نَحْواً مِنْ رُكُوعِهِ»، واتە: هەڵسانەوەی دوای ڕکووعەکەی و، وەستانەکەی بە ڕێکی، نزیکەی ڕکووعەکەی درێژ بووە ماوەکەی، «وَكَانَ يَقُولُ: «لِرَبِّيَ الْحَمْدُ، لِرَبِّيَ الْحَمْدُ» ثُمَّ سَجَدَ فَكَانَ سُجُودُهُ نَحْواً مِنْ قِيَامِهِ، وَكَانَ يَقُولُ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى، سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»، واتە: بە درێژایی وەستانەکەی لە کڕنووش ئەوەی دووبارە کردۆتەوە.

«ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَكَانَ مَا بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ نَحْواً مِنَ السُّجُودِ، وَكَانَ يَقُولُ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي» حَتَّى قَرَأَ الْبَقَرَةَ وَآلَ عِمْرَانَ وَالنِّسَاءَ وَالْمَائِدَةَ أَوِ الْأَنْعَامَ». واتە: پاشان سەری بەرز کردەوە لە کڕنووش بردنەکە بە ئەندازەی مانەوەی لە کڕنووشەکە مایەوە، دەیفەرموو: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، رَبِّ اغْفِرْ لِي» هەتا سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمران و نیساءو مائیدەو ئەنعامی خوێند.

کە دەڵێ: «شُعْبَةُ الَّذِي شَكَّ فِي الْمَائِدَةِ وَالْأَنْعَامِ»، واتە: دڵنیا نەبووە لە بەینی ئەوەی ئایا لەو دوو سوورەتە کامەیانی خوێندووە.

«قَالَ أَبُو عِيسَى وَأَبُو حَمْزَةَ اسْمُهُ طَلْحَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَأَبُو جَمْرَةَ الضُّبَعِيُّ: اسْمُهُ نَصْرُ بْنُ عِمْرَانَ»، ویستویەتی جیاوازی نێوان وشەی: (أَبِي حَمْزَةَ، أَبِي جَمْرَةَ) باسبکات.

٢٧٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «قَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِآيَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ لَيْلَةً»[1].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٤٤٨.



واتە: دایکمان عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: (جارێک) «پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەونوێژدا تەنیا یەک ئایەتی لە قورئاندا خوێند».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێ کەوا پێغەمبەر ﷺ بە یەک ئایەتی قورئان هەموو شەونوێژەکانی شەوێکی کردوە، لە موسنەدی پێشەوا ئەحمەددا[1] هاتوە لەو فەرموودەی کە ئەبو زەڕ رضي الله عنه دەیگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ شەوێک نوێژی کرد، ئیتر تاکو بەیانی لە نوێژدا بوو ڕکووعو کڕنووشی برد کە تەنها یەک ئایەتی قورئانی تێدا دووبارە دەکردنەوە ئەویش ئەو ئایەتە بوو: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ ﴾ المائدة. (ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن، وە ئەگەر لێشیان خۆشبیت، ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بە دەستەڵات و کاردروست).

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا دروستە یەک دانە ئایەت، یان یەک سوورەت، لە یەک ڕکاتدا، یان لە یەک شەودا دووبارە بکرێتەوە.

(إبن القيم) رحمه الله گوتوویەتی: (ئەگەر خەڵکی بیانزانیبا کەوا قورئان خوێندن بە لێ ووردبوونەوەو تێرامان چۆنەو چی تێدایە، ئەوە لە جیاتی هەموو شتێک خۆیان سەرقاڵی قورئان خوێندن دەکرد بە تێرامانەوە، چونکە ئەگەر قورئان بە تێرامانەوە بخوێننەوە، بە جۆرێک کەوا هەر کات بە لای ئایەتێکدا تێپەڕی و زانی کە چارەسەری دەردی دڵی ئەو دەکات، بە دڵنیایی دووبارەی دەکاتەوە، ئەگەر پێویست بە سەد جاریش بکات، ئەگەر شەوێکیش پێویست بکات، چونکە خوێندنەوەی ئایەتێک بە ووردبوونەوەو تێرامان زۆر باشترە لە خوێندنەوەی هەموو قورئان بەبێ تێرامان، وە سوودبەخشترە بۆ دڵ و باشترو پێویستترە بۆ دەستخستنی ئیمانێکی تەواو، هەروەها بۆ چەشتنی شیرینی قورئان، ئا ئەوە یاساو ڕێسای پێشین بووە، بۆ قورئان خوێندن جار هەبووە یەک ئایەتیان تاکو بەیانی دووبارە کردۆتەوە[2].

---

(١) برقم: ٢١٣٢٨.

(٢) مفتاح دار السّعادة: ١/١٨٧.

٢٧٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: «صَلَّيْتُ لَيْلَةً مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلَمْ يَزَلْ قَائِماً حَتَّى هَمَمْتُ بِأَمْرِ سُوءٍ» قِيلَ لَهُ: وَمَا هَمَمْتَ بِهِ؟ قَالَ: «هَمَمْتُ أَنْ أَقْعُدَ وَأَدَعَ النَّبِيَّ ﷺ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێ: «شەوێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم کرد، هێندە زۆر مایەوە لە ڕاوەستان هەتا گومانی خراپم برد»، پێی گوترا: گومانە خراپەکەت چ بوو، ویستت چ بکەی؟ گوتی: «ویستم واز لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێنم و دابنیشم (واتە: خۆم نوێژەکە تەواو بکەم)».

٢٧٨- حَدَّثَنَا سُفْيَانُ بْنُ وَكِيعٍ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ، عَنِ الْأَعْمَشِ، نَحْوَهُ.

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە باسی ئەوە دەکات کەوا شەونوێژەکانی پێغەمبەر ﷺ چەندە درێژبوونە، نموونەی فەرموودەکانی پێشووترە کە باسکران، فەرموودەکانی: زەیدی کوڕی خالیدو عائیشەو حوزەیفەیە ﷺ.

یەکێک لە سوودەکانی کە لەو فەرموودە وەردەگیرێ ئەوەیە: کە جیاواز بوون لەگەڵ ئیمام لە کارە خراپەکان ئەژمار دەکرێ، بۆیە گوتی: «هَمَمْتُ بِأَمْرِ سُوءٍ».

٢٧٩- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي جَالِساً فَيَقْرَأُ وَهُوَ جَالِسٌ، فَإِذَا بَقِيَ مِنْ قِرَاءَتِهِ قَدْرُ مَا يَكُونُ ثَلَاثِينَ أَوْ أَرْبَعِينَ آيَةً، قَامَ فَقَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ، ثُمَّ رَكَعَ وَسَجَدَ، ثُمَّ صَنَعَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ ذَلِكَ»[2].

واتە: دایکمان عائیشە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ بە دانیشتنەوە نوێژی دەکردو، هەر بە دانیشتنەوەش قوڕئانی دەخوێند، جا ئەگەر بە ئەندازەی سی، یان چل ئایەتی مابووایە هەڵدەستایەوەو بە ڕاوەستانەوە قوڕئانەکەی دەخوێند، دوایی ڕکووع و کڕنووشی دەبرد، ئیدی لە ڕکاتی دووەمیشدا هەمان ئەوەی لە ڕکاتی یەکەم ئەنجامی دابوو، دووبارەی دەکردەوە».

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٣٥، ومسلم: ٧٧٣.

(٢) أخرجه البخاري: ١١١٩، ومسلم: ٧٣١، والمصنّف في جامعه: ٣٧٤.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیەدا ئەوە وەردەگیرێ کەوا پێغەمبەر ﷺ لەبەر ماندوویی، یان نەخۆشی، یان بە تەمەندا چوون بە دانیشتنەوە نوێژی کردوە، وە ئەوەی کە بە پێوە خوێندوویەتی هەمان ئەندازە بووە کە بە دانیشتنەوە دەیخوێند، هەتاکو بە ئەندازەی سی ئایەت، یان چل ئایەتی لە قوڕئان دەخوێند، ئنجا هەڵدەستایەوەو تەواوی دەکرد، پاشان ڕکووع و کڕنووشی دەبرد.

٢٨٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنْ تَطَوُّعِهِ، فَقَالَتْ: «كَانَ يُصَلِّي لَيْلاً طَوِيلاً قَائِماً، وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِداً، فَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ قَائِمٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ قَائِمٌ، وَإِذَا قَرَأَ وَهُوَ جَالِسٌ رَكَعَ وَسَجَدَ وَهُوَ جَالِسٌ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم لە دایکمان عائیشە کرد ، دەربارەی نوێژی سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەویش گوتی: «شەوانی درێژ بە پێوە (ڕاوەستاوی) نوێژی دەکردن و (جاری واش هەبوو)، شەوانی درێژ بە دانیشتنەوە نوێژی دەکردن، ئیدی ئەگەر بە ڕاوەستانەوە بیخوێندبووایە، ئەوە هەر بە ڕاوەستانەوە ڕکووع و کڕنووشی دەبرد، ئەگەر بە دانیشتنەوە بیخوێندبووایە، ئەوە هەر بە دانیشتنەوە ڕکووع و کڕنووشی دەبردن».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

وەڵامی عائیشە  لەو فەرموودەیەدا جیاوازە لەگەڵ فەرموودەی پێشوو، (إبن حجر)  لە (فتح الباري)دا[2] دەڵێ: موسلیم لە عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق لە عائیشەوە  دەربارەی چۆنیەتی نوێژە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: (هەر کات نوێژی دەکردو قوڕئانی تێدا دەخوێند، ئەگەر بە پێوە نوێژی بکردبایە ئەوە بەو جۆرە ڕکووع و کڕنووشی دەبرد، وە ئەگەر بە دانیشتنەوە فاتیحەو قوڕئانی ناو نوێژی بخوێندبایە ئەوە بە دانیشتنەوە ڕکووع و کڕنووشی دەبرد، ئەوە ئەو کاتە بوو کە پێغەمبەر ﷺ بە تەمەندا چووە، بەو جۆرە هەردوو فەرموودەکە یەکانگیر دەبن).

---

(١) أخرجه مسلم: ٧٣٠، والمصنّف في جامعه: ٣٧٥.

(٢) ٥٨٥/٨.

نوێژی کەسی دانیشتوو نیوەی خێری نوێژی بە پێوەی هەیە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ جیایەو نوێژەکەی بە دانیشتنەوە پاداشتی نوێژی بە پێوەی هەیە، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە موسلیم لە صحیحەکەی[1] دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: پێیان گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نوێژی کەسی دانیشتوو پاداشتی نیو هێندەی نوێژی کەسی بە پێوەیە، گوتی: منیش هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دیتم بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات، جا دەستم خستە سەر سەری، ئەویش فەرمووی: چیە ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان گوتووم کە جەنابت فەرمووتە: نوێژی کەسی دانیشتوو پاداشتی نیو هێندەی نوێژی کەسی بە پێوەیە، بەڵام جەنابت بە دانیشتەوە نوێژ دەکەی! فەرمووی: بەڵێ وایە، بەڵام من وەکو هیچ یەکێک لە ئێوە نیم (واتە: پاداشتی من لە هی ئێوە زیاترە).

٢٨١- عَنْ حَفْصَةَ ﷺ، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ قَاعِداً وَيَقْرَأُ بِالسُّورَةِ وَيُرَتِّلُهَا حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا»[2].

واتە: دایکمان حەفصە ﷺ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد، وە سوورەتەکەشی بە تەرتیل دەخوێندو تا وای لێدەهات کە درێژتر دەبوو لە سوورەتێکی دیکەی درێژتر لە خۆی (واتە: بە لە سەرخۆیی و هێمنی دەیخوێندو ئیدی درێژ دەبوویەوە)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي فِي سُبْحَتِهِ قَاعِداً»، مەبەست لە (السُّبْحَة) لێرەدا نوێژی سوننەتە، لەبەر ئەوەش پێی دەگوترێ: (السُّبْحَة)، چونکە تەسبیحی تێدایە، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە بەو ناوهێنانە دەگوترێ: ناوهێنانی شتێک بە بەشێک لە بەشەکانی و، مەبەستیشی پێ کۆی شتەکەیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژە سوننەتەکانی لە کۆتایی ژیانیدا بە دانیشتنەوە دەکردن، کاتێ لاشەی قورس ببوو (بە تەمەندا چوو بوو).

---

(١) برقم: ٧٣٥.

(٢) أخرجه مسلم: ٧٣٣، والمصنِّف في جامعه: ٣٧٣.




کە دەڵێ: «وَيَقْرَأُ بِالسُّورَةِ وَيُرَتِّلُهَا حَتَّى تَكُونَ أَطْوَلَ مِنْ أَطْوَلَ مِنْهَا»، ئەوەش بە هۆی ئەوەی کە قورئانی بە تەرتیل و لەسەرخۆیی و بە تێگەیشتن و لێ ورد بوونەوە دەخوێند، بۆیە هەر کات ئایەتێکی دەخوێندەوە کەوا باسی سزای بکردبایە، پەنای بە خوای گەورە دەگرت، خۆ ئەگەر ئایەتێکیشی بخوێندبایە کەوا تەسبیحی تێدا بووایە، تەسبیح (سبحان الله)ی دەکرد، وە هەر کات بە ئایەتێک تێپەڕیبا کە باسی ڕەحمەت و بەزەیی خوای تێدابایە، ئەوە داوای ڕەحمەتەکەی لە خوا دەکرد، جا بۆیە سوورەتەکە درێژتر دەبۆوە بە هۆی ئەوەوە لە سوورەتێکی درێژتر لە خۆی درێژتر دەبوویەوە.

٢٨٢- عَنْ أَبَا سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَخْبَرَهُ أَنَّ عَائِشَةَ ﵂، أَخْبَرَتْهُ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَمُتْ حَتَّى كَانَ أَكْثَرُ صَلَاتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ».

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان ﵁ دەگێڕێتەوە، دایکمان عائیشە ﵂ هەواڵی پێداوە: «کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی نەکرد، هەتا ژمارەیەکی زۆر لە نوێژەکانی بە دانیشتنەوە ئەنجام دان».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە ئەوەی لێوەردەگیرێ کەوا پێغەمبەر ﷺ زۆربەی نوێژەکانی لە کۆتایی تەمەنیدا بە هۆی بە تەمەنداچوون و قورس بوونیەوە بە دانیشتەوە ئەنجامداون.

٢٨٣- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: «صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ»[1].

واتە: نافیع لە ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پێش نیوەڕۆ دوو ڕکات نوێژ (ی سوننەت)م ئەنجام دا، دوای نوێژی نیوەڕۆش دوو ڕکاتی دیکە، دوای مەغریب دوو ڕکات لە ماڵی خۆیدا، وە دوو ڕکاتیش لە دوای نوێژی عیشا، ئەویش هەر لە ماڵی خۆیدا».

---

(١) أخرجه البخاري: ٩٣٧، ومسلم: ٧٢٩، والمصنّف في جامعه: ٤٢٥.




### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە لە باسی سوننەتی پێش و پاشی نوێژە فەرزەکاندایە، فەرموودەکانیتر دەربارەی شەونوێژەکانی بوون، لێرە بە دوا ئەو فەرموودەی ئیبنو عومەریش دێ کە باسی دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دەکات، ئیتر دەبنە دە ڕکات کە پێیان دەگوترێ: (الرواتب) ئەوانیش سوننەتێکن کەوا پێغەمبەر ﷺ سوور بووە لەسەر جێبەجێکردنیان، پاداشتیشیان لە لای خوای گەورە زۆرو گەورەیە.

لێرە بەدوا لە گێڕانەوەکەی عائیشە ﵂ دێت کە پێغەمبەر ﷺ لە پێش نوێژی نیوەڕۆدا چوار ڕکاتی کردوون، جا هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە دوو حاڵەت بووە، جار هەبووە چوار ڕکاتی کردوە، وەکو عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە، جاریش هەبووە دوو ڕکاتی کردوە وەکو ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە.

٢٨٤- عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄، قَالَ: حَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ حِينَ يَطْلُعُ الْفَجْرُ وَيُنَادِي الْمُنَادِي» قَالَ أَيُّوبُ: «وَأُرَاهُ» قَالَ: خَفِيفَتَيْنِ[1].

واتە: نافیع لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: حەفصە ﵂ بۆی باسکردووم: «کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژی بەیانی دوو ڕکات نوێژی ئەنجام دەداو، بانگکەرێک بانگی دەکرد»، وە ئەییوب (کە یەکێکە لە ڕاویەکان) دەڵێ: پێم وابێ ئیبنو عومەر ﵄ گوتی: دوو ڕکاتی سووکی ئەنجام دەدا (واتە: نوێژەکەی درێژ نەدەکردەوە).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیە ئەوە باسکراوە کە پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژی بەیانی دوو ڕکات نوێژی کردوە، جا بەو دوو ڕکاتە نوێژە سوننەتەکانی لەگەڵ نوێژە فەرزەکان دەبنە دە ڕکات، جا ئیبنو عومەریش ﵄ پێی وابوو کە هەشت ڕکاتن، بەڵام حەفصەی خوشکی ئیبنو عومەر ﵄ هاوکات خێزانی پێغەمبەر ﷺ پێی گوتوە: کەوا دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی کردوە، بۆیە ئیبنو عومەر ﵄ ئاگادار نەبووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە ئەو نوێژەی کردوە.

---

(١) وهو جزءٌ من الحديث الَّذي قبله.




ئەو دوو ڕكاتە بابای مسوڵمان لە دوای بانگی بەیانی و، پێش نوێژی بەیانی دەبێ، دەبێ ئەو كاتە بیانكات، سوننەتیشە زۆر درێژ نەبن، بەڵكو كورت و پوخت بن، وە سوننەتیشە كەوا لە ڕكاتی یەكەمدا ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١﴾ وە لە ڕكاتی دووەمدا ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾ بخوێنرێ.

پێشەوا الترمذي ﷫ لە ئەبو دەرداو ئەبو زەڕ ﵄ دەگێڕێتەوە، كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوای ﷻ دەگێڕێتەوە، كە فەرموویەتی: «ابْنَ آدَمَ، ارْكَعْ لِي مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، أَكْفِكَ آخِرَهُ»[1]. واتە: ئەی نەوەی ئادەم! لە سەرەتای ڕۆژدا چوار ڕكات نوێژ بۆ من بكە، دەستەبەری كۆتایی ڕۆژەكەت بۆ دەكەم، (إبن القيم) ﷫ لە (زاد المعاد) دا[2] دەڵێ: گوێم لە ئیبنو تەیمیە بوو دەیگوت: من پێموایە مەبەست لە چوار ڕكاتەكە، نوێژی بەیانی و دوو ڕكاتی پێش نوێژی بەیانییە.

بۆیە ئەو كەسەی خوای ﷻ ڕێزی لێ دەگرێ و لە سەرەتای ڕۆژدا نوێژی بەیانی دەكات و، دوو ڕكات سوننەتیش لە پێش نوێژەكەدا دەكات، ئەوە بۆ ئەو ڕۆژە بەسیەتی، ئا ئەوە پاداشتی ئەوەندە گەورەیە كە نابێ مرۆڤی ژیر لە دەستیان بدات.

٢٨٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: «حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ: رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﵄: وَحَدَّثَتْنِي حَفْصَةُ بِرَكْعَتَيِ الْغَدَاةِ، وَلَمْ أَكُنْ أَرَاهُمَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ»[3].

واتە: ئیبنو عومەر ﵄ دەڵێ: «هەشت ڕكات نوێژ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێر بووم، ئەوانیش دوو ڕكات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕكات پاش نیوەڕۆ، دوو ڕكات پاش مەغریب، دوو ڕكات پاش عیشا، جا ئیبنو عومەر ﵄ گوتوویەتی: حەفصە ﵂ باسی دوو ڕكات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی بۆ كردم، بەڵام من نەمبینیبوو پێغەمبەر ﷺ ئەنجامیان بدات».

---

(١) (ح ٤٧٥).

(٢) ٣٤٨/١.

(٣) انظر: (ح ٢٨٣).

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

فەرموودەکەی ئیبنو عومەر ﷺ هەردوو فەرموودەکەی پێشووتری کۆکردۆتەوە. کە دەڵێ: «وَلَمْ أَكُنْ أَرَاهُمَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ»، واتە: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەماڵەوە نوێژەکەی دەکرد.

٢٨٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ، عَنْ صَلَاةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: «كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ الْعِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ الْفَجْرِ ثِنْتَيْنِ»[1].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم لە دایکمان عائیشە کرد ﷺ دەربارەی نوێژی (سوننەتی) پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتی: «دوو ڕکات نوێژی پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکات پاشی نیوەڕۆ ئەنجامی دەدان، پاش مەغریب دوو ڕکات، پاش عیشا دوو ڕکات، هەروەها لە پێش نوێژی بەیانیش دوو ڕکاتی ئەنجام دەدا».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو گێڕانەوەدا دە ڕکات باسکراوە، لە گێڕانەوەیەکەی تردا کە لە (صحيح مسلم)دا[2] هاتوە، کە دەڵێ: {كَانَ يُصَلِّي فِي بَيْتِي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعًا، ثُمَّ يَخْرُجُ فَيُصَلِّي بِالنَّاسِ، ثُمَّ يَدْخُلُ فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ}. واتە: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەی مندا پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی دەکرد، پاشان دەرچوو نوێژی بۆ خەڵک دەکرد، پاشان دەهاتەوە دوو ڕکاتی دەکرد. ئەوەیان لە عائیشە ﷺ وەرگیراوەو زانراوە، کەواتە: کۆی نوێژەکان دەبنە دوازدە ڕکات، بەڵام دوو ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆ لە گێڕانەوەکەی ئیبنو عومەردا ﷺ هاتوەو جێگیر بووە کە ڕابرد، هەر کەسەیان باسی ئەوەی کردوە کە بینیویەتی، کەواتە: دەکرێ بۆ دوو حاڵەتی جیاواز بووبێ، جار هەبووە چوار ڕکاتی کردوەو جار هەبووە دوو ڕکاتی کردوە، یان دەکرێ بۆ دوو شوێنی جیاواز بووبێ، واتە: ئەگەر لە ماڵەوەی کردبێ ئەوە چوار ڕکاتی کردوون، ئەگەر لە مزگەوتیشدا سوننەتەکەی کردبێ دوو ڕکاتی کردوون.

---

(١) انظر: (ح ٢٨٠).

(٢) برقم: ٧٣٠.



لە (صحیح مسلم)دا[1] لە گێڕانەوەی ئوممو حەبیبەدا ﵂ هاتوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي لِلَّهِ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً ؛ تَطَوُّعًا غَيْرَ فَرِيضَةٍ إِلَّا بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ. أَوْ إِلَّا بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ}. واتە: هەر بەندەیەکی مسوڵمان لە هەر ڕۆژێکدا دوازدە ڕکات نوێژ بکات جگە لە نوێژە فەڕزەکان، ئەوە خوای گەورەماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکات.

ئەو فەرموودەیە لەگەڵ گێڕانەوەکەی عائیشەدا ﵂ یەکدەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە موسلیم ڕیوایەتی کردوە، جا بۆیە پێویستە مسوڵمان سووربێ لەسەر کردنی ئەو دوازدە ڕکاتە بۆ ئەوەی ئەو پاداشتە گەورەو زۆرەی دەست بکەوێ.

٢٨٧- عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ يَقُولُ: سَأَلْنَا عَلِيّاً، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ النَّهَارِ، فَقَالَ: «إِنَّكُمْ لَا تُطِيقُونَ ذَلِكَ قَالَ: فَقُلْنَا: مِنْ أَطَاقَ ذَلِكَ مِنَّا صَلَّى، فَقَالَ: كَانَ إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَاهُنَا كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَاهُنَا عِنْدَ الْعَصْرِ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، وَإِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَهُنَا كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَاهُنَا عِنْدَ الظُّهْرِ صَلَّى أَرْبَعاً، وَيُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعاً، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعَاً، يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلَائِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ وَالنَّبِيِّينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ»[2].

واتە: عاصیمی کوڕی زەمرە دەڵێ: پرسیارمان لە عەلی ﵁ کرد دەربارەی نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژدا؟ ئەویش گوتی: «ئێوە ناتوانن ئەوە ئەنجام بدەن، ئێمەش گوتمان: هەر یەکێک لە ئێمە توانای هەبوو ئەم نوێژە ئەنجام دەدات، ئیدی (عەلی ﵁) گوتی: ئەگەر خۆر لێرەدا وەک ئەم شێوە بووایە، ئەوە لە کاتی عەسردا دوو ڕکات نوێژی دەکرد، وە کاتێکیش خۆر لێرەدا بەم شێوە بووایە، کاتی (نوێژی) نیوەڕۆ ئەوە چوار ڕکاتی دەکردن (فەڕز بوون)، وە پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاتی دەکردو، دوای نیوەڕۆش چوار ڕکاتی دەکرد، وە پێش نوێژی عەسر چوار ڕکاتی دەکرد، نێوان دوو ڕکات دوو ڕکات ماوە هەبوو، لێکی جیادەکردنەوە، بە سەلام دانەوەو سڵاو کردن لە فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەران و شوێنکەوتووانیان لە بڕواداران و مسوڵمانان».

---

(١) برقم: ٧٢٨.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٥٩٩.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «سَأَلْنَا عَلِيّاً، عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ النَّهَارِ»، ئەو پرسیارکردنەو هاوشێوەکانی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەوا چەندە پێشینی ئێمە سوور بوونە لەسەر زانین و ناسینی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، بۆ خاتری ئەوەی کەوا شوێنی پێغەمبەر ﷺ بکەون.

کە دەڵێ: «إِنَّكُمْ لَا تُطِيقُونَ ذَلِكَ»، واتە: ناتوانن بەردەوام بن، وەکو پێغەمبەر ﷺ بە خشوع و تێرو تەواوی جێبەجێی بکەن و، پارێزگاری لێبکەن.

کە دەڵێ: «فَقُلْنَا: مَنْ أَطَاقَ ذَلِكَ مِنَّا صَلَّى»، واتە: حەزو ئارەزوو و پێخۆشبوونەکە هەیە، جا هەر یەکێکمان لە توانایدا هەبوو، ئەوە جێ بەجێی دەکەین و خێرو پاداشتەکەی بە دەست دێنین.

کە دەڵێ: «إِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَاهُنَا»، ئاماژەی بۆ ڕۆژهەڵات کردوە، «كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَاهُنَا»، واتە: لە لای ڕۆژئاواوە، «عِنْدَ الْعَصْرِ»، واتە: کاتێک ڕۆژ لە لای ڕۆژهەڵات، وەکو ئەو کاتەیە کە ڕۆژ لە لای ڕۆژئاوایە لە کاتی عەسردا، کە ئەو کاتە مەبەستی پێ کاتی نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوە.

«صَلَّى رَكْعَتَيْنِ»، واتە: نوێژی چێشتەنگاو.

کە دەڵێ: «وَإِذَا كَانَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَهُنَا»، واتە: لە لای ڕۆژهەڵاتەوە، «كَهَيْئَتِهَا مِنْ هَاهُنَا عِنْدَ الظُّهْرِ»، واتە: پێش ئەوەی خۆر بەرەو ڕۆژئاوا لابدات، «صَلَّى أَرْبَعاً»، مەبەست بەو کاتە لە لای ئەوانەی کە ڕاڤەکاری فەرموودەن دەڵێن: مەبەستی کاتی نوێژی ئەوانەیە کە چاکەکارو تۆبەکارو گوێڕایەڵن، کاتەکەش ئەو دەمەیە کەوا خاک و خۆڵ و بەرد گەرم دەبن، (سمی پێی بێچووە حوشتر داغ دەکات)، ئەوەش هەموو کاتی نوێژی چێشتەنگاوە.

کە دەڵێ: «وَيُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعاً»، واتە: لە دوای بانگی نیوەڕۆو پێش قامەت چوار ڕکاتی کردوە، ئەوەش چوار ڕکاتی پەیوەست بە نوێژی نیوەڕۆیە، ئەو گێڕانەوەیە لەگەڵ گێڕانەوەکەی عائیشەو ئومـمو حەبیبەدا ﵄ یەکدەگرێتەوە کە لەمەوپێش باسکران.




که دەڵێ: «وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ»، واته: له دوای نوێژی نیوەڕۆ دوو ڕکات که دەڵێ: «وَقَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعاً»، واته: له پێش نوێژی عەسردا چوار ڕکاتی دەکرد، بەڵام ئەوەیان له سوننەته (ڕەواتب) پەیوەست به نوێژه فەرزەکان نیه، بەڵام بێگومان دەربارەی فەزڵ و گەورەیی ئەو نوێژه پێشەوا ئەحمەد[1] ڕیوایەتی کردوه، غەیری ئەویش له ئیبنو عومەرەوه ﷺ کەوا پێغەمبەر فەرموویەتی: «رَحِمَ اللَّهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعًا». واته: (ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کەوا پێش نوێژی عەسر چوار ڕکات دەکات).

که دەڵێ: «يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ عَلَى الْمَلَائِكَةِ الْمُقَرَّبِينَ وَالنَّبِيِّينَ، وَمَنْ تَبِعَهُمْ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ»، دەگونجێ مەبەستی ئەو سەلامەبێ که له تەحیاتدا هاتوە: «السَّلامُ عليكَ أيُّها النَّبيُّ ورحمةُ اللَّهِ وبرَكاتُهُ، السَّلامُ علينا وعلى عبادِ اللَّهِ الصَّالحينَ»، که ئەوەش فریشتەکان و چاکەکاران دەگرێتەوه له بەندەکانی خوا.

دەشگونجێ مەبەستی لەو سەلام کردنە، ئەو سەلامدانەوەی کۆتایی نوێژ بێ، چونکه به (الله أكبر)ی نوێژدابەستن نوێژ دادەمەزرێ و، به سەلامدانەوه کۆتایی پێدێت، واته: بەلای ڕاست و چەپدا سەلامی دەدایەوەو که ئەو مانایەش ڕوون و ڕاشکاوترەو دەقەکەش زیاتر لێی نزیکه، چونکه دەڵێ: «يَفْصِلُ بَيْنَ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ بِالتَّسْلِيمِ»، وه لەبەر ئەو فەرموودەی پێشووتریش که دەفەرموێ: «صَلَاةِ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى»، له گێڕانەوەیەکی تردا «والنَّهَارِ»، واته: له نێوان هەردوو ڕکاتێک سەلامی داوەتەوه.

---

(١) المسند: ٥٩٨٠.




نوێژی چێشتەنگاو پێگەیەکی گەورەو مەزنی هەیە، یەکێکە لەو نوێژە سوننەتانەی کەوا پێغەمبەر ﷺ زۆر خەڵکی بۆ هانداوەو خەڵکی هەڵناوە بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نوێژەو پاداشتەکەشی ڕوون کردۆتەوە.

لەو فەرموودانەی کە دەربارەی گرنگی ئەو نوێژە هاتوون:

لە صەحیحی بوخاریدا[1] هاتوە، ئەبو هورەیرە ﷺ گوتوویەتی: {أَوْصَانِي خَلِيلِي بِثَلَاثٍ لَا أَدَعُهُنَّ حَتَّى أَمُوتَ : صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَصَلَاةِ الضُّحَى، وَنَوْمٍ عَلَى وِتْرٍ}. واتە: پێغەمبەری خۆشەویستم ﷺ بە سێ شت ڕایسپاردم کە هەرگیز وازیان لێ ناهێنم، هەتاکو دەمرم: سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوون لە هەر مانگێکدا، وە نوێژی چێشتەنگاو، وە نوستن دوای ئەوەی کە نوێژی ویترم کرد.

لەو گێڕانەوەیەدا دەردەکەوێ و بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا نوێژی چێشتەنگاو پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی پێکردوە.

هەروەها لە (صحيح موسلم)دا[2] هاتوە لە ئەبو زەڕەوە ﷺ کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلامَى مِنْ أَحدِكُمْ صَدَقَةٌ: فكُلُّ تَسْبِيحةٍ صدقةٌ، وكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وكُلُّ تكْبِيرةٍ صدقةٌ، وَأَمْرٌ بِالمعْرُوفِ صَدقةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ المُنكَرِ صدقةٌ، وَيُجْزِيءُ مِنْ ذلكَ ركْعتَانِ يَرْكَعُهُما منَ الضُّحَى}. واتە: هەموو ڕۆژێک پێویستە کە هەر یەکێکتان بۆ سەلامەتی هەر جومگەیەکی جەستەتان چاکەیەک بکات، جا هەر (سبحان الله)ێک چاکەیەکەو هەر (الحمد لله)ێک چاکەیەکە، هەر (لا إله إلا الله)ێک چاکەیەکە، وە هەر (الله أكبر)ێک چاکەیەکە، وە فەرمان بە چاکە چاکەیەکەو نەهی کردن لە خراپە چاکەیە، وە لە بری هەموو ئەوانەش دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو بە بری هەمووی دەکەوێ)، کەواتە: دوو ڕکاتی نوێژی چێشتەنگاو بە بری هەموو ئەو چاکانە دەکەوێت کە لە مسوڵمان داوا دەکرێت کە لە بری ئەندامەکانی بیکات، بۆ هەر ڕۆژێک کە خۆری تێدا هەڵدێت، لە مانای فەرموودەکە ئەوە دەردەکەوێت کەوا لێکدان و پێکەوەلکانی هەر یەکێک لەو ئەندامانەو سەلامەتیان یەکێکە لە بەخششە

---

(١) برقم: ١١٧٨.

(٢) برقم: ٧٢٠.




هەرە گەورەکانی خوای گەورە بەسەر بەندەکانیەوە، بۆیە بۆ هەر ئێسقانێکی جەستە پێویستە مرۆڤ چاکەیەک بکات، وەکو سوپاسگوزاریەک بۆ ئەو بەخششانە، جا کاتێک کە مرۆڤ نوێژ دەکات جوڵەی ئەو ئەندامانە لە کاتی نوێژدا مانای ملکەچیە بۆ خوای پەروەردگارو بە بری ئەو چاکەیە دەکەوێت کە پێویستە بکرێت وەکو سوپاسگوزاریەک بۆ پێدان و سەلامەتی ئەو ئەندامانە.

هەروەها ئەوەی کە لە صەحیحی موسیلمدا[1] هاتوە کە لە زەیدی کوڕی ئەرقەم دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {صَلَاةُ الْأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ}. واتە: نوێژی گوێڕایەڵ و چاکەکاران و تۆبەکاران ئەو کاتەیە کەوا زەوی و خاک و بەرد گەرم دەبێت و سمو پێی بێچووە وشتر داغ دەکات.

ئەو کاتەی باشترین کاتە بۆ بەجێگەیاندنی ئەو نوێژە، ئەو کاتەیە کەوا خۆر زۆر گەرمدا دێ، کە بێچووە وشتر هەست بە گەرمی دەکات، هەرچەندە کاتی نوێژەکە هەر لە سەرەتایی ڕۆژهەڵاتنەوە و دەرکەوتنی بە چارەگە سەعاتێک، بەردەوام دەبێت کاتەکەی درێژ دەبێتەوە هەتاکو پێش ئەو کاتەی کە ڕۆژ بەرەو ڕۆژئاوا لادەدات، بە دە خولەک پێش کاتی نیوەڕۆ، ئیتر ئەو ماوەیە هەمووی کاتی نوێژەکەیەو کاتەکەی فراوانە.

ئیبنو تەیمییە رحمه الله دوای ئەوەی کەوا چەند فەرموودەیەکی صەحیح دەربارەی نوێژی چێشتەنگاو دێنێت، دواتر دەڵێ: هەموو ئەو فەرموودە صەحیحانەو هاووێنەکانی، ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە نوێژی کاتی چێشتەنگاو خۆشەویست و ڕێزدارە[2].

٢٨٨- عَنْ يَزِيدَ الرِّشْكِ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاذَةَ، قَالَتْ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رضي الله عنها: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَتْ: «نَعَمْ، أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللَّهُ عز وجل»[3].

واتە: یەزیدی ڕیشک دەڵێ: بیستم لە موعازەوە دەیگوت: بە عائیشەم رضي الله عنها گوت: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژ چێشتەنگاوی دەکرد؟ گوتی: «بەڵێ چوار ڕکاتی دەکردن، وە چەندی خوای عز وجل ویستبای زیادی دەکرد».

---

(١) برقم: ٧٤٨.

(٢) مجموع الفتاوى: ٢٨٤/٢٢.

(٣) أخرجه مسلم: ٧١٩.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێ کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی چێشتەنگاو چوار ڕکات نوێژی کردوە، وە چەندەش خوای گەورە پێی خۆش بووبێ لێی زیادکردوە لە ژمارەی، بۆیە ئەگەر مسوڵمان بۆی گونجا دوو ڕکات، یان چوار ڕکات، یان شەش ڕکات، یان هەشت ڕکات بکات، ئەوە کێشەیەکی نیە، هەموو ئەو ژمارانە سوننەتن، گوتراوە: کە لای زۆری هەشت ڕکاتە، گوتراویشە: دوازدە ڕکاتە، گوتراویشە: بۆ زۆریەکەی هیچ سنوورێک نیە چەندی مرۆڤ بۆی کرا، ئاساییەو سوننەتە.

٢٨٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الضُّحَى سِتَّ رَكَعَاتٍ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ شەش ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی ئەنجام دەدا».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە شەش ڕکاتی کردوە، بەڵام هیچ تێکگیرانێک نیە لەگەڵ ئەوەی کە پێشتر هاتوە، لە دایکی ئیماندارانەوە، چونکە گوتی: چەندی خوای گەورە پێی خوشبووایە لێی زیاد دەکرد، کەواتە: پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکاتی کردوەو، شەش ڕکاتیشی کردوەو زیاتریش، چەندی خوا ویستی لێ بووبێ.

٢٩٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: مَا أَخْبَرَنِي أَحَدٌ، أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى إِلَّا أُمُّ هَانِئٍ ﷺ، فَإِنَّهَا حَدَّثَتْ «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ بَيْتَهَا يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَاغْتَسَلَ فَسَبَّحَ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ مَا رَأَيْتُهُ ﷺ صَلَّى صَلَاةً قَطُّ أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ»[2].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێ: هیچ کەسێک هەواڵی پێنەداوم کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی ئەنجام داوە جگە لە ئوممو هانئ ﷺ، ئەو گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئازاد کردنی مەککەدا تەشریفی چۆتە ماڵی ئەوو خۆی شۆردوەو هەشت ڕکات سوننەتی کردوە، (وە گوتوویەتی) هەرگیز

---

(١) في إسناده حكيم بن معاوية، وهو مستورٌ، وزياد بن عبيد الله، وهو مقبولٌ، لكن رواه الطبراني في الأوسط: ١٢٧٦ عن عمر بن خالد بن عباد عن زياد بن عبيد الله بن الربيع عن الحسن عن أنس ﷺ.

(٢) أخرجه البخاري: ١١٠٣، ومسلم: ٣٣٦، والمصنّف في جامعه: ٤٧٤.




نەمبینیوە نوێژێکی دیکەی ئاوا بە سووک و کورتی کردبێ، بەڵام ئەوەندە هەبوو کە ڕکووع و کڕنووشەکانی بە تەواوی دەبرد».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «فَسَبَّحَ ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ»، واتە: هەشت ڕکات نوێژی کردوە، ئەوەش ناوهێنانی شتێکە بە بەشێک لەو شتە، بە نوێژ دەگوترێ: (سُبْحَة)، وە دەشگوترێ: (سجدة)، چونکە (سبحان الله) یان کڕنووش بەشێکن لە نوێژ.

ئەو ژمارەش لە گێڕانەوەکەی عائیشەدا ﵂ جێگەی دەبێتەوە، چونکە گوتی: (ویزید ماشاء الله).

کە دەڵێ: «مَا رَأَيْتُهُ ﷺ صَلَّى صَلَاةً قَطُّ أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ»، واتە: بە کورت و پوختی کردوونی بەڵام ڕکووع و کڕنووشەکەی بە جۆرێک بردوە، کە لە ڕکووع و کڕنووشەکەدا تەواو ئارامی گرتوە، ئەو نوێژکردنەی جیاواز بووە لە شەونوێژەکانی، چونکە نوێژی شەوی درێژ دەکردەوە، هەروەکو پێشوتر باسمان کرد.

٢٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى؟ قَالَتْ: «لَا إِلاَّ أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم کرد لە دایکمان عائیشە ﵂ ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد؟ ئەویش گوتی: «نەخێر، تەنها ئەگەر لە گەشت گەڕابایەوە ئەنجامی دەدا».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «لَا إِلاَّ أَنْ يَجِيءَ مِنْ مَغِيبِهِ»، واتە: نەخێر تەنها ئەگەر لە گەشت گەڕابایەوە.

ئەو فەرموودەیە لە ڕواڵەتدا پێچەوانەی ئەو فەرموودانەیە کە دەفەرموون: پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کردوە، بۆیە زانایان دەڵێن: ئەو فەرموودانەی دەربارەی نوێژی چێشتەنگاو هاتوونە سێ بەشن:

---

(١) أخرجه مسلم: ٧١٧.




**بەشی یەکەم:** ئەو فەرموودانەن کە بە ڕەهایی دەیسەلمێنن پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کردوە، وەکو قسەکەی عائیشە رضي الله عنها کە لێی دەپرسن: ئایا پێغەمبەر ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کردوە، ئەوەیش گوتی: بەڵێ، چوار ڕکاتی کردوەو، چەندی خوا ویستبای زیاتری دەکرد.

**بەشی دووەم:** ئەو فەرموودانەن کە تایبەتی دەکەن بە گەڕانەوەی لە گەشت، وەک دەڵێ: نەخێر، تەنها کاتێک کە لە گەشتدا دەگەڕایەوە.

**بەشی سێیەم:** ئەوەیە کە بە ڕەهایی نەفی کردوە، وەکو دەڵێن: (هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی نەکردوە، لێرەدا نەفی ئەوەی کردوە کە هەرگیز نەیبینوە پێغەمبەر ﷺ ئەو نوێژە بکات[1]، ئەگەرنا نەفی ئەوەی نەکردوە کە نوێژی چێشتەنگاو لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگر بووە، چونکە لە ڕێگای گێڕانەوە بۆیان گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو نوێژەی کردوە، بەڵام بۆ خۆی بە چاوی خۆی نەیبینوە).

ئەوەش بەڵگەیە کەوا پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو نوێژی چێشتەنگاوە بەردەوام نەبووە، هەر لەبەر ئەوەشە کە عائیشە رضي الله عنها نەیبینوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەبو هورەیرەی رضي الله عنه هانداوە لەسەری بەردەوام بێ.

بۆیە ئیبنو تەیمییە رحمه الله دەڵێ: (ئایا نوێژی چێشتەنگاو لەسەری بەردەوام بی باشترە، هەروەکو لە فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە رضي الله عنه هاتوە؟ یان باشترە بەردەوام نەبی لەسەری، وەکو شوێنکەوتن و چاوکردن لە پێغەمبەر ﷺ؟ ئەوەیان زانایان ڕا جیان لەسەری، باشتر وایە کە بگوترێ: هەر کەسێک لەسەر شەونوێژ بەردەوام بوو، ئەوە پێویست ناکات لەسەر نوێژی چێشتەنگاو بەردەوام بێ، هەروەکو پێغەمبەریش ﷺ بەو جۆرەی کردوە، وە ئەگەر کەسێک بۆ شەونوێژ هەڵنەستاو نەیکرد، ئەوە با نوێژی چێشتەنگاو لە بری شەونوێژەکانی ئەنجام بدات)[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٢٨.

(٢) مجموع الفتاوى: ٢٢/٢٨٤.





٢٩٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى حَتَّى نَقُولَ: لَا يَدَعُهَا، وَيَدَعُهَا حَتَّى نَقُولَ: لَا يُصَلِّيهَا»[(١)].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ (هێندە زۆر) نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، هەتا دەمانگوت: ڕەنگە هەرگیز وازی لێ نەهێنێ، جاری واش هەبوو (هێندە زۆر) وازی لێ دەهێنا، دەمانگوت: لەوانەیە ئیدی ئەم نوێژە نەکات».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کەوا پێغەمبەر ﷺ لەسەر کردنی نوێژی چێشتەنگاو بەردەوام نەبووە، بەڵکو جار جار کردوویەتی و، جار جاریش نەیکردوە.

٢٩٣- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُدْمِنُ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ عِنْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُدْمِنُ هَذِهِ الْأَرْبَعَ رَكَعَاتٍ عِنْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ؟ فَقَالَ: «إِنَّ أَبْوَابَ السَّمَاءِ تُفْتَحُ عِنْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ فَلَا تُرْتَجُ حَتَّى تُصَلَّى الظُّهْرُ، فَأُحِبُّ أَنْ يَصْعَدَ لِي فِي تِلْكَ السَّاعَةِ خَيْرٌ» قُلْتُ: أَفِي كُلِّهِنَّ قِرَاءَةٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ». قُلْتُ: هَلْ فِيهِنَّ تَسْلِيمٌ فَاصِلٌ؟ قَالَ: «لَا»[(٢)].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاریی ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو لە ئەنجامدانی چوار ڕکات نوێژ لە کاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان بەردەوام ئەم چوار ڕکات نوێژە دەکەی؟ فەرمووی: «کاتی لادان و ترازانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوەو داناخرێن تاکو نوێژی نیوەڕۆ ئەنجام دەدرێ، پێم خۆشە لەو کاتەدا چاکەیەکم بەرز بکرێتەوە»، گوتم: ئایا لە هەموو ڕکاتەکاندا قورئان دەخوێنرێ، فەرمووی: «بەڵێ»، گوتم: ئایا لە نێوان ڕکاتەکاندا سڵاودانەوەیەک نیە لێکیان جیابکاتەوە؟ فەرمووی: «نەخێر».

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٤٤٧، وفي إسناده محمَّد بن ربيعة، وهو صدوقٌ، وفضيل ابن مرزوق، وهو صدوقٌ يهم، وعطيَّة العوفي، وهو ضعيفٌ يدلّس، فالحديث ضعيف الإسناد.

(٢) أخرجه أحمد في المسند: ٢٣٥٣٢. وأخرجه ابن ماجه: ١١٦٨، وفي إسناده عبيدة بن مُعتبٍ، وهو ضعيفٌ، ويشهد له الحديث الآتي بعده، إلاَّ ذكر عدم تسليمٍ فاصلٍ تفرَّد به عبيدة ولم يتابع عليه.

٢٩٤- عَنْ أَبِي أَيُوبَ الأَنْصَارِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ.

واتە: هەمان فەرمووده به سەنەدێکی دیکه گێردراوەتەوە.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

که دەڵێ: «إِنَّكَ تُدْمِنُ هَذِهِ الْأَرْبَعَ رَكَعَاتٍ عِنْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ؟»، واته: ئایا تۆ بەردەوام دەبی لەسەر ئەو چوار ڕکاتەی که له کاتی خۆر لاداندا دەکرێن؟ مەبەست له کاتی لادانی خۆر مانای ئەو فەرموودەیه که عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ دەیگێڕێتەوە که لەمەودوا دێ: (پێغەمبەر ﷺ چوار ڕکات نوێژی دەکرد، دوای ئەوەی که خۆر لایدەدا، پێش نوێژی نیوەڕۆ) ئەو چوار ڕکاتە سوننەتە ڕاتبەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆیە، ئەو فەرموودەو ئەوانەی دواتریش تاکو کۆتایی ئەو بابەتە، ئەوە پەیوەستن بە سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ نەک نوێژی چێشتەنگاو.

که دەفەرموێ: «إِنَّ أَبْوَابَ السَّمَاءِ تُفْتَحُ عِنْدَ زَوَالِ الشَّمْسِ فَلَا تُرْتَجُ حَتَّى تُصَلَّى الظُّهْرُ»، واته: دەرگاکانی ئاسمان لەو کاتەدا داناخرێن، بەڵکو بە کراوەیی دەمێننەوە، هەتاکو نوێژی نیوەڕۆ ئەنجامدەدرێ، لەو فەرموودە هاندان و هەڵنانی تێدایە، که چوار ڕکاتی نوێژی سوننەت له دوای بانگی نیوەڕۆ بکرێ، پێش قامەتکردن بۆ نوێژی نیوەڕۆ، «فَأُحِبُّ أَنْ يَصْعَدَ لِي فِي تِلْكَ السَّاعَةِ خَيْرٌ»، نوێژ گەورەترین و باشترین چاکەیە، که دەڵێ: «قُلْتُ: أَفِي كُلِّهِنَّ قِرَاءَةٌ؟»، ئایا له هەر ڕکاتێکدا خوێندنی فاتیحەو دوای فاتیحەی تێدایە؟ «قَالَ: نَعَمْ»، واته: فاتیحەو دوای فاتیحەش دەخوێنرێ، «قُلْتُ: هَلْ فِيهِنَّ تَسْلِيمٌ فَاصِلٌ؟ قَالَ: لَا»، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی که دەکرێ بێ سەلامدانەوە له بەینی دوو ڕکاتدا بکرێ بەسەر یەکەوە، بەڵام باشتر وایە کەوا دوای دوو ڕکات سەلامدانەوە هەبێ، ئەوجار دوو ڕکاتەکەیتر بکرێ، لەبەر گشتگیری ئەو فەرموودەیە که دەفەرموێ: {صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى}[1].

٢٩٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي أَرْبَعاً بَعْدَ أَنْ تَزُولَ الشَّمْسُ قَبْلَ الظُّهْرِ وَقَالَ: «إِنَّهَا سَاعَةٌ تُفْتَحُ فِيهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، فَأُحِبُّ أَنْ يَصْعَدَ لِي فِيهَا عَمَلٌ صَالِحٌ»[2].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٥٩٧ وغيره، قال ابن بازٍ ﷺ في مجموع فتاويه: ٣٤/١٢: بإسنادٍ صحيحٍ.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٤٧٨.




واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ڕکات نوێژی دەکردن دوای لادان و ترازانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، پێش ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ، وە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئەمە کاتێکە، دەرگاکانی ئاسمانی تێدا دەکرێنەوە، منیش پێم خۆشە لەو کاتەدا کردەوەی چاکم بەرز ببێتەوە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەو فەرموودەیەی عەبدوڵڵای کوڕی سائیب ﷺ بە هەمان مانای فەرموودەکانی ئەبو ئەیوبی ئەنصارییە ﷺ کە ڕابرد، وە بە ڕوونی دیارە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو چوار ڕکاتەی کە پێغەمبەر ﷺ لەسەریان بەردەوام بووە، چوار ڕکاتی پێش نوێژی نیوەڕۆ بوون، هەروەها هاندانیشی تێدایە بۆ کردنی ئەو چوار ڕکاتەی پێش نوێژی نیوەڕۆ.

٢٩٦- عَنْ عَاصِمِ بْنِ ضَمْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ، أَنَّهُ: «كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ أَرْبَعاً، وَذَكَرَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّيهَا عِنْدَ الزَّوَالِ وَيَمُدُّ فِيهَا».

واتە: عاصیمی کوڕی زەمرە دەگێڕێتەوە: «عەلی ﷺ چوار ڕکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، وە باسی کرد کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم چوار ڕکاتەی ئەنجام دەدان و درێژی دەکردنەوە، لە کاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەو فەرموودەیە بە درێژی لە بابەتی پێشوتر باسکرا، کە دەڵێ: «وَيَـمُدُّ فِيهَا»، واتە: قورئان خوێندنی تێدا درێژە پێدەداو ڕکووع و کڕنووشەکانیشی درێژ بوون.

نوێژی سوننەت لە ماڵەوە ئەنجامبدرێ باشترە، نەک لە مزگەوت، با مزگەوتەکەش یەکێک بێ لەو سێ مزگەوتانەی کەوا پاداشتەکەیان چەند بەرامبەرە، نوێژ لە ماڵەوە وەکو ژیان وایە بۆ ماڵەکە، چونکە هەر ماڵێک نوێژی تێدا نەکرێت ماڵێکی مردووە، بۆیە کە سوننەتەو باشترە بابای مسوڵمان نوێژە سوننەتەکانی لە ماڵەوە بکات، بەڵام نوێژە فەرزەکانی واجب و پێویستە لە مزگەوت بە کۆمەڵ بکرێن.

یەکێک لە سوودەکانی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە ئەوەیە، منداڵ دەجوڵێنێ چ کچ بێ، یان کوڕ، بۆ ئەوەی کە حەزی بۆ نوێژکردن بچێ، هەروەها شەیتان دووردەخاتەوە، وە بە هۆی نوێژەوە ئارامیی و ئاسوودەیی و خێرو فەڕ ڕوو دەکاتە ئەو ماڵە، چەندان بەرهەمی دیکەشی هەیە.

٢٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّلَاةِ فِي بَيْتِي وَالصَّلَاةِ فِي الْمَسْجِدِ قَالَ: «قَدْ تَرَى مَا أَقْرَبَ بَيْتِي مِنَ الْمَسْجِدِ، فَلَأَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِي أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُصَلِّيَ فِي الْمَسْجِدِ إِلَا أَنْ تَكُونَ صَلَاةً مَكْتُوبَةً»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەعد ﷺ دەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی نوێژ کردن لە ماڵی خۆم و لە مزگەوت؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «تۆ دەبینی کە ماڵم چەندە نزیکە لە مزگەوت، کەچی ئەگەر لە ماڵی خۆم نوێژ بکەم زۆرم پێ خۆشترو باشترە لەوەی نوێژ لە مزگەوت بکەم، جگە لە نوێژە فەرزەکان دەبێ لە مزگەوت بکرێن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو بابەتەدا تەنها یەک فەرموودەی هێناوە، ئەویش ئەو فەرموودەیە کە عەبدوڵڵای کوڕی سەعد ﷺ دەیگێڕێتەوە دەربارەی گەورەیی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە بۆ پیاو،

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٣٣، وأبو داود في سننه: ٣١١، وابن ماجه في سننه: ٦٥١، وفي إسناده معاوية بن صالح، وهو صدوقٌ له أوهامٌ، وشيخه العلاء ابن الحارث، صدوقٌ اختلط، لكنَّ الحديث صحيحٌ لوجود ما يشهد له؛ ومن ذلكم ما جاء في صحيح البخاري: ٧٣١ من حديث زيد بن ثابتٍ، عن النَّبيِّ ﷺ أنَّه قال: «صَلُّوا أَيُّهَا النَّاسُ فِي بُيُوتِكُمْ ؛ فَإِنَّ أَفْضَلَ الصَّلَاةِ صَلَاةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ»، وما جاء في الصَّحيحين البخاري: ٤٣٢، ومسلم: ٧٧٧ عن ابن عمر ﷺ أنَّ النَّبيَّ ﷺ قال: «اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلَاتِكُمْ وَلَا تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا»، وفي الباب أحاديث أخرى سوى ما ذُكر.



هەتا ئەگەر ئەو کەسە ماڵەکەی، یان دیواری خانووەکەی بە دیواری مزگەوتەوە لکابێ، هەرچەند چوونە مزگەوتیشی بۆ قورس نەبێ، ئەوە نوێژە سوننەتەکە لە ماڵەوە بکات بۆی باشترەو خێرترە.

بەڵام نوێژە فەرزەکان دەبێ لە مزگەوت بکرێن باشترە، بەڵکو پێویستە پیاوان لە مزگەوت نوێژە فەرزەکان بکەن، کە لەوبارەوە بەڵگەی زۆر لە قورئان و فەرموودەدا هاتوە.




دانەر ﷺ، ئەو بابەتەی تایبەت کردوە بە باسکردنی ڕۆژووەکانی پێغەمبەر ﷺ جا ڕۆژووی واجب بێ، یان ڕۆژووی سوننەت، ئیتر ئەو ڕۆژووانەی کە هەفتانە دووبارە دەبنەوە وەکو ڕۆژووی دووشەممەو پێنج شەممە، یان ئەوانەی مانگانە دووبارە دەبنەوە، کە سێ ڕۆژ لە هەر مانگێکە، یان ئەوانەی ساڵانە دووبارە دەبنەوە، وەکو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام، هەروەها ڕۆژووی هەندێک ڕۆژ لە ساڵ، وەکو ڕۆژووی ڕۆژی عاشوڕاو نموونەی ئەویش.

**الصَّوْم**: لە زاراوەدا بە مانای لێگرتنەوەو وازهێنان و خۆگرتنەوە دێ، لە شەرعیشدا واتە: خۆگرتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی کەوا ڕۆژوو دەشکێنن، لە بەرەبەیانەوە تاکو خۆرئاوا بوون.

ڕۆژوو قوتابخانەیەکی پەروەردەی ئیمانییە، گرنگە بۆ پەروەردەی ئیمانی مرۆڤ، خەڵکی بڕوادار بە هۆی ڕۆژووەوە چەند دەرس و ئامۆژگاری گەورە وەردەگرن.

لەبەر ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾﴾ البقرة. (ڕۆژووتان لەسەر نووسراوەو فەرزکراوە، هەروەک چۆن فەرزکراوە لەسەر ئەو ئۆممەتانەی لە پێش ئێوەدا بوون، بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن لە خودا بترسن).

کەواتە: ڕۆژوو پەرستشێکی گەورەو شکۆدارە، بە جۆرێک کەوا پارێزکاری لە دڵی مرۆڤدا دەچێنێ، وە پەیوەندی نێوان بەندەو خوای گەورە بە زیندوویی ڕادەگرێ، هەروەها نەفسی مرۆڤ لە گوناهو تاوان و قەدەغەکراوەکان دووردەخاتەوە، هەروەها قەڵغانێکە بۆ خاوەنەکەی.

ڕۆژوو دوو جۆرە:

**یەکەم**: خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە ڕۆژوو دەشکێنن، وەک: خواردن و خواردنەوەو ئارەزووی داوێن، ئا ئەوەیان لەسەر بەندەکان فەرزو پێویستە، لە بەیانیەوە تاکو خۆرئاوا بوون لە هەموو ڕۆژەکەدا.



**دووەم:** خۆگرتنەوە لە شتە قەدەغەکراوەکان و تاوانەکان، ئەوەشیان لە هەموو کاتدا پێویستەو فەرزە، بۆیە هەر ئەندامێک پێویستە بەڕۆژوو بێ، بۆیە گوێ پێویستە بەڕۆژوو بێ بەوەی کە واز لە بیستنی شتی حەرام بێنێ، زمان دەبێ واز لە تاوان بێنێ و دووربکەوێتەوە لە درۆو غەیبەت و دووزمانی و گاڵتەکردن و ئەو جۆرە شتانە، ئەندامەکانی تریش بە هەمان شێوە.

٢٩٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂، عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَتْ: «كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَفْطَرَ»، قَالَتْ: «وَمَا صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهْراً كَامِلاً مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ إِلَّا رَمَضَانَ»[1].

عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێ: پرسیارم کرد لە دایکمان عائیشە ﵂ دەربارەی ڕۆژووگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئایا چۆن بووە؟)، گوتی: «جاری وابوو هێندە ڕۆژووی دەگرت دەمانگوت نایشکێنێ و هەر بەڕۆژوو دەبێ، جاری واش هەبوو هێندە ڕۆژووی نەدەگرت، تا دەمانگوت ئیدی وازی هێناوە»، جا دەڵێ: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ مەدینە (کۆچی کرد بۆ مەدینە)، «هیچ مانگێکی پڕو تەواو ڕۆژووی نەگرت، جگە لە ڕەمەزان».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ صَامَ»، واتە: ئەوەندە بەردەوام دەبوو لە ڕۆژووگرتن بە جۆرێک کە بە یەکترمان دەگوت، یان بە خۆمان دەگوت: تازە تەواو بەردەوام بەڕۆژوو دەبێ.

کە دەڵێ: «وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَفْطَرَ»، واتە: جار هەبووە چەند ڕۆژێک دەڕۆیشت بەڕۆژوو نەدەبوو، هەتا وای لێدەهات دەمانگوت: ئیتر لێرە بەدوا بەڕۆژوو نابێ.

کە دەڵێ: «وَمَا صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَهْراً كَامِلاً مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ إِلَّا رَمَضَانَ»، لە کاتێکدا ئاماژەی بەوەدا کە پێغەمبەر ﷺ زۆر بە ڕۆژوو دەبوو، لە سەرەتای فەرموودەکەدا، ئیتر لەوە هۆشیاریدا کە لەگەڵ ئەوەی زۆریش بەڕۆژوو بووە، لە هەندێک لە مانگەکاندا

---

(١) أخرجه مسلم: ١١٥٦، والمصنّف في جامعه: ٧٦٨.



وەکو موحەڕەم و شەعبان، بەڵام هەرگیز مانگێک بەسەر یەکەوە بەڕۆژوو نەبووە، جگە لە مانگی ڕەمەزان.

کە دەڵێ: «مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ»، بۆیە بە تایبەت باسی ئەو کاتەی کردوە، چونکە ئەو کات و سەردەمەیە کەوا حوکم و بڕیارە شەرعیەکان یەک لە دوای یەک دادەبەزین کە باسی ڕۆژووش لەو حوکمانەیە.

٢٩٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ صَوْمِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «كَانَ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ حَتَّى نَرَى أَنْ لَا يُرِيدَ أَنْ يُفْطِرَ مِنْهُ، وَيُفْطِرُ مِنْهُ حَتَّى نَرَى أَنْ لَا يُرِيدَ أَنْ يَصُومَ مِنْهُ شَيْئاً. وَكُنْتَ لَا تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنَ اللَّيْلِ مُصَلِّياً إِلَّا رَأَيْتَهُ مُصَلِّياً، وَلَا نَائِماً إِلَّا رَأَيْتَهُ نَائِماً»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەربارەی ڕۆژووگرتنی پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکراوە، جا گوتوویەتی: «جاری وابوو لە مانگەکەدا هێندە ڕۆژووی دەگرتن تا وا دەهاتە پێش چاو نایەوێ هیچی لێ بشکێنێ، وە هەندێک جاریش هێندە زۆر ڕۆژووی نەدەگرت تا دەمانگوت: نایەوێ هیچ ڕۆژووی تێدا بگرێ، بە شەویش چاوەڕێ نەبووی نوێژ بکات، کەچی دەتبینی وا نوێژ دەکات، وە جاری واش بوو چاوەڕێت نەدەکرد خەوتبێ کەچی دەتبینی وا خەوتوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەیە ناوەندگیریی و میانڕەوییە لە کارو فەرماندا، نە بەردەوام بە ڕۆژوو بوون، نە بەردەوام بە ڕۆژوو نەبوون، بەڵکو مامناوەندی لە هەردوولادا، سەرەتای مانگ دەستی دەکرد بە ڕۆژوو گرتن، هەتا وا گومانیان دەبرد کە ئیتر ڕۆژوو ناشکێنێ و، هەموو مانگەکە بەڕوژوو دەبێ، جاریش هەبووە دەستی کردوە بە نەگرتنی ڕۆژوو هەتا وایانزانیوە کە ئیتر هەتاکو مانگ تەواو دەبێ بەڕۆژوو نابێتەوە.

کە دەڵێ: «وَكُنْتَ لَا تَشَاءُ أَنْ تَرَاهُ مِنَ اللَّيْلِ مُصَلِّياً إِلَّا رَأَيْتَهُ مُصَلِّياً، وَلَا نَائِماً إِلَّا رَأَيْتَهُ نَائِماً»، واتە: لە بەسەربردنی شەوەکانیشی مامناوەند بووە، بەشی نوستنی هێشتۆتەوەو بەشی نوێژیشی لێداوە، نە زێدەڕۆیی و نە کەمتەرخەمی نەکردوە، ئەنەس ﷺ لێرەدا تەنها

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٤١، والمصنّف في جامعه: ٧٦٨.



پرسیاری ڕۆژووی پێغەمبەری ﷺ لێکراوە، بەڵام وەڵامی پرسیارەکەی بە زیادەوە داوەتەوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر سەخاوەتمەندی لە بڵاوکردنەوەو پێدانی زانست و زانیاری.

٣٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يُفْطِرَ مِنْهُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ مَا يُرِيدُ أَنْ يَصُومَ مِنْهُ، وَمَا صَامَ شَهْراً كَامِلًا مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ إِلَّا رَمَضَانَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ هێندە ڕۆژووی دەگرتن تا (وای لێدەهات) دەمانگوت: نایەوێ ڕۆژووەکە بشکێنێ، (جاری واش هەبوو) هێندە ڕۆژووی نەدەگرت تا (وای لێدەهات) دەمانگوت: نایەوێ هیچ ڕۆژێک ڕۆژوو بگرێ، جا ئیدی لەو کاتەوە کە هات بۆ مەدینە هیچ مانگێک نەبوو بە پڕو تەواوی تێیدا ڕۆژوو بگرێ، جگە لە (مانگی) ڕەمەزان».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەی ئیبنو عەبباس ﷺ بە مانای ئەو دوو فەرموودەی پێشووترە کە عائیشەو ئەنەس گێڕایانەوە.

٣٠١- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ إِلَا شَعْبَانَ وَرَمَضَانَ»[2].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ، دەڵێ: «جگە لە شەعبان و ڕەمەزان، ئیدی نەمبینیوە پێغەمبەر ﷺ دوو مانگی تەواو لەسەر یەک و بە دوای یەکدا ڕۆژوو بگرێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە ئەوە دەدات بە دەستەوە کەوا هەرگیز پێغەمبەری ﷺ نەبینیوە دوو مانگ بە دوای یەکدا بەڕۆژوو بێت، جگە لە شەعبان و ڕەمەزان.

---

(١) أخرجه البخاري: ١٩٧١، ومسلم: ١١٥٧.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٧٣٦، وأبو داود في سننه: ٢٣٣٦، وابن ماجه في سننه: ١٦٤٨.
قَالَ أَبُو عِيسَى: هَذَا إِسْنَادٌ صَحِيحٌ وَهَكَذَا قَالَ: عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. وَرَوَى هَذَا الْحَدِيثَ غَيْرُ وَاحِدٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، وَيُحْتَمَلُ أَنْ يَكُونَ أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَدْ رَوَى الْحَدِيثَ، عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ ﷺ جَمِيعاً، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

جا بە ڕۆژووبوونی لە مانگی ڕەمەزاندا تەواوی مانگەکە ئەوە ڕوون و دیارە، بەڵام لە شەعباندا ئەوەی کە زانراوەو سەلمێنراوە زۆرینەی مانگەکە بەڕۆژوو بووە، نەک هەموو مانگەکە بەتەواوی، هەروەکو ڕابورد لە فەرموودەی عائیشەو ئیبنو عەبباس ﷺ کەوا پێغەمبەر ﷺ جگە لە ڕەمەزان هیچ مانگێکی دیکە هەموو مانگەکە بەڕۆژوو نەبووە، لەو کاتەوەی کە تەشریفی هێناوە بۆ مەدینە، بۆیە فەرموودەکەی ئوممو سەلەمە ﷺ بەو جۆرە مانا دەکرێ، کاتێک دەڵێ: دوو مانگ لەسەر یەک بە ڕۆژوو دەبوو، واتە: بەشی زۆری شەعبان بەڕۆژوو دەبوو، نەک هەموو مانگەکە لەگەڵ مانگی ڕەمەزان بە تەواوی، ئەو فەرموودەی دواتر زیاتر ڕوونی دەکاتەوە.

٣٠٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ لِلَّهِ فِي شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلَّا قَلِيلاً بَلْ كَانَ يَصُومُهُ كُلَّهُ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ، دەڵێ: «پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە لە مانگێکدا هێندە زۆر بە ڕۆژوو بێ بۆ خوا کە زیاتر بێ لە ڕۆژووگرتنی لە مانگی شەعباندا، مانگی شەعبان ڕۆژووەکانی دەگرتن، مەگەر چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ، (وەک ئەوەی بڵێ) بەڵکو لە هەموو ڕۆژەکانیدا، ڕۆژووی دەگرتن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷺ ئەو فەرموودەی لە کتێبی خۆیدا (الجامع) هێناوە، پاشان گوتوویەتی: لە ئیبنو موبارەک دەگێڕنەوە، کە دەربارەی ئەو فەرموودەیە گوتوویەتی: لە زمانی عەرەبیدا دروستە ئەگەر کەسێک زۆربەی مانگ بەڕۆژوو بێ بگوترێ: مانگەکە هەمووی بەڕۆژوو بووە، هەروەها دەگوترێ: فڵان کەس هەموو شەوەکەی شەونوێژی کردوە، بۆی هەیە کە شەو بە هەندێک شتی دیکەوە سەرقاڵ بووبێ، دیارە کە ئیبنو موبارەک هەردوو فەرموودەکەی بینیوە، بۆیە دەڵێ: مانای ئەو فەرموودەیە ئەوەیە کە زۆربەی مانگەکە بەڕۆژوو بووە.

---

(١) أخرجه البخاري: ١٩٦٩، ومسلم: ١١٥٦، والمصنِّف في جامعه: ٧٣٧.




پێشەوا موسلیم ﷺ لە کتێبەکەی خۆیدا (صحیح مسلم)[١] دەقی فەرموودەکە باشتر ڕوونده‌کاتەوە، لە عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: {كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلا قَلِيلاً}. جا بەو دەقەی کە دەڵێ: کەمێک نەبێ، هەندێکی لە مانگەکە هەڵاواردوە، کە لە دوای ئەوەی کە دەڵێ: هەموو شەعبان بەڕۆژوو دەبوو، بۆیە پێشەوا نەوەوی ﷺ لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێ: بەشی دووەم ڕاڤەی بەشی یەکەم[٢] دەکات، کاتێک دەڵێ: «إِلاَّ قَلِيلاً»، ئەوە تەفسیرە بۆ ئەو بەشەی کە دەڵێ: «يَصُومُ شَعْبَانَ إِلاَّ قَلِيلاً».

٣٠٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنْ غُرَّةِ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، وَقَلَّمَا كَانَ يُفْطِرُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا ﷺ گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەتای گشت مانگێکدا سێ ڕۆژان بە ڕۆژوو دەبوو، کەمجار هەبوو لە ڕۆژی هەینیدا ڕۆژوو نەگرێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە هاندانی تێدایە لەسەر بەڕۆژووبوون لە هەر مانگێکدا سێ ڕۆژ، ئەو جۆرە ڕۆژووگرتنە فەزڵ و خێرەکەی گەورەو زۆرە، لە موسنەدی پێشەوا ئەحمەد[٤] و غەیری ئەویشدا هاتوە، کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {صَوْمُ شَهْرِ الصَّبْرِ، وَصَوْمُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ صَوْمُ الدَّهْرِ}. واتە: ڕۆژووی مانگی ئارامگرتن (ڕەمەزان)، وە ڕۆژووی سێ ڕۆژ لە هەر مانگێکدا بەرانبەرە بە ڕۆژووی تەواوی ساڵ، چونکە چاکە یەک بە دەیە.

جا ئەو سێ ڕۆژە ئەگەر پێتخۆش بوو لە سەرەتای مانگەوە بەڕۆژووبە، یان لە ناوەڕاستەکەی، یان لە کۆتاییەکەی، بەسەر یەکەوە، یان بە جیا جیا، لە (صحیح مسلم)دا[٥] هاتوە کە لە موعازەی عەدەویە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کردوە لە

---

(١) برقم: ١١٥٦.

(٢) المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجّاج: ٣٧/٨.

(٣) أخرجه أبو داود: ٢٤٥٠، والنسائي: ٢٣٦٨، وابن ماجه: ١٧٢٥.

(٤) برقم: ٧٥٧٧.

(٥) برقم: ١١٦٠




عائیشه ﵂: {أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَقُلْتُ لَهَا: مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِي مِنْ أَيِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ يَصُومُ}. واته: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ له هەموو مانگێک سێ ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو؟ گوتوویەتی: بەڵێ، منیش پێم گوت: له کام ڕۆژی مانگدا بەڕۆژوو دەبوو؟ گوتی: گوێی پێ نەدەدا ئاخۆ چ ڕۆژێکە.

که دەڵێ: «يَصُومُ مِنْ غُرَّةِ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ»، واته: له سەرەتای مانگەکەدا، ئەوەش بە مانای ئەوەی که هەندێک جار سەرەتای مانگ بە ڕۆژوو بووە، نەک هەموو مانگەکان له سەرەتاکەی بە ڕۆژوو بووبێ.

که دەڵێ: «وَقَلَّمَا كَانَ يُفْطِرُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ»، واته: پێغەمبەر ﷺ زۆر بەڕۆژوو نەدەبوو، ئەگەرنا بە مانای ئەوە نیە کە تەنها ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو دەبوو، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە بوخاری[1] ﷺ دەیگێڕێتەوەو غەیری ئەویش لە ئەبو هورەیرە ﵁ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لَا يَصُومَنَّ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِلَّا يَوْمًا قَبْلَهُ أَوْ بَعْدَهُ}. واته: هیچ یەکێکتان تەنها ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو نەبێ، مەگەر ڕۆژێک پێش هەینی، یان ڕۆژێک دوای هەینی بەڕۆژوو بێ. لێرەدا بە دواوە دێت کە پێغەمبەر ﷺ بە دوای ڕۆژی دووشەممەو پێنج شەممەوە بووەو بە ڕۆژوو بووە تیایاندا.

٣٠٤- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَحَرَّى صَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ»[2].

واته: عائیشه ﵂، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ له ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممە دەگەڕا (واته: چاوەڕێی هاتنی ئەم دوو ڕۆژەی دەکرد) بۆ ئەوەی تێیاندا بە ڕۆژوو ببێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەر ﷺ زۆر سوور بووە لەسەر بەڕۆژوو بوونی ئەو دوو ڕۆژە: دووشەممەو پێنج شەممە، هۆکارو حیکمەتەکەشی لە فەرموودەی داهاتوودا باسکراوە.

---

(١) برقم: ١٩٨٥.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٧٤٥، وابن ماجه في السنن: ١٦٤٩.




٣٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «تُعْرَضُ الْأَعْمَالُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «لە ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممەدا کردەوەکان (بەرز دەکرێنەوە بۆ لای خواو) دەخرێنەڕوو، پێم خۆشە کاتێ کردەوەکانم پێشانی خوا دەدرێن، (تێیاندا) بە ڕۆژووبم».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

واتە: پێغەمبەر ﷺ لەو دوو ڕۆژەدا بەڕۆژوو بووە، چونکە کردەوەکانی مرۆڤ لەو دوو ڕۆژەدا بۆ لای خوای گەورە بەرز دەکرێنەوەو ڕادەنوێنرێن، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی خۆش بووە کاتێک کردەوەکانی ڕادەنوێنرێن بە ڕۆژوو بووبێ، جا کردەوەی شەو پێش کردەوەی ڕۆژ بەرز دەکرێتەوە، وە کردەوەی ڕۆژ پێش کردەوەی شەو بەرز دەکرێتەوە، کردەوەکانی هەفتەش لە دوو ڕۆژی دووشەممەو پێنج شەممەدا ڕادەنوێنرێن، کردەوەکانی ساڵیش لە مانگی شەعباندا ڕادەنوێنرێن.

لە (صحیح مسلم)دا[2] هاتوە کەوا پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ڕۆژووی دووشەممە پرسیاری لێکراوە، ئەویش فەرموویەتی: لەو ڕۆژەدا لە دایک بووم، ئەوەش حیکمەتێکی دیکەیە بۆ ڕۆژووگرتن لە ڕۆژانی دووشەممە.

٣٠٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصُومُ مِنَ الشَّهْرِ السَّبْتَ وَالْأَحَدَ وَالِاثْنَيْنَ، وَمِنَ الشَّهْرِ الْآخَرِ الثُّلَاثَاءَ وَالْأَرْبَعَاءَ وَالْخَمِيسَ»[3].

واتە: عائیشە ﵂، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ لە مانگێکدا ڕۆژەکانی: شەممەو یەک شەممەو دوو شەممە ڕۆژووی دەگرت، لە مانگی داهاتووشدا ڕۆژەکانی: سێ شەممەو چوار شەممەو پێنج شەممە ڕۆژووی دەگرت».

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٧٤٧، وفي سنده محمَّد بن رفاعة، وهو مقبولٌ، لكن للحديث شاهدٌ يتقوّى به من حديث أسامة بن زيدٍ ﵄ وينظر الإرواء: ٩٤٨ و ٩٤٩.

(٢) برقم: ١١٦٢.

(٣) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٧٤٦، ثمَّ قال: وروى عبد الرَّحمن بن مهدي هذا الحديث عن سفيان ولم يرفعه، وقال الحافظ في الفتح: وهو أشبه أي: عدم رفع الحديث أشبه من رفعه.



### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ لە هەر مانگێک سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبوو، جا ئەگەر ئەو ڕۆژانە (أيَّام البيض) واتە: سێزدەو چواردەو پازدەی مانگی (کۆچی) بووایە بە نموونە، ئەوە لە مانگێک بۆ مانگێکی دیکە جیاواز دەبێ، لە مانگێکدا لەگەڵ شەممەو یەک شەممەو دووشەممە ڕێکدەکەوێ، لە مانگێکی دیکە جیاواز دەبێ، لە مانگێکی دیکەدا لەگەڵ سێ شەممەو چوارشەممەو پێنجشەممە ڕێکدەکەوێ، ئیتر بەو جۆرە.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر هاتوو ڕۆژی شەممە لەگەڵ (أيَّام البيض)، یان ڕۆژووی عەرەفە، یان ڕۆژوی عاشورا ڕێککەوت، یان لەگەڵیدا ڕۆژی هەینیش بە ڕۆژوو بوو، ئەوە هیچ کێشەیەکی نیە، نەهی کردنەکە تەنها بۆ ئەو کەسەیە کەوا ڕۆژی شەممە تایبەت بکات بۆ بەڕۆژوو بوون، (إبن تيمية) ﷺ، گوتوویەتی: لەسەر ئەو بنەمایە کە فەرموویەتی: بەڕۆژوو مەبن لە ڕۆژی شەممەدا، ئەوە مانای وایە کە ڕۆژی شەممە بە مەبەست و ئامانج مەگرن بۆ بەڕۆژوو بوون، مەگەر ڕۆژەکە فەرز بێ، ئەو کات کێشەی نیە.

**٣٠٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ فِي شَهْرٍ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ فِي شَعْبَانَ»(١).**

واتە: عائیشە ﷺ، دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مانگێک هێندەی شەعبان ڕۆژووی زۆر نەدەگرتن (دوای ڕەمەزان، مانگێک کە زۆر ڕۆژووی تێدا گرتوە، مانگی شەعبان بووە)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە فەرموودەی پێشووتر ڕوون دەکاتەوە، کە گوتی: پێغەمبەر ﷺ هەموو شەعبان بەڕۆژوو دەبوو، تەنها کەمێک لە ڕۆژەکانی نەبێ.

---

(١) انظر: (ح ٣٠٢).



٣٠٨- عَنْ يَزِيدَ الرِّشْكِ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاذَةَ، قَالَتْ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ؟ قَالَتْ: «نَعَمْ». قُلْتُ: مِنْ أَيِّهِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: «كَانَ لَا يُبَالِي مِنْ أَيِّهِ صَامَ»[(١)].

واتە: یەزیدی ڕیشکی دەڵێ: بیستم موعازە دەیگوت: پرسیارم کردوە لە عائیشە رضي الله عنها ئایا پێغەمبەری خوا لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژان ڕۆژووی دەگرتن؟ گوتی: «بەڵێ»، گوتم: لە کام ڕۆژدا ڕۆژووی دەگرت؟ گوتی: «لای گرنگ نەبوو، لە هەر ڕۆژێکدا بووایە (گرنگ سێ ڕۆژان ڕۆژووی دەگرتن لە مانگەکەدا)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەوا ئەگەر بەندەی مسوڵمان سێ ڕۆژی سوننەت لە هەر مانگێکدا بگرێ، ئەوە هیچ کێشەی نیە کە ئایا لە کوێی مانگەکەدا بەڕۆژوو دەبێ، سەرەتاکەی بێت، یان ناوەڕاستەکەی، یان کۆتاییەکەی، بۆیە گوتی: «كَانَ لَا يُبَالِي مِنْ أَيِّهِ صَامَ».

٣٠٩- عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: «كَانَ عَاشُورَاءُ يَوْماً تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا افْتُرِضَ رَمَضَانُ كَانَ رَمَضَانُ هُوَ الْفَرِيضَةُ وَتُرِكَ عَاشُورَاءُ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ»[(٢)].

واتە: عائیشە رضي الله عنها، دەڵێ: «عاشوڕا ڕۆژێک بوو کە قوڕەیشییەکان لە سەردەمی نەفامیدا تێیدا ڕۆژوویان دەگرت، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆژووی دەگرت لەم ڕۆژەدا، ئیدی کە هاتە مەدینەش هەر بەڕۆژوو دەبوو لەم ڕۆژەدا، وە فەرمانی (بە مسوڵمانان) کرد بەڕۆژووبن لەم ڕۆژەدا، جا کە ڕەمەزان فەڕز کرا، ئیدی ڕەمەزان بوو بە فەڕزو، ڕۆژووی عاشوڕا وازی لێ هێنرا، هەر کەس بیەوێ ڕۆژووەکە دەگرێ، وە هەر کەسێکیش بیەوێ بە ڕۆژوو نابێت و وازی لێ دێنێ».

---

(١) أخرجه مسلم: ١١٦٠، والمصنِّف في جامعه: ٧٦٣.

قَالَ أَبُو عِيسَى: يَزِيدُ الرِّشْكُ هُوَ يَزِيدُ الضُّبَعِيُّ الْبَصْرِيُّ وَهُوَ ثِقَةٌ رَوَى عَنْهُ شُعْبَةُ، وَعَبْدُ الْوَارِثِ بْنُ سَعِيدٍ، وَحَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ، وَإِسْمَاعِيلُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ، وَغَيْرُ وَاحِدٍ مِنَ الأَئِمَّةِ، وَهُوَ يَزِيدُ الْقَاسِمُ وَيُقَالُ: الْقَسَّامُ، وَالرِّشْكُ بِلُغَةِ أَهْلِ الْبَصْرَةِ هُوَ الْقَسَّامُ.

(٢) أخرجه البخاري: ١٥٩٢، ومسلم: ١١٢٥، والمصنِّف في جامعه: ٧٥٣.




**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ڕۆژی عاشوڕا دەیەمین ڕۆژی مانگی موحەڕڕەمە، ڕۆژووی ئەو ڕۆژە بۆ سوپاسگوزاری خوای گەورەیە، چونکە خوای گەورە لەو ڕۆژەدا مووساو گەلەکەی لە دەستی فیرعەون و دارو دەستەکەی ڕزگار کرد، بۆیە بەڕۆژووبوونی مووسا لەو ڕۆژەدا وەکو سوپاسگوزارییە بۆ خوای خاوەن دەسەڵات، هەروەها پێغەمبەر ﷺ و بڕوادارانیش بۆ سوپاسگوزاریی لەو ڕۆژەدا بە ڕۆژوو دەبوون.

کە دەڵێ: «كَانَ عَاشُورَاءُ يَوْماً تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ»، دەگونجێ کە ڕۆژووی ڕۆژی عاشوڕا بەشێک بووبێ لە دینی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ، کە دیارە لە سەردەمی نەفامیشدا ئەو بەشە گۆڕانی بەسەردا نەهاتوە، «وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُهُ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ صَامَهُ»، واتە: بەردەوام بووە لەسەر گرتنی ئەو ڕۆژووە لەو ڕۆژەدا، «وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ»، لە صەحیحی بوخاری[1] و غەیری ئەویشدا هاتوە، لە ئیبنو عەبباسەوە رضي الله عنهما کە ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە، دەڵێ: {قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ فَرَأَى الْيَهُودَ تَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قَالُوا: هَذَا يَوْمٌ صَالِحٌ؛ هَذَا يَوْمٌ نَجَّى اللَّهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ فَصَامَهُ مُوسَى. قَالَ: «فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ». فَصَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ}. واتە: پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە، بینی جوولەکەکان لە ڕۆژی عاشوڕا بەڕۆژوو دەبن، فەرمووی: «ئەوە مەسەلە چیە (لەو ڕۆژەدا بەڕۆژوون؟)» گوتیان: ئەو ڕۆژە لە ڕۆژە باشەکانە، ئەو ڕۆژەیە کە خوای گەورە نەوەی ئیسرائیلی ڕزگار کرد لە دەستی دوژمنەکەیان، بۆیە مووسا ﷺ تێیدا بەڕۆژوو بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «من لە ئێوە لە پێشترم بۆ مووسا، بۆیە هەم خۆی بەڕۆژوو بوو، هەم فەرمانیشی کرد بە ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژە».

کە دەڵێ: «وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە ڕۆژووی عاشوڕا واجب بووە، چونکە فەرمان کردن بە شتێک ئەوەی لێ دەفامرێنرێ کە ئەو فەرمان پێکراوە واجبە، «فَلَمَّا افْتُرِضَ رَمَضَانُ كَانَ رَمَضَانُ هُوَ الْفَرِيضَةُ وَتُرِكَ عَاشُورَاءُ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ»، ئیتر لە دوای فەڕزبوونی مانگی ڕەمەزان، ڕۆژووی ڕۆژی عاشوڕا بوو بە سوننەت، واجب نەما.

---

(١) برقم: ٢٠٠٤.




سوننەتە بۆ بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عاشورا، ڕۆژی نۆیەمی مانگیشی لەگەڵ بەڕۆژوو بیت، ئەوەش بۆ ئەوەی لەگەڵ جوولەکەکان جیاوازی هەبێ (ئەوان هەر ڕۆژی دەیەم بەڕۆژوو دەبن)، هەروەها لە (صحيح مسلم)دا[1] هاتوە کە ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ، لَأَصُومَنَّ التَّاسِعَ}. واتە: ئەگەر (لە ژیاندا) بمێنم بۆ ساڵی داهاتوو، ئەوە بێگومان ڕۆژی نۆیەمیش بەڕۆژوو دەبم.

پاشان ئەو ڕووداوانەی کەوا بە قەدەری خوای گەورە لەو ڕۆژەدا ڕوویانداوە، ئەوەیە کە حوسەین (کە لەگەڵ براکەی حەسەن لە گەورە گەنجانی بەهەشتن و خاوەنی ڕێزو پلەوپایەی خۆشەویستین لە دڵی بڕواداران کە هیچ گومان لەوەدا نیە) خوای گەورە قەدەری وابووە، کەوا لەو ڕۆژەدا حوسەین بە ستەم شەهید بکرێ، ئیتر لەسەر ئەم ڕووداوە دوو بیدعە سەریانهەڵداوە کە هیچ بنەمایەکی دینیان نیە:

**یەکەم**: ئەوەیە کە ڕۆژی عاشورا کراوەتە ڕۆژی تازیە بارییی و ماتەم گێڕان بە بەهانەی شەهیدبوونەکەی بە ستەم، هەروەها کۆبوونەوەی خەڵک بۆ شین و لەخۆدان و بەرۆک دادڕین و دووعاکردن وەکو سەردەمی نەفامیی.

**دووەم**: ڕێک پێچەوانەی یەکەم، ئەویش ئەوەیە کە ڕۆژی عاشورا دەکرێتە ڕۆژی سەخاوەت و دەستکراوەیی و جۆرێک لە جەژن، بە سازکردنی خواردن و شیرینی و خۆڕازاندنەوەی ماڵ و منداڵ و ئەو جۆرە شتانە.

ئیبنو تەیمیە ﷺ لە کتێبەکەیدا (منهاج السنة)[2] دەڵێ: (شەیتان بە هۆی شەهیدکردنی حوسەینەوە دوو داهێنراوی بۆ خەڵکی داهێنا):

**بیدعەی یەکەم**: دڵتەنگیی و شین و ماتەم لە ڕۆژی عاشورادا، وەکو لەخۆدان و هات و هاوارو، شین و ڕۆڕۆو، گریان و خۆ تینوکردن و شیوەن گێڕان و ئەو شتانەی کە سەردەکێشن بۆ جنێودان و سوکایەتی کردن بە پێشینەی ئوممەت، وە نەفرەت لێکردن و تاوانبارکردنیان بە تاوانێک کە هیچ پەیوەندی بە ئەوانەوە نیە،

---

(١) برقم: ١١٣٤.

(٢) ٣٢٢/٢.

بە جۆرێک ئەوانەی دواتر هاتوون جنێو دەدەن و سووکایەتی بەوانەی پێشخۆیان دەکەن، هەروەها هەواڵگەلێک دێنن و دەبەن لەو بارەوە کە بەشی هەرە زۆری درۆو دەلەسەیە، ئەوەی ئەو کارەشی ڕەواج پێداوە، دیارە کە مەبەستی فیتنەو ئاژاوە نانەوەیە لە ناو ئوممەتدا، تاکو لە یەکتر ترازان دروست بێت، چونکە ئەو جۆرە کارە نە واجبەو، نە سوننەتە، بە کۆدەنگی مسوڵمانان، نەک هەر ئەوە بەڵکو شین گێڕان بۆ ڕووداوە ڕابردووەکان لە گەورەترین ئەو کارانەن کەوا خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی حەرامی کردوون.

**بیدعەی دووەمیش:** دەربڕینی خۆشیی و شادییە لەو ڕۆژەدا...

**٣١٠- عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخُصُّ مِنَ الْأَيَّامِ شَيْئًا؟ قَالَتْ: «كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يُطِيقُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُطِيقُ؟»[1].**

واتە: عەلقەمە دەڵێ: پرسیارم کرد لە دایکمان عائیشە ﵂: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ڕۆژێکی تایبەت دەکرد بۆ عیبادەت کردنێکی تایبەت؟ گوتی: «(پێغەمبەر ﷺ) کردەوەو عیبادەتەکانی بەردەوام بوون، جا ئایا کامەتان توانای ئەنجامدانی ئەو (عیبادەت)ـەی هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ توانای ئەنجامدانی هەبوو؟».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە گشتگیرەو هەموو جۆرە عیبادەتەکان دەگرێتەوە، تایبەت نیە بە باسی ڕۆژووەوە، دەگونجێ دانەر ﵀، بۆیە ئەو فەرموودەیەی لێرەدا هێنا بێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژووی سوننەت بەردەوام بووە، چونکە کارو کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوون.

عەلقەمە کە پرسیار لە عائیشە ﵂ دەکات: «**أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخُصُّ مِنَ الْأَيَّامِ شَيْئًا؟**»، واتە: ئایا پێغەمبەر ﷺ هیچ ڕۆژێکی تایبەت کردوە بۆ نوێژی سوننەت، یان ڕۆژووی سوننەت، یان هەر جۆرێکیتر لە عیبادەت؟ «**قَالَتْ: كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً**»، واتە: ئەگەر کارێکی دەکرد (عیبادەتێک) ئەوە لەسەری بەردەوام دەبوو، خۆشەویسترین کردەوە

---

(١) أخرجه البخاري: ١٩٨٧، ومسلم: ٧٨٣.



بە لای خواوە ئەو کردەوەیە کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بێ ئەگەر کەمیش بێ، بەردەوام بوون لەسەر کردەوەیەکی کەم باشترە، لەوەی کە مرۆڤ عیبادەتێکی زۆر بکات، بەڵام جارێک، یان دووجارو ئیتر لەسەری بەردەوام نەبێ.

جا لەبەر ئەوەیە کە پێویستە لەسەر مسوڵمان کە سوننەتێک دەکات، تەماشا بکات ئاخۆ کامەی لە توانادایە کە لەسەری بەردەوام بێ، تاکو لێی بێزار نەبێ، چونکە خوای گەورە لە بەندەکەی بێزار نابێ تاکو بەندەکەی بێزار نەبێ.

کە دەڵێ: «وَأَيُّكُمْ يُطِيقُ مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُطِيقُ؟»، واتە: خوای گەورە ئەو منەتەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردوە، کە زۆر ئارامگرو بەردەوامە لە هەوڵ و تێکۆشان بە جۆرێک کە جگە لەو هیچ کەس توانای ئەو بەردەوامیەی نیە، پێغەمبەر ﷺ لە هەموو بەندەکانی خوا کامڵتر بوو بۆ عیبادەتی خوای گەورەو بەردەوامترینیان بوو لەسەر کردەوەی چاک و جێبەجێ کردنی و خشوع و ڕوو لە خوا کردن.

٣١١- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدِي امْرَأَةٌ فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟» قُلْتُ: فُلَانَةُ لَا تَنَامُ اللَّيْلَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلَيْكُمْ مِنَ الْأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا»، وَكَانَ أَحَبَّ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ[1].

واتە: عائیشە ﵂، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ لای من (لەو کاتەدا) ئافرەتێکم لەلا بوو، فەرمووی: «ئەو (ئافرەتە) کێیە؟» گوتم: فڵان ئافرەتە کە شەوان ناخەوێ (هەر خەریکی عیبادەتە)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «داواتان لێدەکەم ئەو کردەوانە ئەنجام بدەن کە توانای خۆڕاگریی و بەردەوامیتان لەسەری هەیە، وەڵڵاهی خوا بێزار نابێ (لەوەی چی داوا دەکەن پێتان ببەخشێ)، تا ئێوە بێزار دەبن (لە داوا کردن)»، (جا دایکمان عائیشە ﵂ دەڵێ:) وە خۆشەویسترینی کردەوەکان لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بریتی بوو لەو کردەوانەی خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام دەبوو.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدِي امْرَأَةٌ»، دەڵێن: ئەم ئافرەتە ناوی حەولاء بووە، لە بنەماڵەی دایکی بڕواداران خەدیجە خاتوون ﵂ بووە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٣، ومسلم: ٧٨٥.

«فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قُلْتُ: فُلَانَةُ لَا تَنَامُ اللَّيْلَ»، واتە: بە درێژایی شەو خەریکی عیبادەت و پەرستشی خوای گەورە دەبێ و ناخەوێ، «فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: عَلَيْكُمْ مِنَ الْأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ»، چونکە هەرچەند جەستە چالاک و چاپووک بێ، بەڵام لە کۆتاییدا بێگومان تووشی ماندوویی و بێزاری دەبێ، بۆیە پێویستی بە حەوانەوە هەیە، جا مرۆڤ نابێ خۆی بخاتە ژێر باری کارێک، کە لە توانایدا نیە، هەندێک لە خەڵکی لە سەرەتاوە خۆیان دەخەنە ژێر باری کارێک کە لە تواناياندا نیە، بۆیە پاشی چەند ڕۆژێک هەست دەکەن کە ئەو کارە بۆ ئەویان قورسەو کۆتایی پێدێنن، بۆیە بۆ جێ بەجێکردنی سوننەتەکان وا باش و گونجاوە کەوا مرۆڤ بە گوێرەی توانای خۆی هەوڵبدات، ئنجا وردە وردە لێی زیاد بکات.

کە دەڵێ: «فَوَاللَّهِ لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا»، زانایانی ئیسلام لە تەفسیری ئەو جۆرە دەقانەدا یاسایەکیان هەیە کە چۆن هاتوە، ئاواش تەفسیری دەکەن و هەر شتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناویەتی و خوای گەورە بۆ خۆی بڕیاری داوە ئەوە وەکو خۆی دەهێڵینەوە لەگەڵ بە پاک و بێگەرد ڕاگرتنی خوای گەورە، لە هەموو جۆرە لێکچواندنێک بە دروستکراوانی، چونکە: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾ الشورى. (هیچ شتێک بە وێنەی خوا نیە -نە لە زات و نە لە سیفەت و نە لە کردارییدا-، وە ئەو بیسەرو بینایە).

جا لێکدانەوەی ئەو دەقەی کە دەڵێ: «لَا يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا»، هەروەکو تەفسیری ئەو ئایەتەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ﴿١٥﴾﴾ البقرة. (خوا گاڵتە بەوان دەکات -لە بەرامبەر گاڵتە کردنەکەیان-)، یان ئایەتی: ﴿سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ ﴿٧٩﴾﴾ التوبة. (خوا گاڵتە بەوان دەکات -لە بەرامبەر گاڵتەی ئەواندا-) ئەوە لە بەلاغەی عەرەبیدا پێی دەڵێن: (باب الجزاء على وجه المقابلة).

کە دەڵێ: «وَكَانَ أَحَبَّ ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي يَدُومُ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ»، واتە: ئەو کردەوەیەی کەوا خاوەنەکەی لەسەری بەردەوامە، ئەگەر کەمیش بێ ئەوە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستر بوو، لە کردەوەی زۆری کەسێک کە ماوەیەک دەیکات و ئیتر کۆتایی پێدێنێ.



٣١٢- عَنْ أَبِي صَالِحٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ ﵄، أَيُّ الْعَمَلِ كَانَ أَحَبَّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتَا: «مَا دِيمَ عَلَيْهِ وَإِنْ قَلَّ»[1].

واتە: ئەبو صاڵح دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائیشەو ئوممو سەلەمە ﵄، ئایا خۆشەویستترین کردەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کامە بووە؟ گوتیان: «ئەوەی بەردەوام ئەنجام دەدرێ، هەرچەندە کەمیش بێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

هەمان ماناو حوکمی فەرموودەی پێشووتری هەیە، ئەوەش یاسایەکی بنچینەیی گەورەیە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پەرستشە سوننەتەکان، کەوا مرۆڤ بە ئەندازەی توانای خۆی سوننەتەکان بکات بۆ ئەوەی لەسەریان بەردەوام بێ و بێزار نەبێ.

٣١٣- عَنْ عَاصِمِ بْنِ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً فَاسْتَاكَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ مَعَهُ فَبَدَأَ فَاسْتَفْتَحَ الْبَقَرَةَ فَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ فَسَأَلَ، وَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ فَتَعَوَّذَ، ثُمَّ رَكَعَ فَمَكَثَ رَاكِعاً بِقَدْرِ قِيَامِهِ، وَيَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ»، ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ رُكُوعِهِ، وَيَقُولُ فِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ» ثُمَّ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ ثُمَّ سُورَةً سُورَةً يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ[2].

واتە: عاصیمی کوڕی حومەید دەڵێ: بیستم عەوفی کوڕی مالیک ﵁ دەیگوت: شەوێک لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، (هەڵسایەوەو) سیواکی کرد، پاشان دەستنوێژی شۆرد، دوایی هەڵسایەوە نوێژ بکات، منیش هەڵسام لەگەڵیدا، بە خوێندنی سوورەتی بەقەرە دەستی پێکرد، بە هەر ئایەتێکی بەزەیی هاتنەوە ڕەتبووایە دەوەستاو داوای بەزەیی خوای دەکرد، وە بە هەر ئایەتێکی سزا ڕەتبووایە حەتمەن دەوەستاو پەنای دەگرت بەخوا لەو سزایە، پاشان چووە ڕکووع، بە ئەندازەی وەستانی لە ڕکووع مایەوەو، لە ڕکووعەکەیدا دەیفەرموو: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ»، دوایی کڕنووشی بردو بە ئەندازەی ڕکووعەکەی مایەوەو، لە ڕکووعەکەیدا

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٨٥٦.

(٢) أخرجه أبو داود في السنن: ٨٧٣.

دەیفەرموو: «سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ»، پاشان سوورەتی ئالی عیمرانی خوێند، پاشان سوورەت بە سوورەت وەک ئەوانی دی دەکرد.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە بە ڕوونی دیارە کە پەیوەندی بەو بابەتەوە نیە کە دانەر ﷺ هێناویەتی، واتە: پەیوەندی بە بابەتی ڕۆژووی پێغەمبەرەوە ﷺ نیە، زیاتر نزیکە لە بابەتی عیبادەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی شەونوێژەکانیەوە.

کە دەڵێ: **«كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَيْلَةً فَاسْتَاكَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ»**، پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو کە پێش دەستنوێژگرتن سیواکی دەکرد، هەروەها پێش نوێژ دابەستنیش سیواکی دەکرد، لە (صحیح مسلم)دا[1] هاتوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ}. واتە: ئەگەر نەبیووبایە بارگرانی بەسەر ئوممەتەکەمەوە، ئەوە فەرمانم پێ دەکردن کە پێش هەموو نوێژێک سیواک بکەن. هەروەها سیواک کردن لە مزگەوتدا هیچ کێشەیەکی نیە، ئیبنو تەیمیە ﷺ دەڵێ:[2] (سیواک کردن لە مزگەوتدا لە هیچ زانایەکم نەبیستوە، کەوا بە ناپەسندی زانیبێ، نەک هەر ئەوە، بەڵکو لە پێشینانمان هاتوە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە مزگەوتدا سیواکیان کردوە)، بەڵام یەکێک لە هەڵەکان ئەوەیە کە مسوڵمان سەرقاڵ بێ بە سیواک کردن بە جۆرێک کە (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنی لەگەڵ ئیمام لە دەست بچێ.

کە دەڵێ: **«فَبَدَأَ فَاسْتَفْتَحَ الْبَقَرَةَ»**، واتە: لە سەرەتای سوورەتەکە دەستی پێکرد، **«فَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ فَسَأَلَ، وَلَا يَمُرُّ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ فَتَعَوَّذَ»**، واتە: لە کاتی قورئان خوێندنەکەدا لە نوێژدا ڕادەوەستاو داوای لە خوا دەکرد، جا ئەگەر ئایەتێکی خوێندبایە کە باسی نازو نیعمەت و ڕەحمەت و پاداشتی تێدابایە، ئەوە قورئان خوێندنەکەی ڕادەگرت و دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: (خودایە داوای چاکەو بەخششی تۆ دەکەم)، پاشان لەسەر قورئان خوێندنەکە بەردەوام دەبوو، خۆ ئەگەر بە ئایەتێکدا

---

(١) برقم: ٢٥٢.

(٢) مجموع الفتاوى: ٢٢/٢٠١.




تێپەڕیبا کە باسی تورەیی و سزای بکردبایە پەنای بە خوا دەگرت و دەیفەرموو: (خوایە پەنات پێدەگرم لە تورەیی و سزات).

ئەم حاڵەتە لە قورئان خوێندن کاتێک دەبێ کە بە تێرامان و ووردبوونەوەو قوڵبوونەوە قورئان بخوێنرێ، بەڵام ئەگەر مرۆڤ تەنها گرنگی بە دەنگی خۆش و جوان ئەداکردن بدات و بیر لە ماناو مەبەستی ئایەتەکان نەکاتەوە، ئەوە ئەو جۆرە لە قورئان خوێندن بۆ ئەو کەسە دەستەبەر نابێ.

ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر دروستی و ڕەوایی ئەو جۆرە لە قورئان خوێندنەوە، وە سوننەتیشە لە نوێژی سوننەتدا کە نوێژخوێن بە ئایەتی سزاو تۆڵەدا تێپەڕی ڕابوەستێ و پەنا بە خوا بگرێ لەو سزایە، خۆ ئەگەر بەو ئایەتانەدا تێپەڕی کە باسی ڕەحمەت و میهرەبانی و سۆزی خوا دەکەن، ئەوە داوای ئەو سۆزو ڕەحمەتە بکات.

کە دەڵێ: «ثُمَّ رَكَعَ فَمَكَثَ رَاكِعاً بِقَدْرِ قِيَامِهِ»، واتە: بە ئەندازەی خوێندنی تەواوی سوورەتی (البقرة)، «وَيَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ»، ئەو تەسبیحاتە گەورەو گرنگە واباشە مسوڵمان لە ڕکووع و کڕنووشەکانیدا بیخوێنێ.

کە دەڵێ: «سُبْحَانَ»، واتە: پاک و بێگەرد ڕاگرتنی خوای گەورە لە هەرچی کەم و کوڕیی و عەیبە، هەروەها پاک و بێگەرد ڕاگرتنی خوای گەورە لە وێکچواندنی بە دروستکراوەکانی (السبوح) یەکێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە.

کە دەڵێ: «ذِي الْجَبَرُوتِ»، لە جەبڕەوە، وەرگیراوە، یەکێک لە ناوەکانی خوای گەورە بریتیە لە (الجبَّار)، واتە: خاوەنی هێزو دەسەڵات، هەر خوای پاک و بێگەردە کە دڵە شکاوەکان سارێژ دەکات، (الجبَّار) ئەو زاتەیە کەوا دوژمنەکەی دەگرێت و ناهێڵێ قوتاری بێت.

کە دەڵێ: «الْمَلَكُوتِ» واتە: خاوەنی هەموو موڵک و دەسەڵاتێک، (الملك): یەکێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە، هەر خوا ئەو زاتەیە کە خاوەنی هەموو شتێکە.

کە دەڵێ: «وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ» دوو سیفەتی خوان ﷻ، تایبەتن بەو ﷻ، جا بۆیە هەر کەسێک بانگەشەی ئەم دوو سیفەتانە بکات بۆ خۆی، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا سزای دەدات.




کە دەڵێ: «ثُمَّ سَجَدَ بِقَدْرِ رُكُوعِهِ»، واتە: کڕنووشەکەی درێژی کردەوە بە ئەندازەی ئەو ڕکووعەی بردی، «وَيَقُولُ فِي سُجُودِهِ: سُبْحَانَ ذِي الْجَبَرُوتِ وَالْمَلَكُوتِ وَالْكِبْرِيَاءِ وَالْعَظَمَةِ».

کە دەڵێ: «ثُمَّ قَرَأَ آلَ عِمْرَانَ»، واتە: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ڕکاتی دووەم هەڵسایەوە سووڕەتی ئالی عیمڕانی خوێند بە تەواوی، «ثُمَّ سُورَةً سُورَةً»، واتە: پاشان سووڕەت سووڕەت خوێندی، «يَفْعَلُ مِثْلَ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ»، بە مانای بە ئەندازەی ڕاوەستانەکەی لە ڕکووعدا دەمایەوە، وە بە ئەندازەی ڕکووعەکەی لە کڕنووشدا دەمایەوە، هەروەها لە دانیشتنی دوای کڕنووشیش هێندە دەمایەوە، هەروەها کە لە ڕکووعیش هەڵدەستایەوە هێندە دەمایەوە.

مەبەست لە قورئان خوێندنەوەکەی لێرەدا بریتیە لە قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی دەنگ بەرزکردن، یان بێدەنگ خوێندنەوەکەی، هەروەها لە ڕووی شوێنی وەستانەکانی و مەددەکان و لە ڕووی تەرتیل و شێوازی خوێندنەوەی، وە لە ڕووی دەنگ خۆشیی و ئەو جۆرە شتانەوە کە پەیوەندیان بە خوێندنەوەی پێغەمبەرمانەوە ﷺ هەیە لە قورئان خوێندندا.

٣١٤- عَنْ يَعْلَى بْنِ مَمْلَكٍ: أَنَّهُ سَأَلَ أُمَّ سَلَمَةَ ، عَنْ قِرَاءَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَإِذَا هِيَ تَنْعَتُ «قِرَاءَةً مُفَسَّرَةً حَرْفاً حَرْفاً»[1].

واتە: یەعلای کوڕی مەملەک دەگێڕێتەوە کە پرسیاری کردوە لە ئوممو سەلەمە ، دەربارەی قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ جا ئەویش بۆی وەسف کرد «بە خوێندنەوەیەک کە زۆر ڕوون بوو، وشە بە وشە دەیـخوێندەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە باسی چۆنیەتی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ دەکات لە ڕووی ئەدا کردنەوە، کە دەڵێ: «فَإِذَا هِيَ تَنْعَتُ قِرَاءَةً مُفَسَّرَةً»، وەسفی جۆری خوێندنەوەی قورئانی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ دەکات، کەوا بە جۆرێک بووە کە هەر بە شێوازی خوێندنەوەکەی تەفسیرو ڕاڤەی قورئانی کردوە، کاتێک قورئان خوێندنەوە بە تەفسیر ئەژمار دەکرێ، کە بە هێواشی و بێ پەلەپەل و بە دوای یەکداو، بە وەستان لە شوێنی گونجاو بۆ ڕاوەستان قورئانەکە بخوێنرێ، بۆیەش گوتوویەتی: بە تەفسیرو ڕاڤە دەیخوێند، چونکە خودی خوێندنەوەکەی پێغەمبەر ﷺ یارمەتی و هاوکاری بیسەری دەدا، بۆ تێگەیشتن و تێرامان، ئیتر مەبەستی سەرەکی و گەورەش لە دابەزاندنی قورئان هەر ئەوەیە، چونکە قورئان تەنها بۆ ئەوە خوای گەورە دایبەزاندووە کەوا بەندەکانی لێی وردببنەوەو لێی ڕابمێنن و لەو ماناو مەبەستەی بگەن کە خوا مەبەستیەتی.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٩٢٣، وأبو داود في السنن: ١٤٦٦، والحديث في إسناده يعلى بن مَلك، وهو مقبولٌ، فهو ضعيفٌ، لكنّه صحيح المعنى لما يأتي.



کە دەڵێ: «حَرْفًا حَرْفًا»، ئەوە ڕوونکردنەوەی مەبەستی پێشووە، کە گوتی: «مُفَسَّرَةً»، واتە: بە جوانی پیتەکانی لە شوێنی خۆیانەوە دەردەبڕی، وشەکانیش ڕوون و ئاشکرا دەبوون و، ئیتر تێگەیشتنیان ئاسان دەبوو بۆ بیسەر.

٣١٥- عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: «مَدًّا»[١].

واتە: قەتادە، دەڵێ: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﷺ گوت: ئایا قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوو؟ گوتی: (قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ) «لێککێشراوە بوو»، (واتە: درێژی دەکردەوە).

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مَدًّا»، واتە: خوێندنەوەکەی درێژ دەکردەوەو لێکی دەکێشایەوە، مەبەستی ئەوەیە کە ئەو شوێنەی پێویستی بە درێژکردنەوە هەبووایە، ئەوە درێژی دەکردەوە، ئەوەش هەر ڕوونکردنەوەیە بۆ خوێندنەوەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ بەشێکی شێوازی خوێندنەوەکەی، چونکە قورئان خوێندنەوەکەی چەند سیفەتێکی هەبوو، بەڵام ئەنەس ﷺ لێرەدا تەنها باسی (مدّ) درێژکردنەوەکانی کردوە.

٣١٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْطَعُ قِرَاءَتَهُ يَقُولُ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ ثُمَّ يَقِفُ، ثُمَّ يَقُولُ: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ ﴾، ثُمَّ يَقِفُ، وَكَانَ يَقْرَأُ ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤ ﴾[٢].

واتە: ئوممو سەلەمە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ قورئان خوێندنەکەی بەش بەش بوو (واتە: لە کۆتایی هەر ئایەتێک دەوەستا، بۆ وێنە:) دەیفەرموو: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ﴾ ئنجا دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ ﴾ دوایی دەوەستا، ئنجا (ئایەتی دوای وی دەخوێندنەوە) دەیفەرموو: ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤ ﴾.

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٠٤٥.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٩٢٧.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْطَعُ قِرَاءَتَهُ»، واتە: بەش بەش دەریدەبڕی و دەیخوێندەوەو لە هەموو سەرە ئایەتەکان دەوەستا، بۆیە دەڵێ: دەیفەرموو: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ۝٢﴾، پاشان دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: ﴿ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣﴾، ئنجا ئاوا ﴿مَـٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤﴾ی، دەخوێندەوە، ئەو شێوازە قورئان خوێندنەوەیە یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ تێگەیشتن و تێڕامان.

٣١٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂، عَنْ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ ﷺ أَكَانَ يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ أَمْ يَجْهَرُ؟ قَالَتْ: «كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ قَدْ كَانَ رُبَّمَا أَسَرَّ وَرُبَّمَا جَهَرَ»، فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیس دەڵێ: پرسیارم کرد لە دایکمان عائیشە ﵂ دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ: ئایا بە نهێنی دەیخوێند، یاخود بە ئاشکراو دەنگی پێ بەرزدەکردەوە؟ گوتی: «هەردووکیانی دەکرد، هەندێک جار بە نهێنی و بێ دەنگ، هەندێک جاریش بە ئاشکراو دەنگی بەرز»، بۆیە منیش گوتم: ستایش بۆ ئەو خوایەی فراوانی خستۆتە نێو ئەم ئایینە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂، عَنْ قِرَاءَةِ النَّبِيِّ ﷺ أَكَانَ يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ أَمْ يَجْهَرُ؟»، دانەر ﵀ لە کتێبەکەی خۆیدا (الجامع)[1] بەو شێوە هێناویەتی: (پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ ئایا قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ لە شەودا چۆن بووە؟) قورئان خوێندنەکەی پەیوەست کردوە بە شەو لە شەونوێژەکانیدا، ئەویش گوتوویەتی: هەموو ئەو شێوازانەی بەکارهێناوە، پاشان ئەو قسەیەی ڕووندەکاتەوەو دەڵێ: (بێگومان جار هەبووە بە بێدەنگی دەیخوێندو، جاریش هەبووە بە دەنگی بەرز دەیخوێند) واتە: کاتێک لە شەونوێژدا قورئانی دەخوێند جار هەبوو بە دەنگی بەرز دەیخوێند، کە ئەوەی لێی نزیک بووایە گوێی لێدەبوو، نەک بە دەنگێکی زۆر بەرز، جاریش هەبوو بە هێواشی دەیخوێند، ئەگەر کەسێک لێشی نزیک بووایە گوێ بیستی نەدەبوو.

---

(١) برقم: ٤٤٩.




کە دەڵێ: «فَقُلْتُ»، ئەو کەسە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیسە.

کە دەڵێ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً»، واتە: کارەکەی بۆ ئێمە فراوان کردوە، پێیان خۆشبوو بە دەنگ قورئان دەخوێنین، ئەگەریش پێیان خۆشبوو ئەوە بەبێ دەنگ دەیخوێنین، هەردووڵا دروستن، باشترینیان ئەو جۆرە خوێندنەوەیە کە زیاتر خشووع و دڵنەرم بوونی تێدایە (واتە: بە پێی سات و کات).

٣١٨- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ أَسْمَعُ قِرَاءَةَ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ وَأَنَا عَلَى عَرِيشِي»[1].

واتە: ئوممو هانیئ ﵂، دەڵێ: «من بە شەو گوێبیستی قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر ﷺ بووم، لە کاتێکدا لەسەربانیماڵەکەی خۆم بووم».

حەسەنی بەصریی دەڵێ: (عریش) واتە: سەقف و سەربان، (دیارە لەسەربان خەوتوەو، گوێبیستی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بووە).

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

(العريش) یان (العرش): بە شتێکی بەرزبووەوە دەگوترێ، لەبەر ئەوەش بە جێگای خەو دەڵێن: (عریش) لەبەر بەرزیەکەیەتی، بێگومان هەندێک لە ڕاڤەکارانی فەرمووده دەڵێن: ئەو گوێ لێ بوونە پێش کۆچکردن بووە.

٣١٩- عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ ﵁ يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى نَاقَتِهِ يَوْمَ الْفَتْحِ وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ۝٢﴾ الفتح، قَالَ: «فَقَرَأَ وَرَجَّعَ» قَالَ: وَقَالَ مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ: «لَوْلَا أَنْ يَجْتَمِعَ النَّاسُ عَلَيَّ لَأَخَذْتُ لَكُمْ فِي ذَلِكَ الصَّوْتِ» أَوْ قَالَ: «اللَّحْنِ»[2].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە دەڵێ: بیستم عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﵁ دەیگوت: لە ڕۆژی ئازادکردنی (مەککەدا) پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر پشتی حوشترەکەیەوە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ۝١ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ۝٢﴾ الفتح. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بێگومان ئێمە سەرکەوتنێکی ئاشکرامان

---

(١) أخرجه ابن ماجه: ١٣٤٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٤٢٨١، ومسلم: ٧٩٤.

پێدایت -كە ڕێكەوتنی حودەیبییەیە- ﴿١﴾ تا خوا خۆشببێ لە گوناهەكانی ڕابردوو و داهاتووت)، جا عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل ﷺ دەڵێ: كاتێک (پێغەمبەر ﷺ) دەیخوێندەوە «دەنگی پێ دەلەراندوە»، (شوعبە) دەڵێ: موعاویەی كوڕی قوڕڕە گوتی: «ئەگەر لەبەر هاتن و كۆبوونەوەی خەڵک نەبووایە لەسەرم وەک ئەوم بۆ دەخوێندنەوە»، یان گوتی: «بەو ئاوازەی ئەوم دەخوێندەوە».

### شەرح و ڕوونكردنەوە:

كە دەڵێ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى نَاقَتِهِ يَوْمَ الْفَتْحِ»، مەبەست لە (الْفَتْح) لێرەدا ڕێككەوتنی حودەیبییەیە.

كە دەڵێ: «وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴿٢﴾﴾ الفتح. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بێگومان ئێمە سەركەوتنێكی ئاشكرامان پێدایت -كە ڕێكەوتنی حودەیبییەیە- ﴿١﴾ تا خوا خۆشببێ لە گوناهەكانی ڕابردوو و داهاتووت)، قَالَ: «فَقَرَأَ وَرَجَّعَ» (الترجيع): بە مانای لەرینەوەی دەنگ دێ، دەگوترێ: (رَجَّعَ): كاتێک كەسێک لە خوێندنەوەدا دەنگی بلەرێنێتەوە، بەڵام لێرەدا بە مانای دەنگخۆشی دێت لە كاتی قورئان خوێندنەوەدا، هەروەكو خودی دەقەكەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

كە دەڵێ: «لَوْلَا أَنْ يَجْتَمِعَ النَّاسُ عَلَيَّ لَأَخَذْتُ لَكُمْ فِي ذَلِكَ الصَّوْتِ»، ئا ئەوە دەیسەلمێنێ و ڕوونی دەكاتەوە كە مەبەستی دەنگخۆشییە لە قورئان خوێندنەكەدا، وە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی كە كاتێک زانیت كۆبوونەوەی خەڵكی لەسەر شتێک دەبێتە هۆی ئاشووب و خراپەكەی لە چاكەكەی زیاتر دەبێ، یان سەردەكێشێ بۆ تاوان، ئەوە ئەو كات كارێكی ناپەسندو بێزراوە.

٣٢٠- عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: «مَا بَعَثَ اللَّهُ نَبِيّاً إِلَّا حَسَنَ الْوَجْهِ، حَسَنَ الصَّوْتِ، وَكَانَ نَبِيُّكُمْ ﷺ حَسَنَ الْوَجْهِ، حَسَنَ الصَّوْتِ، وَكَانَ لَا يُرَجِّعُ»[1].

واتە: قەتادە دەڵێ: «خوا هیچ پێغەمبەرێكی نەناردوە مەگەر جوانترین شێوەو ڕووخسارو، خۆشترین دەنگیشی هەبووە، وە پێغەمبەرەكەی ئێوەش (موحەممەد

---

(١) سنده ضعيفٌ، من مرسل قتادة، والرَّاوي عنه حسام بن مِصك ضعيفٌ جدًّا.



ﷺ، جوانترین شێوەو ڕووخساری هەبوو، وە خۆشترین دەنگیشی هەبوو، (لە کاتی خوێندنەوەی قورئانیشدا) دەنگی نەدەلەراندەوە».

ڕەنگە نەیبیستبێ دەنگی لەراندۆتەوە، چونکە قەتادە تابیعینە، فەرموودەی پێشتر ئیبنو موغەففەل بوو، گوتی: بینیم دەنگی دەلەراندەوە، والله أعلم).

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە دوو سیفەتی لە پێغەمبەراندا (عَلَيهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کۆکردۆتەوە: جوانی لە ڕووخسارداو دەنگخۆشی، کە دەڵێ: «وَكَانَ لَا يُرَجِّعُ»، واتە: بەو جۆرەی کە بۆ گۆرانی گوتن بەکاردێ، چونکە قورئان خوێندن بە ئاوازی گۆرانی گوتن پێچەوانەیە لەگەڵ خشوع و ماناو مەبەستی قورئان خوێندن، بەڵام ئەو (الترجيع)ـەی کە بە مانای دەنگخۆشیەو بۆ ڕازاندنەوەی خوێندنەوەکەیە بەبێ زۆر لەخۆکردن و، بێ ئەوەی کە دەستکردو دروستکراو بێ، ئەوە لە فەرموودەکەی پێشووتردا سەلمێنراوە کە کێشەی نیەو ڕەوایە.

٣٢١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: «كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ ﷺ رُبَّمَا يَسْمَعُهَا مَنْ فِي الْحُجْرَةِ وَهُوَ فِي الْبَيْتِ»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما، دەڵێ: «هەندێک جار وا دەبوو ئەوانەی لە ژوورەکەدا بوون گوێبیستی قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبوون».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «رُبَّمَا يَسْمَعُهَا مَنْ فِي الْحُجْرَةِ وَهُوَ فِي الْبَيْتِ»، ئەو فەرموودەیە هەمان فەرموودەکانی پێشووتر ڕووندەکاتەوەو دەیسەلمێنێ، کە قورئان خوێندنەکەی لە شەونوێژدا بە دەنگی بەرز تەنها بە ئەندازەی ئەوەندە دەنگی بەرزبووە، کە ئەوانەی لێی نزیک بوون، گوێبیستی دەبوون، نەک دەنگێکی زۆر بەرز.

---

(١) أخرجه أبو داود: ١٣٢٧.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی گریانی پێغەمبەری خوا ﷺ



پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێک بوو کە لە هەموو کەسێک زیاتر خوای پەرستوە، لە هەموو کەس زیاتر ترسی خوای لە دڵدا بووە، لەبەرئەوە جاری وابووە کە گریانی هاتوە، ئەویش لە چەند جێگایەک و، لەبەر چەند هۆکارێکی جۆراو جۆر.

(إبن القيم) ﷺ دەڵێ: (گریانی پێغەمبەر ﷺ هەر لە جۆری پێکەنینەکەی بووە، واتە: بە دەنگی بەرزو هات و هاوار نەبووە، هەروەکو چۆن پێکەنینەکەشی بە قاقاو بە دەنگی بەرز نەبووە، بەڵکو چاوەکانی فرمێسکیان پێدا دەهات و دەنگی گزەگزی سینگی دەبیسترا، جارجار هەبووە گریانەکەی وەکو سۆزو بەزەیی بووە بۆ مردوو، جار هەبووە ترس بووە بۆ ئوممەتەکەی (کە سزا بدرێن)، وەکو سۆزو بەزەیی و دڵنەرمی بووە، جار هەبووە لە ترسی خوا بووە، جار هەبووە لە کاتی گوێگرتن لە قورئان خوێندن بووە، کە ئەوەش گریانی تامەزرۆیی و خۆشەویستی و بە گەورەزانین بووە، کە ترسی خوای گەورەشی لەگەڵدا بووە، جا کاتێک ئیبراهیمی کوڕی وەفاتی کرد چاوەکانی فرمێسکیان لێ هات و گریانێکی بە سۆزو بەزەیی هات، وە فەرمووی: {تَدْمَعُ الْعَيْنُ، وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يُرْضِي رَبَّنَا، إِنَّا بِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ}[1]. واتە: چاو فرمێسک دەڕێژێ و، دڵ نیگەران دەبێ و هیچ شتێکیش ناڵێین کە پەروەردگارمان پێی ڕازی نەبێ، وە بێگومان ئەی ئیبراهیم بۆت دڵتەنگین. وە کاتێ یەکێک لە کچەکانی لە گیان کێشاندا بوو، بۆی گریا، هەروەها کاتێک عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ سوورەتی (النساء)ی بۆ خوێندەوە کاتێک گەیشتە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النساء. (ئایا -حاڵی کافران- چۆن بێ کاتێک هێنامان لە هەموو ئومەتێکدا شایەتێک -کە پێغەمبەرەکەیانە- تۆیشمان هێنا -ئەی موحەممەد ﷺ- بە شایەت بەسەر ئا ئەوانەوە) کاتێک ئەو ئایەتەی خوێندەوە گریا.

وە کاتێک عوسمانی کوڕی مەظعون ﷺ وەفاتی کرد گریا، وە کاتێک خۆرگیرا، دیسان گریاو نوێژی خۆرگیرانی کردو لە نێو نوێژەکەیدا دەستی کرد بە گریان و، دەنگی گریانی دەبیسترا، وە دەیفەرموو: «رَبِّ أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ؟

---

(١) أخرجه البخاري: ١٣٠٣، ومسلم: ٢٣١٥ من حديث أنس بن مالكٍ ﷺ وأبو داود: ٣١٢٦.



وَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُكَ»[١]. واتە: ئەی پەروەردگار! ئەی بەڵێنی ئەوەت پێ نەدام کە سزایان نەدەی، (مادام من لە نێویاندابم)، ئەوانیش داوای لێخۆشبوون بکەن، ئەوە ئێمەش داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین.

وە کاتێک لە لای گۆڕی یەکێک لە کچەکانی دانیشت گریا، وە هەندێک جار لە شەونوێژەکاندا دەگریا[٢].

٣٢٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ ﷺ قَالَ: «أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، وَلِجَوْفِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ مِنَ الْبُكَاءِ»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر ﷺ دەڵێ: «هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ (لەو کاتەدا) نوێژی دەکرد، لە ناخی دڵیەوە بە گریانێکی وا بە کوڵ دەگریا، وەک قوڵپـەی کوڵانی مەنـجەڵ دەنگی دەهات». (ئاوا پێغەمبەریش ﷺ گریانەکە زۆری بۆ هێناوەو لە پرمەی گریانی لە ناخەوە، دەنگی دەرچووە!).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَلِجَوْفِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ مِنَ الْبُكَاءِ»، واتە: دەنگێک لە سینگ و سینەی دەهات، کە وەکو دەنگی کوڵانی مەنجەڵی لە مس دروستکراو بوو، کاتێک دادەنرێتە سەر ئاگر، ئا ئەو گریانە بریتیە لە گریانی لە ترسی خواو، تامەزرۆیی دیداری خواو، خۆشەویستی بۆ خوای گەورە.

٣٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ قَالَ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي»، فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ، حَتَّى بَلَغْتُ: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ النساء، قَالَ: فَرَأَيْتُ عَيْنَيْ رَسُولِ اللَّهِ تَهْمِلَانِ[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: «قورئانم بەسەردا بخوێنە»، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا من بەسەر

---

(١) انظر: (ح ٣٢٤).

(٢) زاد المعاد: ١/١٨٣.

(٣) أخرجه أبو داود في السنن: ٩٠٤.

(٤) أخرجه البخاري: ٤٥٨٢، ومسلم: ٨٠٠، والمصنّف في جامعه: ٣٠٢٥.




تۆدا بخوێنم، کەچی بە سەر تۆدا دابەزێنراوە؟! فەرمووی: «بەڵێ»، حەز دەکەم گوێبیستی بم لە غەیری خۆمەوە»، جا دەڵێ: منیش سوورەتی (النساء)م بەسەردا خوێند، هەتا گەیشتمە ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ النساء. (تۆیشمان هێنا -ئەی موحەممەد ﷺ- بە شایەت بەسەر ئا ئەوانەوە)، دەڵێ: جا تەماشام کرد، فرمێسکی لە چاوەکانیدا دەهاتنە خوارەوە.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەفەرموێ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي»، پێغەمبەر ﷺ قورئانی لە جیبریلەوە بیستووەو لە هەندێک لە هاوەڵانیش گوێی لێ بووە، جا کاریگەری قورئان خوێندن بۆ مرۆڤ، جار هەیە بە هۆی خوێندنەوەی خۆیەتی، جاریش هەیە بە هۆی ئەوانی دیکەوەیە.

کە دەڵێ: «فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ»، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە دروستەو ناپەسند نیە کە بگوترێ: سوورەتی (النساء)، یان سوورەتی (البقرة)، واتە: پێویست ناکات بگوترێ: ئەو سوورەتەی کە باسی (النساء)ی تێدایە، یان ئەو سوورەتەی کە باسی (البقرة)ی تێدایە.

کە دەڵێ: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ النساء. (تۆیشمان هێنا -ئەی موحەممەد ﷺ- بەشایەت بەسەر ئائەوانەوە)، خوای گەورە بۆ هەموو ئوممەتێک لە ئوممەتەکان شاهێدێکی داناوە کە پێغەمبەرەکەیانە، ئا ئەوەش لەوپەڕی دادپەروەری خوای گەورە دایە، وە پێغەمبەری ئێمەش موحەممەد ﷺ شاهیدە بەسەر ئەو ئوممەتەوە، جا کاتێک عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ لە قورئان خوێندنەکە گەیشتە ئەم شوێنە: ﴿وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾، چاوەکانی فرمێسکیان لێ هاتنە خوارەوە.

جا گریانی پێغەمبەر ﷺ لێرەدا کاتێک بووە کە گوێی لە قورئانخوێندنی کەسێکی دیکە بووە، بەڵام لە فەرموودەکەی پێشوو کاتێک گریاوە کە بۆ خۆی قورئانەکەی خوێندوە.




٣٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: انْكسفَتِ الشَّمْسُ يَوْماً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، حَتَّى لَمْ يَكَدْ يَرْكَعُ ثُمَّ رَكَعَ، فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، فَجَعَلَ يَنْفُخُ وَيَبْكِي، وَيَقُولُ: «رَبِّ أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَأَنَا فِيهِمْ؟ رَبِّ أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ؟ وَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُكَ» . فَلَمَّا صَلَّى رَكْعَتَيْنِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ فَحَمِدَ اللَّهَ تَعَالَى وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا انْكَسَفَا فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ تَعَالَى»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێ: ڕۆژێک خۆرگیران ڕوویدا لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بۆ ئەوەی نوێژ بکات، جا نزیک بوو نەچێ بۆ ڕکووع، دوایی چەماوەو چوو بۆ ڕکووع، ئیدی (هێندە مایەوە) نزیک بوو هەڵنەستێتەوە لە ڕکووع و سەری بەرز نەکاتەوە، دوایی سەری بەرز کردەوەو، (پاشان هێندە مایەوە) نزیک بوو نەچێ بۆ کڕنووش، دوایی چوو بۆ کڕنووش، نزیک بوو هەڵنەستێتەوە لە کڕنووش بردن، دوایی هەڵسایەوەو فووی کردو دەگریاو دەیفەرموو: «ئەی پەروەردگارم ئایا بەڵێنت پێنەداوم کە سزایان نەدەی هەتا من لە نێویاندا بم؟ ئەی پەروەردگارم ئایا بەڵێنت پێنەداوم کە سزایان نەدەی هەتا ئەوان داوای لێخۆشبوونت لێبکەن؟ ئەوە ئێمە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەین»، جا کاتێک دوو ڕکات نوێژەکەی تەواو کردو، خۆرەکە دەرکەوتەوە، دوایی هەڵسا سوپاسگوزاری خوای بەرزی کردو، سەنای خوای کردو فەرمووی: «خۆرو مانگ دوو نیشانەو بەڵگەن لە نیشانەو بەڵگەکانی خوا، لەبەر مردن و لە دایک بوونی هیچ کەسێک ناگیرێن، بۆیە ئەگەر (خۆرو مانگ، یان یەکێکیان) گیران، ئەوە پەنا ببەن بۆ زیکرو یادو پاڕانەوە لە خوای بەرز».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمَاً عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، مەبەست لە گیرانی خۆر ئەوەیە کە ڕووناکی هیچ نەمێنێ و، هەموو بگیرێ، یان هەندێکی دیار نەمێنێ.

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٦٤٨٣.



یەکجار لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ خۆرگیراوە، ئەو جارەش لە ساڵی دەی کۆچیدا بوو، ڕێکەوت بوو لەگەڵ وەفاتی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ، بیرو باوەری خەڵکی سەردەمی نەفامی ئاوا بوو، کە هەر کات خۆر بگیرایە، یان مانگ بگیرایە، ئەوە پێیان وابوو، یان لەبەر مردنی کەسێکی گەورەیە، یان لەبەر هاتنە دونیای کەسێکی گەورەیە، جا کە پێغەمبەر ﷺ بەو بۆنەیەوە وتاری بۆ خەڵکی فەرموو، ڕوونی کردەوەو ڕایگەیاند کە مانگ و خۆرگیران دوو نیشانەو بەڵگەی گەورەیی دەسەڵاتی خوان و، بەندەکانی پێ دەترسێنێ، ئەگەرنا لەبەر مردن و ژیانی هیچ کەسێک نیە.

پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لەو کاتەدا زرێکەی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشاو، لەبەر سامناکی ڕووداوەکە، هەروەکو بڵێی قیامەت بەرپا بووە، فەرمانی کرد کە جاڕ بدرێ بۆ نوێژی بەکۆمەڵ، ئیتر خەڵکیش کۆبوونەوە لە مزگەوتدا، ئەویش نوێژی خۆرگیرانی لە مزگەوت بۆ کردن، «فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي، حَتَّى لَمْ يَكَدْ يَرْكَعُ ثُمَّ رَكَعَ، فَلَمْ يَكَدْ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ، فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَسْجُدَ، ثُمَّ سَجَدَ فَلَمْ يَكَدْ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ»، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە قورئان خوێندن لە نێو نوێژەکەدا، هێندە مایەوە وەکو بڵێی نەیدەویست بچێتە ڕکووع، لەبەر ئەوەی هێندە قورئانی خوێند، پاشان ڕۆیشتە ڕکووع و هێندە ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، وەکو بڵێی نەیدەویست لە ڕکووع هەڵسێتەوە لەبەر درێژی ڕکووعەکەی، پاشان لە ڕکووع هەڵسایەوەو ڕێک بۆوەو هێندە درێژەی بە ڕاوەستانەکەدا، وەکو بڵێی: نەیدەویست بچێتە کڕنووش لەبەر درێژی ڕاوەستانەکەی، پاشان ڕۆیشت بۆ کڕنووش، هێندە لە کڕنوشەکەدا مایەوە، وەکو بڵێی نەیدەویست لە کڕنووشەکە هەڵسێتەوە لەبەر زۆری ماوەکەی، پاشان هەڵسایەوەو، بەو جۆرە نوێژەکەی درێژ دەکردەوە لە هەر ڕووکنێک لە ڕووکنەکانی نوێژەکە.

چۆنیەتی نوێژی خۆرگیران لەو فەرموودەیەدا، وا باسکراوە کە دوو ڕکاتی ئاساییبن، لەگەڵ درێژی ماوەی نێوان ڕووکنەکانی و، قورئان خوێندنی بە دەنگ تێیدا، ئەو فەرموودەیەش بە شاز دانراوە، ئەوەی کە لای فەرموودەناسان ناسراوەو زانراوە،




ئەو فەرموودەیە کە پێشەوا بوخاری[1] و غەیری ئەویش لە عائیشەو غەیری ئەویش ﵁ گێردراوەتەوە، کەوا: (لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆرگیرا، پێغەمبەریش ﷺ پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، ئیتر بە پێوە وەستاو خوێندنی فاتیحەو دوای فاتیحەی درێژ کردەوە، پاشان ڕکووعی بردو ماوەی ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەستایەوەو ڕێک بۆوەو ماوەکەی درێژ کردەوە بەڵام بە ئەندازەی ڕاوەستانی یەکەم نەبوو، پاشان ڕۆیشتەوە ڕکووع و ماوەکەی درێژ کردەوە، کە ئەو ماوە بە ئەندازەی ڕکووعی یەکەم درێژ نەبوو، پاشان کڕنووشی بردو ماوەی کڕنووش بردنەکەی درێژ کردەوە، پاشان هەمان ئەو شتەی لە ڕکاتی دووەمیشدا دووبارە کردەوە، وەکو ڕکاتی یەکەم، پاشان لە نوێژ بۆوەو ڕۆژ بە دەرکەوتەوەو وتاری بۆ خەڵکی فەرموو).

لەو فەرموودەدا بۆ هەر ڕکاتێک دوو ڕکووعی هێناوە، ئا ئەوەش لە لای فەرموودەناسان ناسراوەو زانراوە، هەروەکو زانایان باسی دەکەن، ئەو جۆرە نوێژەش تایبەتە بە خۆرگیران.

کە دەڵێ: «فَجَعَلَ يَنْفُخُ وَيَبْكِي»، واتە: دەنگی سینگ و سینەی دەبیسترا، کە دەنگی گریان بوو لە نوێژەکەیدا، وە لە کاتی پاڕانەوە لە خوای گەورە، دەیگوت: «رَبِّ أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَأَنَا فِيهِمْ؟ رَبِّ أَلَمْ تَعِدْنِي أَنْ لَا تُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ؟ وَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُكَ»، ئەوە ماناو تەفسیری ئەو ئایەتەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأنفال. (وە بەڕاستی خوا سزایان نادات لە کاتێکدا تۆ -ئەی موحەممەد ﷺ- لە ناویاندا بیت، هەروەها خوا تووشی سزایان ناکات لە کاتێکدا ئەوان داوای لێبوردن لە خوا بکەن).

کەواتە: ئەو ئۆممەتە دوو دڵنیاکەرەوەی هەیە لە سزای خوای گەورە: هەبوونی پێغەمبەر ﷺ لە نێو ئۆممەتدا، هەروەها داوای لێخۆشبوون کردن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بێگومان وەفاتی کردوە، بەڵام داوای لێخوشبوون کردنەکە هەر ماوە.

لەو فەرموودە ئەوەش وەردەگیرێ کە لە کاتی خۆرگیراندا دووعاکردن و داوای لێ خۆشبوون کردنی زۆر، لە پێش نوێژو لە پاشی نوێژەکە سوننەتە، تەوبەو گەڕانەوەو

---

(١) برقم: ١٠٤٤.

داوای لێ خۆشبوون کردن، خەم و خەفەت و دڵتەنگی لادەبات و کاروبار ئاسان دەکات، بەڵکو خێرو فەڕی بەسەر کەسەکانەوە لە دونیاو قیامەتدا ئەوەندە زۆرن کە ناژمێردرێن.

کە دەڵێ: «فَقَامَ فَحَمِدَ اللَّهَ تَعَالَى وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَا يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلَا لِحَيَاتِهِ»، بە پێچەوانەی بیروباوەڕی هاوبەشدانەران لە سەردەمی نەفامییدا (کە پێیان وابوو لەبەر مردن، یان ژیانی کەسێکی گەورە خۆر دەگیرێ).

«فَإِذَا انْكَسَفَا فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ تَعَالَى»، لە نوێژکردن و تەسبیحات و (لا إله إلاّ الله) کردن و داوای لێ خۆشبوون کردن لە خواو هاناو پەنا بردن بۆ خوای گەورە.

٣٢٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ابْنَةً لَهُ تَقْضِي فَاحْتَضَنَهَا فَوَضَعَهَا بَيْنَ يَدَيْهِ فَمَاتَتْ وَهِيَ بَيْنَ يَدَيْهِ وَصَاحَتْ أُمُّ أَيْمَنَ فَقَالَ - يَعْنِي ﷺ -: «أَتَبْكِينَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ؟» فَقَالَتْ: أَلَسْتُ أَرَاكَ تَبْكِي؟ قَالَ: «إِنِّي لَسْتُ أَبْكِي، إِنَّمَا هِيَ رَحْمَةٌ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ بِكُلِّ خَيْرٍ عَلَى كُلِّ حَالٍ، إِنَّ نَفْسَهُ تُنْزَعُ مِنْ بَيْنِ جَنْبَيْهِ، وَهُوَ يَحْمَدُ اللَّهَ ﷻ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کچێکی هەبوو لە نەخۆشی سەرەمەرگدا بوو، لە باوەشی کردو خستیە پێش دەستەکانی خۆی، جا کچەکەی وەفاتی کردو مرد، ئوممو ئەیمەن هاواری لێ بەرز بۆوەو دەستی کرد بە گریان، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «ئایا لە بەردەم پێغەمبەری خوا (بەم شێوە هاوار دەکەن و) دەگرین؟» (ئوممو ئەیمەنیش) گوتی: مەگەر تۆ نابینم وا دەگری؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «من نەگریاوم، ئەوە تەنها بەزەییەکە (خوا لە ناخی مرۆڤ دایناوەو)، کەسی بڕوادار لە هەموو حاڵێکدا هەر لە چاکەدایە، لەبەر ئەوەی کاتێک ڕووحی لە لاتەنیشتەکانیەوە دەردەهێنرێ ئەو سوپاسگوزاری و ستایشی خوای ﷻ دەکات».

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٢٤١٢.



**شەرح و ڕوونكردنەوە:**

كە دەڵێ: «أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ابْنَةً لَهُ تَقْضِي»، واتە: لە گیان كێشاندا بوو، گوتراوە: كە ئەو كچە، كچی پێغەمبەر ﷺ بووە، كچی زەینەب لە شووەكەی ئەبولعاصی كوڕی ڕەبیع، وەفاتەكەشی لە ساڵی نۆیەمی كۆچیدا بووە.

كە دەڵێ: «فَاحْتَضَنَهَا»، واتە: بە خۆیەوە گوشی، وەكو سۆزو بەزەییەك بۆ كچەكە، كە دەڵێ: «وَصَاحَتْ أُمُّ أَيْمَنَ فَقَالَ «يَعْنِي ﷺ»: «أَتَبْكِينَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ؟» فَقَالَتْ: أَلَسْتُ أَرَاكَ تَبْكِي؟»، گریانی پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە بووە كە چاوی فرمێسكی لێهاتووەو دڵیشی پڕ بووە لە ڕەزامەندی، كە بێگومان ئەوەی فەرموویەتی: جێگەی ڕەزامەندی پەروەردگار بوو، ئیتر فرمێسكی هاتوەو وەكو سۆزێك و میهرەبانیەك بۆ ئەو كەسەی كە خەریكە گیانی دەكێشرێ، بۆیە بە ئافرەتەكەی فەرموو: «إِنِّي لَسْتُ أَبْكِي، إِنَّمَا هِيَ رَحْمَةٌ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ بِكُلِّ خَيْرٍ عَلَى كُلِّ حَالٍ»، واتە: ئەو فرمێسكانە ڕەحمەتن بۆ مردووەكە، وە ئەو كاریگەر بوونەش، ڕەحمەتە بۆ ئەو كەسەی كە خەریكە گیان دەدات، كەواتە: گریانەكەی گلەیی كردن و تووڕە بوون و گریانی شڵەژان و گریانی سكاڵاكردن نەبووە، بەڵكو تەنها گریانێك بووە وەكو میهرەبانیەك و ڕەحمەت بۆ ئەو كەسەی خەریكە گیان دەدات، ئیتر بەو سیفەتەی ڕەزامەندی دەربڕین بە قەزاو قەدەری خوای كۆكردۆتەوە، لەگەڵ ڕەحمەت و سۆزو میهرەبانی دەربڕین، بۆ ئەو كەسەی نزیكی وەفات كردنە، ئەوجار ئەو سیفەتەش باشترە لە سیفەتی كەسێك كەوا لەبەر بەهێزی ڕەزامەندییەكەی فرمێسكی نایەت و سۆزو ڕەحمەتی لاوازە.

كە دەڵێ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ بِكُلِّ خَيْرٍ عَلَى كُلِّ حَالٍ»، واتە: بێگومان بڕوادار هەموو كاروبارێكی خێرە بە هەر جۆرێك بێ، كاتێك دڵخۆشە لەسەر خێرو چاكەیە، چونكە پاداشت وەردەگرێ لەسەر سوپاسگوزاریەكەی، كاتێكیش لە ناڕەحەتی و ناخۆشیدایە بە هۆی ئارامگریەكەیەوە پاداشت وەردەگرێ.

كە دەڵێ: «إِنَّ نَفْسَهُ تُنْزَعُ مِنْ بَيْنِ جَنْبَيْهِ، وَهُوَ يَحْمَدُ اللَّهَ ﷻ»، دەبینین كە زۆرجار كەسە چاكەكان لە كاتی گیان كێشاندا سوپاس و ستایشی خوا دەكەن و ستایشی خوایان لە بیر نەچۆتەوە، لەو كاتە تووندو ناڕەحەتەدا، هەروەها نەخۆشی بە ئازارو ئێشیش

دەبینن کە بە دەست نەخۆشیەکەوە دەناڵێنن، بەڵام زمانی بە یادو ستایشی خوای گەورە تەڕو پاراوە.

٣٢٦- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَبَّلَ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ وَهُوَ يَبْكِي» أَوْ قَالَ: «عَيْنَاهُ تَهْرَاقَانِ»[1].

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەری خوا ﷺ عوسمانی کوڕی مەزعونی ماچ کرد بە مردوویی و لە هەمان کاتدا دەگریا» یان گوتی: «فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتنە خوارەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو گریانە، گریانی سۆزو میهرەبانییە، خوا بەزەیی بەوانەدا دێتەوە لە بەندەکانی کەوا بە بەزەیین.

فەرموودەکە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی، کە ماچ کردنی مردوو دروستەو، بێگومان ئەبو بەکری صیددیق رضي الله عنه کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد ماچی کرد.

٣٢٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: شَهِدْنَا ابْنَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرَسُولُ اللَّهِ جَالِسٌ عَلَى الْقَبْرِ فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدمَعَانِ، فَقَالَ: «أَفِيكُمْ رَجُلٌ لَمْ يُقَارِفِ اللَّيْلَةَ؟» قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَنَا قَالَ: «انْزِلْ» فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێ: ئامادەبووین لە شاردنەوەو ناشتنی (جەنازەی) کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر (واتە: تەنیشت) گۆڕەکەی دانیشتبوو، تەماشام کرد وا فرمێسک بە چاوەکانیدا دێنە خوارەوە، جا فەرمووی: «ئایا هیچ پیاوێکتان تێدایە لەگەڵ خێزانی جووت نەبووبێ (واتە: لەشگران نەبێ)؟» ئەبو تەڵحە رضي الله عنه گوتی: من، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «دابەزە نێو گۆڕەکە (جەنازەکە وەربگرە)»، ئیدی ئەویش دابەزیە نێو گۆڕەکەی.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٩٨٩، وأبو داود في السنن: ٣١٦٣، وابن ماجه في السنن: ١٤٥٦، وفي إسناده عاصم بن عُبَيد اللّهِ، وهو ضعيفٌ.

(٢) أخرجه البخاري: ١٢٨٥.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «شَهِدْنَا ابْنَةً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، واتە: ئامادەی ناشتنی جەنازەکەی بووین لەگەڵ نوێژ لەسەر کردنەکەی و ناشتنی، ئەو کچەش ئوممو کەلسوم ﵂ بوو، خێزانی عوسمانی کوڕی عەففان ﵁.

«وَرَسُولُ اللَّهِ جَالِسٌ عَلَى الْقَبْرِ»، واتە: لەو کاتەدا کە ویستیان جەنازەکە شۆڕ بکەنەوە بۆ نێو گۆڕ، لەو کاتەدا لەسەر گۆڕەکە دانیشتبوو، کە دەڵێ: «فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَدمَعَانِ»، فرمێسکی چاو لەو کاتەدا، فرمێسکی سۆزو میهرەبانییە هەروەکو پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەی پێشوودا بۆمانی ڕوونکردەوە، بۆیە ئەو جۆرە گریانە دژیەکی نیە لەگەڵ ڕەزامەندی و ئارامگری، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ پێشەوای ئەو کەسانەیە کە ئارامگرن و ڕازین بە قەدەری خوا.

کە دەڵێ: «فَقَالَ: أَفِيكُمْ رَجُلٌ لَمْ يُقَارِفِ اللَّيْلَةَ؟، قَالَ أَبُو طَلْحَةَ: أَنَا قَالَ: انْزِلْ فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا»، واتە: ئایا کەسێکتان لە نێودا هەیە کە ئەمشەو لەگەڵ خێزانی کۆنەبووبێتەوە؟ ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر کەس شەوەکەی لەگەڵ خێزانی کۆبووبێتەوە دروست نیە بەیانیەکەی دابەزێتە نێو گۆڕی مردوو، بەڵکو ئەو کەسەی دەچێتە نێو گۆڕ بۆ دامەزراندنی جەنازەکە، دەبێ کەسێک بێ، کەوا شەوەکەی لەگەڵ خێزانی کۆنەبووبێتەوە، با لەو کاتەدا مەحرەمی مردووەکەش دەستنەکەوێ، چونکە ئەبو تەڵحە ﵁ بۆ کچەکانی پێغەمبەر ﷺ بێگانە بوو.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ڕایەخی پێغەمبەری خوا ﷺ



**الفراش**: بریتیە لەو شتەی کە مرۆڤ لە ژێر خۆیەوە ڕایدەخات کاتێک بیەوێ دابنیشێ، یان بخەوێ، جا هەرچەندە ئەو ڕایەخە نەرم و خۆش و جێی ئاسودەیی بێ، ئەوە زیاتر وا لە مرۆڤ دەکات خەوی دوورو درێژو تەمبەڵی و تەوەزەلی ڕووی تێبکات، لە کاتێکدا ئەگەر بە پێچەوانەوە بێ، ئەوە مرۆڤ بە ئەندازەی پێویست لەسەری دەخەوێ نەک زیاتر.

پێغەمبەر ﷺ ڕایەخەکەی ئەوەندە نەرم و نۆڵ و ئاسوودە نەبووە، بەڵکو تەنها پۆشاکێکی لە خوری دروستکراوی هەبوو، لەسەری دەخەوت، وە خەوەکەشی تەنها بە ئەندازەی ئەوە بووە کە ماندوویەتی بحەسێتەوەو پشوویەک بدات، تەنها بە ئەندازەی پێویست دەچوو بۆ سەر جێگا، نەک زیاتر، چونکە بێگومان ئەو لە ژیانیدا کارێکی زۆر لەوە گەورەتری لە پێش بووە، پێغەمبەرو نێردراوی پەروەردگاری جیهانییان بووەو، پێشەنگی بەندەکانی خوا بووە بە گشتی.

٣٢٨- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: «إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي يَنَامُ عَلَيْهِ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهُ لِيفٌ»[1].

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: «(ئەو) پێخەف و ڕایەخەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری دەخەوت لە پێستی خۆشکراوو دروستکرابوو، ناوەکەشی ڕیشالی خورمای تێدابوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «إِنَّمَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، وشەی (إِنَّمَا) لە ڕەوانبێژی عەرەبیدا بۆ کورتهەڵێنانی شتێکە لەسەر شتێک، بۆیە عائیشە رضي الله عنها بەو وشەیە ئەوە دووپات دەکاتەوەو دەیسەلمێنێ کە ڕایەخەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بەو شێوەیە بووەو جۆرێکی دیکە نەبووە.

کە دەڵێ: «الَّذِي يَنَامُ عَلَيْهِ»، ئەوە ڕوونکردنەوەیە بۆ ڕایەخە، کە بێگومان بۆ پشوودان و خەوتنەکەی بۆی ئامادەکراوە، بە زۆریش ئەو ڕایەخەی کە مرۆڤ لەسەری دەخەوێ ئەوەیە کە زۆر نەرم و ئاسوودە بەخش بێ.

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٤٥٦، ومسلم: ٢٠٨٢، والمصنِّف في جامعه: ١٧٦١.




کە دەڵێ: «مِنْ أَدَمٍ»، کۆی (أدیم)ـە، بە مانای پێستەی خۆشکراوە، کەواتە: ڕایەخەکەی پێغەمبەر ﷺ لە پیستەی خۆشکراو بووە، «حَشْوُهُ لِيفٌ»، (لیفٌ): ئەو شتە نەرمەیە کە لە دارخورما دەردەهێنرێ (ڕیشاڵی خورما).

٣٢٩- عَنْ جَعْفَرُ بْنُ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: سُئِلَتْ عَائِشَةُ ﵂، مَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِكِ؟ قَالَتْ: «مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهُ مِنْ لِيفٍ» وَسُئِلَتْ حَفْصَةُ، مَا كَانَ فِرَاشُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِكِ؟ قَالَتْ: مِسْحاً نَثْنِيهِ ثَنِيَّتَيْنِ فَيَنَامُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ قُلْتُ: لَوْ ثَنَيْتَهُ أَرْبَعَ ثَنْيَاتٍ لَكَانَ أَوْطَأَ لَهُ فَثَنَيْنَاهُ لَهُ بِأَرْبَعِ ثَنْيَاتٍ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: «مَا فَرَشْتُمْ لِيَ اللَّيْلَةَ» قَالَتْ: قُلْنَا: هُوَ فِرَاشُكَ إِلَّا أَنَّا ثَنَيْنَاهُ بِأَرْبَعِ ثَنْيَاتٍ، قُلْنَا: هُوَ أَوْطَأُ لَكَ قَالَ: «رُدُّوهُ لِحَالَتِهِ الْأُولَى، فَإِنَّهُ مَنَعَتْنِي وَطَاءَتُهُ صَلَاتِيَ اللَّيْلَةَ»[1].

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پرسیارم کرد لە عائیشە ﵂ پێخەف و ڕایەخی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی تۆ چی بوو؟ گوتی: «لە پێستی خۆشکراو بوو، ناویشی ڕیشاڵی دارخورما بوو »، (دەڵێ: باوکم گوتی: هەر لەوبارەوە) پرسیار کرا لە حەفصە ﵂: ئایا پێخەف و ڕایەخی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی تۆ چی بوو؟ گوتی: ڕایەخێک بوو دەمان نووشتاندەوە بە دوو قەد لەسەری دەخەوت، جا شەوێک گوتم: ئەگەر بینووشتێنینەوە بە چوار قەد بۆی نزمتر دەبێ، ئەوە بوو بۆمان نوشتاندەوە بە چوار قەد، کاتێ ڕۆژ بوویەوە، فەرمووی: «ئەمشەو چیتان بۆ ڕاخستبووم»، حەفصە ﵂ دەڵێ: گوتمان: پێخەف و ڕایەخی خۆتە، بەڵام نووشتاندوومانەتەوە بە چوار قەد، گوتمان: ئەوە بۆ تۆ نزمترە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بیگەڕێننەوە بۆ یەکەم باری، چونکە نزمیەکەی ئەمشەو ڕێگری شەو نوێژی لێکردم».

---

(١) في إسناده عبد الله بن ميمون، متروك الحديث، فالحديث ضعيفٌ جدًّا لا يُحتجُّ به، إلاَّ ما ذكر عن عائشة ﵂ في جوابها؛ فإنّه صحيحٌ لوروده في الحديث الّذي قبله.




### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مِسْحاً»، (المِسْح): پۆشاکێکە لە خوری دروست دەکرێ، قوماشەکەی بە جۆرێکە کە ئاسوودە بەخش نیە، چونکە جۆرە زبرییەکی هەیە، کە دەڵێ: «نَثْنِيهِ ثَنِيَّتَيْنِ فَيَنَامُ عَلَيْهِ»، واتە: دوو قەدی دەکەین بۆ ئەوەی ببێتە دوو دانەی لەسەر یەک، چونکە ئاوا نەرمترو خۆشتر دەبێ لەوەی کە یەک قەد بێ، بەڵام هەر چۆنێک بێ هەر زبرە.

کە دەڵێ: «فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ قُلْتُ: لَوْ ثَنَيْتَهُ أَرْبَعَ ثَنْيَاتٍ لَكَانَ أَوْطَأَ»، واتە: زیاتر بۆ ئاسوودە بەخشین سوودی هەبووە، گوتی: «لَهُ فَثَنَيْنَاهُ لَهُ بِأَرْبَعِ ثَنْيَاتٍ، فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: «مَا فَرَشْتُمْ لِيَ اللَّيْلَةَ» قَالَتْ: قُلْنَا: هُوَ فِرَاشُكَ»، واتە: هەمان ڕایەخەکەی خۆتەو نەگۆڕاوە، «إِلَّا أَنَّا ثَنَيْنَاهُ بِأَرْبَعِ ثَنْيَاتٍ، قُلْنَا: هُوَ أَوْطَأُ لَكَ»، واتە: بۆ ئەوەی زیاتر ئاسوودەیت پێبدا، کاتێک لەسەری دەخەوی، «قَالَ: رُدُّوهُ لِحَالَتِهِ الْأُولَى، فَإِنَّهُ مَنَعَتْنِي وَطَاءَتُهُ صَلَاتِيَ اللَّيْلَةَ». واتە: بیگەڕێنەوە بۆ هەمان حاڵەتی یەکەمی، چونکە نزمیەکەی ئەمشەو شەونوێژی لێکردم.




خاکی بوون و سادەیی ڕوویەکی نەرم و نیانییە، نیشانەی بە بەزەیی بوون و بە سۆزیی و، جوان مامەڵە کردنە، دوورکەوتنەوەیە لە خۆڕادان و خۆ بە گەورە زانین بەسەر خەڵکیدا، خاکیی و سادەیی پێغەمبەر ﷺ ڕوون و ئاشکراو دیارە لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتیدا ڕەنگیداوەتەوە.

٣٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ إِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ فَقُولُوا: عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما، دەگێڕێتەوە، عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «زێدەڕۆیی مەکەن لە مەدحکردنـمدا، وەک نەصڕانیەکان لە مەدحی کوڕی مەریەمدا تێیانـپەڕاند، بێگومان من تەنیا بەنـدەم (مرۆڤێکی ئاسایی و بەندەی خوام)، بۆیە بڵـێن: بەندەو ڕەوانەکراوی خوا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنَ مَرْيَمَ»، (الإطْراء): زێدەڕۆییکردنە لە پیاهەڵدان و ستایشکردن، نەصڕانیەکان لە پیاهەڵدانی عیسادا عليه السلام زۆر زێدەڕۆییان کردوە لە ستایشکردنیدا، زۆر ڕۆچوون و تووشی لادان بوون، بە جۆرێک هەندێکیان کردوویانە بە خوا، هەیانە کردوویەتی بە کوڕی خوا، پاک و بێگەردی بۆ خوای گەورەو باڵادەست لەوەی کە ستەمکارو سنوور بەزێنەکان دەیڵێن.

لەگەڵ ئەو قەدەغەکردنە ڕاشکاوو ڕوونە، کەچی هەرواش هەندێک لە خەڵکی لە خۆی ڕازی نابێ، هەتا خۆی تووشی لادان و ڕۆچوون نەکات، هەتا بە جۆرێک هی وا هەیە کە هەندێک سیفەتی داوەتە پاڵ کە تەنها بۆ خوا دەست دەدەن، ئەویش لای هەندێک لەوانەی کە لە پیاهەڵدان ڕۆچوون و زێدەڕۆیی ناڕەوایان کردوە، ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە تەنها گرنگی بە پیاهەڵدانی ناشایستەو نابەجێ دەدەن، وە هیچ گرنگی بە شوێنکەوتنی سوننەتەکانی نادەن.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٤٦٢، ومسلم: ١٦٩١، والمصنّف في جامعه: ١٤٣٢.



کە دەڵێ: «إِنَّمَا أَنَا عَبْدٌ فَقُولُوا: عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ»، ئەوەی کە لەسەر ئێمە پێویستە ئەوەیە کە بەو جۆرە باسی بکەین و ستایشی بکەین، کەوا خۆی پێی ڕازیە ﷺ، هەر ئەوەش نیشانەی خۆشویستنی پێغەمبەرە ﷺ.

ئەگەر لەم وشانە ڕابمێنین کەوا پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی هەڵیبژاردوون، ئەوە دەبینی کە چەندە بە نێوەندگیریی هەڵیبژاردوون، چونکە بێگومان بڕوای بە دوو شت تێدا کۆکردوونەوە، کە ئەوانیش بەندایەتی و پەیامبەرییە، پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس زیاترو تەواوتر بەندایەتی بۆ خوا کردوەو، باشترین فەرمانبەرداریی کردوە بۆ خوای گەورە، لە لایەکی دیکەش پەیامەکەی خوای گەورەی بە جۆرێک گەیاندوە، کە هیچ شتێکی چاک و باشەی جێنەهێشتوە کە بە ئۆممەتەکەی ڕانەگەیاندبێ، وە هیچ خراپەیەکیش نیەکە ئۆممەتەکەی لێ ئاگادار نەکردبێتەوە.

ئەو «عَبْد اللَّهِ» یە، دەی بەندەش ناپەرسترێ، وە هیچ شتێک لەو شتانەی کە تایبەتن بە پەروەردگار، نادرێتە پاڵی هەرچەند پایەشی بەرز بێ.

«وَرَسُولُهُ»، دەی پێغەمبەریش ﷺ ئەو کەسەیە کە دەبێ گوێڕایەڵی بکرێ، وە دەبێ شوێن پێی هەڵبگیرێ و خەڵک لەسەر ڕێبازەکەی بڕوات، وە دەبێ شوێن سوننەتەکەی بکەون.

وە وشەی «عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ»، بەندە لە زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی دوور دەخاتەوە، نێوەندگیری پێ دەبەخشێ، نە زێدەڕۆیی و نە کەمتەرخەمی، جا دوورکەوتنەوە لە ڕۆچوون و لادان و سنووربەزاندن بەوە دێتە جێ کە بڕوات وابێت بەندەی خوایە، دوورکەوتنەوەش لە کەمتەرخەمی بەوە دێتە جێ کە بڕوات وابێت پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٣٣١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ لَهُ: إِنَّ لِي إِلَيْكَ حَاجَةً، فَقَالَ: «اجْلِسِي فِي أَيِّ طَرِيقِ الْمَدِينَةِ شِئْتِ أَجْلِسْ إِلَيْكِ»[1].

---

(١) أخرجه أبو داود في سننه: ٤٨١٨، وفي إسناده سويد بن عبد العزيز، وهو لينُ الحديث، لكن رواه مسلم: ٢٣٢٦ من حديث حمّاد بن سلَمة، عن ثابت عن أنس أنَّ امْرَأَةً كَانَ في عَقْلِهَا شَيءٌ، فَقَالَت: يا رَسولَ اللَّهِ ﷺ: إنَّ لِي إلَيْكَ حَاجَةً، فَقَالَ: «يَا أُمَّ فُلانٍ! انظُرِي أيَّ السِّكَكِ شِئْتِ حَتَّى أَقْضِي حَاجَتَكِ»، فَخَلا مَعَها في بَعضِ الطُّرُقِ حَتَّى فَرَغَتْ مِن حَاجَتِها.




واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ، دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: من پێویستیەکم بە تۆ هەیە (هاوکاریم بکەی)، (پێغەمبەریش ﷺ) پێی فەرموو: «لە کام ڕێگاو کۆڵانی مەدینە پێت خۆشە دابنیشە، منیش لەگەڵت دادەنیشم». (تا چیت پێویست بوو بۆت جێبەجێ بکەم).

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا خاکی بوون و سادەیی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێ بۆ ئەو ئافرەتە، بۆ گوێگرتن لە پێداویستیەکانی، هەروەها لەو ڕووەش کەوا دیاریکردنی شوێن و هەڵبژاردنی دایە دەستی ئافرەتەکە، پێی نەفەرموو: وەرە بۆ لام بۆ فڵان شوێن تا گوێت بۆ بگرم، بۆیە ئافرەتەکە شوێنەکەی هەڵبژاردو پێغەمبەریش ﷺ گوێی بۆ گرت، هەتاکو هەموو شتەکانی خۆی لەلا گوت، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ گچکەو گەورە، لەگەڵ خزمەتکارو ئافرەت سادە بوو، هەر ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کەوا بانگەوازەکەی وەربگیرێ.

٣٣٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ  قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُ الْمَرِيضَ، وَيَشْهَدُ الْجَنَائِزَ، وَيَرْكَبُ الْحِمَارَ، وَيُجِيبُ دَعْوَةَ الْعَبْدِ، وَكَانَ يَوْمَ بَنِي قُرَيْظَةَ عَلَى حِمَارٍ مَخْطُومٍ بِحَبْلٍ مِنْ لِيفٍ وَعَلَيْهِ إِكَافٌ مِنْ لِيفٍ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ، دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی نەخۆشی دەکردو، ئامادەی جەنازەی مردووەکان دەبوو، وە سواری گوێ درێژ دەبوو، ئەگەر بەندەیەک دەعوەتی کردبا بە دەمیەوە دەچوو، لە ڕۆژی بەنی قورەیزەدا لەسەر گوێدرێژێکی جڵەو کراو بە گوریسێکی لە ڕیشاڵی خورما دروستکراو، کورتانێکیشی لەسەر بوو (ئەویش هەر) لە ڕیشاڵی دارخورما بوو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُ الْمَرِيضَ»، ئەو نەخۆشە گەورە، یان گچکە بووایە، مسوڵمانە، یان کافر بووایە سەردانی دەکرد، سەردانی نەخۆش دەبێتە

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٠١٧، وابن ماجه في السنن: ٢٢٩٦، إسناده ضعيفٌ؛ لأنّه لا يعرف إلاّ من طريق مسلم الأعور، وهو واهي الحديث، لكن ما ذكر في الحديث من معانٍ كلّه له دلائله في سنّته ﷺ الثّابتة.

هۆی فەرامۆشی و ئاسودەیی بۆ نەخۆشەکە، خۆشی دەچێتە ناو دڵیەوە، هەروەها بانگکردنی نەخۆشەکە بۆ لای خوای گەورە، جگە لەوانەش دەبێتە هۆی پاداشتێکی زۆر لەلایەن خواوە ﷻ.

«وَيَشْهَدُ الْجَنَائِزَ»، واتە: ئامادە دەبوو تا کاتێک کە لە ناشتنی دەبوونەوە.

«وَيَرْكَبُ الْحِمَارَ»، گوێدرێژ لەو سەردەمەدا کەمترین شتێک بووە کە بۆ گواستنەوە بەکارهاتبایە لە ڕووی نرخ و سەنگەوە، بۆیە کاتێک پێغەمبەر ﷺ بە سواری گوێدرێژ ڕۆیشتووە ئەوە لەبەر خاکی بوون و سادەییەکەی بووە.

«وَيُجِيبُ دَعْوَةَ الْعَبْدِ»، خۆ ئەگەر بەندەیەک دەعوەتی بکردبایە بۆ ماڵەکەی خۆی، ئەوە پێغەمبەر ﷺ بە دەمییەوە دەچوو، هەر بە هۆی ئەو ڕەفتارە بەرزو گەورانە دڵی خەڵکی کەمەندکێش دەکرد.

«وَكَانَ يَوْمَ بَنِي قُرَيْظَةَ عَلَى حِمَارٍ مَخْطُومٍ بِحَبْلٍ مِنْ لِيفٍ»، چیرۆکی بەنو قورەیزە زانراو و ڕوونە، کە کاتێک پەیمانی نێوان خۆیان و پێغەمبەریان ﷺ شکاند، کە لە ڕۆژی ئەحزابدا خیانەتیان کرد، جا کاتێک لەگەڵ ئەحزاب یەکلابوویەوە، ئنجا ئاوڕی لە بەنو قورەیزە دایەوەو گەمارۆی خستنە سەرو، شەڕی لەگەڵ کردن، پیاوەکانیان کوژران، جا لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ بە سواری گوێدرێژێک بوو کە کورتان و جڵەوەکەی لە پەلکی دارخورما دروست کرابوون.

«وَعَلَيْهِ إِكَافٌ مِنْ لِيفٍ»، (إكاف): کورتان، ئەوەی کە دەخرێتە سەر پشتی گوێدرێژ بۆ سواریی، لە جێی زینی ئەسپ و کەژاوەی حوشتر، جا سواریی پێغەمبەر ﷺ بەسەر ئەو جۆرە وڵاخەوە ئەوە لە خاکی بوون و سادەییەکەی بووە.

٣٣٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُدْعَى إِلَى خُبْزِ الشَّعِيرِ وَالْإِهَالَةِ السَّنِخَةِ فَيُجِيبُ. وَلَقَدْ كَانَ لَهُ دِرْعٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ فَمَا وَجَدَ مَا يَفُكُّهَا حَتَّى مَاتَ»[1].

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١١٩٩٣، وإسناده ضعيفٌ لا نقاطعه؛ فإنَّ الأعمشَ لم يسمع من أنسٍ ﷺ لكن رواه الإمام البُخاري في كتابه الصَّحيح: ٢٠٦٩ من طريق قتادة عن أنسٍ ﷺ أَنَّهُ مَشَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِخُبزِ شَعيرٍ، وإِهَالَةٍ سَنِخَةٍ، وَلَقَد رَهَنَ النَّبِيُّ ﷺ دِرْعاً لَهُ بِالْمَدِينَة عِنْدَ يَهُودِيٍّ، وَأَخَذَ مِنْهُ شَعِيراً لِأَهْلِهِ.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ بانگهێشت دەکرا بۆ (خواردنی) نانی جۆو ڕۆنی بۆنکردوو، داواکەی بە جێدەهێنا، زرێکەی لای جوولەکەیەک بوو، هیچی دەستنەکەوت تاکو بیدات بۆ لابردنی ڕەهنەکەی تا ڕووحی بە خوا سپارد».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُدْعَى إِلَى خُبْزِ الشَّعِيرِ وَالْإِهَالَةِ السَّنِخَةِ فَيُجِيبُ»، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا پێغەمبەر ﷺ لە لوتکەی خاکی بوون و سادەیی دا بووە، هەرچەندە ئەو خواردنەی کەوا بۆی بانگهێشت کراوە سادەو ساکار بووە، بەڵام ئەو بە دەم بانگهێشتەکەوە چووە.

«الْإِهَالَةِ»، هەر جۆرە ڕۆنێک کە بکرێتە پێخۆر، «السَّنِخَةِ»، بەو شتە دەڵێن: کەوا کەمێک تام و بۆنی گۆڕانی بەسەردا هاتبێت بە هۆی زۆر مانەوە.

«وَلَقَدْ كَانَ لَهُ دِرْعٌ عِنْدَ يَهُودِيٍّ فَمَا وَجَدَ مَا يَفُكُّهَا حَتَّى مَاتَ»، لە صەحیحی بوخاریدا[1] هاتوە کەوا زرێیەکە لە ئاسن بووە، لە هەندێک سەرچاوەی دیکەدا هاتوە کەوا جوولەکەکە بە ئەبو شەحمی یەهودی بانگ دەکرا، پێغەمبەر ﷺ بیست صاع جۆی لێ کڕیوە، گوتراوە: سی صاع جۆی لێ کڕیوە، پارەی کڕینەکەی نەبووە، بۆیە زرێکەی لەلا داناوە بە بارمتە تا ئەو کاتەی پارەی دەبێ، ئیتر هەتاکو وەفاتی کرد ئەوەندە پارەی نەبوو کە زرێکەی پێ لە بارمتە بێنێتە دەرەوە، بۆیە ئەبوبەکر ﷺ لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ زرێکەی لە ڕەهن هێنایە دەرەوە.

٣٣٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَحْلٍ رَثٍّ وَعَلَيْهِ قَطِيفَةٌ لَا تُسَاوِي أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجّاً لَا رِيَاءَ فِيهِ وَلَا سُمْعَةَ»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر کۆپانی حوشترێکی شڕەوە گەشتی حەجی کرد، پۆشاکێکی قەدیفەی لەبەر بوو، نرخەکەی چوار درەم نەبوو (واتە: زۆر هەرزان و سادە بوو)، جا دەیفەرموو: «خوایە! (ئەم حەجەم)

---

(١) برقم: ٢٠٦٨ من حديث عائشة ﷺ.

(٢) أخرجه ابن ماجه في السنن: ٢٨٩٠، وإسناده ضعيفٌ لضعف الرَّبيع بن صبيح، وكذلك شيخه يزيد بن أبان الرَّقاشي، وله شاهدٌ من حديث ابن عبَّاسٍ ﷺ رواه الطَّبراني في الأوسط: ١٣٧٨.




بۆ بگێڕە بە حەجێک کە ڕیاو ناوبانگی تێدا نەبێ». (ئامانج تێیدا بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خۆت بێ).

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى رَحْلٍ رَثٍّ»، (الرَّحل): ئەو شتەیە کە لەسەر پشتی حوشتر دادەنرێ بۆ لەسەر دانیشتن لە کاتی سواربوونیدا، (الرَّث) بە شتێک دەگوترێ کە شڕو کۆن و پەڕپووت بێت.

کە دەڵێ: «وَعَلَيْهِ قَطِيفَةٌ»، پارچە قوماشێک کە گوێچکەی هەبێ و شۆڕ بێتەوە، ئەوەی لەسەر کەژاوەکە دانابوو، «لَا تُسَاوِي أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ»، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر خاکی بوونەکەی.

جا کاتێک لە میقات تەهلیلەی کردو نیەتی حەجی هێنا، ئەو پاڕانەوەیە گەورەیەی کرد: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجًّا لَا رِيَاءَ فِيهِ وَلَا سُمْعَةَ»، دووعای سەرفراز بوون و یەکلابوونەوەی بۆ خوا تێدایە، خوای گەورە بێ نیازترینە لە هاوبەشان، هیچ کردەوەیەکیش وەرناگرێ کە تەنها بۆ ئەو نەبێ، خۆ ئەگەر کەسێک لە کارەکەیدا هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە خوای پاک و بێگەرد خۆی و کردەوەکەی لەگەڵ ئەو هاوبەشەی بڕیاری داوە وازی لێ دەهێنێ بۆ ئەو، هەر کەس حەجی ماڵی خوا بۆ ناوو ناوبانگ و ستایشی خەڵکی بکات ئەوە لێی وەرناگیرێ، هەر کەسێکیش بۆ ڕیاو ناوبانگ بیکات خوای گەورە بە هەمان نیەت پاداشتی دەداتەوە، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ کە هەوڵبدات هەمیشە لە ڕیاو ڕووپامایی دووربکەوێتەوە[1].

٣٣٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» قَالَ: «وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا، لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهَتِهِ لِذَلِكَ»[2].

---

(١) وە لەو کێشە گەورانەی کە لەم ڕۆژگارەی ئێستادا هەیە - وە کاریگەریشی هەیە لەسەر هەبوونی گرفت لە دڵسۆزیی و ئیخلاصدا - ئەوەیە کە حاجیەکان و ئەوانەی کە دەچن بۆ ئەنجامدانی عومرە دەیکەن بە گرتنی وێنەی خۆیان بۆ یادگاری لە شوێنی عیبادەتەکان، تاکو ئەو کاتەی گەڕایەوە بە خەڵکی پیشان بدات، تەنانەت هەندێکیان دەستی بەرز دەکاتەوە وەک ئەوەی دووعا بکات بەڵام کاتی کە وێنەکە گیرا دەستی خۆی دادەنێت!

(٢) أخرجه: المصنّف في جامعه: ٢٧٥٤.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷛، دەڵێ: «هیچ کەسێک بە لایانەوە خۆشەویستتر نەبووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ»، گوتی: «لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ دەیانبینی (و دەهاتە لایان) بۆی هەڵنەدەستانەوە سەر پێ، چونکە دەیانزانی ئەوەی پێناخۆش بوو».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، شوێن و پێگەی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ڕوون دەکاتەوە لە دڵی هاوەڵە بەڕێزەکاندا، کە پێغەمبەریان ﷺ لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان و هەموو خەڵک لەلا خۆشەویستتر بووە.

کە دەڵێ: «وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا، لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهَتِهِ لِذَلِكَ»، چونکە خۆشویستن دەبێ فەرمانبەرداریی تەواوی لەگەڵدا بێت، ئەوەی کە پێغەمبەریش ﷺ خۆشیویستوەو پێی خۆشبووە دەبێ خۆشی بوێ، بەڵام بێ فەرمانی کردن بە بانگەشەی ئەوەی کە گوایە خۆشتدەوێ، ئەوە هیچ پێی ناگوترێ خۆشویستن، تەماشای هاوەڵانت نەکردوە کە چەندیان خۆشویستوە، هەر کات بینیویانە پێیان خۆشبووە لەبەری هەڵسن، بەڵام چونکە زانیوویانە خۆشەویستیان ﷺ پێی خۆش نیە، لەبەری هەڵنەستاون.

ئا ئەوە پێی دەگوترێ یاساو ڕێسای خۆشویستن، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە هیچ یاسایەک ڕەچاو ناکەن، نەک هەر ئەوە، بەڵکو جاری وایە دەکەونە چەند ترازانێکی ترسناک و مەترسیدارەوە، تووشی داهێنانی زۆردەبن لە کاتێکدا کە بانگەشەی خۆشەویستیان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکەن بە گومانی خۆیان، کە ئەوە نە خۆشویستن و، نە وەفایە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

٣٣٦- عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷛، قَالَ: سَأَلْتُ خَالِي هِنْدَ بْنَ أَبِي هَالَةَ، وَكَانَ وَصَّافاً عَنْ حِلْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَنَا أَشْتَهِي أَنْ يَصِفَ لِي مِنْهَا شَيْئاً، فَقَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَخْماً مُفَخَّماً، يَتَلَأْلأُ وَجْهُهُ تَلَأْلُؤَ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ» فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ قَالَ الْحَسَنُ: «فَكَتَّمْتُهَا الْحُسَيْنَ زَمَاناً، ثُمَّ حَدَّثْتُهُ فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي إِلَيْهِ. فَسَأَلَهُ عَمَّا سَأَلْتُهُ عَنْهُ وَوَجَدْتُهُ قَدْ سَأَلَ أَبَاهَا عَنْ مَدْخَلِهِ وَمَخْرَجِهِ وَشَكْلِهِ فَلَمْ يَدَعْ مِنْهُ شَيْئاً».

قَالَ الْحُسَيْنُ ﷛: فَسَأَلْتُ أَبِي، عَنْ دُخُولِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: كَانَ «إِذَا أَوَى إِلَى مَنْزِلِهِ جَزَّأَ دُخُولَهُ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ، جُزْءاً لِلَّهِ، وَجُزْءاً لِأَهْلِهِ، وَجُزْءاً لِنَفْسِهِ، ثُمَّ جَزَّأَ جُزْأَهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ، فَيَرُدُّ ذَلِكَ

بِالْخَاصَّةِ عَلَى الْعَامَّةِ، وَلَا يَدَّخِرُ عَنْهُمْ شَيْئاً، وَكَانَ مِنْ سِيرَتِهِ فِي جُزْءِ الْأُمَّةِ إِيثَارُ أَهْلِ الْفَضْلِ بِإِذْنِهِ وَقَسْمِهِ عَلَى قَدْرِ فَضْلِهِمْ فِي الدِّينِ، فَمِنْهُمْ ذُو الْحَاجَةِ، وَمِنْهُمْ ذُو الْحَاجَتَيْنِ، وَمِنْهُمْ ذُو الْحَوَائِجِ، فَيَتَشَاغَلُ بِهِمْ وَيَشْغَلُهُمْ فِيمَا يُصْلِحُهُمْ وَالْأُمَّةَ مِنْ مُسَاءَلَتِهِمْ عَنْهُ وَإِخْبَارِهِمْ بِالَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ وَيَقُولُ: «لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغَائِبَ، وَأَبْلِغُونِي حَاجَةَ مَنْ لَا يَسْتَطِيعُ إِبْلَاغَهَا، فَإِنَّهُ مَنْ أَبْلَغَ سُلطَاناً حَاجَةَ مَنْ لَا يَسْتَطِيعُ إِبْلَاغَهَا ثَبَّتَ اللَّهُ قَدَمَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، لَا يُذْكَرُ عِنْدَهُ إِلَا ذَلِكَ، وَلَا يُقْبَلُ مِنْ أَحَدٍ غَيْرِهِ، يَدْخُلُونَ رُوَّاداً وَلَا يَفْتَرِقُونَ إِلَا عَنْ ذَوَاقٍ، وَيُخْرِجُونَ أَدِلَّةً يَعْنِي عَلَى الْخَيْرِ.

قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنْ مَخْرَجِهِ كَيْفَ يَصْنَعُ فِيهِ؟ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْزِنُ لِسَانَهُ إِلَا فِيمَا يَعْنِيهِ، وَيُؤَلِّفُهُمْ وَلَا يُنَفِّرُهُمْ، وَيُكْرِمُ كَرِيمَ كُلِّ قَوْمٍ وَيُوَلِّيهِ عَلَيْهِمْ، وَيُحَذِّرُ النَّاسَ وَيَحْتَرِسُ مِنْهُمْ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَطْوِيَ عَنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ بِشْرَهُ وَخُلُقَهُ، وَيَتَفَقَّدُ أَصْحَابَهُ، وَيَسْأَلُ النَّاسَ عَمَّا فِي النَّاسِ، وَيُحَسِّنُ الْحَسَنَ وَيُقَوِّيهِ، وَيُقَبِّحُ الْقَبِيحَ وَيُوَهِّيهِ، مُعْتَدِلُ الْأَمْرِ غَيْرُ مُخْتَلِفٍ، لَا يَغْفُلُ مَخَافَةَ أَنْ يَغْفُلُوا أَوْ يَمِيلُوا، لِكُلِّ حَالٍ عِنْدَهُ عَتَادٌ، لَا يُقَصِّرُ عَنِ الْحَقِّ وَلَا يُجَاوِزُهُ. الَّذِينَ يَلُونَهُ مِنَ النَّاسِ خِيَارُهُمْ، أَفْضَلُهُمْ عِنْدَهُ أَعَمُّهُمْ نَصِيحَةً، وَأَعْظَمُهُمْ عِنْدَهُ مَنْزِلَةً أَحْسَنُهُمْ مُوَاسَاةً وَمُؤَازَرَةً».

قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنْ مَجْلِسِهِ، فَقَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَقُومُ وَلَا يَجْلِسُ إِلَا عَلَى ذِكْرٍ، وَإِذَا انْتَهَى إِلَى قَوْمٍ جَلَسَ حَيْثُ يَنْتَهِي بِهِ الْمَجْلِسُ وَيَأْمُرُ بِذَلِكَ، يُعْطِي كُلَّ جُلَسَائِهِ بِنَصِيبِهِ، لَا يَحْسَبُ جَلِيسُهُ أَنَّ أَحَداً أَكْرَمُ عَلَيْهِ مِنْهُ، مَنْ جَالَسَهُ أَوْ فَاوَضَهُ فِي حَاجَةٍ صَابَرَهُ حَتَّى يَكُونَ هُوَ الْمُنْصَرِفُ عَنْهُ، وَمَنْ سَأَلَهُ حَاجَةً لَمْ يَرُدَّهُ إِلَا بِهَا أَوْ بِمَيْسُورٍ مِنَ الْقَوْلِ، قَدْ وَسِعَ النَّاسَ بَسْطُهُ وَخُلُقُهُ، فَصَارَ لَهُمْ أَباً وَصَارُوا عِنْدَهُ فِي الْحَقِّ سَوَاءً، مَجْلِسُهُ مَجْلِسُ عِلْمٍ وَحِلْمٍ وَحَيَاءٍ وَأَمَانَةٍ وَصَبْرٍ، لَا تُرْفَعُ فِيهِ الْأَصْوَاتُ وَلَا تُؤْبَنُ فِيهِ الْحُرَمُ، وَلَا تُثْنَى فَلَتَاتُهُ مُتَعَادِلِينَ، بَلْ كَانُوا يَتَفَاضَلُونَ فِيهِ بِالتَّقْوَى، مُتَوَاضِعِينَ يُوقِّرُونَ فِيهِ الْكَبِيرَ وَيَرْحَمُونَ فِيهِ الصَّغِيرَ، وَيُؤْثِرُونَ ذَا الْحَاجَةِ وَيَحْفَظُونَ الْغَرِيبَ»[1].

واتە: لە حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ دەگێڕنەوە کە گوتویەتی: پرسیارم لە خاڵم کرد کە هیندی کوڕی ئەبو هالەیە کە ئەو پیاوە زۆر شارەزا بووە لە سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، پرسیارم لێ کرد دەربارەی خوو سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە من زۆر حەزم دەکرد شتێکم لەو بارەوە بۆ باس بکات، ئەویش گوتی: «پێغەمبەر ﷺ کەسێکی هەڵکەوتەو تێرو تەواو بوو، وە هەر بەو جۆرەش دەهاتە پێش چاو، ڕوخساری وەک مانگی چواردە دەدرەوشایەوە»، ئنجا فەرموودەکەی بە درێژی گێڕایەوە.

---

(١) انظر: (ح ٨).

حەسەن گوتی: «ماوەیەک ئەو باسکردنەی لە حوسەینی برای شاردبۆوە، پاشان بۆی گێڕابۆوە، کەچی دیتم ئەو پێش من ئەو پرسیارانەی کردوە، دەربارەی پێغەمبەر ﷺ کەوا من کردوومن».

تەماشام کرد ئەو پرسیاری لە باوکی خۆی (عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب) کردبوو، دەربارەی هاتنەوەو چوونە دەر لە ماڵ و دیمەن و شێوەی پێغەمبەر ﷺ بۆیە حسێن گوتی: من پرسیارم لە باوکم کردوە دەربارەی ئەو کاتانەی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە ماڵەوەو گوتویەتی: کاتێک پێغەمبەر ﷺ دەهاتەوە بۆ ماڵەوە کاتەکەی دەکرد بە سێ بەش بەشێکی تەرخان دەکرد بۆ خواپەرستی، بەشێکیش بۆ ماڵ و خێزانەکانی، بەشێکیش بۆ خۆی، پاشان ئەو بەشەی تایبەت بە خۆی بوو لە نێوان خۆیی و خەڵکیدا دابەش دەکرد، لەو بەشەدا لەگەڵ خەڵکی دابوو، پرسیاری ئەو هاوەڵانەی وەڵام دەدایەوە کە تایبەت بوون (بۆ پرسیارکردن لە دین و تێگەیشتن) پاشان بۆ ئەوانەی دیکە بە گشتی (کەوا شارەزای دینیان لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگواستەوە) وە هیچ پرسیارێکی بەبێ وەڵام بەجێ نەدەهێشت (هەموو شتی بۆ ڕوون دەکردنەوە) لەو بەشەی کە بۆ خەڵکی تەرخان دەکرد عادەتی وابوو ئەوانەی پێش دەخست کە خاوەنی پێگەی بەرز بوون لە دیندا، کەوا هەریەکەو بە گوێرەی فەزڵ و پلەو پایەی خۆی بەشی خۆی پێدەدا.

جا هەیان بووە یەک پرسیاری هەبوو، هەیانبوو دوو پرسیارو، هەیان بوو چەند پرسیار، یان چەند پێداویستیەکی هەبوو، بۆیە (وەکو ڕێزێک) لەگەڵیاندا سەرقاڵ دەبوو، ئەوانیش بەوە سەرقاڵ دەکرد کەوا خێری خۆیان و خەڵکی تێدا بوو، لە داواکاریان و تێگەیاندنیان لەو شتانەی کەوا پێویستیان پێیە، وە دەیفەرموو: «ئەوانەی کە ئامادەن و گوێیان لێیە با بەو کەسانەی بگەیەنن کەوا لێرەنین، وە داواکاری ئەو کەسانە بگەیننە لام کەوا ناتوانن خۆیان بیگەیەنن، چونکە لە ڕاستیدا هەر کەسێک پێداویستی کەسێک بە دەسەڵاتدار بگەیەنێت کەوا خۆی توانای گەیاندنی نیە، ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتتدا دامەزراوی دەکات».




(لە درێژەی گێڕانەوەکەدا گوتی:) لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ جگە لەو شتانە هیچی دیکە باس نەدەکرا، وە قبوڵیشی نەدەکرد لە هیچ کەسی دیکە جگە لەو شتانەی کەوا بۆ دین و ژینی خەڵکی بەسوودن، وە پیاوە سەرکردەکان سەردانیان دەکرد، لە مەجلیسەکەی هەڵنەدەستان مەگەر بە چێژی تێگەیشتن نەبێت، وە بەڕێنیشاندەرو مامۆستا لە خزمەتی دەردەچوون.

گوتی: پرسیارم لێ کرد دەربارەی چوونە دەرەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ناو خەڵک و چۆنیەتی مامەڵەکردنی؟ گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ زمانی خۆی دەپاراست تەنها لە بارەی شتێکەوە قسەی دەکرد کەوا پەیوەندی بە ئەوەوە هەبوایەو هەمیشە دڵی خەڵکی بە یەکەوە پەیوەست دەکرد لەسەر ڕاستی و، هەرگیز لە یەکتری دوور نەدەخستنەوە، هەروەها ڕێزی لە پیاو ماقوڵی هەر هۆزێک دەگرت و وەک برا گەورەی هۆزەکەی حیسابی بۆ دەکرد، بە وریاییەوە دەجوڵایەوە لەگەڵ خەڵکیدا، خۆی لە هەندێ کەس دەپاراست (واتە: هەر کەسەو بە جۆرێک مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد کە لێی بوەشابایەوە) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز ڕووخۆش و ڕەوشت بەرزی خۆی لە کەس نەدەشاردەوە، پرسیاری دەربارەی هاوەڵانی دەکردو، پرسیاری دەربارەی خەڵکی و پێداویستی دەکرد، کاری باشی پەسند دەکردو پشتگیری و کاری خراپی بە پووچ دادەناو قەدەغەی دەکرد، هەمیشە بەکار لە جێی کاری دەکردو ئامانجی دەپێکا، هەمیشە بەئاگا بوو، نەبادا ئەوانەی لە دەوری ئەون بێ ئاگابن لە یادی خواو خەیاڵ و بیریان و بڕوات و لابدات، بۆ هەموو پێشهات و حاڵەتێک ئامادەبوو، هەرگیز بەرانبەر هەق کەمتەرخەم نەبووەو سنورییشی نەبەزاندوە (مامناوەندبووە) ئەوانەی لە چوار دەوری بوون هەمیشە لە گەورە پیاوان و پایە بەرزەکانی ناو خەڵک بوون، گەورەترین کەس لای پێغەمبەر ﷺ دڵسۆزترینیان بووە (بۆ دین و ژینی خەڵکی) پلە بەرزترینیان ئەو کەسانە بوون کەوا بە تەنگ کێشەی خەڵک و پشتیوانی پێغەمبەرو ﷺ دینەکەی بوون».

گوتی: پرسیارم دەربارەی مەجلیسەکانی پێغەمبەر ﷺ لێ کرد، ئەویش گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسان و دانیشتنی تەنها یادو زیکری خوا بوو، کاتێک دەچووە مەجلیس لەو شوێنە دادەنیشت کە کۆتایی مەجلیسە، وە بەو جۆرەش فەرمانی





دەکرد، وە هەموو ئامادەبووانی مەجلیس هەقی خۆی پێدەدا، ئەندامانی مەجلیس هەر یەکەیان وای دەزانی لە هەموویان بەڕێزترە لە لای پێغەمبەر ﷺ، کاتێک کەسێک دەربارەی پێداویستیەکانی قسەی لەگەڵ بکردبایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی بێزار نەدەبوو، بە جێی نەدەهێشت و وازی لێ نەدەهێنا تا کابرا خۆی نەڕۆیشتبا یان وازی نەهێنابا، هەرکەسێک داواکاری هەبوایە ئەوە چی داوا کردبا هەر ئەوەی پێ دەدا، یان بەقسەی دڵخۆشکەر وەڵامی دەدایەوە، ڕەوشتە بەرزو پیرۆزو جوانەکەی هەموو خەڵکی دەگرتەوە (کەس لێی بێبەش نەدەبوو)، وەکو باوک بوو بۆیان لەدڵسۆزی و بەتەنگەوە بووندا، وە لەبەرانبەر هەقدا هەمووان لەلای یەکسان بوون، کۆڕو مەجلیسی کۆڕی زانست و ڕەوشت و ئارامی و شکۆ بوو، کۆڕی ئەمانەت پارێزی و لەسەر خۆیی بوو، دەنگی تێدا بەرز نەدەکرایەوەو، سنوورەکان نەدەبەزێنران و، شتی حەرامی تێدا نەدەگوترا و نەدەکرا، هەڵەو کەم و کوڕی و عەیبی خەڵکی تێدا بڵاو نەدەکرایەوە، دادپەروەرانە بوون، بەڵکو بەڕێزترینیان ئەوانە بوون کە بەتەقواترین بوون، لەگەڵ یەکتریدا خاکی بوون، مرۆڤی گەورەو خاوەن شکۆ بوون، ڕێز لێگیراو بوون، هەروەها لەگەڵ کەم تەمەنەکان بەسۆزو میهرەبان بوون، خاوەن پێداویستیان پێش خۆیان دەخست، مافی خەڵکی بێگانەیان دەداو دەیانپاراست».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیە بەشێکە لە فەرموودەکەی هیندی کوڕی ئەبو هالە ﷺ، کە بێگومان لە پێشووتردا ئاماژەی پێکراوە، کە لە ڕاستیدا فەرموودەکە دوورودرێژە، دانەر ﷺ لە کتێبەکەیدا بەش بەشی کردوە، فەرموودەکەش لە ڕووی ئیسنادەوە لاوازە، بەڵام ئەو سیفەتانەی کە تێیدا باس کراون لە ڕێگایترەوە باسکراون و، هاتوون و صەحیحن و سەلمێنراون.

کە دەڵێ: «فَذَكَرَ الْحَدِيثَ بِطُولِهِ»، ئاماژەیە بەوەی کە فەرموودەکە درێژە، بەڵام دانەر ﷺ بە گوێرەی بابەتەکانی نێو کتێبەکە بەش بەشی کردوە.

کە دەڵێ: «قَالَ الْحَسَنُ: فَكَتَّمْتُهَا الْحُسَيْنَ زَمَاناً»، واتە: بۆ براکەی نەگێڕاوەتەوە، بۆ حوسەینی برای باسی پرسیارەکەی خۆی نەکردوە کە لە هیندی کردوە دەربارەی




سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ، «ثُمَّ حَدَّثْتُهُ فَوَجَدْتُهُ قَدْ سَبَقَنِي إِلَيْهِ»، واتە: بینیم کە حوسەین پێش من ئەو پرسیارەی کردوە، «فَسَأَلَهُ عَمَّا سَأَلْتُهُ عَنْهُ»، لە هەندێک شوێنی دیکەدا دەڵێ: «سَأَلَ أَبِي» واتە: پرسیاری لە باوکی کردوە کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبە ﷺ، «عَنْ مَدْخَلِهِ وَمَخْرَجِهِ وَشَكْلِهِ فَلَمْ يَدَعْ مِنْهُ شَيْئاً»، واتە: حوسەین ئەوەشی زیاد پرسی بوو دەربارەی هاتنەوە نێو ماڵ و دەرچوون لە ماڵ، هەروەها کە دەهاتەوە چی دەکردو کاتەکەی چۆن دابەش دەکرد کە لە ماڵ بوو، چۆن مامەڵەی لەگەڵ ماڵ و خێزانی دەکردو، کردەوەی چۆن بوو بەرانبەریان ، هەروەها کاتێک دەردەچوو لە ماڵ و بە خەڵکی دەگەیشت و چۆنیەتی هەڵسوکەوت و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکداو پرسیاری چۆنیەتی شێوەو ڕووخسارو، دانیشتن و، چۆنیەتی سیفەتی لەگەڵ خەڵکیدا، هەموو ئەو پرسیارانەی لە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ کردبوو.

کە دەڵێ: «كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى مَنْزِلِهِ»، واتە: کە دەهاتەماڵەوە، «جَزَّأَ دُخُولَهُ ثَلَاثَةَ أَجْزَاءٍ»، واتە: ئەو کاتانەی کە لە ماڵەوە بووە کاتەکەی بەسەر سێ بەشدا دابەش کردوە، «جُزْءاً لِلَّهِ»، خۆی دەستبەتاڵ دەکرد بۆ پەرستش و، نوێژو شەونوێژ، «وَجُزْءاً لِأَهْلِهِ»، بەشێکیش بۆ ماڵ و خێزانەکانی و دانیشتن و مامەڵە کردن لەگەڵیاندا، «وَجُزْءاً لِنَفْسِهِ»، پاشان باسی ئەو بەشەی کردو ڕوونی کردەوە کە لەو بەشەی بۆ خۆی دانابوو چی دەکرد، بۆیە گوتوویەتی: «ثُمَّ جَزَّأَ جُزْأَهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّاسِ»، واتە: پێشوازی لەوانە دەکرد کە پرسیارێکیان هەبووایە، یان هەر پێویستیەکیان هەبووایە، کە دەڵێ: «فَيَرُدُّ ذَلِكَ بِالْخَاصَّةِ عَلَى الْعَامَّةِ»، واتە: لەو بەشەی کە بۆ خۆی دانابوو ئەو هاوەڵانە دەهاتن کە تایبەت بوون بۆ پرسیار کردن و تێگەیشتن لە دین لەسەر دەستی پێغەمبەر ﷺ، پاشان ئەوانەی کە دینیان لە پێغەمبەر ﷺ وەردەگرت، ئەوانیش بە خەڵکیان دەگەیاند بە گشتی.

کە دەڵێ: «وَلَا يَدَّخِرُ عَنْهُمْ شَيْئاً»، واتە: ئەگەر پرسیاریان لێ کردبا، ئەوە هەموو شتێکی وەڵام دەدانەوە و هیچی بەجێ نەدەهێشت بەبێ وەڵام.

کە دەڵێ: «وَكَانَ مِنْ سِيرَتِهِ فِي جُزْءِ الْأُمَّةِ»، واتە: ئەو بەشەی کە تایبەتی کردبوو بە خەڵک، «إِيثَارُ أَهْلِ الْفَضْلِ»، ئەوانەی پێش دەخستن کە خاوەنی پێگەی بەرز بوون لە دین و تێگەیشتندا، «بِإِذْنِهِ وَقَسْمِهِ عَلَى قَدْرِ فَضْلِهِمْ فِي الدِّينِ»، هەر یەکەو بە گوێرەی

پلەو گەورەییەکەی لە دینداریی و لە زانست و کردەوەدا بەشی خۆی پێدەدا، «فَمِنْهُمْ ذُو الْحَاجَةِ، وَمِنْهُمْ ذُو الْحَاجَتَيْنِ، وَمِنْهُمْ ذُو الْحَوَائِجِ»، مەبەست لە پێداویستیان لێرەدا ئەو پێویستییە یە کە بۆ کاروباری دین و تێگەیشتن لە دین پێویستیان بوو، بۆیە گوتی: «فَيَتَشَاغَلُ بِهِمْ»، وەک ڕێزلێنان و فێرکردنیان، «وَيَشْغَلُهُمْ فِيمَا يُصْلِحُهُمْ وَالْأُمَّةَ»، واتە: کاتەکانی بەوە بۆ پڕ دەکردنەوە کە بۆ ئوممەت و دینەکەیان سوودی هەبێ، «مِنْ مُسَاءَلَتِهِمْ عَنْهُ وَإِخْبَارِهِمْ بِالَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ»، واتە: شارەزای دەکردن لە ديناو ڕێنوێنی دەکردن و ڕێگای پێشان دەدان، «وَيَقُولُ: لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغَائِبَ»، واتە: ئامادەبووەکان لەو هاوەڵە تایبەتانە بوون، ئەوانەی کە لەسەر دەستی ئەو لە دین تێگەیشتوون، ڕاستەوخۆ لەویان وەرگرتووەو بەو کەسانەشیان گەیاندوە کە لە مەجلیسەکەدا ئامادە نەبوونە، ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە کە لە پێشووتردا ڕابورد: کە گوتی: «فَيَرُدُّ ذَلِكَ بِالْخَاصَّةِ عَلَى الْعَامَّةِ».

«وَأَبْلِغُونِي حَاجَةَ مَنْ لَا يَسْتَطِيعُ إِبْلَاغَهَا»، واتە: پێداویستی ئەوانەم پێ بگەیەنن کە ناتوانن پێداویستیەکانیان بۆ خۆیان بە من بگەیەنن، جا یان لە شەرمان، یان لەبەر هەر هۆکارێکی دیکە، «فَإِنَّهُ مَنْ أَبْلَغَ سُلطَاناً حَاجَةَ مَنْ لَا يَسْتَطِيعُ إِبْلَاغَهَا ثَبَّتَ اللَّهُ قَدَمَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، ئەوەش وەک پاداشتێک لەسەر ئەوەی چاکەی لەگەڵ خەڵک کردوە کە دەنگی گەیاندۆتە خاوەن دەسەڵاتەکان، «لَا يُذْكَرُ عِنْدَهُ إِلَّا ذَلِكَ»، واتە: مەجلیسەکانی تەنها بەو جۆرە بوون و ئاوا زانراون و باسکراون، «وَلَا يُقْبَلُ مِنْ أَحَدٍ غَيْرِهِ»، جگە لەو جۆرە مەجلیسانەش نەبێ کە بۆ ژین و دینی خەڵکی بە سوودن، هیچی دیکەی لەگەڵی قبووڵ نەکردوە.

پاشان باسی ئەو کەسانەی کردوە لە هاوەڵان ﷺ کە دەچوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆیە گوتی: «يَدْخُلُونَ رُوَّاداً»، ئەو کەسەیە کە پێش هۆزەکەی دەکەوێ بۆ ئەوەی شوێنی مانەوەو لەوەڕگە بزانێ، پاشان بگەڕێتەوە بۆ لای هۆزەکەی و پێیان ڕابگەیەنێ، جا ئەو هاوەڵە تایبەتانەی بەو کەسانە چوواندوە کاتێک چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، «وَلَا يَفْتَرِقُونَ إِلَّا عَنْ ذَوَاقٍ»، واتە: لە خزمەتی هەڵنەدەستان، مەگەر بە چێژتن و وەرگرتنی زانست و زانیارییەوە نەبووایە، «وَيُخْرِجُونَ أَدِلَّةً يَعْنِي عَلَى الْخَيْرِ»، واتە: بە هیدایەتدراوو مامۆستاو ڕێنیشاندەر.

«قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنْ مَخْرَجِهِ كَيْفَ يَصْنَعُ فِيهِ؟ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْزِنُ لِسَانَهُ إِلَا فِيمَا يَعْنِيهِ»، واتە: کاروباری دین و چاکسازیی نێو خەڵک و ڕێگری لە خراپەو ڕوونکردنەوەی هەق و ڕاستی، ئیتر هەر ئەوانەن کە پەیوەندیان بە پێغەمبەر ﷺ هەیەو دەستیان بۆ دەبات، «وَيُؤَلِّفُهُمْ»، واتە: سوورو پێداگر بوو لەسەر ئەوەی کە هاوەڵان دڵیان بەیەکەوە پەیوەست بێ و، دڵی هەمووان بەیەکەوە کۆبکاتەوە و لە دەورەی هەق و ڕاستیدا، ڕێکیان بخات و، یەکڕیزیان بکات لەسەر هیدایەت و ڕاستی، «وَلَا يُنَفِّرُهُمْ»، شتێکی نەدەکرد کە دووریان بخاتەوە، «وَيُكْرِمُ كَرِيمَ كُلِّ قَوْمٍ وَيُوَلِّيهِ عَلَيْهِمْ»، ئەوە بۆ ئەوەی کە هەموو کەس بە پێی شوێن و پلەی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بۆیە هەر کات پیاو ماقووڵی هۆزێک بهاتایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ڕێزی لێ دەگرت و لێی نزیک دەبوویەوەو، ڕووی تێدەکرد بۆ دڵدانەوەو سەرنجڕاکێشانی بەرانبەر ڕاستە ڕێی ئیسلام، خۆ ئەگەر ئەو کەسە مسوڵمان ببووایە ئەوە هەروەک گەورەو سەرداری هۆزەکەی دەمایەوەو لێی دەگەڕا، «وَيُحَذِّرُ النَّاسَ وَيَحْتَرِسُ مِنْهُمْ»، بە وریایی و خۆپاراستن جووڵانەوەی بە هەستەوە دەکرد لە کاتی مامەڵە کردندا لەگەڵ خەڵکیدا، چونکە خەڵک هەیە لە ئەخلاق و خوو و کردارو سروشتدا لە یەکتر جیاوازن، مرۆڤ هەیە توندو تیژو تووڕەیە، هەیە وشک و پەستەو هەیە خاوەن ڕەوشتی تەواوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە بە وریاییەوە جووڵاوەتەوە، «مِنْ غَيْرِ أَنْ يَطْوِيَ عَنْ أَحَدٍ مِنْهُمْ بِشْرَهُ وَخُلُقَهُ»، واتە: ڕاستە بە وریاییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا کردوە، بەڵام هەرگیز ڕواڵەت و ڕەوشت بەرزیەکەی خۆی لە کەس نەشاردۆتەوە، خۆ ئەگەر کەسێکی ڕەوشت نزم و تووڕەو نەشیاو بهاتایە خزمەتی ﷺ، ئەوە خۆی لێ دەپاراست، بەڵام بە ڕووی گەش و مامەڵەکردنی جوان و بە ڕوویەکی کراوەوە پێشوازی لێ دەکرد.

«وَيَتَفَقَّدُ أَصْحَابَهُ»، پرسیاری دەربارە دەکردن، لە حاڵ و ئەحواڵی دەپرسین و، لە کاتی نەخۆشیدا سەردانی دەکردن، «وَيَسْأَلُ النَّاسَ عَمَّا فِي النَّاسِ»، پرسیاری دەربارەی کاروباری خەڵکی دەکردو گرنگی پێدەدان، «وَيُحَسِّنُ الْحَسَنَ وَيُقَوِّيهِ، وَيُقَبِّحُ الْقَبِيحَ وَيُوَهِّيهِ»، هەر کات باسی کاری باشیان بۆ بکردبایە، پشتگیری دەکردو خەڵکی لەسەر هاندەدا ﷺ، خۆ ئەگەر باسی کارێکی خراپ بکرابایە، ئەوە بە پووچی

دادەناو باسی خراپییەکەی دەکردو قەدەغەی دەکرد، «مُعْتَدِلُ الْأَمْرِ غَيْرُ مُخْتَلِفٍ»، واتە: هەمیشە کاروبارو فەرمانەکانی لە جێی خۆیدا بوون و ئامانجی دەپێکا، «لَا يَغْفُلُ مَخَافَةَ أَنْ يَغْفُلُوا أَوْ يَمِيلُوا»، واتە: پێغەمبەر ﷺ هەمیشە بە ئاگاو لەسەرخۆ بوو، نەبادا ئەوەی لە لایەتی لە یادو فەرمانی خوا ﷻ بێ ئاگا بێ، لە ترسی ئەوەی کە بۆ کەمتەرخەمی و، بێباکیی و، بێ خەمیی لابدات، «لِكُلِّ حَالٍ عِنْدَهُ عَتَادٌ»، لەو ڕووەوە کە هەمیشە ڕەچاوی بارودۆخی کردوە، کە بۆ ئەو بارودۆخە گونجاوە لە ڕوونکردنەوەو ئاراستە کردن و ڕێنیشاندان و ڕێنوێنی کردن، «لَا يُقَصِّرُ عَنِ الْحَقِّ وَلَا يُجَاوِزُهُ»، هەرگیز بە هەڵسان لە هەق و ڕاستی درێغی نەکردووە، هەرگیز سنووریشی نەبەزاندوە، هەمیشە مامناوەند بووە، «الَّذِينَ يَلُونَهُ مِنَ النَّاسِ خِيَارُهُمْ»، واتە: ئەوانەی کە لە دەوری بوون و لێی نزیک بوون و، ئەوانەی کە بەردەوام بە دەوریەوە بوون لە کەسە هەرە گەورەو پایەبەرزەکانی نێو خەڵکی بوون، ئەوەش ئاماژەیە بەوەی کە هاوەڵان لە پلەوپایەدا جیاواز بوون و، باش و باشترینیان هەبووە، بە نموونە: باشترینیان ئەبو بەکری صیددیق بووە، پاشان عومەر، پاشان عوسمان، پاشان عەلی، پاشان ئەوانیتر لە دە کەسەکان کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە ﷿.

«أَفْضَلُهُمْ عِنْدَهُ أَعَمُّهُمْ نَصِيحَةً»، کەواتە: پلەوپایە بەرزیی پەیوەندی بە پلەی دینداریی و ئەندازەی تەقواو فەرمانبەرداریی خوا ﷻو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ هەیە، هەروەها بەرگری کردن لە پێغەمبەر ﷺو دڵسۆزیی دەربڕین بۆ بەندەکانی خوای گەورە، گەورەترین کەس لە لای پێغەمبەر ﷺ ئەو کەسەیە کە دڵسۆزترینەو دڵسۆزیەکەی گشتگیرە لە پێناوی خوای گەورەداو، بۆ کتێبەکەی خوا، هەروەها بۆ پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ پێشەوای بڕواداران و هەموو خەڵکی، «وَأَعْظَمُهُمْ عِنْدَهُ مَنْزِلَةً أَحْسَنُهُمْ مُوَاسَاةً وَمُؤَازَرَةً»، واتە: هەتا بەندە زیاتر بە تەنگی پێغەمبەر ﷺو دینی خواو بەندەکانی خواوە بێ، یارمەتیدەرو هاوکار بێ و پشتیوانی بکات، ئەوە بەو هۆیەوە پلەوپایەی لای پێغەمبەر ﷺ بەرزتر دەبێت.

«قَالَ: فَسَأَلْتُهُ عَنْ مَجْلِسِهِ، فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَقُومُ وَلَا يَجْلِسُ إِلَا عَلَى ذِكْرٍ، وَإِذَا انْتَهَى إِلَى قَوْمٍ جَلَسَ حَيْثُ يَنْتَهِي بِهِ الْمَجْلِسُ وَيَأْمُرُ بِذَلِكَ»، فەرمان دەکات کە هەرکات کەسێک ڕۆیشتە مەجلیسی کەسانیتر، ئەوە لەو شوێنە دابنیشێ کە کۆتایی مەجلیسەکەیەو

کەسیتر هەڵنەستێنێ لەبەر خاتری خۆی، «يُعْطِي كُلَّ جُلَسَائِهِ بِنَصِيبِهِ»، لە قسە کردن و دواندن و ئەحواڵ پرسی، هەندێکی تایبەت نەدەکردو هەندێکی دیکەی پشتگوێ خستبایە، «لَا يَحْسَبُ جَلِيسُهُ أَنَّ أَحَداً أَكْرَمُ عَلَيْهِ مِنْهُ»، ئەوەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ خاڵی پێشووتر، چونکە هەر کەسەو لە مەجلیسەکەی بەشی خۆی لە کات پێدەدا لە قسە لەگەڵ کردن و هەواڵپرسین، جا هەر یەکێک لە مەجلیس هەڵدەستا وایدەزانی کە لە هەموویان بەڕێزترە لای پێغەمبەر ﷺ، «مَنْ جَالَسَهُ أَوْ فَاوَضَهُ فِي حَاجَةٍ صَابَرَهُ حَتَّى يَكُونَ هُوَ الْمُنْصَرِفُ عَنْهُ»، واتە: لە داواکاریی و داوای پێداویستیەکان بێزار نەدەبوو، جا ئەگەر کەسێک لە خزمەتیدا دابنیشتایە، یان داواکاریەکی هەبووایە، ئەوە لەگەڵیدا ئارامی دەگرت و گوێی بۆ دەگرت بەبێ ئەوەی بێزار بێ و، بێ ئەوەی تووڕە بێ، و قسەشی بە کابرا نەدەبڕی هەتا تەواو دەبوو و، کۆتایی پێدەهێنا، «وَمَنْ سَأَلَهُ حَاجَةً لَمْ يَرُدَّهُ إِلَا بِهَا»، واتە: بێگومان ئەو شتەی کە داوای دەکرد پێی دەدا (ئەگەر لای دەستکەوتبا)، «أَوْ بِمَيْسُورٍ مِنَ الْقَوْلِ»، ئەگەر پێداویستی کابراش کە داوای دەکرد لەلای پێغەمبەر ﷺ دەستەبەر نەبووایە، ئەوە بە قسەی خۆش و دڵخۆشکەر پێشوازی لێ دەکرد، «قَدْ وَسِعَ النَّاسَ بَسْطُهُ وَخُلُقُهُ»، پێغەمبەر ﷺ خاوەنی ئەوپەڕی ڕەوشت بەرزیی بوو، ئەو ڕەوشتە بەرزو پیرۆزەی هەموو خەڵکی دەگرتەوە، «فَصَارَ لَهُمْ أَباً»، وەک باوکی دینی بوو بۆیان، چونکە باوکایەتی دوو جۆری هەیە: باوکایەتی دینی، باوکایەتی ڕەچەڵەکی، لە ڕووی ڕەچەڵەکیەوە پێغەمبەر ﷺ باوکی هیچ کوڕو پیاوێک نەبووە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ ﴾ الأحزاب. (-موحەممەد ﷺ- باوکی هیچ یەک لە پیاوەکانتان نیە -نە زەیدی کوڕی حاریسەو نە هیچ کەسێکی تر-، بەڵکو ئەو نێرداروی خواو کۆتاهەمینی پێغەمبەرانەو، خواش بە هەموو شتێک زانایە).

کە دەڵێ: «وَصَارُوا عِنْدَهُ فِي الْحَقِّ سَوَاءً»، واتە: دادپەروەر بوو لە نێوانیانداو هەموانی بە یەکسانی تەماشا دەکرد و لەگەڵیان دادپەروەر بوو، «مَجْلِسُهُ مَجْلِسُ عِلْمٍ وَحِلْمٍ وَحَيَاءٍ وَأَمَانَةٍ وَصَبْرٍ»، ئا ئەوانە سیفەتی پێغەمبەر ﷺ بوونە لە ڕووی مامەڵەو چۆنیەتی دانیشتنەکانی لەگەڵ ئەوانیتر، هەمیشە بە ئارامیی و بە شکۆو ئەمانەت و لەسەرخۆییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، «لَا تُرْفَعُ فِيهِ الْأَصْوَاتُ»، لە مەجلیسەکەیدا هەرگیز دەنگ

بەرز نەدەکرایەوە، «وَلَا تُؤْبَنُ فِيهِ الْحُرَمُ»، هەرگیز سنوورەکان نەدەشکێنران و باسی عەیب و عارو کەم و کورتیی خەڵکی تێدا نەدەکراو، گاڵتە بە خەڵک نەدەکرا، «وَلَا تُثَنَّى فَلَتَاتُهُ»، واتە: ئەو قسە بێ سەرو بەرانەی کە هەندێ خەڵک دەیکەن، لە مەجلیسی ئەو نەدەگوتران و باس نەدەکران، «مُتَعَادِلِينَ»، لە مامەڵە کردنی پێغەمبەر ﷺ، وە لە قسە لەگەڵ کردنیان و ڕووخۆشی و ڕووکراوەیی، «بَلْ كَانُوا يَتَفَاضَلُونَ فِيهِ بِالتَّقْوَى»، کەواتە بەڕێزترینیان بە تەقواترینیانە، «مُتَوَاضِعِينَ»، واتە: لەگەڵ یەکتردا بە سۆزو خاکیی بوون، «يُوقِّرُونَ فِيهِ الْكَبِيرَ، وَيَرْحَمُونَ فِيهِ الصَّغِيرَ»، کەواتە: هەر کەسێک ڕێز لە گەورەکان نەگرێت و بەزەیی بە گچکەکاندا نەیەتەوە لەسەر ڕێبازی ئێمەدا نیە، «وَيُؤْثِرُونَ ذَا الْحَاجَةِ»، واتە: ئەگەر خاوەن پێداویستیەک بهاتایە، ئەوە بێگومان هاوەڵان ئەویان پێشدەخست بۆ ئەوەی لە پێغەمبەر ﷺ نزیک بێتەوەو قسەی خۆی بکات، بۆ ئەوەی پێداویستیەکەی بڵێ، «وَيَحْفَظُونَ الْغَرِيبَ»، واتە: خەڵکی بێگانەیان دەپاراست و مافیان پێدەدا لە ڕووی ڕێز لێگرتن و چاکە لەگەڵ کردن و میوانداری کردن و وێنەی ئەوانە.

٣٣٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ كُرَاعٌ لَقَبِلْتُ، وَلَوْ دُعِيتُ عَلَيْهِ لَأَجَبْتُ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر پێی مەڕێکیشم بۆ بێنن بە دیاری وەری دەگرم، وە ئەگەر بانگ بکرێم بۆ خواردنێک (هی هەر کەسێک بێ، وە خواردنەکەش هەرچی بێ)، دەچم بە دەم داواکەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَوْ أُهْدِيَ إِلَيَّ كُرَاعٌ لَقَبِلتُ»، (كُرَاع): لە ئەژنۆ بەرەو خوارەوەی لاقە، خۆ ئەگەر کەمێک لەو پارچە گۆشتەی لە خوار ئەژنۆوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنرابایە ئەوە وەریدەگرت، چونکە سادەو خاکیی بوو بە شتی کەمیش ڕازی دەبوو.
کە دەڵێ: «وَلَوْ دُعِيتُ عَلَيْهِ لَأَجَبْتُ»، واتە: ئەگەر کەسێک دەعوەتم بکات بۆ ماڵەکەی

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٣٣٨.




خۆی و خواردنەکەی تەنها ئەو پارچە ئێسقانەی لاق بێ کە گۆشتی زۆر کەم پێوەیە، ئەوە دەعوەتەکەی قبووڵ دەکەم، ئەوەش ئەوپەڕیی خاکیی و سادەیی بوون دەگەیەنێ.

٣٣٨- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: «جَاءَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ براكِبِ بَغْلٍ وَلَا بِرْذَوْنٍ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەگێڕێتەوە: جابر رضي الله عنه گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هات بۆ لام، نە سواری ئەسپ ببوو، نە سواری بیرزەون». (کە جۆرێکە لە ئاژەڵی بارهەڵگر).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

پێغەمبەر ﷺ هاتە سەردانی جابر رضي الله عنه بە پیادە، بۆیە سەردانی کرد، چونکە جابر رضي الله عنه نەخۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ بە پیادەو بە سواریی سەردانی هاوەڵانی دەکرد.

کە دەڵێ: «لَيْسَ براكِبِ بَغْلٍ وَلَا بِرْذَوْنٍ»، بۆیە ئەو دوو وڵاخەی دیاری کردوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ کاتێک ویستبای سەردانی یەکێک بکات نەدەهات باشترین و جوانترین وڵاخ ببات بۆ سەردانیەکە، بەڵکو کامیان بەردەست و ئاسان بووایە ئەوی دەبرد، ئەگەرنا بە پیادە دەڕۆیشت.

**البِرْذَوْن**: جۆرە وڵاخێکە کە جەستەو ئەندام و پەلەکانی گەورەو بەهێزن، لە ئەسپ جیاوازە (هەرچەندە لە ڕەچەڵەکی ئەسپە)، گوتراویشە: ئەسپێکە کە عەرەب نیەتی.

٣٣٩- عَنْ يَحْيَى بْنُ أَبِي الْهَيْثَمِ الْعَطَّارُ قَالَ: سَمِعْتُ يُوسُفَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَّامٍ رضي الله عنه قَالَ: «سَمَّانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوسُفَ، وَأَقْعَدَنِي فِي حِجْرِهِ، وَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي»[2].

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو هەیسەمی عەتتار دەڵێ: گوێم لێ بوو یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام رضي الله عنه گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوم یوسف، وە لە کۆشی خۆی داینیشاندووم، وە دەستیشی بەسەرمدا هێناوە».

---

(١) أخرجه البخاري: ١٩٤، ومسلم: ١٦١٦، والمصنِّف في جامعه: ٣٨٥١.

(٢) أخرجه أحمد في المسند: ١٦٤٠٤.




**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

که دەڵێ: «سَمَّانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوسُفَ»، واته: کاتێک له دایک بووه هێناویانه بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ.

که دەڵێ: «وَأَقْعَدَنِي فِي حِجْرِهِ، وَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي»، دەستهێنان بەسەر سەردا، جۆرێکه له خۆشەویستی و سۆز دەربڕین بۆ منداڵ، ئەوەش بەڵگەیه لەسەر خاکیی بوونی پێغەمبەرمان ﷺ که خۆشەویستیی و نەرمونیانی بۆ گچکەکانیش دەربڕیوەو له باوەشی خۆیدا دایناون.

٣٤٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَجَّ عَلَى رَحْلٍ رَثٍّ وَقَطِيفَةٍ، كُنَّا نَرَى ثَمَنَهَا أَرْبَعَةَ دَرَاهِمَ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَالَ: «لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ لَا سُمْعَةَ فِيهَا وَلَا رِيَاءَ»[1].

واته: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر کۆپانی وشترێکی شڕەوە گەشتی حەجی کرد، پۆشاکێکی قەدیفەی لەبەر بوو، ئێمە پێمان وا بوو نرخەکەی چوار درەم دەبوو (یان نەدەبوو)، (واته: زۆر هەرزان و سادە بوو)، جا کاتێک چووە سەر وشترەکەو ڕێک دانیشت فەرمووی: «خوایە! ئامادەم له خزمەتت دا بۆ ئەنجامدانی حەجێک که نه ناوبانگی تێدابێ و نه ڕیاو ڕووپاماییی».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەوەشیان ڕێگایەکیترە که فەرموودەکەی لێوە هێنراوە، که له سەرەتای ئەو بابەتەدا ڕابورد.

٣٤١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً خَيَّاطاً دَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَرَّبَ مِنْهُ ثَرِيداً عَلَيْهِ دُبَّاءُ قَالَ: «فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْخُذُ الدُّبَّاءَ وَكَانَ يُحِبُّ الدُّبَّاءَ» قَالَ ثَابِتٌ: فَسَمِعْتُ أَنَساً يَقُولُ: «فَمَا صُنِعَ لِي طَعَامٌ أَقْدَرُ عَلَى أَنْ يُصْنَعَ فِيهِ دُبَّاءُ إِلَا صُنِعَ»[2].

واته: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەگێڕێتەوە: پیاوێکی بەرگدوور بانگی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، ئەویش لێی نزیک کەوتەوە (بینی) چێشتی ثـەریدی کردبوو کودووی تێدا بوو، «جا پێغەمبەری خوا ﷺ (له کاتی خواردن) دەستی دەبرد بۆ کودووەکان

(١) انظر: (ح ٣٣٤).

(٢) أخرجه مسلم: ٢٠٤١.




و دەری دەهێنا، چونکە زۆر حەزی لە کودوو بوو»، (سابت) دەڵێ: گوێم لێ بوو ئەنەس دەیگوت: «هیچ خواردنێکم بۆ دروست نەکراوە توانیبم کودووی تێبکەم، ئیلا تێمکردوە (واتە: لەبەر دڵی پێغەمبەر ﷺ) بۆ ئەوەی بیخوات».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «أَنَّ رَجُلاً خَيَّاطاً دَعَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە کەسێک خاوەنی پیشەش بێ، وەڵامی بانگهێشتەکەی داوەتەوە، ئەوەش لەبەر خاکی بوونەکەی ﷺ.

کە دەڵێ: «فَقَرَّبَ مِنْهُ ثَرِيداً عَلَيْهِ دُبَّاءُ»، تێگوشیووی بە کولەکەو کودوو، (الدُّبَّاء) واتە: کودوو.

کە دەڵێ: «فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْخُذُ الدُّبَّاءَ وَكَانَ يُحِبُّ الدُّبَّاءَ»، بە بەردەوامی ئەنەس ﷺ (کودوو) کولەکەی پێ خۆشبوو لەو کاتەوەی دیتبووی پێغەمبەر ﷺ پێی خۆشە، بۆیە: «فَمَا صُنِعَ لِي طَعَامٌ أَقْدَرُ عَلَى أَنْ يُصْنَعَ فِيهِ دُبَّاءُ إِلَّا صُنِعَ».

٣٤٢- عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ عَمْرَةَ، قَالَتْ: قِيلَ لِعَائِشَةَ ﷺ: مَاذَا كَانَ يَعْمَلُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: «كَانَ بَشَراً مِنَ الْبَشَرِ، يَفْلِي ثَوْبَهُ، وَيَحْلُبُ شَاتَهُ، وَيَخْدُمُ نَفْسَهُ»[1].

واتە: یەحیای کوڕی سەعید دەگێڕێتەوە کە عەمرە گوتوویەتی: پرسیار کرا لە عائیشە ﷺ: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ بە چ خەریک و سەرقاڵ بوو لە ماڵی خۆیدا؟ گوتی: «وەک هەر مرۆڤێکی دیکە، مرۆڤێکی ئاسایی بوو، پۆشاکی خۆی دەدوریەوەو مەڕەکەی دەدۆشی و، خۆی خزمەتی خۆی دەکردو، خودی خۆی کاروبارەکانی تایبەت بە خۆی ئەنجامدەدا».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

دەربارەی کاروباری پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیار لە عائیشە ﷺ کراوە، ئەویش گوتوویەتی: «كَانَ بَشَراً مِنَ الْبَشَرِ»، ئەوەی وەک پێشەکیەک بۆ قسەکانی دواتر گوتوە، واتە: خۆی لە خەڵکیتر جیانەکردۆتەوە، «يَفْلِي ثَوْبَهُ»، پۆشاکەکەی خۆی

---

(١) أخرجه البخاري في الأدب المفرد: ٥٤١.

دوریوەتەوە بە دەستی خۆی، «وَيَحْلُبُ شَاتَهُ»، واتە: ڕاستەوخۆ بە دەستی موباڕەکی خۆی مەڕەکەی دۆشیوە، «وَيَخْدُمُ نَفْسَهُ»، واتە: بۆ خۆی بە خزمەتکردنی خۆی هەڵساوەو، ئەگەر پێویستی بە شتێک بووایە بۆ خۆی پێی هەڵدەستاو داوای لە کەس نەدەکرد کە بۆی ئامادە بکات، ئەوەش هەمووی بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە زۆر سادەو خاکی بووە.




**ڕەوشت** ئەو شتەیە کە پەیوەستە بە دیوی نێوەوەی مرۆڤ، وەک: ئارامگریی و شەرم و ڕێز، هەروەها ئەوەیشی کە پەیوەندی بە ڕواڵەتی مرۆڤەوە هەیە، وەک: مامەڵەو ڕەفتاری جوان و، ڕاستگۆیی و، ڕووخۆشیی و، وێنەی ئەوانە.

ڕەوشت دابەش دەبێ بەسەر دوو بەشدا: ڕەوشتی جوان و پەسند، ڕەوشتی ناشیرین و خراپ و ناپەسند، جا ڕەوشتی جوان بریتیە لە خۆڕازاندنەوە بە شتە جوانەکان و، سیفەتە بەرزو جوانەکان و پابەندبوون پێیانەوە، وە خۆڕاهێنانە لەسەر یاساو ڕێساکانی ڕەوشت جوانیی و، خۆدارِنین لە ئاکارو ڕەفتارە بێزراوو ناپەسندەکان، ئەوەش بە دوورکەوتنەوەو، خۆپاراستن لە ڕەوشتە ناشیرینەکان دەستەبەر دەبێ، ڕەوشت ناشیرینیش پێچەوانەی ئەوەیە کە باسمان کرد.

ئەخلاقی پێغەمبەر ﷺ کامڵترین و تەواوترین و پاکترین و جوانترینە، ئەخلاقی بریتی بوو لە قورئان، هەرچی لە قورئاندا هاتوە لە ڕەوشت و ئاداب و مامەڵەو، بانگەوازی چاکەو چاکەکاریی و، قەدەغەکردنی نزمیی و پەستیی، ئەوە بێگومان پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەو ئاکارە جوانانەی بە تەواوترین و جوانترین شێوە لە ڕەفتارو گوفتاریدا ڕەنگی داوەتەوە.

فەرموودەگەلێکی زۆر لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون، دەربارەی ڕەوشتی بەرزو، هاندان و بانگەواز بۆ ڕەوشت بەرزیی، هەروەها گەورەییەکەشی ڕوونکراوەتەوە، وە باسی گەورەیی پاداشتەکەشی لە لای خوای گەورە کراوە، کۆی ئەو ئادابە جوانانە لە چوار فەرموودەدا کۆکراونەتەوە، کە هەرکەس لەبەریان بکات و کاریان پێبکات، ئەوە بناغەو بنچینەی هەرچی ئەخلاقی جوانە دەستیکەوتوە.

**یەکەم**: ئەو فەرموودەی (بوخاری و موسلیم)[1] کە لە ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەیگێڕنەوە، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ؛ فَلْيَقُول خَيْرًا أو لِيَصْمُتْ».

**دووەم**: ئەو فەرموودەیەی الترمذي[2] گێڕاویەتیەوە لە عەلی کوڕی حوسەین رضي الله عنه، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «إِنَّ مِنْ حُسْنِ الإِسْلامِ المَرْءِ تَرْكُهُ مَالاَ يَعْنِيهِ».

---

(١) البخاري: ٦٤٧٥، ومسلم: ٤٧.

(٢) جامع الترمذي: ٢٣١٨.




**سێیەم:** ئەو فەرموودەیەی بوخاری[١] کە لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگێڕێتەوە، کە پیاوێک بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش فەرمووی: (لَا تَغْضَبْ)، چەند جار کابرا دووبارەی کردەوەو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (لَا تَغْضَبْ).

**چوارەم:** ئەو فەرموودەی (بوخاری و موسلیم)[٢] لە ئەنەس ﷺ گێڕاویانەتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ».

ئەبو موحەممەدی قەیرەوانی دەڵێ: (کۆی ڕەوشتە چاکەکان لە چوار فەرموودەدا سەرچاوە دەگرن)[٣]، ئنجا فەرموودەکانی هێناون.

لە فەرموودەی یەکەمدا ڕێنمایی تێدایە کە مرۆڤ زمانی دامەزراو بکات بە بیرکردنەوەو، ڕامان لەو شتەی کە دەیڵێ، جا ئەگەر ئەوەی دەیەوێ بیڵێ، ئەگەر خێری تێدابوو با بیڵێ، ئەگەر خراپەو شەڕیش بوو با نەیڵێ، هەر کەس زمانی خۆی نەپارێزێ و زاڵ نەبێ بەسەریدا، ئەوە بێگومان لەو کەسانە نیە کە ڕەوشت بەرزن.

لە فەرموودەی دووەمدا ڕێنمایی تێدایە، کە مرۆڤ خۆی لە هەموو شتێک هەڵنەقورتێنێ، جا چ قسە بێ، یان گوێگرتن بێ، یان تەماشا کردن بێ، یان وێنەی ئەوانە.

لە فەرموودەی سێیەمدا ڕێنمایی ئەوەی تێدایە کە مرۆڤ دەست بەسەر دڵ و دەروونیدا بگرێت، لە کاتی هەڵچووندا ویست و دروستیی لە بڕیاردان لە دەست نەدات.

لە فەرموودەی چوارەمدا ڕێنماییمان دەکات کە دڵ و دەروونی مرۆڤی بڕوادار دەبێ سەلامەت بێ بەرامبەر بە برا (و خوشکی)ی مسوڵمانی، نابێ غەش و ڕق و چرووکیی و ڕژدیی تێدابێ، وە نابێ جگە لەوانەش جۆرەکانی تری نەخۆشیەکانی دڵی تێدابێ.

**٣٤٣-** عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ قَالَ: دَخَلَ نَفَرٌ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ، فَقَالُوا لَهُ: حَدِّثْنَا أَحَادِيثَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَاذَا أُحَدِّثُكُمْ؟ كُنْتُ جَارَهُ «فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ بَعَثَ إِلَيَّ فَكَتَبْتُهُ لَهُ، فَكُنَّا إِذَا ذَكَرْنَا الدُّنْيَا ذَكَرَهَا مَعَنَا، وَإِذَا ذَكَرْنَا الْآخِرَةَ ذَكَرَهَا مَعَنَا، وَإِذَا ذَكَرْنَا الطَّعَامَ ذَكَرَهُ مَعَنَا، فَكُلُّ هَذَا أُحَدِّثُكُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٤].

---

(١) برقم: ٦١١٦.

(٢) أخرجه البخاري: ١٣، ومسلم: ٤٥.

(٣) نقله ابن رجب في جامع العلوم والحكم: ٢٨٨/١.

(٤) في إسناده الوليد بن أبي الوليد، وهو لينٌ الحديث، وسليمان بن خارجة مجهول.



واتە: خاریجەی کچی زەیدی کوڕی سابت دەگێڕێتەوە کە کۆمەڵێک کەس هاتنە خزمەت زەیدی کوڕی سابیت ﷺ پێیان گوت: فەرمایشتی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ باس بکە، ئەویش گوتی: چیتان بۆ باس بکەم؟ من دراوسێی بووم، «کاتێک وەحی دادەبەزیە سەر، بە دوای دەناردم جا منیش بۆیم دەنووسیەوە، کاتێک باسی دونیامان دەکرد، لەگەڵ ئێمە باسی دەکرد، وە کاتێک باسی دواڕۆژمان دەکرد، ئەویش لەگەڵ ئێمە باسی دەکرد، کاتێک باسی خواردنمان دەکرد، ئەویش لەگەڵمان باسی دەکرد، ئا هەموو ئەوانە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆتان دەگێڕمەوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «دَخَلَ نَفَرٌ عَلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، فَقَالُوا لَهُ: حَدِّثْنَا أَحَادِيثَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پێشینانمان زۆر سوورو پێداگربوون لەسەر بیستنی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

کە دەڵێ: «مَاذَا أُحَدِّثُكُمْ»، ئاماژەیە بەوەی کە چەندین فەرموودەی جۆراوجۆری دەربارەی شتگەلی جۆراوجۆر لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەبەری کردوون،، لە ئاکارو ئەخلاق و ئاداب و وێنەی ئەوانە.

کە دەڵێ: «كُنْتُ جَارَهُ»، واتە: ماڵم لە ماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ نزیک بوو، بەو قسەیەی ئەوە دەسەلمێنێ کە زۆر باش لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ شارەزایەو دەیانزانێ، «فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ بَعَثَ إِلَيَّ فَكَتَبْتُهُ لَهُ»، زەید یەکێک بوو لەوانەی کە وەحیان نووسیوەتەوە، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لە ڕوویەکی دیکەشەوە لە پێغەمبەر ﷺ نزیک بووە، ئەویش ئەوەیە کە وەحی نووسیوەتەوە.

کە دەڵێ: «فَكُنَّا إِذَا ذَكَرْنَا الدُّنْيَا ذَكَرَهَا مَعَنَا»، ئەوەی لەگەڵ باسکردوون کە زۆر گرنگی بە دونیا نەدەن و زیاد لە ئەندازەی پێویست خۆی پێوە سەرقاڵ نەکەن، نە زێدەڕۆیی تێدا بکەن، نە کەمتەرخەمی، وە باسی ئەوەی بۆ کردوون کە هەموو سەختیەکان و خۆشی و ناخۆشیەکان بە فەرمانی خوایە، وە ئەوەیشی بۆ باسکردوون کە دونیا بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەک لای خوا ﷻ نرخی نیە، لەو بارەوە نموونەی زۆری هێناونەوە.




که دەڵێ: «وَإِذَا ذَكَرْنَا الْآخِرَةَ ذَكَرَهَا مَعَنَا»، واته: باسی گرنگی ئەو ڕۆژەی بۆ دەکردن و هانی دەدان لەسەری، وە باسی ئەوەی بۆ دەکردن که هەر ئەوێ شوێنی مانەوەی بەردەوامە، هەروەها باسی پاداشتی چاکەکاران و سزای تاوانبارانی بۆ دەکردن.

که دەڵێ: «وَإِذَا ذَكَرْنَا الطَّعَامَ ذَكَرَهُ مَعَنَا»، باسی ئادابی خواردن و سوودەکانی و تایبەتمەندی هەندێک خواردنی بۆ دەکردن.

که دەڵێ: «فَكُلُّ هَذَا أُحَدِّثُكُمْ عَنِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، واته: ئەوە بابەتێکی دوورو درێژە، بۆیە بەو کورتیە بۆی پوخته کردن.

٣٤٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ وَحَدِيثِهِ عَلَى أَشَرِّ الْقَوْمِ يَتَأَلَّفُهُمْ بِذَلِكَ فَكَانَ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ وَحَدِيثِهِ عَلَيَّ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنِّي خَيْرُ الْقَوْمِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ أَبُو بَكْرٍ؟ قَالَ: «أَبُو بَكْرٍ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ عُمَرُ؟ فَقَالَ: «عُمَرُ»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ عُثْمَانُ؟ قَالَ: «عُثْمَانُ»، فَلَمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَصَدَقَنِي فَلَوَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ سَأَلْتُهُ[1].

واته: عەمرِی کوڕی عاص ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕووخۆشی و قسه خۆشی پێشوازی له خراپترینی خەڵکی دەکرد، بەوەش هۆگری خۆی دەکردن، جا بەو ڕووخۆشی و قسه خۆشیەی پێشوازی لێ دەکردم، هەتا گومانم برد من خۆشەویستترینی خەڵکی بم لەلای، بۆیە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من باشترم یان ئەبو بەکر؟ فەرمووی: «ئەبو بەکر»، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من باشترم یان عومەر؟ فەرمووی: «عومەر»، ئیدی گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من باشترم یان عوسمان؟ فەرمووی: «عوسمان»، دوای ئەوەی پرسیارم له پێغەمبەری خوا ﷺ کردو ئەویش بە ڕاشکاوی وەڵامی دامەوە، خۆزگەم دەخواست هەر پرسیارم لێ نەکردبا لەوبارەوە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

که دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ وَحَدِيثِهِ عَلَى أَشَرِّ الْقَوْمِ يَتَأَلَّفُهُمْ بِذَلِكَ»، واته: هەر کاتێک کەسێک دەهاتە مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر ئەو کەسە خراپترین کەس و

---

(١) في إسناده يونس بن بُكَيرٍ، وهو صدوقٌ يُخطِئ، ومحمَّد بن إسحاق مدلِّس؛ وقد عنعن.



ڕق ئەستوورترین کەسیش بووایە، پێغەمبەر ﷺ هەر بە ڕووێکی گەشاوەو خۆشەوە ڕووی تێدەکرد، هەروەها پاکترین و جوانترین مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، بۆیە بە تەواوی ڕووی لە ڕووی بەرانبەرەکەی دەکرد، هەروەها لە کاتی قسەکردنیشیدا ڕووی تێدەکرد.

هەر ئەو ئەخلاقە جوان و بەرزو تێرو تەواوەیە کەوا دڵی خەڵکی خراپیشی ڕادەکێشاو وای لێکردوون کەوا چاکەو چاکەکاریان خۆشبوێ.

کە دەڵێ: «فَكَانَ يُقْبِلُ بِوَجْهِهِ وَحَدِيثِهِ عَلَيَّ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنِّي خَيْرُ الْقَوْمِ»، واتە: بە خۆشحاڵیەوە بەرەو ڕووم دەبۆوەو، لە کاتی قسەکردندا بە جۆرێک ڕووی تێدەکردم کە وامدەزانی من باشترینی هاوەڵانم، «فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ أَبُو بَكْرٍ؟ قَالَ: «أَبُو بَكْرٍ» فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ عُمَرُ؟ فَقَالَ: «عُمَرُ»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا خَيْرٌ أَوْ عُثْمَانُ؟ قَالَ: «عُثْمَانُ»، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە خۆشەویستن و بە باشترین تەماشاکردنی ئەبو بەکرو، پاشان عومەرو، پاشان عوسمان لە دڵی هاوەڵاندا بە تەواوی جێگیر بووە، بۆیە سەرەتا لە باشترین دەستی پێکردوە ئەوجار باشترو باش.

لە (صحيح البخاري) بە ژمارە (٣٦٥٥) لە ئیبنو عومەرەوە ﵄ هاتوە، کە گوتوویەتی: {كُنَّا نُخَيِّرُ بَيْنَ النَّاسِ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَنُخَيِّرُ أَبَا بَكْرٍ، ثُمَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ، ثُمَّ عُثْمَانَ بنَ عَفَّانَ}. واتە: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ باشترینەکانمان دەستنیشان دەکرد، بۆیە سەرەتا ئەبو بەکرمان هەڵدەبژارد، ئنجا عومەر، ئنجا عوسمان ﵃.

کە دەڵێ: «فَلَمَّا سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَصَدَقَنِي فَلَوَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ سَأَلْتُهُ»، بۆیە وای گوتوە پێی خۆشبوو کە هەر لەسەر گومانی خۆی مابایەوە، کە پێی وابوو لە هەموان خۆشەویستترو باشترە!

٣٤٥- عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: «خَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ فَمَا قَالَ لِي أُفٍّ قَطُّ، وَمَا قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ لِمَ صَنَعْتَهُ، وَلَا لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ لِمَ تَرَكْتَهُ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقاً، وَلَا مَسَسْتُ خَزّاً وَلَا حَرِيراً وَلَا شَيْئاً كَانَ أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلَا شَمَمْتُ مِسْكاً قَطُّ وَلَا عِطْراً كَانَ أَطْيَبَ مِنْ عَرَقِ النَّبِيِّ ﷺ»[1].

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٠٤١، ومسلم: ٢٣٣٠، والمصنّف في جامعه: ٢٠١٥.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷛ دەڵێ: «دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد، هەرگیز پێی نەگوتم: ئۆف! بۆ هیچ شتێک کە کردبێتم نەیفەرمووە: بۆ وات کردوە؟ بۆ هیچ شتێک کە نەمکردبێ پێی نەفەرمووم: بۆ نەتکردوە؟ وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەسێک ڕەوشتی بەرزو جوانتر بوو، دەستم نەداوە لە هیچ صوفێک و ئاوریشمێک و هیچ شتێک تر، کە نەرمتر بووبێ لە نێو لەپەدەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە هەرگیز بۆنی هیچ میسکێک و بۆنێکم هەڵنەمژیوەو بۆن نەکردوە خۆشتر بووبێ لە بۆنی ئارەقەی پێغەمبەر ﷺ».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «خَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ»، ئەوە ڕێخۆشکردنێکە بۆ ئەو قسانەی کە دواتر دەیانکات، چونکە دە ساڵ خزمەتکردنی کەسێک، ئەوە بە ڕوونی ئەخلاقی ئەو کەسەی کە خزمەتی کردوە بۆی دەردەکەوێ.

کە دەڵێ: «فَمَا قَالَ لِي أُفٍّ قَطُّ»، لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ماوە زۆرە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووە کە چاوەڕێ دەکرێ و حەتمیە کە هەڵەو کەم و کوڕی ڕوویدات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ کەمترین نارەزایەتی بەرانبەری دەرنەبڕیوە، دەبێ چەند جوان بێ، ئەو ڕەوشتە گەورەو مەزنە!

کە دەڵێ: «وَمَا قَالَ لِشَيْءٍ صَنَعْتُهُ لِمَ صَنَعْتَهُ وَلَا لِشَيْءٍ تَرَكْتُهُ لِمَ تَرَكْتَهُ»، واتە: هەر کارێک کە دەمکرد نەیدەفەرموو بۆ واتکرد؟ وە کاتێک فەرمانم پێکراوەو کارەکەم بۆ ئەنجام نەداوە نەیفەرمووە بۆ ئەنجامت نەداوە؟ کە ئەوەش لەو شتانەیە کە پەیوەستە بە خزمەتکردن و ئادابەکانی، نەک ئەو شتانەی کە تەکلیفی شەرعین وەک: نوێژو ڕۆژوو وێنەی ئەوانە، چونکە لە نەکردنی تەکلیفە شەرعیەکان دروست نیە چاوپۆشی تەواو بکرێ لە کەسێک کە جێبەجێیان ناکات، هەروەها لەو فەرموودەیەدا مەدح و سەنای بۆ ئەنەسیش ﷛ تێدایە، چونکە لەو ماوەیەدا کارێکی نەکردوە، کە پێغەمبەر ﷺ ڕووبەڕووی بێتەوە بە لۆمەکردن، لەگەڵ ئەوەی کە ماوەکەشی دوورو درێژ بووە.

که دەڵێ: «وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ خُلُقاً»، ئەوەش پوختەی قسەکەیە، پێغەمبەر ﷺ لە ڕووی ئەخلاقەوە لە قسەو کردارو ئاداب و مامەڵەدا باشترینی هەموو خەڵکی بووە.

که دەڵێ: «وَلَا مَسَسْتُ خَزّاً وَلَا حَرِيراً وَلَا شَيْئاً كَانَ أَلْيَنَ مِنْ كَفِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، (خَزّ): جۆرێکە لە قوماش کە لە ئاوریشم و شتیتریش پێکهاتوە، پێغەمبەر ﷺ لەپی دەستی نەرم بووە، بەڵکو لە ئاوریشم و، هەر شتێکی نەرم نەرمتر بووە، لەو شتانەی کە ئەنەس ﷺ دەستی لێداوە.

که دەڵێ: «وَلَا شَمَمْتُ مِسْكاً قَطُّ وَلَا عِطْراً كَانَ أَطْيَبَ مِنْ عَرَقِ النَّبِيِّ ﷺ»، پێغەمبەر ﷺ بۆنی ئارەقەکەی لە هەر بۆنێکی تر خۆشتر بووە، کە ئەوە یەکێکە لەو شتە تایبەتانەی کە خوا ﷻ وەک ڕێزێکی زۆر تایبەت بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەخشیوە.

٣٤٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ كَانَ عِنْدَهُ رَجُلٌ بِهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَكَادُ يُوَاجِهُ أَحَداً بِشَيْءٍ يَكْرَهُهُ، فَلَمَّا قَامَ قَالَ لِلْقَوْمِ: «لَوْ قُلْتُمْ لَهُ يَدَعُ هَذِهِ الصُّفْرَةَ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: پیاوێک لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پاشماوەی ڕەنگی زەردی پێوە دیار بووە، (ئەنەس ﷺ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی نەدەکرد ڕووبەڕووی هیچ کەسێک ببێتەوە بە شتێک ڕقی لێبوایەتەوە، لەبەر ئەوە کاتێ پیاوەکە هەڵسا بە خەڵکەکەی فەرموو: «ئەگەر پێتان گوتایە وازی لەم ڕەنگە زەردە بهێنابووایە».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

که دەڵێ: «كَانَ عِنْدَهُ رَجُلٌ بِهِ أَثَرُ صُفْرَةٍ»، (صُفْرَة): جۆرە بۆنێکە کە ئافرەتان بەکاری دێنن و، جگە لە بۆنێکی کەم ڕەنگیشی هەیە کاتێک لە پۆشاک دەدرێ، لە زەعفەران دروست دەکرێ، تایبەتە بە ئافرەتان، چونکە بۆنی سووکەو ڕەنگی دیارە بە پۆشاکەوە.

---

(١) أخرجه أبو داود في السنن: ٤١٨٢، إسناده ضعيفٌ؛ لأنَّ فيه سلمًا العلوي، وهو ضعيفٌ.

کە دەڵێ: «وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَكَادُ يُوَاجِهُ أَحَداً بِشَيْءٍ يَكْرَهُهُ»، واتە: بە زۆری عادەتی وابوو ﷺ کە ئەگەر شتێکیشی پێ ناخۆش بووایە کەمتر وابوو بۆ خۆی بە ڕووی کابرای بێنێ، بەڵام کاتێک کە بەرژەوەندی لەوە دابایە کە پێی بڵێ، ئەوە بۆ خۆی پێی دەفەرموو ﷺ.

کە دەڵێ: «فَلَمَّا قَامَ قَالَ لِلْقَوْمِ: لَوْ قُلْتُمْ لَهُ يَدَعُ هَذِهِ الصُّفْرَةَ»، بۆ خۆی بە ڕووی کابرای نەدایەوە، بەڵکو فەرمانی بە کەسانی تر دەکرد کە پێی بڵێن، (کە ئەوەش ئەوپەڕی لەبەرچاو گرتنی هەست و نەستی کەسی بەرانبەرە، بۆ ئەوەی کابرا بە خۆیدا نەشکێتەوە)!

٣٤٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاحِشاً وَلَا مُتَفَحِّشاً وَلَا صَخَّاباً فِي الْأَسْوَاقِ، وَلَا يَجْزِيءُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ»[1].

واتە: عائیشە ﵂، دەڵێ: «بە هیچ جۆرێک پێغەمبەری خوا ﷺ زمان شڕو جنێو فرۆش نەبووە، وە دەنگی بەرز نەدەکردەوەو هاواری نەکردوە لە بازاڕ، وە خراپەیەک کە بەرانبەری کرابوو، بە خراپە تۆڵەی نەدەسەندەوە، بەڵکو (خاوەن خراپەی) دەبووردو لێی خۆش دەبوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاحِشاً وَلَا مُتَفَحِّشاً»، واتە: ڕەوشت ناشیرینی لە ڕێبازەکەی پێغەمبەر ﷺ بوونی نەبووە، نە لە قسەکردندا، نە لە کردەوەشدا.

کە دەڵێ: «وَلَا صَخَّاباً فِي الْأَسْوَاقِ»، (الصَّخَّاب): ئەو کەسەیە کە لە بازاڕدا دەنگی بەرز دەکاتەوە.

کە دەڵێ: «وَلَا يَجْزِيءُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَصْفَحُ»، واتە: کاتێک یەکێک خراپەی بەرانبەر بکردایە هەرگیز بە خراپە وەڵامی نەدەدایەوە، لەگەڵ ئەوەی کە وەڵامدانەوەی خراپە بە خراپە بە ئەندازەی خۆی حەڵاڵ و ڕەوایە، چونکە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ ﴾ الشورى. (وە تۆڵەی هەر خراپەیەک

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه ٢٠١٦.

خراپەیەکە بە وێنەی خۆی)، باشترین شت و شایەنترین و تەواوترین شت کە بکرێت ئەوەیە کەوا لێخۆشبوو بێ و چاوپۆشی بکات، چونکە لە تەواوکردنی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٠﴾ الشورى. (جا هەر کەسێک ببورێ و ئاشتەوایی بکات ئەوە پاداشتی ئەو لە لای خوایە بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆشناوێن).

٣٤٨- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ شَيْئاً قَطُّ، إِلَا أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَلَا ضَرَبَ خَادِماً أَوِ امْرَأَةً»[1].

واتە: عائیشە رضي الله عنها، دەڵێ: «بە هیچ جۆرێک پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەست لە هیچ کەسێکی نەداوە، مەگەر لە جیهادو تێکۆشان بووبێ (لە دژی بێبڕوایان)، وە هەرگیز لە خزمەتکارو لە هیچ ئافرەتێکی (خۆی) نەداوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «وَلَا ضَرَبَ خَادِماً أَوِ امْرَأَةً»، ئەوە باسکردنی شتی تایبەتە لە دوای شتی گشتی، چونکە ئەوەش دەچێتە پاڵ: «مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ شَيْئاً قَطُّ، إِلَا أَنْ يُجَاهِدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، پێغەمبەر ﷺ هەرگیز هەڵەو کەم و کوڕیی بە لێدان چارەسەر نەکردوە، بەڵکو هەمیشە هاوەڵانی بە جوانترین شێوە پەروەردە کردوە، بە جۆرێک کە هەرگیز بە شتێک کە پێی ناخۆشبووبێ ڕووبەڕووی نەبۆتەوە، بەڵکو تەنها ڕەنگی ڕووخساری گۆڕاوەو ئیتر هاوەڵان تێگەیشتوون کە ئەو شتەی پێناخۆشە، ئەوەش پەروەردەیەکە کە هەرگیز وێنەی نیە.

٣٤٩- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُنْتَصِراً مِنْ مَظْلَمَةٍ ظُلِمَهَا قَطُّ مَا لَمْ يُنْتَهَكْ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ تَعَالَى شَيْءٌ، فَإِذَا انْتُهِكَ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ شَيْءٌ كَانَ مِنْ أَشَدِّهِمْ فِي ذَلِكَ غَضَباً، وَمَا خُيِّرَ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ مَأْثَماً»[2].

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٢٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٥٦٠، ومسلم: ٢٣٢٧.

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «هەرگیز پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە بە هۆی ستەمێکەوە کە لێیکراوە (وەک خودی خۆی) تۆڵەی سەندبێتەوە، مادام هیچ شتێک لە سنوورەکانی خوا نەبەزێنرابن، بەڵام ئەگەر شتێک لە سنوورەکانی خوا بەزێنرابن، لە هەموویان توندتر تووڕەبووە لەو کارەدا، هیچ کات لە نێوان دوو شتاندا سەرپشک نەکراوە، حەتمەن ئەوەی ئاسانترە ئەوی هەڵیبژاردوە، مادام گوناهباریی تێدا نەبووبێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُنْتَصِراً مِنْ مَظْلَمَةٍ ظُلِمَهَا قَطُّ»، پێغەمبەر ﷺ لەبەر خاتری خودی خۆی تووڕە نەبووە، وە تۆڵەی نەکردۆتەوە، «مَا لَمْ يُنْتَهَكْ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ تَعَالَى شَيْءٌ، فَإِذَا انْتُهِكَ مِنْ مَحَارِمِ اللَّهِ شَيْءٌ كَانَ مِنْ أَشَدِّهِمْ فِي ذَلِكَ غَضَباً»، جا هەر کاتێک سنووره قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە بەزێنرابان ئەوە زۆر بە توندی تووڕە دەبوو.

«وَمَا خُيِّرَ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ مَأْثَماً»، هەر کات لە نێوان دوو شتدا سەرپشک کرابایە، ئەوە بێگومان ئاسانترینەکەی هەڵدەبژارد (کە ئەوەش ئەوپەڕی دڵسۆزیی و بە خەمیی و بەزەیی بوون دەگەیەنێ بۆ ئۆممەتەکەی، چونکە هەرگیز نەیویستوە تووشی سەغڵەتییان و نائارامیان بکات بە شتێک کە لەسەریان قورس بێ) مادام شتەکە لەو شتانە نەبووبێ کە بە ئاسانکاریەکەی سەر بکێشێ بۆ تاوانکاری، چونکە پێغەمبەر ﷺ بێگومان هەر شتێک بۆنی تاوانی لێ هاتبێ، ئەوە حاشای لێکردووەو خۆی و ئۆممەتەکەی لێ بە دوورگرتوە.

٣٥٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عِنْدَهُ، فَقَالَ: «بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ» أَوْ «أَخُو الْعَشِيرَةِ»، ثُمَّ أَذِنَ لَهُ، فَأَلَانَ لَهُ الْقَوْلَ، فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ مَا قُلْتَ ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ؟ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂، دەڵێ: پیاوێک داوای مۆڵەتی هاتنە لای پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، لەو کاتەدا من لە خزمەتی بووم، (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:) «ئەوە لە

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٠٣٢، ومسلم: ٢٥٩١، والمصنِّف في جامعه: ١٩٩٦.



خراپترین کەسی هۆزەکەیەتی»، دوایی مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ (ڕووی گەش و خۆش کردو) لەگەڵی نەرم و نیان بوو، جا کاتێک کە چووەدەر گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەی (بە فلانت) فەرموو فەرمووت، پاشان (ڕووت گەش و خۆش کردو) لە قسە کردنیش نەرم و نیان بووی لەگەڵی؟! فەرمووی: «ئەی عائیشە! لە خراپترینی خەڵکی ئەو کەسانەن، کە خەڵک خۆیان لێ دەپارێزێ، یان وازی لێ دێنێ لەبەر خراپەکاریی و زمان شڕیی».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عِنْدَهُ»، گوتراوە: پیاوەکە عویەینەی کوڕی حصن بووە، گوتراویشە: مەخرەمەی کوڕی نەوفل بووە، هەر چەندە تێگەیشتنی فەرموودەکە لەسەر زانینی ناوی کەسەکە نەوەستاوە.

ئەو پیاوە داوای مۆڵەتی کردوە کە بچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەی خۆیدا، «فَقَالَ: بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ أَوْ أَخُو الْعَشِيرَةِ»، ماناکەی هەر یەکە، عەشیرەت واتە: گەل و هۆز، کە ئەوە ئاگاداری ئەوەی تێدایە کە ئەو پیاوە ڕەوشت ناشیرین و وشک بووە، «ثُمَّ أَذِنَ لَهُ»، واتە: مۆڵەتی پێدا کە بێتە ژوورەوە، جا کاتێک هاتە ژوورەوە، «فَأَلَانَ لَهُ الْقَوْلَ»، واتە: بە نەرم و نیانی قسەی لەگەڵ کابرادا کرد.

«فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ مَا قُلْتَ ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ؟»، وەک بڵێی عائیشە رضي الله عنها پێی سەیر بوو کە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە باسی کابرای کردو، کەچی پاشان لەگەڵیدا بە نەرم و نیانی دەدوا، وە بە ڕووی خۆشەوە پێشوازی لێکرد، بە ڕوویدا کراوە بوو بە جوانی بە خێرهاتنی کرد، جا کاتێک لەو بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمووی: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ»، واتە: خەڵکی لەبەر زمان پیسی و ڕەوشت نزمیی وازی لێ بێنن.

کەواتە: ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە لەگەڵیان نەرم و نیان نەبی، ئەوە کاری نارەواو نابەجێی گەورەیان لێ چاوەڕوان دەکرێ، بۆیە باشتر وایە کە بە شێوازێکی نەرم و جوان بەرەو ڕوویان بی، بۆ خۆپاراستن لە شەڕو خراپەیان.




٣٥١- عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ رضي الله عنهما، قَالَ: قَالَ الْحُسَيْنُ رضي الله عنه: سَأَلْتُ أَبِي، عَنْ سِيرَةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي جُلَسَائِهِ، فَقَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَائِمَ الْبِشْرِ، سَهْلَ الْخُلُقِ، لَيِّنَ الْجَانِبِ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ، وَلَا صَخَّابٍ وَلَا فَحَّاشٍ، وَلَا عَيَّابٍ وَلَا مُشَاحٍ، يَتَغَافَلُ عَمَّا لَا يَشْتَهِي، وَلَا يُؤْيِسُ مِنْهُ رَاجِيهِ وَلَا يُخَيَّبُ فِيهِ، قَدْ تَرَكَ نَفْسَهُ مِنْ ثَلَاثٍ: الْمِرَاءِ وَالْإِكْثَارِ وَمَا لَا يَعْنِيهِ، وَتَرَكَ النَّاسَ مِنْ ثَلَاثٍ: كَانَ لَا يَذُمُّ أَحَداً وَلَا يَعِيبُهُ، وَلَا يَطْلُبُ عَوْرَتَهُ، وَلَا يَتَكَلَّمُ إِلَّا فِيمَا رَجَا ثَوَابَهُ، وَإِذَا تَكَلَّمَ أَطْرَقَ جُلَسَاؤُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِهِمُ الطَّيْرُ، فَإِذَا سَكَتَ تَكَلَّمُوا لَا يَتَنَازَعُونَ عِنْدَهُ الْحَدِيثَ، وَمَنْ تَكَلَّمَ عِنْدَهُ أَنْصَتُوا لَهُ حَتَّى يَفْرُغَ، حَدِيثُهُمْ عِنْدَهُ حَدِيثُ أَوَّلِهِمْ، يَضْحَكُ مِمَّا يَضْحَكُونَ مِنْهُ، وَيَتَعَجَّبُ مِمَّا يَتَعَجَّبُونَ مِنْهُ، وَيَصْبِرُ لِلْغَرِيبِ عَلَى الْجَفْوَةِ فِي مَنْطِقِهِ وَمَسْأَلَتِهِ حَتَّى إِنْ كَانَ أَصْحَابُهُ لَيَسْتَجْلِبُونَهُمْ وَيَقُولُ: إِذَا رَأَيْتُمْ طَالِبَ حَاجَةٍ يطْلُبُهَا فَأَرْفِدُوهُ، وَلَا يَقْبَلُ الثَّنَاءَ إِلَّا مِنْ مُكَافِئٍ، وَلَا يَقْطَعُ عَلَى أَحَدٍ حَدِيثَهُ حَتَّى يَجُوزَ فَيَقْطَعُهُ بِنَهْيٍ أَوْ قِيَامٍ»[1].

واتە: لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە رضي الله عنهما، گێڕدراوەتەوە، کە حوسەین رضي الله عنه گوتوویەتی: پرسیم لە باوکم دەربارەی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دەوروبەرەکانی، گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ (بەم شێوەیە بوو:) ڕوخساری بەردەوام دەدرەوشایەوەو، موژدەدەر بوو، هەمیشە ئاسانکاری دەکرد، زۆر بە سۆزو نەرم نیان بوو، توندو تیژو دڵڕەق نەبوو، دەنگیشی بەرز نەدەکردەوە (لە کاتی بانگ کردن، یان گفتوگۆکردن)، قسەی بێماناو بێ سوودی نەدەکرد، ڕەخنەو عەیبگر نەبوو (نە لە خواردن، نە لە مرۆڤ، نە لە ئاژەڵ)، ڕەزیلی لە ناخیدا نەبوو، خۆی بێ ئاگا دەکرد لەو شتەی کە بە دڵی نەبووبا، (چونکە ڕێزی لە مرۆڤ دەگرت، سەرزەنشتی نەدەکرد، بەڵکو بە گشتی قسەی دەکرد، تا ئەو کەسەی سەرپێچی کردوە بە خۆیدا بچێتەوە)، ئەو کەسەی ئومێدی پێ دەکرد (ماڵ و سامان یان شتێکی پێ ببەخشێ) بێ ئومێدی نەدەکرد، خۆی لە سێ شت بە دوور گرتبوو، دەمەقاڵێ کردن و زۆر بلێیی و خۆ هەرقورتاندن لە شتێک پەیوەندی بەوەوە نەبووایە، لە سێ شتیشدا وازی لە خەڵک هێنابوو: ڕووبەڕو سەرزەنشتی هیچ کەسێکی نەدەکرد، هەروەها لە پاشملەش باسی نەدەکرد (عەیب و عارو ڕەخنەی لێ نەدەگرت)، بە دوای عەیبەو کەم و کوڕی کەس نەدەکەوت، وە قسەی لە هیچ شتێکدا نەدەکرد، مەگەر لە شتێکدا ئومێدی

---

(١) انظر: (ح ٨).

وەرگرتنی پاداشتی بکردایە، کاتێ قسەی بکردایە سەرنجی مەجلیسی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا، ئەوەندە بێدەنگ دەبوون دەتگوت: باڵندە بەسەر سەریانەوەیە، کاتێ بێدەنگ بووایە قسەیان دەکرد (هەرگیز قسەیان پێ نەدەبڕی)، لە خزمەتیدا ناکۆکیان دروست نەدەکرد لە قسەکردنداو دەمەقاڵێیان نەدەکرد، هەر کەسیش لە خزمەتیدا قسەی بکردایە گوێیان دەگرت و بێدەنگ دەبوون، هەتا قسەکەی تەواو دەکرد، قسەکردنی یەکەم کەس و کۆتا کەسیان لە خزمەتی (پێغەمبەر ﷺ) وەکو قسەکردنی یەکەمینیان بوو (واتە: وەکو یەک گوێی بۆ دەگرتن بێ ئەوەی بێزار ببێ)، پێدەکەنی بەوەی ئەوان بە هۆیەوە پێدەکەنین (واتە: کاتێ ئەوان دڵخۆشبوونایە ئەویش لەگەڵیان خۆشی دەردەبڕی)، سەریان بەچی سووڕبمایە ئەویش لەگەڵیان سەرسوڕمانی خۆی پێشان دەدا، ئارامی دەگرت لەسەر ئەوەی کەسێکی غەریب (دەشتەکی) بهاتایە بە ناشیرینی و ناشایستەیی و وشکی قسەی کردباو پرسیاری کردبووایە، هەتا هاوەڵەکانی کەسێکی دەشتەکیان ببینیایە دەیانهێنا (بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ) تا پرسیاری لێ بکات (چونکە خۆیان شەرمیان لێ دەکرد لە مەجلیسدا هەموو پرسیارێکیان نەدەکرد)، وە (پێغەمبەر ﷺ) دەیفەرموو: ئەگەر کەسێکتان بینی پێویستیەکی هەیە دەیەوێ بە دەستی بێنێ یارمەتی بدەن بۆ بەدەستهێنانی، وەسف و پێداهەڵگوتنی قبووڵ نەدەکرد، مەگەر لە کەسێک سنووری تێنەپەڕاندایە، هەروەها قسەی کەسی نەدەبڕی هەتا سنووری تێدەپەڕاند، ئنجا یان قسەکەی پێدەبڕی بە قەدەغە کردن لەو قسەیە، یان لەو مەجلیسە هەڵدەستا».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە فەرموودەیەکی درێژە، دانەر ﷺ، بە پێی بابەتەکان بەش بەشی کردوە لە چەند شوێنێکدا لەم پەرتووکەدا، وە پێشتر ئاماژە بەوە کرا کە لاوازی تێدایە.

کە دەڵێ: «سَأَلْتُ أَبِي، عَنْ سِيرَةِ النَّبِيِّ ﷺ فِي جُلَسَائِهِ»، واتە: ئاخۆ مامەڵەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاونشینی مەجلیسەکانی چۆن بووە؟ «فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دَائِمَ الْبِشْرِ»، واتە: هەمیشە بە ڕووێکی کراوەو گەشەوە ڕووی دەکردە خەڵکی مەجلیسەکەی، «سَهْلَ الْخُلُقِ»، ڕەوشتی نەرم و نیان و لەسەرخۆو لێبووردەو هێمن بوو، مامەڵەی




جوان و سەنگین بوو، «لَيِّنَ الْجَانِبِ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا خاکی و بە بەزەیی بووە لەگەڵ ئیماندارانددا، «لَيْسَ بِفَظٍّ وَلَا غَلِيظٍ»، توندو تیژو تووڕە نەبووە لەگەڵ بەرانبەرەکەیدا، ڕەوشت توندو دڵ ڕەق نەبووە، نەک هەر ئەوە بەڵکو خوای گەورە لە قورئاندا بەو جۆرە وەسفی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران. (بە هۆی بەزەیی خواوەیە بۆ ئەوان نەرم و نیانی بوێت ئەگەر تۆ بەدخوو قسە ڕەق و دڵ ڕەق بوویتایە ئەوە هەموو بڵاوەیان دەکرد لە دەورت کەواتە لێیان ببورەو داوای لێبوردنیان بۆ بکە لە خواو ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا جا کاتێک -دوا ڕاوێژکردن- بڕیارتدا ئەوە پشت بە خوا ببەستە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشت بە خوا دەبەستن).

کە دەڵێ: «وَلَا صَخَّابٍ»، (الصخب): گاڵە گاڵ و دەنگ بەرزکردنەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾ ﴾ لقمان. (وە لە ڕۆیشتنتدا مامناوەندی بە -نە هێواش بە، نە پەلە پەل-، -لە قسەکردندا- دەنگت نزم بکەرەوە بەڕاستی ناخۆشترینی دەنگەکان دەنگی -زەڕەی- گوێدرێژەکانە).

کە دەڵێ: «وَلَا فَحَّاشٍ»، (الفُحْش): واتە: هەڵسوکەوت و ڕەفتارو گوفتاری ناشیرین، «وَلَا عَيَّابٍ»، واتە: قەت شتی باشی عەیبدار نەکردوە، کاری جوانی عەیبدار نەکردوە، بەڵام شتی ناشیرین و ناپەسندی قەدەغە کردوەو لۆمەی کردوەو بە عەیبەی داناوە، کە دەڵێ: «وَلَا مُشَاحٍ»، (المشَاحِ): کەسێکە کەوا چروکە بەرامبەر بەو شتەی هەیەتی و حەز دەکات هی خەڵکیش بۆ ئەو بێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ هیچ یەک لەو سیفەتە ناقۆڵایانەی نەبووەو بەخشندەو دڵکراوەو بە بەزەیی بووە، هەم لە ماڵ بەخشین، هەم لە زانست پێدان و ئامۆژگاری کردن.

کە دەڵێ: «يَتَغَافَلُ عَمَّا لَا يَشْتَهِي»، واتە: زۆر وشیارو وریایە لەو شتانەی کە لە دەوری ڕوو دەدەن و ئاگای لێیە، بەڵام هەندێک جار کە خۆی لێ بێ ئاگا دەکات لەبەر بەرژەوەندی گشتیەتی، پێشەوا شافیعی ﷺ دەڵێ: (ئاقڵی وریای زیرەک کەسێکە کە بە هۆش و وریا بێ و خۆی بێ ئاگا بکات).




«وَلَا يُؤْيِسُ مِنْهُ رَاجِيهِ وَلَا يُخَيِّبُ فِيهِ»، کاتێک کەسێک دەچووە خزمەتی داواکارییەکی هەبووایە هەرگیز قسەیەکی پێ نەدەگوت کە نائومێدی بکات، ئەگەر ئەو شتەی کابرا داوای دەکرد لە لای پێغەمبەر ﷺ هەبووایە، ئەوە پێی دەبەخشی، خۆ ئەگەر دەستنەکەوتبایە، ئەوە قسەی ئومێد بەخشی پێ دەفەرموو، وەکو جێبەجێکردنی فەرمانی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾﴾ الاسراء. (وە ئەگەر ڕووت وەرگێڕا لەوانە -لەبەر نەداری- چاوەڕوانی بەخششی و ڕۆزیەک بوویت لەلایەن پەروەردگارتەوە ئەوە قسەی جوان و نەرمیان لەگەڵدا بکە).

«قَدْ تَرَكَ نَفْسَهُ مِنْ ثَلَاثٍ: الْمِرَاءِ وَالْإِكْثَارِ وَمَا لَا يَعْنِيهِ»، واتە: سێ سیفەتی لە خۆی دوور خستبۆوە، کێشمە کێش و دەمەقاڵێ، ماڵ و سامان بەسەرێک هاویشتن، بەدواداچوونی شتێک کە پەیوەندی بە ئەوەوە نەبووایە لە دین و دونیاکەیدا.

کە دەڵێ: «وَتَرَكَ النَّاسَ مِنْ ثَلَاثٍ»، واتە: لە سێ شتدا، «كَانَ لَا يَذُمُّ أَحَداً وَلَا يَعِيبُهُ»، واتە: باسی عەیبەو نەنگی کەسی نەدەکرد وە نەدەگەڕا بە شوێنیاندا، بەڵکو خەڵکیشی لەو بابەتە قەدەغە دەکرد، «وَلَا يَطْلُبُ عَوْرَتَهُ»، باس و خواسی عەیب و عاری خەڵکی نەدەکرد، «وَلَا يَتَكَلَّمُ إِلَّا فِيمَا رَجَا ثَوَابَهُ»، واتە: باسی شتێکی نەدەکردو قسەی تێدا نەدەکرد، مەگەر شتێک نەبایە کە پێی وابوو پێکاویەتی و خوای گەورە پێی ڕازییەو چاوەڕێی پاداشتی لێ دەکات.

کە دەڵێ: «وَإِذَا تَكَلَّمَ أَطْرَقَ جُلَسَاؤُهُ كَأَنَّمَا عَلَى رُءُوسِهِمُ الطَّيْرُ»، هەر کات وەکو مامۆستایەک، یان وەکو فێرکاری دینی، یان ئامۆژگاری کارێک قسەی لەگەڵدا کردبان، ئەوە ئەوانەی لە دەوری بوون هەموویان بێ دەنگ و بێ هەست و جووڵە گوێیان بۆ دەگرت، بە جۆرێک بێ جووڵە دەبوون وەکو ئەوەی کە باڵندە لەسەر سەریان بێ و نەیانەوێت هەڵبفڕێت، دیارەکە باڵندە لەسەر شتی بێ جووڵەو ئارام نەبێت نانیشێتەوە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بێ سنوور بە ئەدەب و بەڕێزو گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمان و ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر ﷺ بوون.

کە دەڵێ: «فَإِذَا سَكَتَ تَكَلَّمُوا»، کاتێک لە ڕوونکردنەوەو شیکاری شتێک دەبۆوە، ئنجا ئەوان قسەیان دەکرد، «لَا يَتَنَازَعُونَ عِنْدَهُ الْحَدِيثَ»، واتە: لەبەردەمی پێغەمبەر ﷺ کێشمەکێشم و دەمەقاڵیان نەدەکرد، بەڵکو ڕەچاوی ئەوەیان دەکرد ئایا کێ مافی ئەوەی هەیە سەرەتا قسە بکات، وا پەروەردەی کردبوون کە سەرەتا گەورە قسە بکات، قسەیان پێ نەدەبڕی وگوێیان بۆ دەگرت هەتاکو قسەکەی تەواو دەبوو و مەبەستەکەی دەگەیاند، «حَدِيثُهُمْ عِنْدَهُ حَدِيثُ أَوَّلِهِمْ»، کێ یەکەم جار قسەی دەکرد دەربارەی ئەوە قسەیان دەکرد، یان کامەیان زووتر دەستی بە قسەکردن کردبا، ئەوە مافی قسەکردنی پێ دەدرا.

کە دەڵێ: «يَضْحَكُ مِمَّا يَضْحَكُونَ مِنْهُ، وَيَتَعَجَّبُ مِمَّا يَتَعَجَّبُونَ مِنْهُ»، ئەوەش لە خاکی بوون و دڵنەرمی پێغەمبەر ﷺ بووە لەگەڵ هاوەڵانی و ئەوانەی دەوروبەری، کەوا زۆر بە شێوازێکی جوان و گونجاو مامەڵەو هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کردوون.

کە دەڵێ: «وَيَصْبِرُ لِلْغَرِيبِ عَلَى الْجَفْوَةِ فِي مَنْطِقِهِ وَمَسْأَلَتِهِ»، کە کەسێکی بێگانە هاتبایە خزمەتی، ئەوە هەمیشە لە هەموو حاڵێکدا لەگەڵی ئارام و لەسەرخۆ دەبوو، بەڵام هاونشین و هاوەڵەکانی پەروەردە کردبوو لەسەر ئادابی کۆڕو مەجلیس، کە زۆر بەڕێزو سەنگین بن و خاوەنی ڕەوشتی بەرزبن، بەڵام ئەگەر کەسێکی بێگانە بهاتایە ئەگەر کابرا توندو توڕەو تیژیش بووایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا لەسەرخۆو ئارامگر دەبوو، هەم لە کاتی قسەکردنی و، هەمیش ئەگەر کابرا داواکارییەکی هەبووایە، «حَتَّى إِنْ كَانَ أَصْحَابُهُ لَيَسْتَجْلِبُونَهُمْ»، هەتا هاوەڵانیش سوور بوون، لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێکی غەریبە بهاتباو پرسیاری خۆی کردبا بۆ خۆیان کابرایان دەهێنایە پێش، چونکە کابرای بێگانە هەموو ئەو پرسیارانەی دەکرد کەوا هاوەڵان شەرمیان دەکرد لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بپرسن، بۆیە سوودیان لە وەڵامی پرسیاری ئەو کەسانە وەردەگرت.

«وَيَقُولُ: إِذَا رَأَيْتُمْ طَالِبَ حَاجَةٍ يَطْلُبُهَا فَأَرْفِدُوهُ»، واتە: هاوکار بن لە جێبەجێکردنی پێداویستیەکانیدا، «وَلَا يَقْبَلُ الثَّنَاءَ إِلَّا مِنْ مُكَافِئٍ»، ئەگەر کەسێک چاکەیەکی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکردبایە، ئەوە زۆر بە باشتر پاداشتی چاکەکەی دەدایەوە.




کە دەڵێ: «وَلَا يَقْطَعُ عَلَى أَحَدٍ حَدِيثَهُ حَتَّى يَجُوزَ فَيَقْطَعُهُ بِنَهْيٍ أَوْ قِيَامٍ»، واتە: قسەی بە کەس نەدەبڕی کاتێک کەسەکە قسەی کردبایە، مەگەر کابرا لە قسەکردندا سنووری بەزاندبا ئەو کات قسەکەی پێ دەبڕی، جا یان قەدەغەی دەکرد لەو جۆرە قسەکردنە، یان جێی دەهێشت.

٣٥٢- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً قَطُّ فَقَالَ: لَا»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەڵێ: بیستم جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، دەیگوت: «پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هیچ شتێکی لێنەکراوە، (لای هەبووبێ) فەرمووبێتی: نا، یان نەخێر». (بەڵکو حەتمەن بەخشیویەتی).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مَا سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً قَطُّ فَقَالَ: لَا»، واتە: هەرگیز لە پێناو ئەوەیدا کە نەیەوێت شتێک ببەخشێت کە لێی داواکراوە نەیفەرمووە: نەخێر، بەڵام هەندێک جار کە فەرموویەتی: نەخێر، لەبەر ئەوە بووە کە ئەو شتەی داوای لێکراوە نەیبووە بیبەخشێت، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ ﴿٩٢﴾﴾ التوبة. (وە تاوان لەسەر ئەو کەسانەش نیە کە هاتنە لات -ئەی موحەممەد ﷺ- بۆ ئەوەی -وڵاخیان بۆ دابین بکەیت- و سواریان بکەیت، وتت وڵاخم دەست ناکەوێ سوارتان بکەم -بۆ جیهاد کردن-).

٣٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى يَنْسَلِخَ فَيَأْتِيهِ جِبْرِيلُ فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ، دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ سەخیترین کەس بوو لە بەخشیندا، وە لە کاتێکدا کە لە مانگی ڕەمەزاندا دەبوو زۆر بەخشندەتر بوو تا

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٠٣٤، ومسلم: ٢٣١١.

(٢) أخرجه البخاري: ١٩٠٢، ومسلم: ٢٣٠٨.




ڕەمەزان تەواو دەبوو، هەتا جیبـریل دەهاتە لای و قورئانی بەسەردا دەخوێندەوە، جا کاتێک جیبریلی پێدەگەیشت پێغەمبەری خـوا ﷺ لە بەخشیندا لە بـای هەڵکردوو خێراتـر بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودە باسی دەستکراوەیی و بەخشندەیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات، کە یەکێک بووە لە ئەخلاقە هەمیشەییەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە دەڵێ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ»، واتە: لە هەموویان زیاتر بەخشندەو دەستکراوەتر بووە، پێغەمبەر ﷺ وەک پادشاکان دەیبەخشی، هەر کەسێک هاتبایە خزمەتی پێی دەبەخشی، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەشدا جار هەبووە چەند شەوێک بەسەریدا تێپەڕیوە کە بەردی لە سکی خۆی بەستوە لە برسان، بەڵام ئەگەر کەسێک بهاتایە داوای شتێکی بکردایەو، پێغەمبەریش ﷺ ئەو شتەی هەبووایە ئەوە پێی دەبەخشی، جار هەبووە ماڵێکی زۆری هاتۆتە دەست، بەڵام شەوێک لە لای نەماوەتەوەو هەمووی بەخشیوە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کامڵترین کەس بووە لە هەموو ڕووێکی باشەوە، هەم لە ڕووی عیبادەتیشەوە باشترین و جوانترین و تەواوترین عیبادەتی کردوە، بە تەقواترین و لە خواترسترین و بەڕێزترین کەس بووە.

کە دەڵێ: «وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا مانگی ڕەمەزان تایبەتمەندیی خۆی هەیە بۆ بەخشندەیی، وەک هەندێک لە پێشین دەڵێن: هەرکات ڕەمەزان هات، ئەوە تەنها مانگی قورئان خوێندن و بەخشندەییە.

کە دەڵێ: «فَيَأْتِيهِ جِبْرِيلُ فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ الْقُرْآنَ»، جیبریل لە ڕەمەزاندا دەهات و قورئانی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕادەنواند، مەبەست لە ڕانواندنەکە: خوێندنەوەی قورئانە بە لەبەر، ئەوەش لە هەموو ڕەمەزانێکدا دووبارە دەبوویەوە، ئەوەش گرنگی ئەوە دەگەیەنێ کە کەسێک قورئانی لەبەر بێ، بۆ کەسێکی دیکە بخوێنێتەوە، تاکو چاک لە سینەیدا جێگیر بێ، بە تایبەتی لە ڕەمەزاندا کە مانگی قورئانە.

کە دەڵێ: «فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ»، (با) هەم بۆ خێرو خۆشیە، هەم بۆ سزاو تۆڵەشە، بەڵام مەبەست لە (با) لێرەدا ئەو بایەیە کە




خوای گەورە بە خێرو ڕەحمەت دەینێرێ لەگەڵ هەوردا، جا ئەگەر بای لەگەڵدا بێ ئەوە گشتگیر دەبێ و زۆربەی سەر زەوی دەگرێتەوەو، ئاوی دەدات و کشتوکاڵ و مەڕو ماڵات پاراو دەبێت و خەڵکی سوودی لێ دەبینێت.

٣٥٤- عَنْ ثَابِتٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَدَّخِرُ شَيْئاً لِغَدٍ»[1].

واتە: سابت دەگێڕێتەوە، ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ گوتی: «پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی (بۆ خودی خۆی) هەڵنەدەگرت بۆ بەیانی».

شەرح و ڕوونکردنەوە:

واتە: هیچ شتێکی بۆ خۆی هەڵنەدەگرت وەک پاشەکەوت، ئەوەش لەبەر دوو هۆ: هەم لەبەر بەخشندەییەکەی، هەم لەبەر ئەو متمانەیەی کە بە پەروەردگاری هەبوو، مەگەر وەکو قوت و خۆراک بۆ ماڵ و منداڵ و خێزانی هەڵی گرتبێ، عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: {أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَبِيعُ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ، وَيَحْبِسُ لأَهْلِهِ قُوتَ سَنَتِهِم}[2]. واتە: پێغەمبەر ﷺ خورماکانی بەنی نەزیری دەفرۆشت و، بەشی ساڵێک خواردنی بۆ ماڵ و خێزانی دەهێشتەوە.

٣٥٥- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﷺ، أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا عِنْدِي شَيْءٌ وَلَكِنِ ابْتَعْ عَلَيَّ، فَإِذَا جَاءَنِي شَيْءٌ قَضَيْتُهُ» فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أَعْطَيْتَهُ فَمَّا كَلَّفَكَ اللَّهُ مَا لَا تَقْدِرُ عَلَيْهِ، فَكَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ قَوْلَ عُمَرَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْفِقْ وَلَا تَخَفْ مِنْ ذِي الْعَرْشِ إِقْلَالاً، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَرَفَ فِي وَجْهِهِ الْبِشْرَ لِقَوْلِ الأَنْصَارِيِّ، ثُمَّ قَالَ: «بِهَذَا أُمِرْتُ»[3].

واتە: لە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و داوای لێکرد پێی ببەخشێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «هیچ شتێکم لەلا نیە، بەڵکو چیت پێویستە بیکڕە لەسەر من، هەرکات شتێکم بۆ هات قەرزەکەت دەدەمەوە»، عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێت بەخشیوەو خوا داوای

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٣٦٢.

(٢) برقم: ٥٣٥٧.

(٣) في إسناده موسى بن أبي علقمة المديني - والد هارون - مجهولٌ.




کارێکی لێ نەکردووی لە توانای تۆدا نەبێ، پێغەمبەر ﷺ ناڕازی بوو لە قسەکانی عومەر، پیاوێک لە پشتیوانان، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ببەخشەو مەترسە کە خاوەن عەرش کەمی بکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی کرد بە هۆی قسەی پیاوە پشتیوانەکەوە دڵخۆشی و گەشاوەیی بە ڕوویەوە دەبینرا، پاشان فەرمووی: «بەوە فەرمانم پێکراوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ماناکەی ئەوەیە کەوا پیاوێک داوای یارمەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش هیچی لەلا نەبوو پێی بدات، بەڵام پێی فەرموو: لە بازاڕ هەر پێویستیەکت هەیە بیکڕە، پارەکەی لەسەر من، هەر کات خوا ناردی قەرزەکەت بۆ دەدەمەوەو لەسەر تۆ نیە، «فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أَعْطَيْتَهُ فَمَا كَلَّفَكَ اللَّهُ مَا لَا تَقْدِرُ عَلَيْهِ»، واتە: پێش ئەو جارەش یارمەتیت داوە، مادام ئێستا هیچت بە دەستەوە نیە، بیدەیتێ بۆ تەکلیفێک دەخەیتە سەر شانت کە داوات لێ نەکراوە لە لایەن خوای گەورەوە، «فَكَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ قَوْلَ عُمَرَ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْفِقْ وَلَا تَخَفْ مِنْ ذِي الْعَرْشِ إِقْلَالاً»، لە وشەی «قَلَّ»ـەوە هاوە، واتە: هەژار بوو، بە مانای: خوای گەورە بەخشینەکانی فراوانەو هەر خۆی خاوەنی چاکەو بەخششی لە بن نەهاتوە، گەنجینەی خوا پڕەو کەم ناکات، چەند جوانی فەرمووە کە دەڵێ: «مِنْ ذِي الْعَرْشِ»، مانای ئەو وشەیە لەم شوێنەدا، واتە: خەمت نەبێت، خاوەنی عەرش و غەیری عەرشە، هەر خۆی کاروبار ڕێکدەخات لە ئاسمانەوە بۆ زەوی و هیچ هاوبەشێکی نیە.

کە دەڵێ: «فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَعَرَفَ فِي وَجْهِهِ الْبِشْرَ لِقَوْلِ الْأَنْصَارِيِّ»، واتە: زەردەخەنەی کردو ڕووی گەشایەوە کە نیشانەی دڵخۆشی و خۆشحاڵ بوونە لەبەر قسەی ئەم هاوەڵە، «ثُمَّ قَالَ: بِهَذَا أُمِرْتُ»، واتە: فەرمانم پێکراوە بەخشندە بم و لە کەمی ماڵ و نەمانی نەترسم، واتای ئەو فەرموودەیە ئەو ئایەتە بەڵگەیەتی کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۝٣٩﴾ سبأ. (وە ئێوە هەر شتێک ببەخشن -لە پێناو خوادا-، ئەوە خوا جێگەی پڕدەکاتەوەو، ئەو -خوایە- چاکترینی ڕۆزیدەرانە).





هەروەها موسلیم لە (صحيح)ـەکەیدا[١] گێراویەتیەوە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ}. واتە: (ماڵ بە بەخشین کەم ناکات).

٣٥٦- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ ﷺ، قَالَتْ: «أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِقِنَاعٍ مِنْ رُطَبٍ وَأَجْرٍ زُغْبٍ فَأَعْطَانِي مِلْءَ كَفِّهِ حُلِيّاً وَذَهَباً»[٢].

واتە: ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفراء ﷺ، دەڵێ: «بە سینیە خورمایەک و هەندێک تەرۆزی بچوکی تووکنەوە چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پڕ لەپی دەستی خشڵ و زێڕی پێ بەخشیم».

٣٥٧- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْبَلُ الْهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا»[٣].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ دیـاری وەردەگـرت و، لە بەرانبەردا پاداشتیشی دەدایەوە (بە خاوەنەکەی)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

واتە: پێغەمبەر ﷺ هەدیەو دیاری وەرگرتووەو ڕەتی نەکردۆتەوە، کە وەرگرتنی دیاریش جۆرێکە لە ڕێزگرتن، وە بەشێکە لە ڕەوشت جوانیی و دڵ ڕادەکێشێ و پێوەی پابەند دەبێ.

کە دەڵێ: «وَيُثِيبُ عَلَيْهَا»، واتە: لە بری دیارییەکە شتێکی پێ دەبەخشی، مەبەست لە پاداشتدانەوەی چاکەکەیەتی، کەمترینی پاداشت بەرانبەر بە دیاریی نرخی دیارییەکەیە.

---

(١) برقم: ٢٥٨٨.

(٢) إسناده ضعيفٌ، وقد سبق ذكره برقم: ٢٠٣.

(٣) أخرجه البخاري: ٢٥٨٥ من رواية عيسى بن يونس، وأخرجه المصنّف في جامعه: ١٩٥٣.

**شەرم و شکۆ** سیفەتێکی گەورەیەو، بەشێکە لە بەشەکانی ئیمان، هەمیشە خێرو چاکەیە، چونکە پاڵنەرە بۆ ئەوەی کەوا مرۆڤ هەمیشە کاری باش و جوان بکات لە فەرمانبەردارییی و مامەڵە کردن لەگەڵ دەوروبەرو، هەم لە ئاداب و ڕەوشتدا، وە پاڵنەرە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە کاری خراپ و تاوان و ڕەوشتی ناشیرین خۆی بپارێزێ، بە کورتی سیفەتێکە کەوا مرۆڤ پاڵدەنێ کە خۆی بە سیفەتە جوان و بەرزەکان برازێنێتەوەو خۆی لە شتە ناشیرین و دزێوەکان دابڕێنێ.

چونکە هەر کەسێک شەرم و شکۆی نەما، ئەوە لە تاوان و خراپەکاریدا ڕۆدەچێت و ڕەوشتی دادەبەزێت و، مامەڵە کردنی ناشیرین دەبێ و، هەڵسوکەوتەکانی بێ نرخ دەبن.

**٣٥٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: «كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذرَاءِ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئاً عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ»[١].**

واتە: ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ لە گەورە کچی نێو پەردە بەشەرمتر بوو، وە ئەگەر شتێکی پێناخۆش بووایە لە ڕووخسارییەوە دەمانزانی و هەستمان پێ دەکرد». (دیارە مەبەست لە شەرم و شکۆی زۆری پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوە نەبووە، کە لـە سـنوور بچێتـە دەرێ و، ڕێگریی هەق گوتن و، بەرپەرچدانەوەی ناهەقی لێبکات، چونکە تێپەڕاندن لە هەموو شتێکدا هەر خراپە)[٢].

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: **«كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذرَاءِ فِي خِدْرِهَا»**، ئەبو سەعیدی خودری ﷺ نموونەی بەو شتە هێناوەتەوە تاکو تەواویەتی شەرم و شکۆی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ڕوون بکاتەوە، (الْعَذرَاءِ فِي خِدْرِهَا) بەو کچە تازە پێگەیشتووانە دەگوترێ کە لە ماڵەوەدان و لەبەر زۆر بە شەرمیان ناتوانن لەگەڵ ئافرەتی گەورەش قسە بکەن، چ جای لەگەڵ پیاودا، کە ئەوەش سروشتی ئافرەتانە کە لەگەڵیاندایەو، بەشێکە لە ڕێزو شکۆو سروشتیان.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٥٦٢، ومسلم: ٢٣٢٠.

(٢) وەرگێڕ.




بەڵام لەو سەردەمەی ئێستادا شتەکان گۆڕاون، بۆیە ئەو سروشتەی ئافرەتیش گۆڕاوەو، ئێستا وای لێهاتوە ئافرەتان هەندێکیان بێ شەرم و شکۆو بەبێ ڕێزییەوە قسە لەگەڵ پیاوان دەکەن!.

لە هۆکارەکانی کەمی شەرم و شکۆی ئافرەتان: تێکەڵبوونە لە ناوەندەکانی خوێندن لە زۆربەی کۆمەڵگاکان، وە پابەندنەبوونە بە پۆشاکی شەرعیەوە، وە کرانەوەیە بە ڕووی داب و نەریتی خراپ و ناشیرینی دوژمنانی ئیسلام، هەروەها چەند هۆکارێکی تریش.

کە دەڵێ: «وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئاً عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ»، ئەوە لە ئەوپەڕی کامڵیی و تێرو تەواوی ڕەوشتی پێغەمبەرە ﷺ کەوا هاوەڵە بەڕێزەکانی بەو جۆرە پەروەردە کردوە، هیچ پێویستیان بە ئاگادارکردنەوەو پێگوتن نەبوو، بەڵکو تەماشای ڕووخسای پێغەمبەریان ﷺ کردوە، جا ئەگەر تووڕەییان پێوە بینیبایە، ئەوە دەیانزانی ئەو کارەیان هەڵەیە، بۆیە پێغەمبەری ﷺ تووڕە کردوە، کابرای ئەنجامدەر ئاگادار دەبوویەوەو دەستی لێ هەڵدەگرت.

٣٥٩- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «مَا نَظَرْتُ إِلَى فَرْجِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ» أَوْ قَالَتْ: «مَا رَأَيْتُ فَرْجَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَطُّ»[1].

واتە: لە عائیشە ﵂ گێڕدراوەتەوە: گوتوویەتی: «سەرنجی دامێن و شەرمگەی پێغەمبەری خوام ﷺ نەداوە»، یان فەرمووی: «هەرگیز دامێن و شەرمگەی پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەم فەرموودەیەی عائیشە ﵂ ئیسنادەکەی لاوازە، چونکە ئەو بەندەیەی عائیشە ﵂ نەناسراوە، لە صەحیحی بوخاری[2] دا هاتوە کە عائیشە ﵂ گوتوویەتی: {كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا والنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، تَخْتَلِفُ أَيْدِينَا فِيهِ}. واتە: من و پێغەمبەر ﷺ لە یەک دەفردا، یان تەشتێکدا، خۆمان دەشوشت و دەستمان لە تەشتەکەدا تێکەڵ دەبوو، ئەو فەرموودە پێشتر دانەر ﵀ هێناویەتی[3].

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السنن: ٦٦٢.

(٢) برقم: ٣٢٢.

(٣) انظر (ح ٢٥).



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی کەڵەشاخ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ



بَابُ مَا جَاءَ فِي حِجَامَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




**کەڵەشاخ**: بەشێکە لە چارەسەرییەکان، کە سوودێکی زۆری هەیە، پێغەمبەر ﷺ چەند جار کەڵەشاخی لە خۆی گرتوەو، کرێی کەڵەشاخگرتنیشی داوەتە ئەو کەسەی کە کەڵەشاخەکەی بۆ ئەنجامداوە، هەروەها خەڵکیشی بۆ کەڵەشاخگرتن ڕێنوێنی کردوە، وە هەواڵی ئەوەشی داوە کەوا چارەسەری تێدایە، (کەڵەشاخ بریتیە لەوەی کە) بە مووس پێست بریندار دەکرێ، یان شتێکی وەکو مووس، بەڵام برینێکی سووک و کەم، هەروەها ڕاکێشانی خوێن بەو شتەی کە کەڵەشاخی پێ دەگیرێ، کە ئەوەش بەشێکە لە چارەسەر، لە صەحیحی بوخاریدا[1] هاتوە کە ئیبنو عەبباس رضي الله عنهما دەگێرێتەوە لە پێغەمبەرمانەوە ﷺ کە فەرموویەتی: {الشِّفَاءُ فِي ثَلَاثَةٍ، شَرْبَةِ عَسَلٍ، وَشَرْطَةِ مِحْجَمٍ، وَكَيَّةِ نَارٍ، وَأَنْهَى أُمَّتِي عَنِ الْكَيِّ}. واتە: چارەسەر لە سێ شتدا هەیە: خواردنی هەنگوین، کەڵەشاخ، داخکردنی بە ئاگر، وە بێگومان چارەسەری بە داخکردن لەسەر ئۆممەتەکەم قەدەغە دەکەم.

کەڵەشاخ سوودو قازانجێکی زۆری بۆ جەستەی مرۆڤ هەیە، چارەسەرە بۆ چەند نەخۆشیەک کە لەم سەردەمەدا بە چەند نەخۆشیەکی قورس ناسراون، بەڵام خوای گەورە چارەسەری ئەو نەخۆشیانەی لە کەڵەشاخدا داناوە، لە ڕاستیدا لە نێو خەڵکدا ڕوون و ئاشکرایە کەوا چەند چارەسەرێک لە (الطب النبوي)دا هەیە کە خەڵکی شاهێدی لەسەر دەدەن و بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەو چارەسەرانەی کە لە پێغەمبەرمانەوە ﷺ بۆمان ماوەتەوە.

بێگومان چارەسەرکردنی نەخۆشی فەرمانی پێکراوەو، هیچ تێکگیرانێکی نیە لەگەڵ پشت بەستن بە ویستی خوای گەورە، ئیبنو ماجە[2] گێڕاوییەتیەوە لە ئوسامەی کوڕی شەریکەوە رضي الله عنه کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {تَدَاوَوْا عِبَادَ اللَّهِ؛ فَإِنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلَّا وَضَعَ مَعَهُ شِفَاءً، إِلَّا الْهَرَمَ}. واتە: ئەی بەندەکانی خوا چارەسەری نەخۆشیتان بکەن، چونکە بێگومان خوا هیچ نەخۆشیەکی دانەناوە کە چارەسەریشی لەگەڵ دانەنابێت جگە لە پیری.

---

(١) برقم: ٥٦٨٠.

(٢) برقم: ٥٦٨٠.




٣٦٠- عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ ﷺ عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ، فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وَكَلَّمَ أَهْلَهُ فَوَضَعُوا عَنْهُ مِنْ خَرَاجِهِ وَقَالَ: «إِنَّ أَفْضَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ»، أَوْ «إِنَّ مِنْ أَمْثَلِ دَوَائِكُمُ الْحِجَامَةَ»[١].

واتە: حومەید دەڵێ: پرسیار کرا لە ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەربارەی وەرگرتنی کرێی کەڵەشاخ کردن؟ (ئەنەس ﷺ) گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کەڵەشاخی لەلایەن ئەبو تەیبە بۆ ئەنجامدرا، جا فەرمانی کرد بە پێدانی دوو صاع خواردن، وە قسەی لەگەڵ خانەوادەی کرد (تا باج و خەراجی لەسەر هەڵگرن). وە فەرمووی: «بەڕاستی باشترین شت کە خۆتانی پێ چارەسەر بکەن کاری کەڵەشاخە»، یان فەرمووی: «بە ڕاستی لە چاکترین دەرمانتان کاری کەڵەشاخە».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

دەربارەی پارە وەرگرتن لەسەر کەڵەشاخ پرسیار کرا لە ئەنەس ﷺ ئەویش گوتی: «احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ»، کردەوەی پێغەمبەر ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا کرێی کەڵەشاخ کردن حەڵاڵە، چونکە ئەگەر حەڕام بووایە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ کرێی نەدەدا، ئەوەی کە لە صەحیحی موسیلمدا[٢] هاتوە لە فەرموودەی ڕافیعی کوڕی خەدیجدا ﷺ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {كَسْبُ الحَجَّامِ خَبِيثٌ}. واتە: (کرێی کەڵەشاخگر پیسە)، ئەو فەرموودەیە بەڵگە نیە لەسەر حەڕامیێتی کرێیەکە، چونکە ئەگەر حەڕام بووایە پێغەمبەر ﷺ کرێی نەدەدا، لێرە بە دوا قسەکەی ئیبنو عەبباس ﷺ دێت کە دەڵێ: «وَلَوْ كَانَ حَرَاماً لَمْ يُعْطِهِ». واتە: (ئەگەر حەڕام بووایە پێغەمبەر ﷺ کرێی نەدەدا) بەڵام ئیشی کەڵە شاخگرتن پیسیەکەی لەبەر ئەوەیە کە خودی ئیشەکە مامەڵە کردنە لەگەڵ شتی پیس، ئێ خۆ سیرو پیازیش بە دوو ڕووەکی پیس پێناسەکراون، بەڵام خۆ ئەوە خواردنەکەیان حەڕام ناکات.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢١٠٢، ومسلم: ١٥٧٧، والمصنّف في جامعه: ١٢٧٨.

(٢) برقم: ١٥٦٨.

کە دەڵێ: «وَكَلَّمَ أَهْلَهُ فَوَضَعُوا عَنْهُ مِنْ خَرَاجِهِ»، چونکە ئەبو تەیبە بەندە بوو باجی خرابوویە سەر، ئەو جۆرە باجە بەو شێوەیە: خاوەنی بەندەکە ڕێگا بە بەندەکەی دەدات کەوا ئیش بکات، بەو مەرجەی بەشێک لە داهاتەکەی وەکو باج بدات بە گەورەکەی، جا ئیشەکە بازرگانی بێ، یان پیشەزانی بێ، یان هەر کارێکی تر، باجەکە مانگانە دەدات، یان هەموو هەفتەیەک، یان بە جۆرێک کە لەسەری ڕێک دەکەون، جا پێغەمبەر ﷺ داوای لە خاوەنەکەی کرد کەوا باج لەسەر ئەبو تەیبە سووک بکات و بۆی کەم بکاتەوە.

کە دەفەرموێ: «إِنَّ أَفْضَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ، أَوْ إِنَّ مِنْ أَمْثَلِ دَوَائِكُمْ الحِجَامَةَ»، باسی گەورەیی چارەسەرو سوودی کەڵەشاخ دەکات، کە خەڵک بە کەمی دەیکات و پێویستیشیان پێیەتی، هەر کەسێک کتێبی (الطب النبوي) لە کتێبەکەی (إبن القيم) ﷺ (زاد المعاد) بخوێنێتەوە هەموو چارەسەرو شێوازەکانی و شوێنەکانی و کاتەکانی کەڵەشاخگرتنی تێدا باسکراوە.

٣٦١- عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ وَأَمَرَنِي فَأَعْطَيْتُ الْحَجَّامَ أَجْرَهُ»[(١)].

واتە: عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ کەڵەشاخی کرد، وە فەرمانیشی بە من کرد هەقی ئەو کەسە بدەم کە کەڵەشاخی بۆ کردووم».

٣٦٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ فِي الْأَخْدَعَيْنِ وَبَيْنَ الْكَتِفَيْنِ، وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ وَلَوْ كَانَ حَرَاماً لَمْ يُعْطِهِ»[(٢)].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەردوو خوێنبەری دەماری ملی و نێوان شانەکانیدا کەڵەشاخی کردو، هەقی ئەو کەسەشیدا کە بۆی ئەنجامدا، بێگومان ئەگەر (وەرگرتنی) کرێ لە بەرانبەر کەڵەشاخ (ئەنجامدان بۆ خەڵک) حەڕام بووایە، کرێیەکەی نەدەدا (بەو کەسە)».

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السنن: ٢١٦٣، وفي إسناده أبو جميلة، وهو مقبولٌ، لكنَّه يتقوَّى بما قبله وما بعده.

(٢) في الإسناد جابر الجعفيُّ، وهو ضعيفٌ، لكنَّه توبع عليه، وقد رواه مسلم في صحيحه: ١٢٠٢ بلفظ: «حَجَمَ النَّبِيَّ ﷺ عَبْدٌ لِبَنِي بَيَاضَةَ، فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ ﷺ أَجْرَهُ، وَكَلَّمَ سَيِّدَهُ فَخَفَّفَ عَنْهُ مِنْ ضَرِيبَتِهِ، وَلَوْ كَانَ سُحْتًا لَمْ يُعْطِهِ النَّبِيُّ ﷺ»، ورواه البخاري في صحيحة: ٢١٠٣ بلفظ: «احْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَعْطَى الَّذِي حَجَمَهُ، وَلَوْ كَانَ حَرَامًا لَمْ يُعْطِهِ».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ فِي الْأَخْدَعَيْنِ»، (الأَخْدَعَان): دوو دەماری لەملاولای ملن، «وَبَيْنَ الْكَتِفَيْنِ»، لەسەرووی پشت نێوان شانەکان.

کە دەڵێ: «وَأَعْطَى الْحَجَّامَ أَجْرَهُ وَلَوْ كَانَ حَرَاماً لَمْ يُعْطِهِ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کرێیەی کەڵەشاخگر وەری دەگرێ لە بەرامبەر کارەکەیدا حەڵاڵ و ڕەوایە.

٣٦٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَعَا حَجَّاماً فَحَجَمَهُ وَسَأَلَهُ: «كَمْ خَرَاجُكَ؟» فَقَالَ: ثَلَاثَةُ آصُعٍ، فَوَضَعَ عَنْهُ صَاعاً وَأَعْطَاهُ أَجْرَهُ.

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کەسێکی بانگکرد کە کاری کەڵەشاخگری دەکرد، کەڵەشاخی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەنجامدا، ئنجا لێی پرسی: «ئایا باجەکەت چەند لەسەرە؟» گوتی: سێ صاع، (پێغەمبەر ﷺ) یەک صاعی بۆ کەم کردەوەو کرێیەکەی خۆی پێدا.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

بە مانای فەرموودەکەی ڕابورد، کە دەڵێ: «فَوَضَعَ عَنْهُ صَاعاً»، واتە: لە لای خاوەنەکەی تکای بۆ کرد، کەوا صاعێک لە باجەکەی دابەزێنێ و لێی خۆشبێ، تەنها دوو صاع باج بدات.

٣٦٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَحْتَجِمُ فِي الْأَخْدَعَيْنِ وَالْكَاهِلِ، وَكَانَ يَحْتَجِمُ لِسَبْعَ عَشْرَةَ وَتِسْعَ عَشْرَةَ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر هەردوو خوێنبەری ملی و سەرووی پشتی کەڵەشاخی کردو، جا (لە ڕۆژەکانی:) حەڤدەو نۆزدەو بیست و یەکدا کەڵەشاخی ئەنجام دەدا».

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٠٥١، وأبو داود في السنن: ٣٨٦٠، وابن ماجه في السنن: ٣٤٨٣.




### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە شەرحەکەی پێویستە کەسێکی پسپۆڕ لە بواری پزیشکی وەرگێڕانی بۆ بکات، چونکە ئیشی من نیە، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ۝٧ ﴾ الأنبياء. (دەی پرسیار بکە لە خاوەنی کتێبەکانی -پێشوو لە زانایانی جوولەکەو نەصرانیی- ئەگەر ئێوە نازانن).

٣٦٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ بِمَلَلٍ عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەلەل (کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینە) کەڵەشاخی ئەنجامدا لەسەر پشتی پێی (لە کاتێکدا) لە ئیحرامدا بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ بِمَلَلٍ»، (بِمَلَلٍ): شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەینەدا، لە مەدینە نزیکترە.

کە دەڵێ: «عَلَى ظَهْرِ الْقَدَمِ»، پێشەوا ئەحمەد ﷺ ئەوەی بۆ زیاد کردوە، لەبەر ئەو ئازارەی کە هەیبوو، کەڵەشاخ یەکێکە لەو چارەسەرانەی کە زۆرترین سوودی هەیە بۆ ئارام بوونەوە لە ئازار.

ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کەڵەشاخگرتن بۆ کەسێک کە لە ئیحرامدا بێ هیچ کێشەیەکی نیە مادام تەنها خوێنگرتنەکە بێ، بەڵام ئەگەر شوێنەکەی پێویستی بە تاشینی موو هەبوو، ئەوە با مووەکە لابەرێت و فیدیەی دەکەوێتە سەر.

---

(١) في المسند: ١٢٦٨٢.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی ناوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ



پێغەمبەرمان ﷺ چەند ناوێکی هەن، زۆری ناوەکانیشی بەڵگەیە لەسەر زۆری سیفەتە جوانەکانی، کەواتە: ناوەکانی تەنها ناوی ڕووت و بێ ناوەڕۆک نین، بەڵکو هەروەکو چۆن ناون، بە هەمان شێوە مانادارن و ناوەڕۆکیان هەیە، هیچ دژیەکییەک لە نێوان ناوو سیفەتەکاندا نیە.

٣٦٦- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِي أَسْمَاءً: أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا الْمَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الْكُفْرَ، وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا الْعَاقِبُ وَالْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ نَبِيٌّ»[1].

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «من چەند ناوێکم هەن: موحەممەدم، ئەحمەدم، ماحیم ئەو کەسەم کە خوا کوفرو بێبڕوایی بە من لادەبات، وە من حاشیرم ئەو کەسەم کە خوا لەبەر دەستی من خەڵک کۆدەکاتەوە (لە دواڕۆژدا)، وە هەروەها عاقیبم، عاقیب ئەو کەسەیە کە لە دوای ئەو هیچ پێغەمبەرێک نیەو نایێ».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «إِنَّ لِي أَسْمَاءً أَنَا مُحَمَّدٌ»، ئەو ناوەیان هەمان ئەو ناوەیە کە باوکی ناوی ناوە، بۆ ئەوەش بەو ناوە ناوینا بە ئومێدی ئەوەی کە لە دونیاو قیامەتدا سوپاسکراو بێ، مانای (مُحَمَّدٌ) ئەوەیە کە ئەو کەسە سیفەتی بەرزی هەبن و بە هۆیانەوە سوپاسی بکرێت.

لەبەر مانای جوانی (مُحَمَّدٌ) بوو، کە موشریکەکان ئەگەر بیانویستبا بە خراپ باسی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ناویان بە موحەممەد نەدەهێنا، بەڵکو دەیانگوت: (مذمَّمٌ)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: {أَلَا تَعْجَبُونَ كَيْفَ يَصْرِفُ اللَّهُ عَنِّي شَتْمَ قُرَيْشٍ وَلَعْنَهُمْ؟ يَشْتِمُونَ مُذَمَّمًا وَيَلْعَنُونَ مُذَمَّمًا، وَأَنَا مُحَمَّدٌ}. واتە: پێتان سەیر نیە چۆن خوای گەورە جنێودان و نەفرینی قورەیشی لە من بواردووە؟!) ئەوان جنێو بە (مذمَّمٌ) دەدەن و، نەفرەت لە (مذمَّمٌ) دەکەن، لە کاتێکدا من ناوم (مُحَمَّدٌ)ـە. بوخاری[2] گێڕاویەتیەوە

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٥٣٢، ومسلم: ٢٣٥٤، والمصنّف في جامعه: ٢٨٤٠.

(٢) برقم: ٣٥٣٣ من حديث أبي هريرة ﷺ.




بەو جۆرە خوای گەورە پاراستوویەتی هەم ناوەکەی و هەم سیفەتەکەی، باسی خراپەکردنەکەی لە لایەن قورەیشەوە بەرەو (مذمم) لادراوە.

هُم يَشتُمُونَ مُذَمَّماً وَمُحَمَّدٌ عَن شَتمِهِم فِي مَعزِلٍ وَصِيَانِ

صَانَ الإِلَهُ مُحَمَّداً عَن شَتْمِهِم فِي اللَّفظِ وَالمعنَى همَا صِنْوَانِ

کە دەڵێ: «أَنَا مُحَمَّدٌ»، بێگومان سوپاسگوزارترین بووە بۆ خوای گەورەو، زۆرترین ستایشکاری خوای گەورە بووە، هەر لەبەر ئەوەشە کە کاتێک لە قیامەتدا تکا بۆ سەرەتاو کۆتایی خەڵکی دەکات، خوای گەورە فێری سوپاسگوزاریەکی تایبەتی دەکات و، جوانترین ستایشی فێر دەکات کە تەنها تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ لە ناو هەموو دروستکراوەکاندا.

کە دەڵێ: «وَأَنَا الْمَاحِي»، بە ڕستەی دواتر تەفسیری کردوە کە دەڵێ: «الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الْكُفْرَ»، خوای گەورە بۆ ئەوە ناردوویەتی کەوا کوفرو بێبڕوایی پێ بسڕێتەوە، وە گومڕایی و سەرلێشێواوی بە هۆی ئەو لە ناو بەرێ و نەیهێڵێ، بە هۆی ئەو چاوە کوێرەکان ڕووناک بکاتەوە، بۆ ئەوە ناردوویەتی دڵە داخراوەکان بکاتەوەو، گوێچکە کەڕبووەکان و نابیستەکان بکاتەوە.

کە دەڵێ: «وَأَنَا الْحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي»، واتە: بێگومان ئەو یەکەم کەسە لە پێش هەموو خەڵکیدایە بۆ حەشر، وە یەکەم کەسە کەوا گۆڕەکەی دەکرێتەوەو، ئەوجار خەڵکی بە دوای ئەودا زیندوو دەکرێنەوە.

(إبن القيم) ﷺ لە کتێبی (جلاء الأفهام)دا[1] دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو ناوانەی خۆی کردوە تاکو گەورەیی و پلەوپایەی خۆی بە ئێمە بڵێ کە خوای گەورە ئەوی پێ تایبەت کردوەو، مانای ناوەکانی بۆمان ڕوون بکاتەوە، چونکە ئەگەر وانەبێ و ناوەکان تەنها ناوبن و مانایان نەبێ، ئەوە بۆ پیاهەڵدان و گەورەیی نەدەبوونە بەڵگە.

کە دەڵێ: «وَأَنَا الْعَاقِبُ»، واتە: خوا کردوویەتی بە کۆتا پێغەمبەرو هیچ پێغەمبەرێک لە دوای ئەو نایەت و بوونی نیە، بەڵکو ئەو کۆتا پێغەمبەرەو لە دوای هەموویان هاتوە.

---

(١) ص ١٠٨.

که دەڵێ: «وَالْعَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدَهُ نَبِيٌّ»، دەڵێن: ئەوەیان قسەی زوهرییە کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوەو، کردوویەتیە ناویەوەو کۆتاییەکەی تەفسیر کردوە.

٣٦٧- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ: لَقِيتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي بَعْضِ طُرُقِ الْمَدِينَةِ فَقَالَ: «أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا نَبِيُّ الرَّحْمَةِ، وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ، وَأَنَا الْمُقَفَّى، وَأَنَا الْحَاشِرُ، وَنَبِيُّ الْمَلَاحِمِ»[1].

واتە: حوزەیفە ﷺ دەڵێ: لە یەکێک لە ڕێگاکانی مەدینە بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتم، فەرمووی: «من موحەممەدم، من ئەحمەدم، من پێغەمبەری ڕەحمەتم، پێغەمبەری پەشیمانی و لێبوردنم، من هەڵگری ڕێبازی پێغەمبەرانی پێش خۆمم، من حاشیرم، من پێغەمبەری جەنگ و تێکۆشانە گەورەکانم».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

وەکو فەرموودەکەی پێشووترەو هەندێک زیادەشی لەگەڵدایە، کە دەڵێ: «وَأَنَا نَبِيُّ الرَّحْمَةِ»، خوا بە ڕەحمەت ناردوویەتی بۆ هەموو جیهانییان، ڕەحمەتەکەشی لە شوێنکەوتنیەتی، کە دەڵێ: «وَنَبِيُّ التَّوْبَةِ»، خوا ناردوویەتی هەتاکو خەڵکی بانگ بکات بۆ لای خوای گەورەو بگەڕێنەوە، هەر خۆشی سەردەستەی ئەوانەیە کە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە.

کە دەڵێ: «وَأَنَا الْمُقَفَّى»، یان (الْمُقفِّى): (إسم فاعل)ـە، لەوکاتەدا واتاکەی ئاوای لێدێ واتە: منیش بە دوای پێغەمبەرانی پێش خۆمدا هاتووم، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْۗ ﴿٩٠﴾ ﴾ الأنعام. (ئەوانە -ئەو پێغەمبەرانەی باسکران- کەسانێک بوون خوا ڕێنموونی کردن دەی پەیڕەوی ڕێگاو ڕێبازی ئەوان بکە -ئەی موحەممەد ﷺ-). پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ هەموویان بران و بیروبڕواکەیان یەکە، تەنها شەریعەتیان جیاوازە.

(الْمُقَفَّى): خۆ ئەگەر (اسم مفعول) بێ، ماناکەی ئاوایە بە شوێن پێغەمبەرانداو بە دوای ئەواندا نێردراوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا ﴿٢٧﴾ ﴾ الحديد. (لە پاشان بە شوێن ئەواندا دیسان پێغەمبەرانی خۆمانمان نارد).

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ٢٣٤٤٥.

بە مانای (اسم فاعل)، یان (اسم مفعول) بێ، ماناکەی هەر یەکە.

کە دەڵێ: «وَنَبِيُّ الْمَلَاحِمِ»، (الملحمة): واتە: جەنگ، بۆیەش پێی دەگوترێ: (ملحمة): چونکە گۆشتەکان و جەستەکان بەریەک دەکەون لە جەنگدا، هەر لێدانێک ڕوویدات بەرجەستە دەکەوێ بۆیە بە جەنگ دەڵێن: (الملحمة).

### ئاگاداریەک:

پێویستە لەسەر مسوڵمانان کە لە ناوو پیاهەڵدانی پێغەمبەر ﷺ زێدەڕۆیی نەکەن و ناوو سیفەتێکی پاڵ نەدەنە لای کە تەنها بۆ خوای گەورەیە، وەکو ناوهێنانی پێغەمبەر ﷺ بە ناوەکانی: «الأوّل، والآخر، والظاهر، والباطن» یان بە جۆرێک وەسفی بکرێ کە بگوترێ: «أَنَّهُ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً». واتە: پێغەمبەر ﷺ زانستی بە هەموو شتێک هەیە، دروست نیە ئەو جۆرە وەسفانە بکرێ، یان وەکو قسەی ئەوانەی کەوا زێدەڕۆیی دەکەن و سەرلێشێواون، چونکە کەسیتر مافی ئەو سیفەتانەی نیە جگە لە خوا.

چونکە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامی ئەو کەسەدا کە دەیگوت: ئەگەر خواو تۆ بتانەوێ. فەرمووی: {أَجَعَلْتَنِي وَاللَّهَ عَدْلًا ، بَلْ مَا شَاءَ اللَّهُ وَحْدَهُ}[1]. واتە: ئایا منیشت وەکو خوا بەرانبەر کرد؟! بڵێ: تەنها ئەگەر خوا بیەوێ.

٣٦٨- عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ بِمَعْنَاهُ، هَكَذَا قَالَ حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ زِرٍّ، عَنْ حُذَيْفَةَ.

واتە: حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەیەکی دیکە، کە هەمان مانای ئەوەی ڕابردووی هەیە، بەڵام سەنەدەکە بەم شێوەیە لە حەمادی کوڕی سەلەمە، لە عاصیم، لە زیڕەوە، لە حوزەیفە ﷺ.

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٨٣٩ تحقيق أحمد شاكر، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح، والبيهقي في السُّنن: ٥٨١٢.

دانەر ﷺ، لە باسی نۆیەمدا ئەو بابەتەی باسکردوە، بەڵام لەوێ دوو فەرموودەی هێناوە لێرەدا باسەکەی دووبارە کردۆتەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵێک فەرموودەی دیکە باس بکات، کەوا ژیان و گوزەرانی پێغەمبەر ﷺ ڕووندەکەنەوە، پێغەمبەر ﷺ بە کەمیش ڕازی بووە، ئەگەر تەنها بەشی ژیانێکی سادەی هەبووبێ پێی ڕازی بووەو، گرنگی زۆری بە دونیا نەداوە، هەموو گرنگی دانەکەی تەنها بۆ دواڕۆژی بووە، بۆیە بە خواردن و گوزەرانێکی سادەیش ڕازی بووەو قەناعەتی کردوە.

٣٦٩- عَنْ سِمَاكِ بْنِ حَرْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ﷺ يَقُولُ: أَلَسْتُمْ فِي طَعَامٍ وَشَرَابٍ مَا شِئْتُمْ؟ «لَقَدْ رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ وَمَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ مَا يَمْلَأُ بَطْنَهُ»[1].

واتە: سیماکی کوڕی حەڕب دەڵێ: لە نوعمانی کوڕی بەشیرم بیست ﷺ دەیگوت: ئایا ئێوە چەندی بتانەوێ لە خواردن و خواردنەوە نایخۆن و نایخۆنەوە (واتە: با دەیخۆن و دەیخۆنەوە)؟! «بە ڕاستی من پێغەمبەرتانم ﷺ بینیوە خراپترین جۆری خورمای چنگ نەدەکەوت (بیخوات و) سکی پێی تێر بکات».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «أَلَسْتُمْ فِي طَعَامٍ وَشَرَابٍ مَا شِئْتُمْ»، واتە: بە ڕۆژگارێک گەیشتوون کە هەرچی پێتان خۆش بێ لە خواردن و خواردنەوە بۆتان دەستەبەر دەبێ بە ئاسانی، «لَقَدْ رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ ﷺ وَمَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ مَا يَمْلَأُ بَطْنَهُ»، (الدَّقَل): ناوە بۆ خورمای خراپ، واتە: پێغەمبەر ﷺ خورمای خراپیشی پڕ بە سکی خۆی دەستنەکەوتوە، چ جای خورمای تەڕو تازەو زۆر چاک.

٣٧٠- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: «إِنْ كُنَّا آلَ مُحَمَّدٍ نَمْكُثُ شَهْراً مَا نَسْتَوْقِدُ بِنَارٍ، إِنْ هُوَ إِلَا التَّمْرُ وَالْمَاءُ»[2].

واتە: عائیشە ﷺ دەڵێ: «ئێمەی خانەوادەی موحەممەد ﷺ، جاری وابوو یەک مانگی تەواو دەماینەوە لە ماڵ و ئاگرمان هەڵنەدەکرد، چونکە ئەوەی هەبوو (بۆ

---

(١) انظر: (ح ١٥٢).

(٢) أخرجه البخاري: ٦٤٥٨، ومسلم: ٢٩٧١، وأخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٤٧١.



خواردن) تەنها خورماو ئاو بوو». (واتە: شتێک نەبوو شایانی گەرم کردنەوەو سوور کردنەوە بێ لە ماڵیان).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووترە، ئەوەشیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا دونیاو خۆشیەکانی لە لای خوای گەورە زۆر بێ نرخ و بێ بایەخن، خۆ ئەگەر وانەبووایە ئەوە دونیای تایبەت دەکرد بە پێغەمبەر ﷺ، کە باشترین و چاکترین بەندەکانی خوا بووە لە ڕووی پەرستش و فەرمانبەرداریی و لە خواترسی لە هەموو ڕووێکەوە کامڵترین و گەورەترین و بە شکۆترین بەندەی خوا بووە.

٣٧١- عَنْ أَبِي طَلْحَةَ رضي الله عنه قَالَ: «شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْجُوعَ وَرَفَعْنَا عَنْ بُطُونِنَا عَنْ حَجَرٍ حَجَرٍ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَطْنِهِ عَنْ حَجَرَيْنِ»[1].

واتە: ئەبو تەڵحە رضي الله عنه دەڵێ: «سکاڵامان برد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوەی بەسەرمان هاتبوو لە برسیەتی، (هەر یەکێکمان) بەردی لەسەر سکی خۆی دانابوو، ئیدی پێغەمبەری خواش ﷺ دوو بەردی لەسەر سکی خۆی دانابوو (لە برسان)».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْجُوعَ وَرَفَعْنَا عَنْ بُطُونِنَا عَنْ حَجَرٍ حَجَرٍ»، واتە: هەر یەکێکمان لە برسان و لەبەر ئەوەی برسێتی تینی بۆ هێنابووین و لاوازی کردبووین، هەر یەکەمان بەردێکمان لە سکی خۆمان بەستبوو، بۆ ئەوەی کەمێک فەرامۆشیمان بۆ بێت.

مرۆڤ ئەگەر برسێتی تینی بۆ بێنێ، ئەوە بە دەستەکانی پەستان دەخاتە سەر سکی

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٢٣٧١، والحديث بهذا الإسناد ضعيف؛ لأنَّ سيَّار بن حاتم العنزي صدوقٌ له أوهام ومناكير، لكن معناه صحيحٌ تشهد له أحاديث أخرى صحيحةٌ، فمن ذلك ما جاء في صحيح البخاري: ٤١٠١ عن جابرٍ رضي الله عنه أنَّه قال: إِنَّا يَوْمَ الْخَنْدَقِ نَحْفِرُ، فَعَرَضَتْ كُدْيَةٌ شَدِيدَةٌ، فَجَاءُوا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا : هَذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضَتْ فِي الْخَنْدَقِ. فَقَالَ: أَنَا نَازِلٌ. ثُمَّ قَامَ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ، وَلَبِثْنَا ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ لَا نَذُوقُ ذَوَاقًا.

پێشەوا تیرمذي رحمه الله دەڵێ: ئەمە فەرموودەیەکی غەریبەو، لەو فەرموودانەی ئەبو تەڵحە ڕیوایەتی کردوە، لەم ڕووەوە نەبێ نەمانزانیوەو نایزانین، وە کە دەشڵێ: (وَرَفَعْنَا عَنْ بُطُونِنَا عَنْ حَجَرٍ حَجَرٍ) واتە: هەر یەکێکیان بەردێکی دەبەست لەسەر سکی خۆی بە هۆی قورسی باری گوزەرانیان و بێهێزیان لە برسان.




بۆ ئەوەی برسێتیەکەی کەمێک سووک بێت، جا هاوەڵان زۆرجار ماوەی برسێتیان درێژەی دەکێشا، بۆیە دەست خستنە سەر سکیان بەس نەبوو، لەبەر ئەوە یەکێک ئەگەر تووشی ئەو حاڵە ببووایە، ئەوە بەردێکی لە سکی دەبەست.

جا کاتێک برسێتیەکەیان زۆر سەغڵەتی کردن، هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ سکاڵای توندی برسێتیەکەیان لەلا دەکرد، «فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَطْنِهِ عَنْ حَجَرَيْنِ»، خۆی دوو بەردی بەستبوو بە سکیەوە ئەوەش لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ برسێتی زۆری بۆ هێنابوو.

٣٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَاعَةٍ لَا يَخْرُجُ فِيهَا وَلَا يَلْقَاهُ فِيهَا أَحَدٌ، فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ: «مَا جَاءَ بِكَ يَا أَبَا بَكْرٍ؟» قَالَ: خَرَجْتُ أَلْقَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَنْظُرُ فِي وَجْهِهِ، وَالتَّسْلِيمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: «مَا جَاءَ بِكَ يَا عُمَرُ؟» قَالَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ ﷺ: «وَأَنَا قَدْ وَجَدْتُ بَعْضَ ذَلِكَ» فَانْطَلَقُوا إِلَى مَنْزِلِ أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ التَّيْهَانِ الْأَنْصَارِيِّ وَكَانَ رَجُلاً كَثِيرَ النَّخْلِ وَالشَّاءِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ خَدَمٌ، فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَقَالُوا لِامْرَأَتِهِ: أَيْنَ صَاحِبُكِ؟ فَقَالَتِ: انْطَلَقَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا الْمَاءَ، فَلَمْ يَلْبَثُوا أَنْ جَاءَ أَبُو الْهَيْثَمِ بِقِرْبَةٍ يَزْعَبُهَا، فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَاءَ يَلْتَزِمُ النَّبِيَّ ﷺ وَيُفَدِّيهِ بِأَبِيهِ وَأُمِّهِ، ثُمَّ انْطَلَقَ بِهِمْ إِلَى حَدِيقَتِهِ فَبَسَطَ لَهُمْ بِسَاطاً، ثُمَّ انْطَلَقَ إِلَى نَخْلَةٍ فَجَاءَ بِقِنْوٍ فَوَضَعَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَفَلَا تَنَقَّيْتَ لَنَا مِنْ رُطَبِهِ؟» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَرَدْتُ أَنْ تَخْتَارُوا، أَوْ تَخَيَّرُوا مِنْ رُطَبِهِ وَبُسْرِهِ، فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ. فَقَالَ ﷺ: «هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ظِلٌّ بَارِدٌ، وَرُطَبٌ طَيِّبٌ، وَمَاءٌ بَارِدٌ». فَانْطَلَقَ أَبُو الْهَيْثَمِ لِيَصْنَعَ لَهُمْ طَعَاماً. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَذْبَحَنَّ ذَاتَ دَرٍّ»، فَذَبَحَ لَهُمْ عَنَاقاً أَوْ جَدْياً، فَأَتَاهُمْ بِهَا فَأَكَلُوا، فَقَالَ ﷺ: «هَلْ لَكَ خَادِمٌ؟» قَالَ: لَا. قَالَ: «فَإِذَا أَتَانَا سَبْيٌ فَأْتِنَا». فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِرَأْسَيْنِ لَيْسَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ، فَأَتَاهُ أَبُو الْهَيْثَمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اخْتَرْ مِنْهُمَا» فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اخْتَرْ لِي. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ، خُذْ هَذَا فَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي، وَاسْتَوْصِ بِهِ مَعْرُوفاً».

فَانْطَلَقَ أَبُو الْهَيْثَمِ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: مَا أَنْتَ بِبَالِغٍ حَقَّ مَا قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ إِلَّا بِأَنْ تَعْتِقَهُ! قَالَ: فَهُوَ عَتِيقٌ، فَقَالَ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيّاً وَلَا خَلِيفَةً إِلَّا وَلَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ لَا تَأْلُوهُ خَبَالاً، وَمَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ»[1].

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٣٦٩، وأبو داود في السنن: ٥١٢٨، وابن ماجه في السنن: ٢٧٤٥.




واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێ: (ڕۆژێک) پێغەمبەری خوا ﷺ (لە ماڵ) چووە دەر، کە عادەت نەبوو لەو کاتەدا بچێتە دەرەوە، لەو کاتەشدا کەس سەردانی نەدەکردو پێی نەدەگەیشت، ئیدی ئەبو بەکر پێی گەیشت، فەرمووی: «ئەی ئەبو بەکر چ شتێک تۆی هێناوەتەدەر (هۆکاری هاتنەدەرت چیە؟)»، گوتی: هاتوومەتە دەرێ تا بگەم بە پێغەمبەری خوا ﷺو ڕووخساری ببینم و تەماشای بکەم و سڵاوی لێبکەم، زۆری پێنەچوو عومەر هات، فەرمووی: «ئەی عومەر چ شتێک تۆی هێناوەتەدەر؟» گوتی: برسیەتی ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەست بە هەندێ برسیەتی دەکەم»، ئیدی پێکەوە ڕۆیشتن بۆ ماڵی ئەبو هەیسەمی کوڕی تەیهانی ئەنصاڕیی، پیاوێک بوو دارخورماو مەڕی هەبوون، خزمەتکاری نەبوو، (لەو کاتەدا ئەبو هەیسەم) خۆی لە ماڵ نەبوو، بۆیە بە خێزانەکەیان گوت: پیاوەکەت لە کوێیە؟ گوتی: ڕۆیشتووە بۆ ئەوەی ئاومان بۆ بێنێ، جا زۆر نەمانەوە لەوێ ئەبو هەیسەم هاتەوە ماڵ بە کوندەیەک ئاو، ئیدی داینایە سەر زەوی، پاشان هات دەستی خستە سەر شان و ملی پێغەمبەری خوا ﷺو دایک و باوکی بە قوربانی کرد، دوایی بردنی بۆ نێو باخەکەی ڕایەخێکی بۆ داناو، ئنجا بە پەلە چوو بۆ لای دارخورمایەک و هێشووەک فەریکە خورمای بۆ هێناو لەبەر دەستیان دانا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «بۆچی خورمای پێگەیشتووت بۆ نەهێناوین؟» گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ویستم سەرپشک بن لە هەڵبژاردنی ئەوەی پێتان خۆشە لە خورمای پێگەیشتوو و، فەریکە خورما، جا ئەوە بوو (لە خوارماکەیان) خواردو لە ئاوەکەشیان خواردەوە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «(سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە ئەمە لەو نیعمەت و چاکانەیە کە لە ڕۆژی دوایی پرسیارتان دەربارەیان لێ دەکرێ، سێبەرێکی فێنک (لە گەرمای هاویندا)، خورمای پێگەیشتووی خۆش، هەروەها ئاوی سارد)».

جا ئەبو هەیسەم بە پەلە ڕۆیشت بۆ ئەوەی خواردنیان بۆ ئامادە بکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «(ئاژەڵی) شیردەرمان بۆ سەرمەبڕە»، ئەویش کاریلە، یاخود گیسکێکی بۆ سەربڕین و بۆی هێنان پێکەوە خواردیان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئایا خزمەتکارت هەیە؟» گوتی: نەخێر، فەرمووی: «هەر کات دیلێکمان بۆ هات وەرە لامان»، پاشان پێغەمبەر ﷺ دوو کەسی بە دیلگیراوی بۆ هێنرا، سێ کەس نەبوون، ئنجا ئەبو هەیسەم

هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: «یەکێک لەم دووانە هەڵبژێرە (بۆ ئەوەی یارمەتیت بداو هاوکارت بێت)»، (ئەبو هەیسەمیش) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا جەنابت بۆم هەڵبژێرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ڕاوێژکار متمانە پێکراوە، ئەو دیلە ببە، چونکە من بینیومە نوێژ دەکات، چاک ڕەفتاربە لەگەڵیدا».

ئیدی ئەبو هەیسەم بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی و فەرموودەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ ڕاگەیاند، خێزانەکەی گوتی: تۆ ناگەی بە پێدانی مافی ئەو خزمەتکارە بەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، مەگەی ئازادی بکەی! ئەبو هەیسەمیش گوتی: ئازادە (واتە: ئازادم کرد)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان خوا پێغەمبەرێک، یان جێنشینێکی نەناردوە، مەگەر دوو جۆر لە (کەسی) نزیکی بە دەورەوەن، (کەسانێکی) نزیک کە فەرمانی بە چاکە پێ دەکەن و، قەدەغەی خراپەی لێ دەکەن، (کەسانێکی) نزیکیش کە کەمتەرخەمی ناکەن لە خراپکردن و گومڕاکردنیدا، جا بە دڵنیایی هەر کەس خۆی بپارێزێ لە کەسە نزیکە خراپەکەی، پارێزراو دەبێ لە خراپە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَاعَةٍ لَا يَخْرُجُ فِيهَا وَلَا يَلْقَاهُ فِيهَا أَحَدٌ»، ئەو کاتە شەو بووە، یان ڕۆژ بووە؟ باسی نەکردوەو ڕوونی نەکردۆتەوە، بەڵام ناوەڕۆکەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆژ بووە (والله أعلم). هەروەکو دوایی باسی دێ.

کە دەڵێ: «فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ»، هەمیشە لە دەوری پێغەمبەر ﷺ بووە، لە ماڵ و لە گەشتدا، لێی جیانەبۆتەوە، «فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا أَبَا بَكْرٍ؟ قَالَ: خَرَجْتُ أَلْقَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَنْظُرُ فِي وَجْهِهِ، وَالتَّسْلِيمَ عَلَيْهِ»، واتە: لەو کاتەدا بۆ ئەوە لە ماڵ دەرچووە ویستویەتی بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بگات، کە ئەوە بەڵگەیە لەسەر تامەزرۆیی هاوەڵان لەسەر دیدارو بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەر ﷺ، وە زۆر بینینی و لە خزمەتیدا دانیشتن و گوێ گرتن لە فەرموودەکانی.

کە دەڵێ: «فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا عُمَرُ؟ قَالَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ»، واتە: کاتێکی کەمی بەسەردا تێپەڕی کە عومەر برسێتی گەیاندیە لای ئەوان، فەرمووی:




«وَأَنَا قَدْ وَجَدْتُ بَعْضَ ذَلِكَ»، واتە: منیش هەست بە برسێتی دەکەم، پێویست ناکات بە زۆر مانای فەرموودەکە، لە مانای خۆی لابدەین لەوەی کە بڵێین: نابێ برسێتی پاڵبدەینە لای پێغەمبەر ﷺ.

«فَانْطَلَقُوا إِلَى مَنْزِلِ أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ التَّيْهَانِ الأَنْصَارِيِّ وَكَانَ رَجُلاً كَثِيرَ النَّخْلِ وَالشَّاءِ»، خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی ئەو پیاوەی فراوان کردبوو، زۆری پێ بەخشیبوو، باخێکی خورماو مەڕو بزنیشی هەبوو، «وَلَمْ يَكُنْ لَهُ خَدَمٌ»، خزمەتکاری نەبوو، «فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَقَالُوا لِامْرَأَتِهِ: أَيْنَ صَاحِبُكِ؟ فَقَالَتِ: انْطَلَقَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا الْمَاءَ»، واتە: کوندەیەکی بردوە لەگەڵ خۆی تاکو ئاوی زوڵاڵمان بۆ بێنێ، «فَلَمْ يَلْبَثُوا أَنْ جَاءَ أَبُو الْهَيْثَمِ بِقِرْبَةٍ يَزْعَبُهَا»، (يَزْعَبُهَا): هەڵیگرتبوو، «فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَاءَ يَلْتَزِمُ النَّبِيَّ ﷺ»، واتە: باوەشی لە پێغەمبەر ﷺ داو بە خۆیەوە گوشی لە خۆشی هاتنی بۆ ماڵەکەی «وَيُفَدِّيهِ بِأَبِيهِ وَأُمِّهِ»، واتە: دەیگوت بە دایک و باوکەوە فیدات بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

«ثُمَّ انْطَلَقَ بِهِمْ إِلَى حَدِيقَتِهِ»، (الحَدِيقَة): واتە: باخ، باخچە، بۆیە پێی گوتراوە: (حَدِيقَة) چونکە زۆرجار چوار دەوری شوورە دەکرێ، «فَبَسَطَ لَهُمْ بِسَاطاً»، واتە: ڕاخەرێکی بۆ لەسەر زەوی ڕاخستن تاکو لەسەری دابنیشن، «ثُمَّ انْطَلَقَ إِلَى نَخْلَةٍ فَجَاءَ بِقِنْوٍ فَوَضَعَهُ»، واتە: هێشویەکی تەواوی لە خورمای تەڕو تازەو فەریکی بۆ هێنان و لە پێش پێغەمبەری خوای ﷺ دانا، «فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَفَلَا تَنَقَّيْتَ لَنَا مِنْ رُطَبِهِ؟»، واتە: پێویست نەبوو هێشووەکە بە تەواوی لێ بکەیتەوە هەر هەندێک خورمای تەڕو پێگەیشتووت بۆ هێنابایەن بەسمان بوو، «فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَرَدْتُ أَنْ تَخْتَارُوا، أَوْ تَخَيَّرُوا مِنْ رُطَبِهِ وَبُسْرِهِ»، چونکە ئەگەر هێشووی خورما بە تەواوی لەبەر دەستی مرۆڤ بێ، ئەوە بە دڵی خۆی چی پێ خۆشبێت و حەزی لێ بێ، ئەو لێدەکاتەوەو دەیخوات، کە ئەوەش بۆ حەزو ئارەزوو و چێژ وەرگرتن باشترە، لەوەی کە هەندێکی بۆ بژێری.

کە دەڵێ: «فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ»، ئەو ئاوەی کە لە کوندەکەڕا هێنابووی، «فَقَالَ ﷺ: هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ظِلٌّ بَارِدٌ، وَرُطَبٌ طَيِّبٌ، وَمَاءٌ بَارِدٌ».




هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾ التكاثر. (لە پاشان سوێند بە خوا لەو ڕۆژەدا -لەسەر هەموو نازو نیعمەتێک کە خوا پێی دابوون لە دونیادا- لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکرێ).

نازو نیعمەت هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، کەوا مرۆڤ چێژو خۆشیان لێ دەبینی لە دونیادا، لە خواردن و خواردنەوەو ڕاخەرو پۆشاک، یان لەشساغی و جگە لەوانەش، هەموو ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لێ پرسینەوەیان لەسەرە.

کاتێک مرۆڤ لە کاتی گەرما سێبەرێک هەیە کە لە ژێریدا خۆی فێنک بکاتەوە، ئەوە یەکێکە لە نازو نیعمەتەکان، چ جای بگات بەو فێنککەرەوانەی کە لە ماڵەوە لە گەرمای بەتینی وەرزی هاویندا دەستەبەر کراون، یان کاتێک لە ماڵ دەردەچێت و سواری سەیارەکەی دەبێ نێو سەیارەکەش فێنککەرەوەی تێدایە، یان کاتێک دەچێتە مزگەوت بە هەمان شێوە، ئیتر ئەوانە لەو نیعمەتانەن کە لە ڕۆژی دوایدا لێ پرسینەوەیان لەسەر دەکرێ، چونکە سەرجەم ئەو نیعمەتانە کە خوا بە بەندەکانی داون بۆ ئەوەیە کە لە فەرمانبەرداریی خوادا بەکاریان بێنن، جا ئەگەر لە فەرمانبەرداریی خوادا بەکاری هێنان و، سوپاسی خوای گەورەی لەسەر کردن و، دانی نا بەوەی کە لەلایەن خواوە پێی دراون، ئەوە بەندەیەکی سوپاسگوزاری خوای گەورەیە بۆ ئەو نیعمەتە.

کە دەڵێ: «فَانْطَلَقَ أَبُو الْهَيْثَمِ لِيَصْنَعَ لَهُمْ طَعَاماً»، بۆ ئەوەی خواردنێکیان بۆ ئامادە بکات و بیخۆن، چونکە خورمایەکان وەکو میوە بوون و، ویستی خواردنیشیان بۆ ئامادە بکات، «فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَا تَذْبَحَنَّ ذَاتَ دَرٍّ»، واتە: مەڕی شیردەر مەکوژەوە، چونکە سودیتری هەیەو با سوودەکەی بەردەوام بێ، «فَذَبَحَ لَهُمْ عَنَاقاً أَوْ جَدْياً»، (العناق): بێچووی مێی بزنە، (الجدي): بێچووی نێرەی بزنە، واتە: کاریلە، یا گیسک، «فَأَتَاهُمْ بِهَا فَأَكَلُوا»، واتە: حازری کردو کوڵاندی و ئامادەی کردو لە پێشی دانان و خواردیان، «فَقَالَ ﷺ: هَلْ لَكَ خَادِمٌ؟ قَالَ: لَا»، پرسیارەکە بۆ پاداشتی ئەو کارەیە بوو، «قَالَ: فَإِذَا أَتَانَا سَبْيٌ فَأْتِنَا، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِرَأْسَيْنِ لَيْسَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ»، واتە: جارێکیان تەنها دوو پیاویان هێنان لە دەستکەوتی جەنگی کە لە دوژمن دەستیان کەوتبوون، «فَأَتَاهُ



أَبُو الْهَيْثَمِ»، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەڵێنی پێدابوو، ئەگەر دەستکەوتیان دەستکەوت، بچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لە کاتی خۆیدا چوو، «فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اخْتَرْ مِنْهُمَا»، سەرپشکی کرد، کە یەکێکی بە دڵی خۆی هەڵبژێرێت کامەی لەلا خۆشەویستر بوو، «فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اخْتَرْ لِي»، پێی خۆشبوو کە مافی هەڵبژاردنەکە بداتەوە پێغەمبەر ﷺ، «فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ»، واتە: کاتێک کەسێک ڕاوێژی پێ دەکرێت پێویستە دڵسۆزو ئامۆژگارکار بێت.

ئەوەش یاسایەکی گرنگە کە کەسێک ڕاوێژی پێ دەکرێ، دەبێ ئاگای لێ بێ دڵسۆز بێ، «إِنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ»، واتە: کاتێک کەسێک باوەڕی پێت هەیەو ڕاوێژت پێدەکات، پێویستە کەوا زۆر دڵسۆزانەو بەوپەڕی ئەمانەتەوە وەڵامی بدەیتەوە.

کە دەڵێ: «خُذْ هَذَا فَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي»، پێغەمبەر ﷺ ئەو پیاوەی هەڵبژارد کەوا بینیبووی نوێژ دەکات، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا یەکەم شتێک پێویست بێ گرنگی پێ بدرێت لە کاتی ڕاوێژکردندا بۆ هاوسەرگیری، یان هەر شتێکی دیکە، ئەوەیە بزانێت ئاخۆ نوێژ دەکات، چونکە نوێژ کلیلی هەموو چاکەیەکە، هەر کەس پارێزگاری لە نوێژەکانی بکات، ئەوە پارێزگاری لە دینەکەشی دەکات، خۆ ئەگەر نوێژ بە زایە بدات، ئەوە شتی تر لە پێشترە بە زایەی بدات.

کە دەڵێ: «وَاسْتَوْصِ بِهِ مَعْرُوفًا»، باسی ئەو چاکەیەی بە دیاریکراوی بۆ نەکردوە، بەڵکو گشتگیرەو هەموو لایەنێکی چاکە دەگرێتەوە.

«فَانْطَلَقَ أَبُو الْهَيْثَمِ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، باسی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری ﷺ بۆ کرد، چونکە ویستی ڕاوێژی پێ بکات ئاخۆ چۆن مامەڵەی لەگەڵ خزمەتکارەکەو وەسیەتەکەی پێغەمبەر ﷺ بکەن، «فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: مَا أَنْتَ بِبَالِغٍ حَقَّ مَا قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ إِلَّا بِأَنْ تَعْتِقَهُ!»، پێی گوت: ناتوانی هەقی خۆ بە وەسیەتەکەی پێغەمبەر ﷺ بدەی مەگەر بە ئازادکردنی خزمەتکارەکە نەبێت.

تەماشای ئەو دیمەنە بکە! ئەو پیاوە باخ و باخات و مەڕو ماڵاتی هەیە، هیچ خزمەتکاریشی نیە، بۆ ئاوی خواردنەوەشی دەبێت خۆی بچێت، ئاو بۆ ماڵ و منداڵی بێنێت، کەچی خزمەتکارێک کە پێغەمبەر ﷺ پێی داوە خێزانە چاکەخوازەکەی پێی

دەڵێ ئازادی بکات، بەبێ بیرکردنەوەو دوو دڵی، چونکە پێی وایەکە ناتوانن هەقی خۆی پێ بدەن، وەکو ئەو وەسیەتەی کە پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، بۆیە پیاوەکەش یەکسەر دەڵێ: «فَهُوَ عَتِيقٌ»، پیتی (فاء) لێرەدا بۆ مانای پەلەو خێرا بەکاردێت، واتە: یەکسەر دوای قسەکە گوتی: ئەوە ئازادم کرد، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆر سووربوونە لەسەر پەلەکردن بۆ کاری خێرو چاکە.

کە دەڵێ: «فَقَالَ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيّاً وَلَا خَلِيفَةً إِلَّا وَلَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ»، ئەگەر مرۆڤ خێزان و کەسوکاری چاکی هەبن، ئەوە پشت بە خوای گەورە هەمیشە دڵنیایە لەوەی کە ڕێگای باش دەگرێ، بەڵام ئەگەر خراپ و بەدکاربن، ئەوە «لَا تَأْلُوهُ خَبَالاً»، باکی نیە کە ئایا تووشی بەڵاو شەڕو خراپە دەبێ یان نا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی فەرموو، چونکە ئەبو هەیسەم بە هۆی ئامۆژگاری خێزانە چاکەکەیەوە لە بڕیارەکەدا سەرکەوتوو بووە، خێزانەکەشی بۆی بوو بە خێزانێکی باش و ئامۆژگاریکارێکی دڵسۆز.

کە دەڵێ: «وَمَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ»، واتە: ئەگەر خوا هەر فەرمانڕەوایەکی پاراست لە دەوروبەری خراپ، ئەوە لە شەڕو ئاشووب و خراپە بە دوور دەبێ.

٣٧٣- عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ يَقُولُ: «إِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ أَهْرَاقَ دَماً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ، وَإِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَغْزُو فِي الْعِصَابَةِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ مَا نَأْكُلُ إِلَّا وَرَقَ الشَّجَرِ وَالْحُبْلَةِ حَتَّى تَقَرَّحَتْ أَشْدَاقُنَا، وَإِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ وَالْبَعِيرُ، وَأَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ يَعْزُرُونِي فِي الدِّينِ. لَقَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِذاً وَضَلَّ عَمَلِي»[1].

واتە: قەیسی کوڕی ئەبو حازیم دەڵێ: «گوێم لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بوو ﷺ دەیگوت: دڵنیابن من یەکەم پیاو بووم خوێنم ڕشت لە پێناوی خوا ﷻ، یەکەم پیاویش بووم تیری هاوێشتبێت لە پێناو خوادا، دەتبینیم لە نێو کۆمەڵێک لە هاوەڵانی موحەممەدا ﷺ دەجەنگام، جگە لە گەڵای دارو دڕکەزێ هیچی ترمان نەدەخوارد، تا شەویلگمان بریندار بوو، یەکێکمان پشقلی وشکی دادەنا هاوشێوەی دانانی مەڕو

(١) أخرجه البخاري: ٣٧٢٨، ومسلم: ٢٩٦٦، والمصنِّف في جامعه: ٢٣٦٥.




حوشتر، کەچی هۆزی ئەسەد سەرزەنشت و گلەییم لێدەکەن لەسەر ئەوەی کەوا نوێژ بە باشی ناکەم، کەواتە خەسارەتمەندم و کردەوەم زایە بوون».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «إِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ أَهْرَاقَ دَمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷻ»، واتە: یەکەم خوێن ڕژێنرا لە پێناوی خوادا لەسەر دەستی ئەو بوو، گوتی: «وَإِنِّي لَأَوَّلُ رَجُلٍ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، ئەوەش یەکەمیەکی دیکەیە بۆ ئەو، چونکە یەکەم تیرێک کە لە پێناوی خوای گەورە هاوێژراوە بە دەستی ئەو بووە، کە ئەوانەش دەڵێ: وەک خۆهەڵکێشان و خۆبەگەورە زانین و ستایش کردنی خۆی نایڵێ، بەڵکو وەکو بەرگری لە خۆی و کەسایەتی خۆی ئەو شتەی گوتوە.

کە دەڵێ: «لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَغْزُو فِي الْعِصَابَةِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ عَلَيْهِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامِ مَا نَأْكُلُ إِلَّا وَرَقَ الشَّجَرِ وَالْحُبْلَةِ»، (الْحُبْلَة): جۆرە دارێکە، دەڵێ: لە جەنگ و جیهاددا کاتێکی زۆرمان بەسەردا تێپەڕی، کە هیچ شتێکمان لە دەست نەبوو بیخۆین، جگە لە گەڵای دار کە برسێتی زۆریش تینی بۆ هێنابووین.

«حَتَّى تَقَرَّحَتْ أَشْدَاقُنَا»، واتە: ئەملاولای دەممان تووشی برین ببوو، بە هۆی ئەو گەڵایەی کە دەمانخوارد.

کە دەڵێ: «وَإِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ وَالْبَعِيرُ»، واتە: کاتێک سەرئاومان دەکرد، مەڕو حوشتر چی دادەنێن ئێمەش ئەوەمان دادەنا، چونکە هەمان ئەو شتەمان دەخوارد کە مەڕو حوشتر دەیانخوارد.

کە دەڵێ: «وَأَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ يُعَزِّرُونِي فِي الدِّينِ»، (يُعَزِّرُونِي): واتە: بە گومانی خۆیان بۆیان ڕاستەدەکردمەوەو توانجیان لێ دەدام کە گوایە نازانم نوێژ بکەم، چونکە لای عومەر ؓ باسیان دەکردو دەیانگوت: سەعد بە جوانی نوێژ ناکات، بۆیە ناچاربوو باسی ڕابردووی خۆی بکات، لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە کە لە جابری کوڕی سەمورە ؓ دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: خەڵکی کوفە هاتن سکاڵایان دژی سەعد ؓ کرد لە لای عومەر ؓ. ئەویش لایداو عەمماری ؓ بۆ کردن بە کاربەدەست،




بە جۆرێک سکاڵایان لەسەر کرد هەتا گوتیان: نازانێت بە جوانی نوێژیش بکات، ئەویش بە دوایدا نارد، ئنجا پێی گوت: ئەی ئەبو ئیسحاق! ئەوانە پێیان وایە کەوا تۆ بە جوانی نوێژ ناکەی! ئەبو ئیسحاقیش گوتی: لە ڕاستیدا من سوێند بە خوا وەکو نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ پێش نوێژیان بۆ دەکەم، هیچی لێ کەم ناکەمەوە، کە نوێژی خەوتنانیان بۆ دەکەم دوو ڕکاتی یەکەم درێژ دەکەمەوەو دووەکەیتر کورت دەکەمەوە، گوتی: هەر ئەو گومانەت پێ دەبردرێ ئەی ئەبو ئیسحاق.

کە دەڵێ: «لَقَدْ خِبْتُ وَخَسِرْتُ إِذاً وَضَلَّ عَمَلِي»، واتە: ئەگەر نەزانم نوێژ بکەم لە کاتێکدا کە نوێژ کۆڵەکەی دینە، ئەوە هەموو کردەوەکانم بە تاڵن و دەستخەڕۆو خەسارەتمەند دەبم.

لەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە باسکردنی کەسێک بە درۆ زیانێکی زۆری بۆ کۆمەڵگا هەیەو، چەکی ئەوانەیە کە چەکیان پێ نیەو، بێ بەڵگە خەڵک تۆمەتبار دەکەن، بەڵگەی کەسی بە تاڵە کە بەڵگەی نیە، بە زۆری خەڵکی بیدعەچی کە بیانەوێ کەسێک سووک بکەن لە کۆمەڵگادا، دێن و شتی ناڕاست و درۆی بۆ هەڵدەبەستن، تاکو خەڵک لێی دوور بکەوێتەوەو، ڕووی تێنەکەن، زۆرێک لە زانایان بەو جۆرە باسکردنانە تاقیکراونەتەوە.

٣٧٤- عَنْ عَمْرُو بْنُ عِيسَى أَبُو نَعَامَةَ الْعَدَوِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ خَالِدَ بْنَ عُمَيْرٍ، وَشُوَيْسًا أَبَا الرَّقَادِ، قَالَا: بَعَثَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عُتْبَةَ بْنَ غَزْوَانَ ﷺ، وَقَالَ: انْطَلِقْ أَنْتَ وَمَنْ مَعَكَ، حَتَّى إِذَا كُنْتُمْ فِي أَقْصَى بِلَادِ الْعَرَبِ، وَأَدْنَى بِلَادِ الْعَجَمِ فَأَقْبِلُوا، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْمِرْبَدِ وَجَدُوا هَذَا الْكِذَّانَ، فَقَالُوا: مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: هَذِهِ الْبَصْرَةُ فَسَارُوا حَتَّى إِذَا بَلَغُوا حِيَالَ الْجِسْرِ الصَّغِيرِ، فَقَالُوا: هَهُنَا أُمِرْتُمْ، فَنَزَلُوا «فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ بِطُولِهِ»، قَالَ: فَقَالَ عُتْبَةُ بْنُ غَزْوَانَ: «لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لَسَابِعُ سَبْعَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا لَنَا طَعَامٌ إِلَّا وَرَقَ الشَّجَرِ حَتَّى تَقَرَّحَتْ أَشْدَاقُنَا، فَالْتَقَطْتُ بُرْدَةً قَسَمْتُهَا بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدٍ، فَمَا مِنَّا مِنْ أُولَئِكَ السَّبْعَةِ أَحَدٌ إِلَّا وَهُوَ أَمِيرُ مِصْرٍ مِنَ الْأَمْصَارِ وَسَتُجَرِّبُونَ الْأُمَرَاءَ بَعْدَنَا».

واتە: عەمرى کوڕی عیسا کە ئەبو نەعامەی عەدەوییە دەڵێ: بیستم خالیدی کوڕی عومەیرو شوەیسی ئەبو ڕەقاد دەیانگوت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ عوتبەی کوڕی غەزوانی ناردو پێی فەرموو: تۆو ئەوانەی لەگەڵتن بڕۆن تا دەگەن بەوپەڕی وڵاتی

عەرەب و، خواروی وڵاتی عەجەم ڕوویان تێبکەن، ئەوانیش ڕۆیشتن تا گەیشتنە میربەد (ناوی شوێنێکە) بەردەڵانێکی سپیماڵیان بینی، گوتیان: ئەمە چیە؟ پێیان گوترا: ئەمە بەصرەیە، ئنجا بەڕێکەوتن تا گەیشتنە بەرانبەر پردە بچووکەکە، گوتیان: (بە دانانی مەنزڵ) لەم شوێنە فەرمانتان پێکراوە، مەنزڵیان داناو «فەرموودەکەیان بە تەواوی باس کرد»، ئنجا عوتبەی کوڕی غەزوان ﷺ گوتی: «(ئەگەر) دەتبینی کە من حەوتەمی حەوت کەسەکە بووم کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین هیچ خواردنێکمان لەلا نەبوو، جگە لە گەڵای دار (ئیتر کە خواردمان) شەویلگمان بریندار بوو، پەردەیەکم هێناو لە نێوان خۆم سەعد دوو کەرتم کرد، هیچ یەکێکمان نیە لەم حەوت کەسە، مەگەر ئێستا گەورەی یەکێک لە شارە گەورەکان نەبێ، دوای ئێمەش چەندان کاربەدەستی دیکە ئەو دەسەڵاتە تاقی دەکەنەوەو دێنە شوێنمان».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ عوتبەی کوڕی غەزوانی ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوەڵان ناردووە تاکو لە تێکۆشان و سەنگەر دابن لە بەرەی ئیسلام، وە شوێنێکی بۆ دیاری کردن بۆ ئەوەی لێی بمێننەوە، بۆیە گوتی: «حَتَّى إِذَا كُنْتُمْ فِي أَقْصَى بِلَادِ الْعَرَبِ، وَأَدْنَى بِلَادِ الْعَجَمِ»، واتە: کە گەیشتنە ئەو شوێنە ئەوە لەوێ لە پاسەوانی و ئامادەباشیدا بن.

کە دەڵێ: «فَأَقْبِلُوا، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْمِرْبَدِ»، واتە: چۆنی پێ گوتبوون ئاوا ڕۆیشتن گەیشتنە میربەدی بەصرە، کە تا ئەو کاتیش شاری بەصرە دروست نەکرابوو، زەوییەک بوو جۆرە بەردێکی هەبوو، کە پێی دەگوترا: بەصرە، بۆیە گوتی: «وَجَدُوا هَذَا الْكِذَّانَ»، بریتیە لە بەردەڵانێکی نەرم و سپی، «فَقَالُوا: مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: هَذِهِ الْبَصْرَةُ»، بۆیە گوتراوە: ئەوەی کە شاری بەصرەی دروست کرد عوتبەی کوڕی غەزوان ﷺ بووە، ئەگەرنا مەبەست لە بەصرە لە گێڕانەوەکەدا هەمان ئەو شارە نیە کە ناسراوەو ئێستا هەیە، چونکە ئەو کات ئەو شارە دروست نەکرابوو، بەڵکو مەبەست لە بەصرە مانای بەردەڵانی وردی لمی بڵاوە، کە نەرمن و زوو دەشکێن.




کە دەڵێ: «فَسَارُوا حَتَّى إِذَا بَلَغُوا حِيَالَ الْجِسْرِ الصَّغِيرِ»، کاتێک گەیشتنە بەرانبەر ئەو پردە بچووکە کە لەسەر ڕووباری دیجلە بوو، «فَقَالُوا: هَهُنَا أُمِرْتُمْ، فَنَزَلُوا»، واتە: ئەو شوێنەی دەکەوێتە نێوان شارەکانی عەرەب و عەجەم، ئیتر لەوێ بارگەیان خست، «فَذَكَرُوا الْحَدِيثَ بِطُولِهِ»، واتە: خالیدو شووەیس.

«فَقَالَ عُتْبَةُ بْنُ غَزْوَانَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لَسَابِعُ سَبْعَةٍ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا لَنَا طَعَامٌ إِلَا وَرَقَ الشَّجَرِ حَتَّى تَقَرَّحَتْ أَشْدَاقُنَا»، (الأشداق): کۆی (شدق)ـە، بە ئەملاولای دەم دەگوترێ، کە بە هۆی خواردنی گەڵای دار بریندار ببوون.

کە دەڵێ: «فَالْتَقَطْتُ بُرْدَةً قَسَمْتُهَا بَيْنِي وَبَيْنَ سَعْدٍ»، واتە: سەعدی کوڕی مالیک ﷺ، واتە: عەبایەکی دۆزیەوە کە لە زەوی کەوتبوو، ئەویش هەڵیدەگرێتەوەو لە نێوان خۆی و سەعددا دابەشی دەکات، لەبەر ئەوەی بە زەروری ئیشیان پێبووە، «فَمَا مِنَّا مِنْ أُولَئِكَ السَّبْعَةِ أَحَدٌ»، وەکو عوتبەی کوڕی غەزوان و سەعدی کوڕی مالیک، «إِلَّا وَهُوَ أَمِيرُ مِصْرٍ مِنَ الْأَمْصَارِ»، باسی ئەو نازو نیعمەتە دەکات کەوا لە دوای ئەو هەموو ناخۆشی و نەبوونی و ژیانە قورس و گرانە پێی گەیشتوون، گوتی: «وَسَتُجَرِّبُونَ الْأُمَرَاءَ بَعْدَنَا». چەندان کاربەدەستی دیکە دوای ئێمە، ئەو دەسەڵاتە ئەزموون دەکەن و دێنە شوێنمان.

٣٧٥- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللَّهِ وَمَا يَخَافُ أَحَدٌ، وَلَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ، وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَلَاثُونَ مِنْ بَيْنِ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ وَمَا لِي وَلِبِلَالٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلَّا شَيْءٌ يُوَارِيهِ إِبِطُ بِلَالٍ»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بە جۆرێک ترسێنراوم لە پێناوی خوادا، کە هیچ کەسێکی دی ئاوا نەدەترسێنرا، وە بە جۆرێک ئەزیەت و ئازار دراوم لە پێناوی خوا، کە هیچ کەسێک بەم شێوە ئەزیەت و ئازار نەدەدرا، (جاری وا بووە) سی شەو و ڕۆژ بەسەرمدا تێپەڕیوە هیچ شتێک نەبووە بیخۆین لەگەڵ بیلال، کە زیندەوەر بیخوات، مەگەر ئەوە نەبێ کە بیلال بە نهێنی لەبن باخەڵیدا شاردویەتیەوە و هێناویەتی و خواردوومانە».

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٣٧٢، وابن ماجه في السنن: ١٥١، وفي الإسناد رَوح ابن أسلم أبو حاتم البصري، وهو ضعيفٌ، لكن تابع وكيع وعبد الصَّمد وعفَّان في مسند الإمام أحمد: ١٤٠٥٥.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

که دەڵێ: «لَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللَّهِ وَمَا يَخَافُ أَحَدٌ»، واتە: لە ڕێگای خواوە لە ڕێگای بانگەواز بۆ دینی خواو سەرخستنی هەق و ڕاستی.

«وَلَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ»، پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگای خوادا زۆر ئازاری چەشتوە، وە لە ڕێگای بانگەوازو سەرخستنی دینەکەی خوا ئازارێکی زۆری چەشتوە، کە هیچ کەسێک نەیچەشتوە.

«وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَلَاثُونَ مِنْ بَيْنِ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ وَمَا لِي وَلِبِلَالٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ»، ئەوەیان بۆ دڵنیاکردنەوەی پێشوو باسدەکات، واتە: هیچ شتێکم لە خواردن دەستنەدەکەوت کە زیندەوەر دەیخوات، ئەوەش گشتیگرە هەم مرۆڤ و هەم ئاژەڵ دەگرێتەوە، «إِلَّا شَيْءٌ يُوَارِيهِ إِبِطُ بِلَالٍ»، تەنها شتێکی کەم نەبێت کە بیلال لە بن باڵی خۆیدا دەیشاردەوە.

ئەوەش هەموو لە ئەنجامی ئەوەی کە گەلەکەی تەنگیان پێ هەڵدەچنی و فشاریان دەخستە سەری، کە گەلەکەی خستبوویانە سەری، تاکو واز لە بانگەواز بۆ دینەکەی بێنێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە تێکۆشان و ئارامگرییەوە هەر بەردەوام بوو وازی نەهێناوە هەتاکو خوای گەورە سەرکەوتووی کردو ئایینی خوای سەرخست.

٣٧٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَجْتَمِعْ عِنْدَهُ غَدَاءٌ وَلَا عَشَاءٌ مِنْ خُبْزٍ وَلَحْمٍ إِلَّا عَلَى ضَفَفٍ» قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ كَثْرَةُ الْأَيْدِي[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ هیچ کاتێک لە ژەمی خواردنی بەیانی و ئێوارەندا گۆشتی لەبەردەم کۆنەدەبوویەوە، مەگەر لە کاتی هەبوونی میوان و میوانداریی دا». عەبدوڵلا (واتە: پێشەوا داریمی) دەڵێ: هەندێک دەڵێن: مەبەست لە (ضَفَفٍ) واتە: زۆربوونی دەستەکان لەسەر خواردن، (ئەوەش لە کاتێکدایە کە مرۆڤ میوانی هەبن، یان لە میوانداریی دا بێ).

---

(١) أخرجه أحمد في المسند: ١٣٨٥٩.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

واتە: هەرگیز نەبووە بەیانیەک و ئێوارەیەک بەسەر یەکەوە نان و گۆشتی دەستکەوتبێ، «إِلَّا عَلَى ضَفَفٍ»، عەبدوڵلا گوتوویەتی: لە لێکدانەوەی مانای وشەی (ضَفَف): هەندێ لە زانایان گوتوویانە: بە مانای دەستی زۆر دێت، وەکو هەبوونی میوان، پێشووتر فەرموودەکە هاتوە لە بابەتی: ئەوەی هاتوە دەربارەی ژیان و گوزەرانی پێغەمبەری خوا ﷺ[١].

٣٧٧- عَنْ نَوْفَلِ بْنِ إِيَاسٍ الْهُذَلِيِّ قَالَ: كَانَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ لَنَا جَلِيسًا، وَكَانَ نِعْمَ الْجَلِيسُ، وَإِنَّهُ انْقَلَبَ بِنَا ذَاتَ يَوْمٍ حَتَّى إِذَا دَخَلْنَا بَيْتَهُ وَدَخَلَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ خَرَجَ وَأُتِينَا بِصَحْفَةٍ فِيهَا خُبْزٌ وَلَحْمٌ، فَلَمَّا وُضِعَتْ بَكَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، مَا يُبْكِيكَ؟ فَقَالَ: «هَلَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يَشْبَعْ هُوَ وَأَهْلُ بَيْتِهِ مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ» فَلَا أَرَانَا أُخِّرْنَا لِمَا هُوَ خَيْرٌ لَنَا[٢].

واتە: نەوفەلی کوڕی ئییاسی هوزەلی دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ هاوەڵمان بوو، وە باشترین هاوەڵیش بوو، ڕۆژێک داوەتی نان خواردنی کردین بۆ ماڵەوە، خۆشی لەگەڵمان گەڕایەوە هاتەوە بۆ ماڵ، کە گەیشتینە ماڵیان چووە ژوورەوە خۆی شۆردو هاتە دەرەوە، دوایی قاپێکمان بۆ هێنرا نان و گۆشتی تێدابوو، جا خواردنەکە دانرا عەبدوڕڕەحمان گریـا، منیش گوتم: ئەی ئەبو موحەممەد بۆچی دەگری، چ شتێک دەتگریێنێ؟ گوتی: «(بۆ ئەوە دەگریم) پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی سپاردو وەفاتی کرد کەچی نە خۆی و نە خێزانەکانی تێر نانی جۆیان نەخوارد، بۆیە ئێمە کە ماوینەوە تا ئێستا (گیانمان نەسپاردوە) پێم وانیە بۆ کارێکی چاک مابینەوە».

---

(١) برقم: ٧٢.

(٢) إسناده ضعيفٌ لجهالة نوفل بن إياسٍ الهذلي، لكن جاء في صحيح الإمام البخاري ﷺ: ١٢٧٤ «أُتِيَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ يَوْمًا بِطَعَامِهِ، فَقَالَ: قُتِلَ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، وَكَانَ خَيْرًا مِنِّي، فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مَا يُكَفَّنُ فِيهِ إِلَّا بُرْدَةٌ، وَقُتِلَ حَمْزَةُ أَوْ رَجُلٌ آخَرُ خَيْرٌ مِنِّي، فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مَا يُكَفَّنُ فِيهِ إِلَّا بُرْدَةٌ، لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ يَكُونَ قَدْ عُجِّلَتْ لَنَا طَيِّبَاتُنَا فِي حَيَاتِنَا الدُّنْيَا، ثُمَّ جَعَلَ يَبْكِي».




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كَانَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ لَنَا جَلِيسًا، وَكَانَ نِعْمَ الْجَلِيسُ، وَإِنَّهُ انْقَلَبَ بِنَا ذَاتَ يَوْمٍ حَتَّى إِذَا دَخَلْنَا بَيْتَهُ وَدَخَلَ فَاغْتَسَلَ»، ستایشی ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەکات، کە عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفە ﷺ یەکێکە لەو دە کەسەی کە موژدەی بەهەشتیان پێدراوە.

کە دەڵێ: «خَرَجَ وَأَتَيْنَا بِصَحْفَةٍ فِيهَا خُبْزٌ وَلَحْمٌ، فَلَمَّا وُضِعَتْ بَكَى عَبْدُ الرَّحْمَنِ»، کاتێک قاپەکە، یان دەفرە خواردنەکە دانرا، وە خواردنەکەش پاک و خۆش و بە تام بوو کە گۆشت و نان بوو، گریا، «فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ، مَا يُبْكِيكَ؟»، واتە: هۆی گریانەکەت چیە؟ «قَالَ: هَلَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يَشْبَعْ هُوَ وَأَهْلُ بَيْتِهِ مِنْ خُبْزِ الشَّعِيرِ» فَلَا أَرَانَا أُخِّرْنَا لِمَا هُوَ خَيْرٌ لَنَا»، مانای (هَلَكَ): واتە: وەفاتی کرد، وشەی (هَلَكَ) ئاساییە بەو مانایە بێت، چونکە لە قورئانیشدا هاتوە، بە هەمان مانا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾﴾ غافر.

(سوێند بە خوا بێگومان پێشتر یوسف پێغەمبەرتان بۆ هات بە بەڵگە ڕوونەکانەوە، کەچی ئێوە هەر لەگوماندا بوون، لەو بەڵگانەی بۆی هێنابوون، تا کاتێک -یوسف- وەفاتی کرد، وتتان: ئیتر دوای ئەو، خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێ، ئا بەو جۆرە خوا گومڕای دەکات ئەو کەسەی زێدەڕۆو دوو دڵە).

گریانەکەی عەبدوڕڕەحمان ﷺ لە ترسی ئەوە بووە، کەوا ئەو ڕزق و ڕۆزی فراوانەی دیتوە، کە نەکا ئەو شتە پاکە ئەوە بێ کە پەلەی تێدا کراوەو بۆی پێشخراوە لە دونیادا لە نازو نیعمەتەکانی بەهەشت.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ



---

بَابُ: مَا جَاءَ فِي سِنِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.




دانەر ﷺ ئەو باسەی تایبەت کردوە بۆ ڕوونکردەوەی ئەو ساڵانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیاندا ژیاوە، بە جۆرێک لە هەندێک فەرموودەدا هاتوە کەوا شەست ساڵ ژیاوە، لە هەندێکیتردا تەمەنی شەست و سێ ساڵ ژیاوە، لە هەندێکیشدا شەست و پێنج ساڵ هاتوە.

لێکۆڵینەوەی قسەکردن لەو بابەتەوە دێ:

٣٧٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: «مَكَثَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَكَّةَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ سَنَةً يُوحَى إِلَيْهِ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْراً، وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: «پێغەمبەر ﷺ سێزدە ساڵ لە مەککە مایەوەو وەحی بۆ دەهات، وە لە مەدینەش دە ساڵ مایەوە، وە کاتێ گیانی سپارد بە خواو وەفاتی فەرموو، تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەو فەرموودەیەدا بە درێژی باسی قۆناغەکانی ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ دەکات، بە جۆرێک کە چل ساڵ لە مەککە بووە، پێش ئەوەی وەحی بۆ بێت، کە لە چل ساڵیدا وەحی بۆ هاتوە، ئەوە هیچ ڕاجیایی تێدانیە لەلایەن زانایانەوە، هەروەکو لەسەر ئەوەش یەک دەنگن کەوا دە ساڵ دوای کۆچ لە مەدینە ماوەتەوە، ئەوەی ڕاجیایی تێدایە مانەوەیەتی لە مەککە دوای هاتنی وەحی، واتە: نێوان پێغەمبەرایەتی و کۆچکردنی بۆ مەدینە، ئەوەی کە ڕاستیشە ئەوەیە کە لەو فەرموودەیەدا هاتوە، وە لە فەرموودەی دیکەشدا بەم شێوە هاتوە، کەوا سێزدە ساڵ لە مەککەدا بووە، دواتر کۆچی کردوە بۆ مەدینە، کەواتە: کۆی ئەوانە دەبێتە شەست و سێ ساڵ، هەمان ئەو ژمارەیە کە ئیبنو عەبباس باسی کردوەو، لێرەدا کە گوتوویەتی: «وَتُوُفِّيَ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ»، هەر ئەوەشیان ڕاسترە لە دیاریکردنی تەمەنی موبارەکی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٩٠٣، ومسلم: ٢٣٥١، والمصنّف في جامعه: ٣٦٥٢.




٣٧٩- عَنْ مُعَاوِيَةَ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَخْطُبُ قَالَ: «مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ»، وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، وَأَنَا ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ(١).

واتە: لە موعاویەوە ﵁ بیستراوە لە کاتی وتاردان، کە وتاری دەدا، گوتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی دا وەفاتی فەرموو»، وە ئەبو بەکر و عومەریش ﵄، وە منیش تەمەنم شەست و سێ ساڵە.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەشیان وەک هەمان فەرموودەی پێشووترە دەربارەی دیاریکردنی تەمەنی پێغەمبەر ﷺ کە شەست و سێ ساڵ بووە، ئەوەشی لێ زیاد کردوە، کە ئەو ژمارەیە تەمەنی ئەبو بەکرو عومەریش بووە، هەروەها تەمەنی موعاویەش بووە، لە کاتی وتاردانەکەیدا ﵁ لەوانەیە وای زانیبێ کەوا ئەویش لەو ساڵەدا دەمرێ، بەڵام تاکو نزیکەی هەشتا ساڵ ژیا.

٣٨٠- عَنْ عَائِشَةَ ﵂: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَاتَ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ سَنَةً»(٢).

واتە: عائیشە ﵂، دەگێڕێتەوە: «کە پێغەمبەر ﷺ لە تەمەنی شەست و سێ ساڵی دا وەفاتی فەرموو».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەش ڕێک وەکو فەرموودەکەی موعاوییە ﵁ وایە، هەروەها وەکو فەرموودەکەی ئیبنو عەبباسیش وایە لە دیاریکردنی تەمەنی پێغەمبەردا ﷺ.

٣٨١- عَنْ عَمَّارٍ مَوْلَى بَنِي هَاشِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ يَقُولُ: تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ ابْنُ خَمْسٍ وَسِتِّينَ(٣).

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٥٢، والمصنِّف في جامعه: ٣٦٥٣.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٥٣٦، ومسلم: ٢٣٤٩، والمصنِّف في جامعه: ٣٦٥٤، وفي إسناده ابن جُريجٍ، وقد عنعن، لكنَّه قد توبع، ويشهد له أيضًا ما سبق.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٣٥٣، والمصنِّف في جامعه: ٣٦٥٠.




واتە: عەممار کە مەولای بەنی هاشم بوو، دەڵێ: بیستم عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەمەنی شەست و پێنجساڵی دا وەفاتی فەرموو.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو گێڕانەوەیەی ئیبنو عەبباس ﷺ جیاوازە لەگەڵ گێڕانەوەکەی پێشووتری، بەڵام زانایان پشتیان بە گێڕانەوەی یەکەم بەستوە، کەوا تەمەنی پێغەمبەر ﷺ شەست و سێ ساڵ بووە، ئەوەی جیاواز لەوە لە ئیبنو عەبباسەوە ﷺ هاتوە، یان شازە (واتە: لاوازە)، یان تەئویل کراوە.

٣٨٢- عَنْ دَغْفَلِ بْنِ حَنْظَلَةَ ﷺ: «أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قُبِضَ وَهُوَ ابْنُ خَمْسٍ وَسِتِّينَ» قَالَ أَبُو عِيسَى: وَدَغْفَلُ لَا نَعْرِفُ لَهُ سَمَاعاً مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلاً.

واتە: دەغفەلی کوڕی حەنظلە دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ وەفاتی فەرموو و ڕووحی کێشرا، لە کاتێکدا تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو»، ئەبو عیسا گوتوویەتی: نازانین دەغفەل فەرموودەی بیستبێ لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە کاتێکدا لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ پیاو بوو.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەیان جیاوازیی و تێکگیرانی هەیە لەگەڵ کۆمەڵە فەرموودەیەکی صەحیح، کەوا زۆرو بەربڵاون و دەیسەلمێنن کە تەمەنی پێغەمبەر ﷺ شەست و سێ ساڵ بووە.

ئەبو عیسا دەڵێ: «وَدَغْفَلُ لَا نَعْرِفُ لَهُ سَمَاعاً مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ فِي زَمَنِ النَّبِيِّ ﷺ رَجُلاً»، واتە: سەلماندنی ئەوەیە کە ئەو پیاوە هاوڕێیەتی پێغەمبەری ﷺ کردوە جێی تێڕامانە، چونکە ڕاستە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ گەورە بووە، بەڵام هیچ شتێکمان نیە کە بیسەلمێنێ هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوای ﷺ کردبێت.




٣٨٣- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيْسَ بِالطَّوِيلِ الْبَائِنِ، وَلَا بِالْقَصِيرِ، وَلَا بِالْأَبْيَضِ الْأَمْهَقِ، وَلَا بِالْآدَمِ، وَلَا بِالْجَعْدِ الْقَطَطِ، وَلَا بِالسَّبْطِ، بَعَثَهُ اللَّهُ تَعَالَى عَلَى رَأْسِ أَرْبَعِينَ سَنَةً، فَأَقَامَ بِمَكَّةَ عَشْرَ سِنِينَ، وَبِالْمَدِينَةِ عَشْرَ سِنِينَ، وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً وَلَيْسَ فِي رَأْسِهِ وَلِحْيَتِهِ عِشْرُونَ شَعْرَةً بَيْضَاءَ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ باڵای نە زۆر درێژ بوو، نە کورتیش بوو، وە ڕەنگی (پێستی) نە زۆر سپی بوو، نە ئەسمەر بوو، پرچی نە لوول و نە خاو بوو، خوای بەرز ناردی لە سەرەتای (تەمەنی) چل ساڵی دا، جا دە ساڵان لە مەککە مایەوەو، دە ساڵانیش لە مەدینە (مایەوە)، وە خوای بەرز لە سەرەتای شەست ساڵی وەفاتی پێ فەرموو، (تا ئەو تەمەنەش) بیست تاڵە مووی لە سەرو ڕیشی سپی نەبوو بوون».

٣٨٤- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، نَحْوَهُ.

واتە: بەم سەنەدەش هەمان فەرموودە گێڕدراوەتەوە لە ئەنەسەوە ﷺ.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لە سەرەتای ئەو کتێبە ئەو فەرموودەیە هاتوە، بەڵام لێرەدا دووبارەی کردۆتەوە، لەبەر ئەوەی دەڵێ: «وَتَوَفَّاهُ اللَّهُ عَلَى رَأْسِ سِتِّينَ سَنَةً»، ئەو گێڕانەوەیە ئەوەی تێدایە کەوا تەمەنی پێغەمبەر ﷺ شەست ساڵ بووە، بەڵام لە ڕاستییدا ژمارەیەک گێڕانەوەی دیکەدا هاتوە کە ئەو کەمیە هەڵدەوەشێتەوە، (واتە: شەست نیەو، شەست و سێ ساڵە).

بۆ پشتگیری شەست و سێ ساڵەکە گێڕانەوەیەکی پێشەوا موسلیم[2] هەیە، کە ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوەو هاوڕێکە لەگەڵ قسەی کۆی زانایان، کە دەڵێ: {قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ}. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، لە کاتێکدا کە تەمەنی شەست و سێ ساڵ بوو.

---

(١) انظر: (ح ١).

(٢) في صحيحه: ٢٣٤٨.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی کۆچی دوایی (مردنی) پێغەمبەری خوا ﷺ



کاتێک دانەری کتێب ﷬، باسی ئاکارەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ تەواو کرد، ئنجا ئەو بابەتەی لێرەدا نووسی بۆ ئەوەی لە نێو بابەتەکەدا باسی ڕووداوە گرنگ و بەڵاو موصیبەتە گەورەو بە ئازارەکە بکات، ئەو ڕووداوە شۆک هێنەرەی، کەوا هەموو خەڵکی تووشی شۆک و دڵتەزین و دڵتەنگییەک کرد، بە جۆرێک هەموو خەڵکی گرتەوە لەو کاتەدا، ئەویش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە یەکێک بوو لە موصیبەتە هەرە گەورەکان و (جەرگ برەکان).

ئەو موصیبەتە لەسەر دڵی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ زۆر قورس بووە، ئەو هاوەڵانەی کەوا دڵ و دەروون پاکترین مرۆڤ بوون و خوای گەورە ڕێزی هاوەڵایەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ پێ بەخشیوون و، ڕێزی بیستنی وتەو فەرموودە موبارەکەکانی پێ بەخشیبوون، بەڵێ، ئەو هەواڵە لەسەر دڵی هەمووان زۆر توندو قورس بە ئازار بوو، نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو هەندێک لە هاوەڵان ئەسڵەن ئەو هەواڵەیان ڕەت دەکردەوەو، بڕوایان وابوو کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی نەکردوە، ئەوەتا عومەری کوڕی خەتتاب ﷛ بەوپەڕی متمانەوە دەڵێ: (هەر کەسێک بڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە، ئەوە بە شمشێر لێی دەدەم، عومەر ﷛ یەکەم کەس بوو کە هەواڵەکەی پێگەیشت، هەتاکو هەواڵ بە ئەبو بەکر ﷛ گەیشت و، هات لە بەردەم هەموو خەڵکەکە لە مزگەوت ڕاوەستاو وتارێکی دا، کە دڵی هەموو بڕوادارانی دامرکاندەوەو دڵ و دەروونی هەموویانی جێگیر کرد، بۆیە سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کردو، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کەوا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الزمر. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بەڕاستی تۆ دەمری و، ئەوانیش دەمرن)، تاکو هەموو ئایەتەکەی خوێندەوە ئەوجار ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِين مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران. (-موحەممەد ﷺ- تەنها پێغەمبەرێکە -نەمر نیە-، بێگومان لە پێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردوون، جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد، یان کوژرا، دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان -پاشگەز دەبنەوە-، هەر کەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی -بۆ بتپەرستی-، ئەوە هەرگیز -ئەو کەسە-




هیچ زیانێک ناگەیەنێ بە خوا، وە بە زوویی خوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە)، پاش ئەوەی ئایەتەکەی خوێندەوە، ئەوجار وتە بە ناوبانگەکەی پێشکەش کرد، کە گوتی: هەر کەسێک خوا دەپەرستێ ئەوە خوا زیندووەو هەرگیز نامرێ، ئەوەش کە موحەممەد دەپەرستێ، ئەوە بێگومان موحەممەد وەفاتی کرد)!!

عومەر ﷺ دەڵێ: ئەم ئایەتە کە لە قورئاندایە، لەو کاتەدا هیچ هۆشم لەوە نەبوو کە ئەو ئایەتە لە قورئاندا هاتوە، لە گێڕانەوەی تردا هاتوە کەوا (هیچ کەسێک نەبووە کە ئەو ئایەتەی نەخوێندبێتەوە لەو کاتەدا)، واتە: لەو ڕۆژەدا لە مەدینە، ئیتر خەڵکی لە ڕاستی و دروستی هەواڵەکە تێگەیشتن، ئەوجار بە تەواوی هەستیان بەو موصیبەتە گەورەیە کرد، کە وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە لە هەموو هەواڵ و موصیبەتەکان گەورەتر بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر یەکێکتان تووشی بەڵایەک بوو، با موصیبەتی مردنی من بیر خۆی بخاتەوە، چونکە لە گەورەترین موصیبەتەکانە لە لای.

٣٨٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: «آخِرُ نَظْرَةٍ نَظَرْتُهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ كَشْفُ السِّتَارَةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ، فَنَظَرْتُ إِلَى وَجْهِهِ كَأَنَّهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ وَالنَّاسُ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ، فَأَشَارَ إِلَى النَّاسِ أَنِ اثْبُتُوا، وَأَبُو بَكْرٍ يَؤُمُّهُمْ وَأَلْقَى السِّجْفَ، وَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: «کۆتا سەرنجدان و تەماشاکردنێک کە تێیدا تەماشای پێغەمبەری خوام ﷺ کردبێ، ڕۆژی دووشەممە بوو، کاتێک پەردەی (ماڵەکەی) هەڵدایەوە (یا الله! چ هەڵدانەوەیەک!)، ئیدی تەماشای ڕووخساری نوورانیم کرد، دەتگوت پەڕو کاغەزی سپییە، خەڵکیش لە دوای ئەبو بەکرەوە ڕاوەستابوون، (ئیدی خەڵک خەریک بوو بشڵەژێن و نوێژەکەیان لێ تێکبچێ) بۆیە ئاماژەی بۆ کردن کە ئارامبگرن، ئەبو بەکر ﷺ پێشنوێژی بۆ دەکردن، ئیتر پەردەکەی دادایەوە (یا الله! چ دادانەوەیەک!) لە کۆتایی ئەم ڕۆژەدا بوو پێغەمبەر گیان ﷺ ڕووحی موبارەکی بە خوا سپاردو کۆچی دوایی فەرموو».

(١) أخرجه البخاري: ٦٨٠، ومسلم: ٤١٩.




## شەرح و ڕوونکردنەوە:

باسی ئەوە دەکات کەوا پێغەمبەر ﷺ لە چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممە وەفاتی کردوە، نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژە خەڵکی بە پێش نوێژی ئەبو بەکری صیددیق ﵁ نوێژەکەیان کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ڕۆژەدا نەخۆشییەکەی زۆر توند بووە، بۆیە پەردەی دەرگاکەی لاداوەو، تەماشای هاوەڵانی کردوە، بینیویەتی کەوا ڕێک و پێک بە ڕیز وەستاون و ملکەچی پەرستنی خوای گەورەن و خواپەرستی خۆیان دەکەن، بە تەمای پاداشتی خوای گەورەن و لە سزاو تۆڵەی خوا دەترسن، جا کاتێک ئەوەی بینی لە خۆشیاندا زەردەخەنەیەکی کرد، وەک لە (صحيح مسلم)دا[1] هاتوە: (پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بە زەردەخەنەیەک پێکەنینی دەربڕی)، لە دڵخۆشی و خۆشحاڵی خۆی بۆ هاوەڵان.

ئەنەسیش ﵁ لەو چرکەو کاتەدا کە باس دەکات سەیری پێغەمبەری ﷺ کردو دەڵێ: «كَأَنَّهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ»، واتە: لە ڕوونی و جوانی و درەوشاوەیی پڕشنگدارییدا.

پێغەمبەر ﷺ پەردەکەی دادایەوەو بەو دیمەنە چاوەکانی ڕوون بوونەوەو خۆشحاڵ بوو، کە بینی ئوممەتەکەی لە مزگەوتدا کۆبوونەوەو نوێژ دەکەن، خوای گەورە چاوی پێغەمبەرەکەی ﷺ بەو دیمەنە ڕووناککردەوەو لە جوانی و خۆشی دیمەنەکە پێکەنی و دڵخۆشی و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی و، چاوی بەو دیمەنە جوانە ڕوون و گەشایەوە.

بێگومان گرنگیدانی پێغەمبەر ﷺ بە نوێژەکان، تەنها ئەوەندە نەبوو لە ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنیدا، بەڵکو عەلی ﵁ دەڵێ: کە پێشەوا ئەحمەد ﵀، لێی دەگێڕێتەوە لە (المسند)[2]، کە کۆتا وتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بووە: دەیفەرموو: {الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ، اتَّقُوا اللَّهَ فِيمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ}. واتە: ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێ و دەربارەی بەردەستەکانیشتان لە خوا بترسێن.

---

(١) أخرجه مسلم: ٤١٩ من حديث أنس بن مالك ﵁.

(٢) برقم: ٥٨٥، وأخرجه أبو داود في سننه: ٥١٥٦ من حديث عليّ ﵁.




بەڵکو لە (سنن إبن ماجه)دا[١] بە ڕوون و ڕاشکاوتر هاتوە لە ئەنەسەوە کە گوتوویەتی: بە گشتی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە کۆتاییەکانی ژیانیدا بووە، وەسیەتەکەی بریتی بوو لە: (ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێ و ئاگاتان لەوانە بێ کە لەبەر دەستاندان)، وە هەروەها لە گێرانەوەی ئوممو سەلەمە ﵂ کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ هاتوە کە هەموو وەصیەتی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی مردنیدا ئەوە بووە دەیفەرموو: {الصَّلَاةَ الصَّلَاةَ، وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ}. واتە: نوێژ، نوێژ، وە ئەوەی لە ژێر دەستاندان ئاگاتان لێیان بێ. تا پێغەمبەر ﷺ لە دڵی خۆیدا ئەمەی دەوتەوەو زمانی نەیدەتوانی بیڵێ[٢].

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر پلەوپایەو گەورەیی نوێژ لە ئیسلامدا.

جا کاتێک پێغەمبەر ﷺ بە ڕووی هاوەڵاندا پێکەنی، هاوەڵان زۆر دڵخۆش بوون، وایانزانی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ چاک بۆتەوەو دێت پێش نوێژیان بۆ دەکات، بەڵام ئاماژەی بۆ ئەبو بەکرو ئەوانەی لەگەڵیدا بوو کرد کەوا بەردەوام و جێگیربن لەسەر نوێژەکەیان، «وَأَلْقَى السِّجْفَ»، واتە: پەردەکەی دادایەوە، ئیتر لە ماڵەکەی خۆیدا مایەوە هەتاکو وەفاتی کرد، کاتێک کە چێشتەنگاو گەرم بوو لەو ڕۆژەدا وەفاتی کرد.

ئەوەی کە صەحیحە لە لای ئەوانەی کەوا ژیاننامەی پێغەمبەریان ﷺ نوسیوە، کۆدەنگن کەوا لە چێشتەنگاوی ئەو ڕۆژەدا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە.

وە ئەوەی کە ئەنەس ﵁ دەڵێ: «وَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ آخِرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ»، لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێ کەوا لە کۆتایی ڕۆژەکەدا هەواڵەکە بۆ هەموو خەڵکی بووبێتە ڕاستی، چونکە لە چێشتەنگاودا کە یەکەم جار هەواڵەکە بڵاوبۆوە خەڵکی تووشی شۆک و دوو دڵی و گومان بوون لە هەواڵەکە، بە دوای ئەبو بەکردا ﵁ چوون، کاتێک ئەویش هات تەماشای ڕوخساری پێغەمبەری ﷺ کردو ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الزمر. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بە ڕاستی تۆ دەمری و، ئەوانیش دەمرن).

پاشان نێوچاوانی پێغەمبەری ﷺ ماچکرد، ئەوجار وتارێکی بۆ خەڵکی داو ئەو هەواڵە ناخۆش و شۆک هێنەرو موچڕکە پێداهێنەرەی پێ ڕاگەیاندن.

---

(١) برقم: ٢٦٩٧.

(٢) شرح مشكل الآثار: ٨/٢٢٥_٢٢٦.

٣٨٦- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «كُنْتُ مُسْنِدَةً النَّبِيَّ ﷺ إِلَى صَدْرِي، أَوْ قَالَتْ: إِلَى حِجْرِي، فَدَعَا بِطَسْتٍ لِيَبُولَ فِيهِ، ثُمَّ بالَ، فَمَاتَ»[1].

واتە: عائیشە ﵂، دەڵێ: «پێغەمبەرم ﷺ پاڵ پشت کردبوو بە سینگمەوە (ڕاوی دەڵێ) یان گوتی: بە کۆشمەوە، جا داوای کرد تەشتێکی بۆ بێنن تا پێداویستی خۆی جێبەجێ بکات (سەرئاو بکات)، کە پێداویستی تەواوکرد، وەفاتی فەرموو، ڕووحی بە خوا سپارد».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «كُنْتُ مُسْنِدَةً النَّبِيَّ ﷺ إِلَى صَدْرِي، «أَوْ قَالَتْ:» إِلَى حِجْرِي»، ڕاوی لە گوماندایە کەوا عائیشە ﵂ کامەیانی گوت، بەڵام ئەوەی کە لە گێڕانەوەکانی دیکەدا هاتوە، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەوا سەری کردۆتە سنگی، نەخۆشیەکەشی دووشەممەی پێشووتر دەستی پێکردوە، پێش ئەو دووشەممەی کەوا تێیدا وەفاتی کردوە، پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی لە خێزانەکانی دیکەی وەرگرت، بۆ ئەوەی کە لە ماڵی عائیشە ﵂ بمێنێتەوە لە نەخۆشیەکەیدا، ئەوانیش مۆڵەتیان پێدا، جا لە نێوان دوو پیاودا دەڕۆیشت و پێیەکانی بە زەویدا دەخشاند، پاشان لەگەڵ توندی نەخۆشیەکەشی دەچوو پێش نوێژی بۆ خەڵکی دەکرد، هەتاکو جارێکیان نەخۆشیەکەی توند بوو، داوای لە خێزانەکانی کرد کەوا حەوت کوندە ئاوی بۆ بێنن و لە کاتی نوێژدا ئاوی بەسەردا برێژن، جا کە ئاوایان کرد دەرچوو پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کۆتا پێش نوێژکردنی لە ڕۆژی جومعەدا بوو، پاشان ئەبو بەکری ﵁ لەجێی خۆی دانا بە فەرمانی خۆی، ئەبو بەکر ﵁ ئیتر پێش نوێژی بۆ خەڵک کرد، لە ڕۆژی جومعەوە تاکو بەیانی ڕۆژی دووشەممەو ئیتر پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد.

کە دەڵێ: «فَدَعَا بِطَسْتٍ لِيَبُولَ فِيهِ، ثُمَّ بِالَ، فَمَاتَ»، واتە: داوای دەفرێکی کرد لەبەر توندی نەخۆشیەکەی بۆ ئەوەی میزی تێبکات، چونکە توانای هەڵسان و ڕۆیشتنی نەمابوو.

---

(١) أخرجه البخاري: ٧٤١، ومسلم: ١٦٣٦.



لە گێڕانەوەیەکدا هاتوە لە (صحیح البخاري)دا[1] لە دایکە عائیشەوە ﵂ گوتوویەتی: {قَبَضَهُ اللَّهُ بَيْنَ سَحْرِي وَنَحْرِي}. واتە: خوای گەورە لە کاتێکدا ڕووحی کێشا کە لەسەر سینگم بوو. (السَّحْر): واتە: سی، (النَّحْر): واتە: سەرووی سینگ، وە ئەوەش بە واتای وتەکەیەتی لێرەدا: «كُنْتُ مُسْنِدَةً النَّبِيَّ ﷺ إِلَى صَدْرِي».

٣٨٧- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، أَنَّهَا قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ بِالْمَوْتِ وَعِنْدَهُ قَدَحٌ فِيهِ مَاءٌ، وَهُوَ يُدْخِلُ يَدَهُ فِي الْقَدَحِ ثُمَّ يَمْسَحُ وَجْهَهُ بِالْمَاءِ، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى مُنْكَرَاتِ - أَوْ قَالَ عَلَى سَكَرَاتِ - الْمَوْتِ»[2].

واتە: عائیشە ﵂، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە کاتی گیان کێشاندا بوو، پەرداخێک ئاویشی لەلا بوو، جا دەستی دەخستە نێو پەرداخەکەو ئاوەکەی بە ڕووخساری دا دەهێنا، پاشان دەیفەرموو: «خوایە! یارمەتیم بدە لەسەر سەغڵەتیەکانی سەرەمەرگ، - یان فەرمووی: لەسەر تەنگانەکانی - مردن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ بِالْمَوْتِ»، واتە: کاتێک خەریکی گیان بەخشین بوو، عائیشە ﵂ تەماشای دەکرد، «وَعِنْدَهُ قَدَحٌ فِيهِ مَاءٌ»، (قَدَحٌ): قاپی ئاو پێ خواردنەوەیە.

«وَهُوَ يُدْخِلُ يَدَهُ فِي الْقَدَحِ ثُمَّ يَمْسَحُ وَجْهَهُ بِالْمَاءِ»، پاشان داوای یارمەتی دەکرد لە خوا کە هاوکاری بێ لە ناخۆشیەکان و ئازارەکانی گیان کێشاندا، وە وتەی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)ی زۆر دووبارە دەکردەوە، دەیفەرموو: (بە ڕاستی مردن ئازارو ئێش و نارەحەتی هەیە، پاشان دەستەکانی بەرەو سەرەوە بەرزکردەوەو دەیفەرموو: «في الرفيق الأعلى»، هەتا وەفاتی کردو دەستەکانی بەربوونەوە.

---

(١) برقم: ١٣٨٩.

(٢) أخرجه المصنّف في جامعه: ٩٧٨، وهذا الإسناد ضعيف لجهالة موسى بن سرجس، لمن جاء في صحيح البخاري: ٦٥١٠ من طريق ذكوان مولى عائيشة ﵂ كَانَتْ تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ رَكْوَةٌ أَوْ عُلْبَةٌ فِيهَا مَاءٌ - يَشُكُّ عُمَرُ - فَجَعَلَ يُدْخِلُ يَدَيْهِ فِي الْمَاءِ، فَيَمْسَحُ بِهِمَا وَجْهَهُ، وَيَقُولُ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، إِنَّ لِلْمَوْتِ سَكَرَاتٍ». ثُمَّ نَصَبَ يَدَهُ، فَجَعَلَ يَقُولُ: «فِي الرَّفِيقِ الْأَعْلَى». حَتَّى قُبِضَ، وَمَالَتْ يَدُهُ.

کە دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى مُنْكَرَاتِ - أَوْ قَالَ عَلَى سَكَرَاتِ - الْمَوْتِ»، واتە: ئازارەکانی، ئەو ئازارە دەبێتە کەفارەت و هۆی پلەی بەرز، دانەر رحمه الله، لە کتێبەکەیدا (الجامع)[1] بە: {غَمَرَاتِ الْمَوْتِ} هێناویەتی، مانای وەکو یەکە.

٣٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «لَا أَغْبِطُ أَحَدًا بِهَوْنِ مَوْتٍ بَعْدَ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ شِدَّةِ مَوْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر رضي الله عنهما، دەگێڕێتەوە کە عائیشە رضي الله عنها، گوتوویەتی: «خۆزگە بە ئاسان و سووک مردنی هیچ کەسێک ناخوازم، دوای ئەوەی سەغڵەتی و ناڕەحەتی ڕووح کێشانی پێغەمبەری خوام ﷺ بینـی».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَا أَغْبِطُ أَحَدًا بِهَوْنِ مَوْتٍ بَعْدَ الَّذِي رَأَيْتُ مِنْ شِدَّةِ مَوْتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، واتە: ئەگەر دەیزانی کەسێک بەبێ ئازارو بە ئاسانی مردووەو هیچ ئازارو ناڕەحەتی مردنی نەچەشتوە، ئەوە خۆزگەی پێنەدەخواست، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە چرکە ساتەکانی کۆتاییدا لە کاتی ڕووح کێشاندا تووشی ئازارو ناڕەحەتی تووندو زۆر بوو، لە کاتێکدا باشترینی بەندەکانی خواو باشترینی دروستکراوانی خوا بووە.

ئەو ئازارەش کە لە کاتی نەخۆشیەکەیدا تووشی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، بە هۆی ئەوەوە بوو کە دوو جار پاداشتی هەبووە لە لای خوا، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە لە صەحیحی بوخاریدا[3] هاتوە لە ئیبنو مەسعودەوە رضي الله عنه گوتوویەتی: {أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي مَرَضِهِ، وَهُوَ يُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا، وَقُلْتُ : إِنَّكَ لَتُوعَكُ وَعْكًا شَدِيدًا. قُلْتُ: إِنَّ ذَاكَ بِأَنَّ لَكَ أَجْرَيْنِ؟ قَالَ: أَجَلْ، مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى، إِلَّا حَاتَّ اللَّهُ عَنْهُ خَطَايَاهُ كَمَا تَحَاتُّ وَرَقُ الشَّجَرِ}. واتە: لە نەخۆشیەکەیدا هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش تایەکی زۆر قورسی لێ بوو، منیش گوتم: جەنابیشت کە تووشی تای تووند دەبی، ئایا ئەوەش لەبەر ئەوەیە

---

(١) برقم: ٩٧٨.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٩٧٩، والحديث الَّذي ساقه المصنِّف ضعيف الإسناد لجهالة عبد الرَّحمن بن العلاء، لكن جاء عنها في صحيح البخاري: ٤٤٤٦ ما يشهد له حيث قالت عائيشة رضي الله عنها: مَاتَ النَّبِيُّ ﷺ وَإِنَّهُ لَبَيْنَ حَاقِنَتِي وَذَاقِنَتِي، فَلَا أَكْرَهُ شِدَّةَ الْمَوْتِ لِأَحَدٍ أَبَدًا بَعْدَ النَّبِيِّ ﷺ.

(٣) برقم: ٥٦٤٧.



کە دووجار پاداشتت هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، بێگومان هەر مسوڵمانێک تووشی ئازارو نارەحەتیەک بێت، ئەوە خوای گەورە بە هۆیەوە تاوانەکانی هەڵدەوەرێنێ، هەروەکو چۆن دار گەڵاکانی هەڵدەوەرێن.

٣٨٩- عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اخْتَلَفُوا فِي دَفْنِهِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً مَا نَسِيتُهُ قَالَ: «مَا قَبَضَ اللَّهُ نَبِيّاً إِلَا فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ» . ادْفِنُوهُ فِي مَوْضِعِ فِرَاشِهِ[1].

واتە: ئیبنو ئەبو مەلیکە، دەگێڕێتەوە: کە عائیشە رضي الله عنها، گوتوویەتی: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووحی کێشرا، (هاوەڵان) ڕاجیاوازیان کەوتە نێوان لەسەر ناشتن و شاردنەوەی، ئیدی ئەبو بەکر رضي الله عنه گوتی: شتێکم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بیستوەو، هەر لە بیرم ماوە، فەرمووی: «خوا ڕووحی هیچ پێغەمبەرێکی نەکێشاوە، مەگەر لەو شوێنەی کە حەزی کردوە تێیدا بنێژرێ، بۆیە لە شوێنی ڕاخەرەکەی بینێژن».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەسەر ناشتنەکەی پێغەمبەر ﷺ دوو جۆر ڕاو بۆچوون هەبوو:

**یەکەم**: ئایا دەنێژرێ یان نانێژرێ؟

**دووەم**: ئەگەر دەنێژرێ لە کوێدا دەنێژرێ؟

کە دەڵێ: «فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ شَيْئاً مَا نَسِيتُهُ»، ئەوەی بۆ دڵنیایی گوت، کەوا بێگومان لە پێغەمبەری ﷺ بیستوە، «قَالَ: مَا قَبَضَ اللَّهُ نَبِيّاً إِلَا فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ، ادْفِنُوهُ فِي مَوْضِعِ فِرَاشِهِ»، پێغەمبەر ﷺ لە ژوورەکەی عائیشەدا رضي الله عنها وەفاتی کرد، لەسەر جێگاکەی ئەو، ئیتر هەموو هاوەڵان بە پشت بەستن بە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ کە ڕاستگۆترینی ئوممەت رضي الله عنه بۆی گێڕانەوە ڕێککەوتن، کەوا هەر لە شوێنەکەی خۆی بینێژن، ئیتر ئەبو تەڵحە رضي الله عنه لە شوێنی جێگای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ گۆڕەکەی بۆ هەڵکەندو هەر لەوێش ناشتیان.

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ١٠١٨، والحديث في إسناده عبد الرَّحمن بن أبي بكرٍ الملَيكيُّ، وهو ضعيفٌ، لكنَّ الحديث صحيحٌ بما له من شواهد.

٣٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَعَائِشَةَ رضي الله عنهما: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه «قَبَّلَ النَّبِيَّ ﷺ بَعْدَ مَا مَاتَ»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس و عائیشە رضي الله عنهما دەڵێن: ئەبو بەکر رضي الله عنه «پێغەمبەری ﷺ ماچ کرد، دوای ئەوەی (پێغەمبەر ﷺ) ڕووحی بە خوا سپاردو مرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەبو بەکر رضي الله عنه لە ناوچەی عالیە لە ماڵەکەی خۆیدا بوو، کەسێکیان بە دوادا ناردو ئەویش رضي الله عنه هات، خەڵکیش لە دەوری ماڵەکەی عائیشە کۆببوونەوە، ئەبو بەکر رضي الله عنه داوای کرد ڕێگای بۆ چۆڵ بکەن تاکو بچێتە ژوورەوە، ئیتر چوو بۆ ژوورەوەو پێغەمبەر ﷺ داپۆشرابوو، ئەویش پەردەی لەسەر ڕوخساری پێغەمبەر ﷺ لاداو زانی کە وەفاتی کردوە، بۆیە دەمی رضي الله عنه خستە سەر نێوچاوانی خۆشەویستەکەی کە پێغەمبەری خوایەو ﷺ نێوچاوانی ماچکرد وەک ماڵئاوایی کردن.

ئەوەی لێ وەردەگیرێ کەوا دروستە مردوو ماچ بکرێ، وەکو ئەوەی مرۆڤ ناوچاوانی باوکی، یان دایکی، یان زانایەک یان خۆشەویستێکی دەمرێ، دروستە، وەکو ماڵئاوایی ماچی بکات[٢].

٣٩١- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ رضي الله عنه، دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ وَفَاتِهِ فَوَضَعَ فَمَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَوَضَعَ يَدَيْهِ عَلَى سَاعِدَيْهِ، وَقَالَ: «وَانَبِيَّاهُ، وَاصَفِيَّاهُ، وَاخَلِيلَاهُ»[٣].

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: ئەبو بەکر رضي الله عنه هاتە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پاش ڕووح کێشرانی، دەمی لە نێوان هەردوو چاوەکانی داناو دەستەکانیشی خستنە سەر هەردوو باسکە (موبارەکەکانی و ئنجا) گوتی: «ئەی هاوار بۆ پێغەمبەر! ئەی هاوار بۆ باشترین هەڵبژێردراوی خوا! ئەی هاوار بۆ باشترین دۆست و خۆشەویستی بە وەفا!».

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٤٥١.

(٢) وقد قبلت جبين عالم الأمة سماحة الإمام عبد العزيز بن باز رحمه الله بعد وفاته ورأيت في وجهه من النور والجمال ما يبهر النّاظر.

(٣) أخرجه أبو داود في السنن: ٢١٣٧.



**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەوەشیان هەر بە مانای فەموودەکەی پێشووترە، بەڵام زیادەی زیاتری تێدایە، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێ: دەستەکانی خۆی لەسەر باسکەکانی پێغەمبەر ﷺ دانا، وەکو ئەوەی کە بیگرێتە باوەشی، پاشان ئەو وشانەی گوت: «وَانَبِيَّاهُ، وَاصَفِيَّاهُ، وَاخَلِيلَاهُ»، ئەوانە وشەگەلی دەربڕینی ئازارو ئێش و مەینەتین بۆ لە دەستدانی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئیسنادی ئەو فەرموودەیە، یەزیدی کوڕی بابنوسی تێدایە، کە ئەگەر بە تەنیا فەرموودەکە بگێڕێتەوە زۆر بەهێز نیە، بەڵام ئەگەر فەرموودەی تری هاوشێوە هەبێ وەرگیراوە.

٣٩٢- عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: «لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا نَفَضْنَا أَيْدِيَنَا مِنَ التُّرَابِ، وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ ﷺ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا»[1].

واتە: ئەنەس ﷺ دەڵێ: «ئەو ڕۆژەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە نێو مەدینە، هەموو شتێک تێیدا ڕووناکبوویەوە، ئەو ڕۆژەش کە تێیدا وەفاتی کرد، هەموو شتێکی تێدا تاریک کرد، ئێمە هێشتا خۆڵی گۆڕەکەیمان لە دەستمان دانەوەشاندبوو، وە خەریکی شاردنەوەو ناشتنی بووین، (بە هۆی ئەو کارەساتەوە کە بەسەرماندا هات ئیدی خۆمانمان لە بیر چوو بوویەوە)، دڵەکانمان نکوڵی لێدەکردو بەرپەرچی (هەواڵەکەی) دەدایەوە.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەنەس ﷺ لەو فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ وێنا دەکات کە لەو ڕۆژەدا کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی تێدا کردوە، خەڵکی زۆر ناڕەحەت بوون و دڵ و دەروونیان پڕ بووە لە خەم و خەفەت و، ڕۆژێکی پڕ ئازار بووە بەسەر خەڵکیەوە، کە ئەوەیان بەسەرهاتوە، ئەوجار دێت بەرانبەریەک دەکات لەگەڵ ئەو ڕۆژەی کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا هات بۆ مەدینە لەگەڵ ئەو ڕۆژەی کە تێیدا وەفاتی کرد، دەڵێ: «لَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي دَخَلَ

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٣٦١٨، وابن ماجه في السنن: ١٦٣١.




فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ الْيَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ»، ئەو قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کەوا کارەساتەکە زۆر گەورەو شۆک هێنەر بووە، گەورەیی ئەو دەنگ و باسە دەگەیەنێ کەوا بە چوار دەوری مەدینەدا بڵاوبۆتەوە.

لە کارەساتێکدا بوون کە گەورەترین کارەسات بووە کە زەوی لەبەر چاوانیان تاریک بووە، ئێش و ئازار دڵیانی پڕ کردوە.

کە دەڵێ: «وَمَا نَفَضْنَا أَيْدِيَنَا مِنَ التُّرَابِ، وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ ﷺ»، واتە: لە دوای ناشتنی پێغەمبەر ﷺ «حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا»، واتە باوەڕیان نەدەکرد لەبەر گەورەیی و ئازاری کارەساتەکە، نەک لەبەر بە درۆخستنەوە، یان گومان هەبوون، یان لاوازی باوەڕ.

ناشتنی پێغەمبەر ﷺ لە لایەن هاوەڵانەوە، بەڵگەیە لەسەر وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، وە ڕەتدانەوەی ئەوانەیە کەوا گومان دەبەن پێغەمبەر ﷺ مردبێ، چونکە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ زیندوو بووایە هاوەڵانی نەیاندەناشت بە زیندوویی، ئەوە شتێکە کە کەسی عاقڵ قبووڵی ناکات و قسەی وا ناڵێ.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ بە گوێرەی ژیانی دونیای بێگومان مردووە، بەڵام لە دونیای بەرزەخدا زیندووە، بەرزەخیش لەگەڵ ژیانی سەر دونیا جیاوازە.

٣٩٣- عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: «تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ»[1].

واتە: عائیشە ﵂ دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دوو شەممە کۆچی دوایی کرد».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

باسی دیاری کردنی ئەو ڕۆژە دەکات کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا وەفاتی کردوە، کە ڕۆژی دووشەممەیەو، ئەوەش کۆدەنگی لەسەرە، وە هەر لەو ڕۆژەشدا لە دایک بووە ﷺ.

---

(١) أخرجه المصنِّف في جامعه: ٩٩٦، وإسناده ضعيفٌ؛ لأنَّ فيه عامر بن صالح بن عبد الله بن عروة بن الزُّبير، متروك الحديث، لكنَّ معناه صحيحٌ؛ لأحادث أخرى كثيرة.




٣٩٤- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: «قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ فَمَكَثَ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَلَيْلَةَ الثُّلاَثَاءِ، وَدُفِنَ مِنَ اللَّيْلِ» وَقَالَ سُفْيَانُ: وَقَالَ غَيْرُهُ: يُسْمَعُ صَوْتُ الْمَسَاحِي مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ[١].

واتە: جەعفەری کوڕی موحەممەد لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دوو شەممە ڕووحی کێشرا، ڕۆژی دووشەمەو شەوی سێ شەممە مایەوە، لە شەوی چوار شەممە نێژرا»، سوفیان دەڵێ: جگە لە موحەممەدی باوکی جەعفەر کەسی دیکەش گوتوویانە: دەنگی ئامێری گۆڕ هەڵکەنەکان دەبیسترا لە کۆتایی و درەنگانی شەودا.

شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ فَمَكَثَ ذَلِكَ الْيَوْمَ وَلَيْلَةَ الثُّلاَثَاءِ، وَدُفِنَ مِنَ اللَّيْلِ»، واتە: لە شەوی چوارشەممە نێژرا، کە دەڵێ: «يُسْمَعُ صَوْتُ الْمَسَاحِي مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ»، **الْمَسَاحِي**: واتە: خاکەناز، پێمەڕە.

هەندێک لە زانایان دواخستنی ناشتنەکەی بۆ ئەوە دەگێڕنەوە، تاکو خەڵک بتوانن نوێژی لەسەر بکەن، بۆیە پۆل پۆل خەڵکی نوێژیان لەسەر دەکرد، چونکە لە ژوورەکەی عائیشە ﷺ بووە، ژوورەکەش بچووک بووە، خەڵکی زۆر جێی نەبۆتەوە.

ئەو فەرموودەیە موڕسەلە، بەڵام لە موسنەدەکەی پیشەوا ئەحمەددا هاتوە کە عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئاگاداری ناشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووین، هەتاکو لە کۆتایی شەوی چوارشەممەدا گوێمان لە دەنگی ئامێری گۆڕ هەڵکەندن بوو.

٣٩٥- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ، قَالَ: «تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ، وَدُفِنَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ»[٢].

واتە: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ، گوتوویەتی: «پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی دووشەممە وەفاتی کردو، ڕۆژی سێ شەم نێژرا».

---

(١) أخرجه بن محمَّد -هو الصَّادق-، عن والده محمَّد بن علي الباقر زين العابدين، وهو من التَّابعين ولم يشهد وفاة النَّبيِّ ﷺ؛ فيكون الحديث مرسلاً.

(٢) قَالَ أَبُو عِيسَىٰ: هَذَا حَدِيثٌ غَرِيبٌ.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەو فەرموودەیە لە ڕووی سەنەدو مەتنەوە لاوازە، ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف تابیعی بووەو ئاگاداری وەفاتی پێغەمبەر ﷺ نەبووە، واتە: ئەو کات ئامادە نەبووە چونکە تابیعی بووە.

کەواتە: لە ڕووی سەنەدەوە فەرموودەکە بێهێزە، چونکە موسەلەو عەبدولعەزیزی کوڕی موحەممەدی دەڕاوەردی تێدایە، ئەویش (صدوق)ـەو، کتێبی غەیری خۆی لە فەرموودە دەگێڕێتەوەو هەڵەشی هەن، وە شەریکی کوڕی عەبدوڵڵای تێدایە ئەویش (صدوق)ـە، بەڵام هەڵە دەکات لە کاتی گێڕانەوەدا.

لە ڕووی مەتنیشەوە، چونکە پێچەوانەی ئەم فەرموودە سەلمێنراوە، کەوا پێغەمبەر ﷺ لە شەوی چوارشەممەدا نێژراوە.

٣٩٦- عَنْ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ قَالَ: أُغْمِيَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ فَأَفَاقَ، فَقَالَ: «حَضَرَتِ الصَّلَاةُ»؟ فَقَالُوا: نَعَمْ. فَقَالَ: «مُرُوا بِلَالاً فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ لِلنَّاسِ»، «أَوْ قَالَ: بِالنَّاسِ»، قَالَ: ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَأَفَاقَ، فَقَالَ: «حَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟» فَقَالُوا: نَعَمْ. فَقَالَ: «مُرُوا بِلَالاً فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: إِنَّ أَبِي رَجُلٌ أَسِيفٌ، إِذَا قَامَ ذَلِكَ الْمَقَامَ بَكَى فَلَا يَسْتَطِيعُ، فَلَوْ أَمَرْتَ غَيْرَهُ قَالَ: ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ فَأَفَاقَ فَقَالَ: «مُرُوا بِلَالاً فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ أَوْ صَوَاحِبَاتُ يُوسُفَ» قَالَ: فَأُمِرَ بِلَالٌ فَأَذَّنَ، وَأُمِرَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى بِالنَّاسِ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَجَدَ خِفَّةً، فَقَالَ: «انْظُرُوا لِي مَنْ أَتَّكِئُ عَلَيْهِ»، فَجَاءَتْ بَرِيرَةُ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَاتَّكَأَ عَلَيْهِمَا فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَنْكُصَ فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ أَنْ يَثْبُتَ مَكَانَهُ، حَتَّى قَضَى أَبُو بَكْرٍ صَلَاتَهُ، ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ، فَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ لَا أَسْمَعُ أَحَداً يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ إِلَا ضَرَبْتُهُ بِسَيْفِي هَذَا قَالَ: وَكَانَ النَّاسُ أُمِّيِّينَ لَمْ يَكُنْ فِيهِمْ نَبِيٌّ قَبْلَهُ، فَأَمْسَكَ النَّاسُ، فَقَالُوا: يَا سَالِمُ، انْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَادْعُهُ، فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأَتَيْتُهُ أَبْكِي دَهِشاً، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: أَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قُلْتُ: إِنَّ عُمَرَ يَقُولُ: لَا أَسْمَعُ أَحَداً يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ إِلَا ضَرَبْتُهُ بِسَيْفِي هَذَا، فَقَالَ لِي: انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَجَاءَ هُوَ وَالنَّاسُ قَدْ دَخَلُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَفْرِجُوا لِي، فَأَفْرَجُوا لَهُ فَجَاءَ حَتَّى أَكَبَّ عَلَيْهِ وَمَسَّهُ، فَقَالَ: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾﴾ الزمر، ثُمَّ قَالُوا: يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَعَلِمُوا أَنْ قَدْ صَدَقَ،

قَالُوا: يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيُصَلَّى عَلَى رَسُولِ اللَّهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالُوا: وَكَيْفَ؟ قَالَ: يَدْخُلُ قَوْمٌ فَيُكَبِّرُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَدْعُونَ، ثُمَّ يَخْرُجُونَ، ثُمَّ يَدْخُلُ قَوْمٌ فَيُكَبِّرُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَدْعُونَ، ثُمَّ يَخْرُجُونَ، حَتَّى يَدْخُلَ النَّاسُ، قَالُوا: يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيُدْفَنُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالُوا: أَيْنَ؟ قَالَ: فِي الْمَكَانِ الَّذِي قَبَضَ اللَّهُ فِيهِ رُوحَهُ، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَقْبِضْ رُوحَهُ إِلَّا فِي مَكَانٍ طَيِّبٍ. فَعَلِمُوا أَنْ قَدْ صَدَقَ، ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَغْسِلَهُ بَنُو أَبِيهِ وَاجْتَمَعَ الْمُهَاجِرُونَ يَتَشَاوَرُونَ، فَقَالُوا: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى إِخْوَانِنَا مِنَ الْأَنْصَارِ نُدْخِلُهُمْ مَعَنَا فِي هَذَا الْأَمْرِ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: مَنْ لَهُ مِثْلُ هَذِهِ الثَّلَاثِ: ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴿٤٠﴾﴾ التوبة، مَنْ هُمَا؟ قَالَ: ثُمَّ بَسَطَ يَدَهُ فَبَايَعَهُ وَبَايَعَهُ النَّاسُ بَيْعَةً حَسَنَةً جَمِيلَةً[١].

واتە: سالمی کوڕی عوبەید یەکێکە لە هاوەڵان ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی نەخۆشکەوتنەکەیدا (بە هۆی سەختی نەخۆشیەکەی) بوورایەوەو، دواتر بە ئاگاهاتەوە، فەرمووی: «کاتی نوێژ هاتوە؟» گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: «بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبو بەکریش بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات»، سالم دەڵێ: دیسان بوورایەوەو، ئنجا بە ئاگاهاتەوە، فەرمووی: «کاتی نوێژ هاتوە؟» گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: «بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبو بەکریش بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات»، جا عائیشە گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا) باوکم پیاوێکی دڵناسکە (زوو خەمبارو دڵتەنگ دەبێ)، ئەگەر لەو شوێنەدا بوەستێ دەگری و، ناتوانێ ئەو کارە بکات، ئەگەر فەرمانت کردبا بە کەسێکی دیکە (بۆ ئەوەی پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات)، (بۆ جاری سێیەم پێغەمبەری خوا ﷺ) بوورایەوەو دوایی بە ئاگاهاتەوە، فەرمووی: «کاتی نوێژ هاتوە؟» گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: «بە بیلال بڵێن: با بانگ بدات، بە ئەبو بەکریش بڵێن: با پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە بکات، لەبەر ئەوەی ئێوە وەک ئافرەتانی دەوری یوسفن»، (واتە: ڕاستیەکان دەشارنەوە)، ئیدی (سالم) دەڵێ: فەرمانکرا بە بیلال بانگ بدات (بانگیداو) ئەبو بەکریش فەرمانی پێکرا نوێژ بۆ خەڵکەکە بکات، دواتر هەستی بە لەش سووکی خۆی کردو فەرمووی: «تەماشا بکەن (کەسێکم بۆ بانگ بکەن با بێت)، تا دەستەکانمی لەسەر

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السنن: ١٢٣٤.

شان دابنێم»، بەرِیرە (ئافرەتێک بوو خزمەتکاری عائیشە رضي الله عنها بوو) هات لەگەڵ پیاوێکی دیکە، پێغەمبەریش ﷺ خۆی بەسەر شانیاندادا، کە ئەبو بەکر پێغەمبەری خوای ﷺ بینی ویستی بکشێتەوە بۆ دواوە، بۆیە (پێغەمبەر ﷺ) ئاماژەی بۆ کرد کەوا لە شوێنی خۆی بمێنێتەوەو بە چەسپاوی، تا نوێژەکەی تەواو کرد. دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، جا عومەر (زۆر تووڕە بوو بوو بۆیە) گوتی: سوێند بە خوا لە هەر کەسێک ببیستم بڵێ: پێغەمبەری خوا ڕووحی کێشراوەو وەفاتی کردوە، بەم شمشێرەم لێی دەدەم، خەڵکەکەش شارەزاییان (لە ئایینەکانی پێشوو نەبوو)، پێش (پێغەمبەری خواش ﷺ) هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتبوو، جا بۆیە بێدەنگیان هەڵبژارد، (سالم دەڵێ:) گوتیان: ئەی سالم بە پەلە برۆ بانگی هاوەڵی پێغەمبەری خوا بکە، منیش چووم بۆ لای ئەبو بەکرو، زۆر بە پەشۆکاویی دەگریام، کە تەماشای کردم! گوتی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد؟! گوتم: عومەر دەڵێ: سوێند بە خوا لە هەر کەسێک ببیستم بڵێ: پێغەمبەری خوا ڕووحی کێشراوەو وەفاتی کردوە، بەم شمشێرەم لێی دەدەم، ئەبو بەکریش گوتی: بە پەلە با بڕۆین، منیش لەگەڵی ڕۆیشتم کە هات، بینی خەڵکەکە کۆبوونەتەوە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی خەڵکینە! شوێنم بکەنەوەو ڕێگام بۆ چۆڵ بکەن، ئیدی کەلێنیان بۆ کردەوەو هاتە ژوورەوە (کە بینی) خۆی بەسەر داداو دەستی پێداهێنا، ئنجا گوتی: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الزمر. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بەڕاستی تۆ دەمری و ئەوانیش دەمرن)، پاشان خەڵکەکە گوتیان: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا، ئایا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە؟! ئەبو بەکریش گوتی: بەڵێ (وەفاتی کردوە)، ئیتر خەڵکەکە دڵنیابوون لە ڕاستی هەواڵەکە، (جا پرسیاریان کرد) خەڵکەکە گوتیان: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر دەکرێ؟ گوتی: بەڵێ، گوتیان: چۆنیەتی نوێژ کردنەکەمان بۆ باس بکە، گوتی: هەندێک لە خەڵکی دێنە ژوورەوەو تەکبیر دەکەن نوێژو دوعا دەکەن، پاشان دەچنە دەرەوە دوایی هەندێکی دیکە دێنە ژوورەوەو تەکبیر دەکەن نوێژو دوعا دەکەن، پاشان دەچنە دەرەوە هەتا هەموو خەڵکەکە دەچنە ژوورەوە (و نوێژو دوعا دەکەن بەم شێوەیە)، گوتیان: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ دەنێژرێ؟ گوتی: بەڵێ، گوتیان لە




کوێ؟ گوتی: لەو شوێنەدا کە خوا تێیدا ڕووحی کێشاوە، لەبەر ئەوەی لە شوێنی پاک و چاک نەبێ خوا ڕووحی نەکێشاوە، ئیتر دوای ئەوە دڵنیان بوون لە دروستی و ڕاستی فەرموودەکە، پاشان داوای لە خزمەکانی کرد بیشۆرن، (چونکە پێشتر پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی کردبوو دەبێ خزمەکانی بیشۆرن)، ئیدی موهاجیرەکان کۆبوونەوە ڕاوێژیان کرد، گوتیان: با بچین بۆ لای براکانمان لە برا ئەنصارەکان، بۆ ئەوەی لەم بابەتەدا هاوبەشیان پێبکەین، ئەنصارەکان گوتیان: با ئەمیرێک لە ئێمەو یەکێکیش لە ئێوە بێ (واتە: وەک شوێنگرەوە)، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: چ کەسێک ئەم سێیەی تێدابن، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ﴿٤٠﴾﴾ التوبة. (پێغەمبەر یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک ئەو دووانە -پێغەمبەرو ئەبو بەکر- لە ئەشکەوتی -ثور-دا بوون، ئەو کاتە بە هاوەڵەکەی -بە ئەبو بەکری صیددیقی- وت: خەم مەخۆ، بێگومان خوا لەگەڵمانە). ئایا ئەو دووانە کێن؟ سالم دەڵێ: دوایی دەستی درێژ کردو بەیعەتی پێدا، پاشان خەڵکەکەش هەموو بەیعەتێکی جوان و (ئارەزوومەندانەیان) پێدا.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

سالیمی کوڕی عوبەید شەڕەفی ﷺ هاوڕێیەتی پێغەمبەری ﷺ هەبووە، وە دەڵێن: کە لە ئەهلی صوفەش بووە، ئەو گێڕانەوەیەی ئەو، کۆمەڵێک هەواڵی دەربارەی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لە خۆ گرتووە.

کە دەڵێ: «أُغْمِيَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي مَرَضِهِ فَأَفَاقَ»، (الإغماء): واتە: لە هۆش چوون و بێ ئاگابوون لە دەوروبەر، پێغەمبەر ﷺ بە هۆی توندی و قورسی نەخۆشیەکەیەوە، تووشی ئەو حاڵەتە بووە، پاشان هاتەوە سەرخۆیی و «فَقَالَ: حَضَرَتِ الصَّلَاةُ»؟»، ئەو فەرمایشتە پرسیارەو ئامرازی پرسیارەکە نەهاتوە، واتە: ئایا نوێژ بووەو کاتی هاتوە؟ «فَقَالُوا: نَعَمْ»، گوتیان بەڵێ، دیارە ئەوەش جەخت لە گەورەیی پێگەی نوێژ دەکاتەوە لە ئیسلامدا، چونکە نوێژ کۆڵەکەی دینە، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەی کە هەموو کاروبارە گرنگەکانی ئۆممەتی لەلا گرنگ بووە، بەڵام لە بە ئاگاهاتنەوەکەیدا تەنها پرسیاری نوێژی کردوە، عومەریش ﷺ کە دەرچووی قوتابخانەی پێغەمبەرە ﷺ




کاتێک کە لە نێو نوێژدا لێیدراو بێ هۆش کەوت، کاتێک بە ئاگاهاتەوە گوتی: ئایا خەڵکی نوێژەکەیان کرد؟ نوێژ ئەو ئەرکەیە کە هەمووانی لەو کاتەدا سەرقاڵ کردوە بە خۆیەوە، وە جێگەی ڕەچاوکردن و گرنگی پێدانیان بووە، هەمیشە دڵیان بە مزگەوتەوە پەیوەست و گرێدراو بوو.

کە فەرموویەتی: «مُرُوا بِلَالاً فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ لِلنَّاسِ، «أَوْ قَالَ: بِالنَّاسِ»، قَالَ: ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ، فَأَفَاقَ، فَقَالَ: حَضَرَتِ الصَّلَاةُ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ. فَقَالَ: مُرُوا بِلَالاً فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، واتە: با ئەبو بەکر پێشنوێژی بکات ئەوەش پێگەی بەرزی ئەبو بەکر دیاری دەکات و دەریدەخات کە چەندە بەرز بووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ لە نێو هەموو هاوەڵاندا ئەوی هەڵبژارد بۆ پێش نوێژی ئیمانداران، بۆیە عومەریش هەر ئەوەی کردە بەڵگە بەسەر ئەنصارەوە لە ڕۆژی (سەقیفە)داو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دینەکەمان لێی ڕازی بوو، ئایا ئێمەش بۆ کاروباری دونیامان لێ ڕازی نەبین؟.

کە دەڵێ: «فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: إِنَّ أَبِي رَجُلٌ أَسِيفٌ»، واتە: دڵناسکەو زوو کاریگەر دەبێت و بە سۆزو بەزەییە، بۆیە گوتی: «إِذَا قَامَ ذَلِكَ الْمَقَامَ بَكَى فَلَا يَسْتَطِيعُ، قَالَ: ثُمَّ أُغْمِيَ عَلَيْهِ فَأَفَاقَ»، واتە: ناتوانێت نوێژەکە بە تەواوی بکات، «فَلَوْ أَمَرْتَ غَيْرَهُ»، لە هەندێک گێڕانەوەدا هاتوە کە عائیشە ﵂ گوتوویەتی: (فەرمان بە عومەر بکە پێش نوێژی بۆ خەڵکی بکات)، وە قسەی لەگەڵ حەفصەش کرد، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ ڕازی بکات کەوا عومەر پێش نوێژی بکات، بەڵام هەر جارێک پێغەمبەر ﷺ بە ئاگادەهاتەوە، دەیفەرموو: «مُرُوا بِلَالاً فَلْيُؤَذِّنْ، وَمُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ»، ئەوانیش دەیانگوت: «إِنَّ أَبُو بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ»، جا کە ئەوان هێندە ئەو قسەیان دووبارە کردەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ أَوْ صَوَاحِبَاتُ يُوسُفَ»، واتە: ئێوە وەکو ئەوانن، لەوەی کە بە ئاشکرا شتێک دەڵێن و شتێکیش دەشارنەوە، ئاخر عائیشە ﵂ بە ئاشکرا ئەوەی ڕاگەیاند کە باوکی دڵی ناسکە، بەڵام بە شاراوەیش لە خەمی باوکیدا بوو کە بچێتە شوێنی پێغەمبەر بۆ پێش نوێژی کردن.

کە دەڵێ: «ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَجَدَ خِفَّةً»، واتە: لە دوای ئەو حاڵەتە کە بەسەریدا هات، کەمێک توانای هاتەوە بەر کە بچێت بۆ نوێژ.




## با سەرنج بدەین!

کە چەند گرنگی بە نوێژ دراوە لەو کاتەدا، بە پێچەوانەی هەندێک خەڵکی ئێستا کە بەهۆی کەمترین بەهانەوە نوێژەکانیان دوادەخەن و گرنگی پێنادەن، بەڵکو هەندێک کەس تەنها مەگەر کاتی زیادەیان هەبێت و بۆ نوێژ تەرخانی بکەن، ئەگەرنا جار هەیە بەهۆی ماندووبوونێکی کەم یان نەخۆشیەکی سووکی وەکو هەڵامەت نوێژەکە دوا دەخات، کەچی لە سەردەمی هاوەڵاندا جار هەبووە کەسێک نەخۆش و بێ توانا بووە، کەچی بە دوو پیاو چوونە بن باڵی و هێناویانەتە ناو ڕیزی جەماعەت.

کە دەڵێ: «انْظُرُوا لِي مَنْ أَتَّكِئُ عَلَيْهِ»، واتە: کەسێک بێنن کەوا بێتە بن باڵم بۆ ئەوەی بچم لە مزگەوت نوێژەکەم بکەم.

کە دەڵێ: «فَجَاءَتْ بَرِيرَةُ»، کەنیزەکی عائیشە ﷺ بووەو حەبەشی بوو، «وَرَجُلٌ آخَرُ»، لە هەندێک گێڕانەوەدا ناوی هاتوە بە (نەوبە) ئەویش بەندە بووە، «فَاتَّكَأَ عَلَيْهِمَا»، وە بردیان بۆ مزگەوت.

لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە، کەوا شانی داوەتە سەر عەبباسی مامی و پیاوێکی دیکە کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب بووە، دەکرێ بگوترێ سەرەتا بەڕیرەو نەوبە هەتا ماوەیەک چوونە بن باڵی، دواتریش عەبباس و عەلی هاتوون و گەیاندوویانەتە شوێنی خۆی، یان دەگونجێ دووجار ئەوە ڕوویدا بێت.

«فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ ذَهَبَ لِيَنْكُصَ»، واتە: کاتێک ئەبو بەکر بینی و زانی پێغەمبەریان ﷺ هێنا، ویستی بێتە دواوە بۆ ڕیزی نوێژ خوێنان، تاکو پێغەمبەر ﷺ پێش نوێژیەکە بکات، «فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ أَنْ يَثْبُتَ مَكَانَهُ، حَتَّى قَضَى أَبُو بَكْرٍ صَلَاتَهُ»، جا ئایا پێغەمبەر ﷺ لەو نوێژەدا ئیمام بووە، یان مەئموم ئەوە چەند بۆچوونێک هەیە:

هەندێک دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەبو بەکر بووە بە ئیمام و ئەبو بەکریش بۆ خەڵکەکە بووە بە ئیمام.

هەندێکیش دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ مەئموم بووە.

لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا هاتوە کەوا پێغەمبەریان ﷺ لە لای چەپی ئەبو بەکر داناوەو

دایاننیشاندووە، ئەوەیان لەو ڕایە نزیکە کەوا پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەبو بەکر ئیمام بووەو ئەویش بۆ خەڵکەکە.

کە دەڵێ: «ثُمَّ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ»، مادام وشەی (ثُمَّ)ی بەکارهێناوە، واتە: لەو ساتەدا وەفاتی نەکردوە، بەڵکو گەڕاوەتەوە بۆماڵەوەو ئەبو بەکر بۆ نوێژەکانی دیکە پێش نوێژی بۆ خەڵک کردوە، هەتاکو لە چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممەدا پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە.

ئیتر خەڵکەکە دەستیان کرد بە باسکردنی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ، هەیانبوو دەیگوت: وەفاتی کردوە، هەشیان بوو پرسیاری دەکرد بۆیە: «فَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ لَا أَسْمَعُ أَحَدًا يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ إِلَّا ضَرَبْتُهُ بِسَيْفِي هَذَا»، چونکە عومەر پێی وابووە کەوا وەکو جاران لە هۆشی خۆی چووەو وەفاتی نەکردووەو بە ئاگا دێتەوە.

کە دەڵێ: «وَكَانَ النَّاسُ أُمِّيِّينَ»، واتە: خوێندەواریان نەبووە، ئنجا مەبەستەکە ڕوونەکاتەوەو دەڵێ: «لَمْ يَكُنْ فِيهِمْ نَبِيٌّ قَبْلَهُ»، بۆیە کەوتنە گومانێکی زۆر گەورەو، کارەساتێکی گەورەیان بەسەرداهات و ئەقڵیانی وەستاند، ئەگەرنا پێشتر پێغەمبەریان ﷺ لە ناو دابایەو وەفاتی بکردبایە، ئەوە دەیانزانی کە ئەو پێغەمبەرەش ﷺ وەکو پێغەمبەرانی پێشووتر وەفات دەکات و تووشی شۆک نەدەبوون.

کە دەڵێ: «فَأَمْسَكَ النَّاسُ»، واتە: دوای ئەوەی عومەر ﷺ ئاوای دەگوت ئیتر ئەوانیش وازیان هێنا، «فَقَالُوا: يَا سَالِمُ»، خەڵکی بە سالمیان گوت: «انْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَادْعُهُ»، کۆدەنگی خەڵکی لەسەر ئەوەی کەوا بانگی ئەبو بەکر بکرێت لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو هاوەڵەشدا کە هەم شارەزای دین و، هەمیش پەیوەست بوون بە هاوڕێیەتی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەمان پێدەڵێ: کەوا پێگەی ئەبو بەکر ﷺ لە ناو هاوەڵاندا چەندە بەرز بووەو خاوەنی پلەو ڕێزێکی تایبەت بووە لە نێویاندا.

کە گوتوویانە: «انْطَلِقْ إِلَى صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَادْعُهُ»، لەگەڵ ئەوەی کە هەموویان هاوڕێ و هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوون، بەڵگەیەکی دیکەیە بۆ تایبەتمەندی ئەبو بەکر ﷺ، بەڵام لە نێو هاوەڵانیشدا کە دەگوترا: هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ یەکسەر ئەبو بەکریان دەهاتە خەیاڵ، چونکە ئەبو بەکر ﷺ ئەو پلەو جیاوازییەشی هەبووە،




ئاخر تاکە هاوەڵە کە قورئان ناوی بەو جۆرە هێناوەو دەفەرموێ: ﴿ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَاۖ ﴾ التوبة. (پێغەمبەر یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک ئەو دووانە -پێغەمبەرو ئەبو بەکر- لە ئەشکەوتی -ثور-دا بوون ئەو کاتە بەهاوەڵەکەی -بە ئەبوبەکری صدیقی- وت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە).

کە دەڵێ: «فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأَتَيْتُهُ أَبْكِي دَهِشًا»، واتە: بە سەرسامی و داخ و پڕ ئازارەوە دەگریام لەبەر گەورەیی کارەساتەکە، «فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: أَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟»، لەبەر ئەوەی ئەبو بەکر ﷺ دەیزانی کە نەخۆشیەکەی پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکی زۆر توندو بە ئازار دایە، سالیم ﷺ نەیگوت: بەڵێ، چونکە عومەر ﷺ ئەو قسەیەی لێ قەدەغە کردبوون، وە سوێندیشی خواردبوو هەر کەسێک بڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە، بە شمشێر لێی دەدات، هەر لەبەر ئەوە بووە گوتی: «قُلْتُ: إِنَّ عُمَرَ يَقُولُ: لَا أَسْمَعُ أَحَدًا يَذْكُرُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ إِلَّا ضَرَبْتُهُ بِسَيْفِي هَذَا».

کە دەڵێ: «فَقَالَ لِي: انْطَلِقْ، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَجَاءَ هُوَ وَالنَّاسُ قَدْ دَخَلُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»، واتە: لە دەوری ماڵی پێغەمبەر ﷺ قەرەباڵغی بوو، «فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، أَفْرِجُوا لِي»، واتە: ڕێگام بۆ چۆڵ بکەن، «فَأَفْرَجُوا لَهُ»، ڕێگایان بۆ کردەوە.

کە دەڵێ: «فَجَاءَ حَتَّى أَكَبَّ عَلَيْهِ وَمَسَّهُ»، واتە: دەستی خستە سەر جەستەی، ئیتر بە تەنها دەست لێدانەکەی زانی و گوتی: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾ الزمر. (-ئەی موحەممەد ﷺ- بە ڕاستی تۆ دەمری و، ئەوانیش دەمرن). ئیتر دڵنیا بووە کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە.

کە دەڵێ: «قَالُوا: يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَعَلِمُوا أَنْ قَدْ صَدَقَ»، ئیتر لێرەدا دڵنیابوونەوە هەموویان کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردوە.

ئنجا ئەبو بەکر ﷺ چوو بۆ مزگەوت و، خەڵکی لە دەوری کۆبوونەوەو وتارێکی بۆ خەڵکەکەداو، وتارێکی پڕ ماناو کاریگەر، کە تێیدا دڵنەوایی و، هەروەها دامەزراندنی دڵی بڕواداری تێدا بوو، هەروەها دامەزراندی خوا بە یەکگرتن و



ئیمان لە دڵیاندا، هەروەها بابەتەکەی بە تەواوی بۆ ڕوونکردنەوەو ڕاستی بابەتەکەی بۆ شیکردنەوە، بەوپەڕی دامەزراویی و خۆڕاگرییەوە گوتی: {أَمَّا بَعْدُ؛ فَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا فَإِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ مَاتَ، وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ}(١). واتە: دوای ئەمە؛ هەر کەسێک موحەممەدی دەپەرست، ئەوە موحەممەد وەفاتی کرد، هەر کەسێکیش خوا دەپەرستێت، ئەوە بێگومان خوای گەورە زیندووەو هەرگیز نامرێ. ئەوەی کەوا ئەبو بەکری صیددیق ﵁ لەو کارەساتە گەورەیەدا گرنگی پێداو باسی کرد هەمان ئەو شتە بوو کە پێغەمبەر ﷺ گرنگی پێدەدا، کە بریتی بوو لە خوا بە یەکگرتن، کە ئەوەش بناغەو بنچینەی هەر کارێکە لە ژیانداو گەورەترین داواکراوە لە بەندە.

ئەبو بەکر ﵁ لەو کاتەدا باسی لە دامەزراویی و خۆڕاگریی و جێگیرکردنی بیروباوەڕی ئیمانداران کرد، چونکە ئەگەر ئیمان پتەوو دامەزراو بوو، ئیتر هەموو شتەکانی دیکە دێنەسەر خەت و چاک دەبن، چونکە گرنگترین شت لە کاتی ڕوودانی کارەساتدا، کە پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت، ئیمان و بیرو باوەڕە.

پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔاۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران. (-موحەممەد ﷺ- تەنها پێغەمبەرێکە -نەمر نیە-، بێگومان لە پێش ئەو پێغەمبەرانی تر ڕابوردون جا ئایا ئەگەر وەفاتی کرد، یان کوژرا، دەگەڕێنەوە بۆ دواوەی خۆتان -پاشگەزدەبنەوە؟!-، هەر کەس هەڵگەڕێتەوە بۆ دواوەی خۆی -بۆ بتپەرستی-، ئەوە هەرگیز -ئەو کەسە- هیچ زیانێک ناگەیەنێت بە خوا، وە بەزوویی خوا پاداشتی سوپاسگوزاران دەداتەوە). ئیبنو عەبباس ﵄ گوتی: (سوێند بە خوا وەکو ئەوە وابوو خەڵکی ئەو ئایەتەی نەزانیبێ کە هەیە، هەتاکو ئەبو بەکر خوێندیەوە) خوێندنەوەی ئەو ئایەتە لەو کاتەدا لە لایەن ئەبو بەکرەوەو دامەزراندنی خەڵک بە هۆی وتارەکەیەوە لەسەر بیروباوەڕو خوا بە یەکگرتن تەوفیقێکی خوا بوو، ئیتر خەڵکی هەمووی لە هەر چوار لای مەدینەدا ئەو ئایەتەیان دەخوێندەوە وەکو ئەوەی کە ئەو ڕۆژە ئەو ئایەتە دابەزیبێت.

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٦٦٧ من حديث عائشة، ٤٤٥٤ من حديث ابن عبّاس ﵄.



هەتا ئەو عومەرەی ﷺ کە دەیگوت: هەر کەسێک بڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە، بە شمشێر لێی دەدەم، وای لێهات کە دەیگوت: سوێند بە خوا هیچ شتێکم نەبوو، هەتا گوێم لە ئەبو بەکر بوو ئەو ئایەتەی خوێندەوەو ئیتر تێگەیشتم کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردوە، حاڵەتێکم بەسەرهات هەتا پێیەکانم نەیانتوانی ڕامبگرن و کەوتمە سەر زەوی)، ئەوەش وەک ڕێزلێنانێکی خوا بوو بۆ ڕاستگۆترینی ئەو ئوممەتەو دامەزراوی بوو بۆ ئەو.

ئەوجار خەڵکی بە پرسیارکردن ڕوویانکردە ئەبو بەکر ﷺ، گوتیان: «يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيُصَلَّى عَلَى رَسُولِ اللَّهِ؟»، نوێژ کردن لەسەر مردوو، واتە: داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەین و دووعای سۆزو میهرەبانی خوای گەورەی بۆ بکەین، ئێ خۆ پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووی خۆشبووە، ئایا نوێژی لەسەر دەکرێ؟ «قَالَ: نَعَمْ»، ئنجا پرسیارێکی دیکە بە مێشکیاندا هات «قَالُوا: وَكَيْفَ؟ قَالَ: يَدْخُلُ قَوْمٌ فَيُكَبِّرُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَدْعُونَ، ثُمَّ يَخْرُجُونَ، ثُمَّ يَدْخُلُ قَوْمٌ فَيُكَبِّرُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَدْعُونَ، ثُمَّ يَخْرُجُونَ، حَتَّى يَدْخُلَ النَّاسُ»، واتە: پۆل پۆل خەڵکی دەچنە ژوورەوەو بە گوێرەی لە خۆگرتنی ژوورەکە، کە لە ڕاستیدا ژوورەکە زۆر بچووک بووە، بۆیەش ناشتنەکەی زۆر دواکەوت، ئنجا شتێکی دیکەیان لێبوو بە کێشە، کە ئایا پێغەمبەر ﷺ دەنێژرێ؟ «قَالُوا: يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيُدْفَنُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالُوا: أَيْنَ؟ قَالَ: فِي الْمَكَانِ الَّذِي قَبَضَ اللَّهُ فِيهِ رُوحَهُ»، پاشان بۆ قسەکەی بەوەی بەڵگەی هێنایەوە کە گوتی: «فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَقْبِضْ رُوحَهُ إِلَا فِي مَكَانٍ طَيِّبٍ. فَعَلِمُوا أَنْ قَدْ صَدَقَ»، پێشتر باسی ئەوە کرا کە ئەبو بەکر ﷺ گوتی: شتێکم لە پێغەمبەر ﷺ بیستووە کە لە بیرم نەچۆتەوە گوتی: «مَا قَبَضَ اللَّهُ نَبِيًّا إِلاَّ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ»، ئیتر ئەبو بەکر ﷺ بەڵگەو هۆکارەکەی بەیەکەوە باسکرد.

کە دەڵێ: «ثُمَّ أَمَرَهُمْ أَنْ يَغْسِلَهُ بَنُو أَبِيهِ»، واتە: خزمەکانی پشتی، بۆیە کوڕە مامەکەی کە عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ بوو شوشتی، هەندێک لە خزمەکانیشی یارمەتیاندا، لە سێ پۆشاکی یەمانی سپی کفنیان کرد، واتە: لە لۆکە بوون، کە نەکراس و نە مێزەریان لەگەڵ نەبوون.

کە دەڵێ: «وَاجْتَمَعَ الْمُهَاجِرُونَ يَتَشَاوَرُونَ»، ئەو ڕاوێژەیان لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺو

لە پێش ناشتنیدا بوو، ڕاوێژەکەیان دەربارەی جێنشین بوو، بۆیەش لەو کارە بە پەلە بوون، چونکە لە هەموو کاتێکدا ئەگەر فەرمانڕەواییەک نەبێت کاروبار تێکدەچێت و دەبێتە ئاڵۆزی، خەڵکی دابەش دەبن و، یەک ڕەئی نابن و تووشی فیتنەو لێک ترازان دەبن و کێشەو ئاشووب دەکەوێتە نێوانیان.

لا يَصلُحُ النَّاسُ فَوْضَى لا سَراةَ لَهم وَلا سَراةَ إذَا جُهَّالُهُمْ سَادوا

ئنجا موهاجیرەکان لەوە دەترسان کە ئەگەر ئەنصارەکان بە تەنیا کۆببنەوەو کەسێک لە خۆیان هەڵبژێرن فیتنەو ئاشووب سەر هەڵبدات، بە جۆرێک کە ڕێگری لێ نەکرێت، بۆیە بە ئەبو بەکریان گوت: «انْطَلِقْ بِنَا إِلَى إِخْوانِنَا مِنَ الْأَنْصَارِ نُدْخِلُهُمْ مَعَنَا فِي هَذَا الْأَمْرِ»، واتە: با ئەو کارە هەموومان بە یەکسانی پێی هەڵسین و کەسێک دیاری بکەین و لەسەری ڕێککەوین بۆ ئەوەی کاروباری مسوڵمانان بگرێتە دەست و ببێتە جێنشین، ئنجا ڕۆیشت بۆ لای ئەنصارەکان کە لە سەقیفەی بەنو ساعیدە کۆببونەوە، «فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ»، لەسەر زمانی حەبابی کوڕی مونزیر ﷺ گوتیان، «مِنَّا أَمِيرٌ وَمِنْكُمْ أَمِيرٌ»، ئەوەش هەندێک جار دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی، چونکە لە هەر کۆمەڵەیەک فەرمانڕەوایەک دەبێت و، ئەویان گوێ بۆ ئەویتریان ڕاناگرێ، بەڵام خوای گەورە عومەری کوڕی خەتتابی ﷺ سەرکەوتوو کرد لەو کارەشداو، قسەیەکی خستە دڵەوە، کە دڵی هەمووانی کۆکردەوە لەسەری، کە گوتی: «مَنْ لَهُ مِثْلُ هَذِهِ الثَّلَاثِ»، واتە: کێ هەیە ئەو سێ سیفەتە بەرزەی تێدابێ پێم بڵێن، جا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا ﴿٤٠﴾﴾ التوبة. (پێغەمبەر یەکێک بوو لەو دوو کەسە کاتێک ئەو دووانە لە ئەشکەوتی -ثور- دا بوون ئەو کاتە بە هاوەڵەکەی وت خەم مەخۆ بێگومان خوا لەگەڵمانە).

لەو ئایەتەدا سێ سیفەتی باسکردوە!

**یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ﴾، کێ بوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەرگەی ناڕەحەتی و قورسی و، ترسی ناو ئەشکەوتی گرت و خۆی بۆ ڕاگرت؟

**دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ﴾، کامە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ لە قورئاندا بە دەق ناوی هاوەڵی لێنراوە؟




سێیەم: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾، باشە ئەو لەگەڵ بوونە تایبەتە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بۆ کێیە؟

وەڵامی هەرسێک پرسیارەکە ئەوەیە ئەو تایبەتمەندیانە تەنها لە ئەبو بەکردا ﷺ بوونیان هەیە.

«ثُمَّ بَسَطَ يَدَهُ فَبَايَعَهُ وَبَايَعَهُ النَّاسُ بَيْعَةً حَسَنَةً جَمِيلَةً»، بەبێ ڕاجیایی و کێشەو گرفت پەیمانیان بە ئەبو بەکردا، پاشان لە نێو مزگەوتدا کۆبوونەوە، ئەوەی کە لە سەقیف ڕوویدا، ئیتر لە مزگەوتدا لە نێو خەڵکەکەدا ئاشکرا کرا، بۆیە عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ و زوبەیری کوڕی عەوام ﷺ هاتن پێش خەڵکەکە بەیعەتیان بە ئەبو بەکر ﷺ داو، ئیتر کۆی گشتی هاوەڵانیش بەیعەتیان پێدا.

٣٩٧- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ كُرَبِ الْمَوْتِ مَا وَجَدَ، قَالَتْ فَاطِمَةُ ﷺ: وَاكَرْبَاهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا كَرْبَ عَلَى أَبِيكِ بَعْدَ الْيَوْمِ، إِنَّهُ قَدْ حَضَرَ مِنْ أَبِيكِ مَا لَيْسَ بِتَارِكٍ مِنْهُ أَحَدًا، الْمُوافَاةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی بە ئازارو گرفتاریەکانی سەرەمەرگی کرد، فاطیمە ﷺ، گوتی: ئەی هاوار بۆ ئەو ئێش و ئازارە زۆرەی باوکم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «دوای ئەو ئێش و ئازارەی ئەمڕۆ، هیچ ئێش و ئازارێکی دی تووشی باوکت نابێ، ئەو مردن و ڕووح کێشانەی بۆ باوکت هاتوە، واز لە هیچ کەسێک ناهێنێ، بەڵێنگەی پێکگەیشتنەوەمان ڕۆژی قیامەتە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «لَمَّا وَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ كُرَبِ الْمَوْتِ مَا وَجَدَ»، واتە: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ بە دەست ئازارو نارەحەتی مردنەوە تووشی ناخۆشی و ئازار ببوو، «قَالَتْ فَاطِمَةُ»، فاطیمەی کچی ﷺ کە لەلای پێغەمبەر ﷺ بووە، گوتی: «وَاكَرْبَاهُ»، واتە: ئەی هاوار بۆ ئەو ئێش و ئازارە زۆرەی، ئەو وتەیە بۆ ناخۆشی و ئازار چەشتن بەکاردێت.

---

(١) أخرجه ابن ماجه في السنن: ١٦٢٩.

فەرموودەکە لە صەحیحی بوخاریدا بەو جۆرە هاتوە: «وَاكَرْبَاهُ أباه»[1]. واتە: چ بەڵایەکی گەورەیە تووشی بووە، لەوانەیە ئەوەشیان ڕاستتر بێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دواتر دەفەرموێ: «لَا كَرْبَ عَلَى أَبِيكِ بَعْدَ الْيَوْمِ»، چونکە ناخۆشی و ئازار لەسەر خۆشەویستانی خوا نامێنێ و کۆتایی دێت بە مردن.

کە دەفەرموێ: «إِنَّهُ قَدْ حَضَرَ مِنْ أَبِيكِ مَا لَيْسَ بِتَارِكٍ مِنْهُ أَحَداً»، مەبەستی پێ مردنە، بە سێ شت دڵنەوایی فاطیمە ﷺ دەکات:

**یەکەم**: کە دەفەرموێ: «لَا كَرْبَ عَلَى أَبِيكِ بَعْدَ الْيَوْمِ».

**دووەم**: کە دەفەرموێ: «إِنَّهُ قَدْ حَضَرَ مِنْ أَبِيكِ مَا لَيْسَ بِتَارِكٍ مِنْهُ أَحَداً»، چونکە ئەوەی پێدەفەرمووێ کەوا مردن شتێکە هەموو کەسێک دەگرێتەوەو، چێژتنەکەی گشتییە، کە ئەوەش باری سەر شانی مرۆڤ سووک دەکات، مادام گشتی بێ.

**سێیەم**: کە دەفەرموێ: «الْمُوافَاةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، واتە: شوێنی بەیەکتر شادبوونەوە ڕۆژی قیامەتەو دونیاکەی دیکەیە بە ویستی خوا لەسەر باشترین حاڵەت، خوایە بەیەکەوە لە بەهەشتەکەتدا کۆمان بکەیتەوە لەگەڵ پێغەمبەر گیاندا ﷺ.

٣٩٨- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، يُحَدِّثُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ لَهُ فَرَطَانِ مِنْ أُمَّتِي أَدْخَلَهُ اللَّهُ تَعَالَى بِهِمَا الْجَنَّةَ»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: فَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: «وَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ يَا مُوَفَّقَةُ» قَالَتْ: فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: «فَأَنَا فَرَطٌ لِأُمَّتِي، لَنْ يُصَابُوا بِمِثْلِي»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ، گوتوویەتی: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «هەر کەس لە ئۆممەتم دوو منداڵی پێش خۆی بمرن، (و ئەویش ئارامبگرێ) خوای بەرز دەیخاتە بەهەشت»، عائیشە ﷺ گوتی: ئەدی ئەو کەسەی لە ئۆممەتت یەک منداڵی پێش خۆی بمرێ؟ فەرمووی: «هەر کەس منداڵێکی پێش خۆی مردبێ تۆ هەمیشە بۆ کاری خێرو چاکە سەرکەوتوویت»، عائیشەش ﷺ گوتی: ئەدی ئەو کەسەی لە

---

(١) برقم: ٤٤٦٢.

(٢) أخرجه المصنِّف في جامعه: ١٠٦٢، وفي إسناده كلامٌ؛ لأنَّ فيه عبد ربِّه بن بارق الحنفي، وهو صدوقٌ يكذب، وهذا أعلَّه المصنف ﷺ في كتابه الجامع بقوله: هذا حديثٌ غريبٌ.

ئۆممەتەکەت هیچ منداڵێکی پێش خۆی نەمردبێ؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «من مردووی پێشکەوتووی ئۆممەتەکەمم»، لە دوای مردنی من، ئۆممەتەکەم تووشی هیچ ناڕەحەتی و سەغڵەتیەکی دیکەی وێنەی مردنی من نابن.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «مَنْ كَانَ لَهُ فَرَطَانِ مِنْ أُمَّتِي أَدْخَلَهُ اللَّهُ تَعَالَى بِهِمَا الْجَنَّةَ»، (الفرط): لە ئەسڵدا بەو کەسە دەگوترێ کەوا پێش هۆزەکەی دەکەوێت، بۆ ئەوەی شوێنێکی گونجاویان بۆ ببینێتەوە، بەڵام لێرەدا مەبەستی پێ منداڵە پێش باڵغ بوون، واتە: هەر کەسێک دوو منداڵی بمرێ پێش ئەوەی (بالغ)بن و پێبگەن، جا کوڕ بن یان کچ، مادام ئارامگر بێ و پێشی وابێ کەوا خوای گەورە پاداشتی دەداتەوەو، چاوەڕێی پاداشت بکەی، ئەوە خوای گەورە بە هۆی ئەوەوە دەیخاتە بەهەشتەوە.

«فَقَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: فَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟»، واتە: ئەگەر کەسێک تەنها یەک منداڵیشی مردبێ، ئەو پاداشتە دەیگرێـتەوە؟ ئەویش فەرمووی: «وَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ يَا مُوَفَّقَةُ»، واتە: ئەوەی یەک منداڵیشی مردبێ، ئەوە ئەو پاداشتە دەیگرێتەوە، کە بە عائیشەی رضي الله عنها فەرموو: «يَا مُوَفَّقَةُ»، واتە: تۆ هەمیشە بۆ کاری خێرو چاکە سەرکەوتوویت، بۆ نموونەی ئەو پرسیارانەی کەوا سوودبەخشن و جێی قازانجن، ئەوەش یەکێکە لەو سیفەتانەی کە عائیشە رضي الله عنها پێی ناسراوەو، پێگەی بەرزیەتی.

کە دەڵێ: «فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟»، واتە: ئەو حاڵی چۆن دەبێ، ئەوەش یەکێکە لەو نیشانانە کەوا زۆر سوور بووە بۆ کاری چاک و دڵسۆز بووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «فَأَنَا فَرَطٌ لِأُمَّتِي، لَنْ يُصَابُوا بِمِثْلِي»، واتە: لە دەستدان و نەمانی پێغەمبەر ﷺ بە زیندوویی جەستەی لە نێو ئۆممەتەکەیدا گەورترە لە لەدەستدانی منداڵێک، یان دوو منداڵ، یان سێ منداڵ، یان دە منداڵ، هەر کەسێکی نزیکی کە لە دەست دەدات، وەکو باوکی، یان دایکی، یان برایەکی، یان منداڵێکی، یان هەر خۆشەویستێکی، ئەوە با موصیبەتی لە دەستدانی پێغەمبەر ﷺ بە بیر خۆی بێنێتەوە، چونکە بە ڕاستی گەورەترین موصیبەت و ناڕەحەتیە کە تووشی ئەم ئۆممەتە بووبێ.




دانەر ﷬ ئەو باسەی تایبەت کردوە بۆ ئەو شتەی کە پێغەمبەر ﷺ لە دونیادا لە دوای خۆی بەجێی هێشتوە، خۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ و تەواوی پێغەمبەرانیش ﷺ ئەوەی کە بە جێیان هێشتبێت لە شتی دونیایی، ئەوە دەکرێتە خێرو صەدەقە، چونکە بێگومان ئەوان دینارو درەمیان لێ بە میرات جێنەهێشتووە، بەڵکو تەنها زانست و زانیارییان بە میرات بەجێ هێشتوە.

٣٩٩- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ، أَخِي جُوَيْرِيَةَ لَهُ صُحْبَةٌ قَالَ: «مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَّا سِلَاحَهُ وَبَغْلَتَهُ وَأَرْضاً جَعَلَهَا صَدَقَةً»[1].

واتە: عەمڕی کوڕ حارس، برای جوەیریەیە ﷺ کە هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ، گوتوویەتی: «کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، (لە دوای خۆی) هیچ ماڵ و سامانێکی جێ نەهێشت جگە لە چەکەکەی (کە هەموو پێداویستیەکانی جەنگ دەگرێتەوە)، وە هێسترەکەی (کە ناوی دول دول بوو، ڕەنگی سپی بوو)، هەروەها پارچە زەویەک کە بەخشی و کردیە خێر».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیە ئەو دەردەکەوێ، کەوا پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی بە میرات لە دوا بەجێنەماوە، جگە لە هەندێک شتی زۆر کەم نەبێ، کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن و، ئەویشی کردۆتە خێر بۆ ئۆممەتەکەی.

(إبن كثير) ﷬ دەڵێ: (بێگومان دونیا بە هەموو شتێکی ناویەوە زۆر لەوە کەمتر بووە، کەوا پێغەمبەر ﷺ هەوڵی بۆ بدات، یان لە دوای خۆی بیکات بە میرات، سەلام و درووود لە پێغەمبەر ﷺ و هەموو پێغەمبەرانی برای هەتا ڕۆژی دوایی)[2].

٤٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ، فَقَالَتْ: مَنْ يَرِثُكَ؟ فَقَالَ: أَهْلِي وَوَلَدِي، فَقَالَتْ: مَا لِي لَا أَرِثُ أَبِي؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا نُورَثُ»، وَلَكِنِّي أَعُولُ مَنْ كَانَ رسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُولُهُ، وَأُنْفِقُ عَلَى مَنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْفِقُ عَلَيْهِ[3].

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٧٣٩.

(٢) البداية والنهاية: ٥/٢٧٣٩.

(٣) أخرجه المصنف في جامعه: ١٦٠٨.

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: فاطیمە هاتە خزمەت ئەبو بەکر ﷺ گوتی: ئایا کێ میرات لە تۆ دەگرێ (دوای مردنت)؟ (ئەبو بەکر) گوتی: هاوسەرو منداڵەکانم، (فاطیمە ﷺ) گوتی: ئەدی ئایا من میرات لە باوکم ناگرم؟ ئەبو بەکر ﷺ گوتی: گوێ بیست بووم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «(ئێمەی پێغەمبەران) کەس میراتمان نابات (میراتگرمان نین)»، (ئەبو بەکر ﷺ) گوتی: بەڵام بێگومان ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپەرشتی کردوە، منیش سەرپەرشتی دەکەم، هەر کەسیش پێغەمبەری خوا ﷺ بژێوی بۆ دابین کردوە، منیش بژێوی بۆ دابین دەکەم.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لەم فەرموودەیەدا دیارە کە فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ «جَاءَتْ فَاطِمَةُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﷺ»، هاتوە بۆ لای جێنشینی بڕواداران و ئەو کەسەی کە کاروباری مسوڵمانانی بە دەستە لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاتوە داوای بەشە میراتی خۆی دەکات کە لە باوکیەوە بۆی بەجێ ماوە، دیارە ئەو فەرموودەی پێنەگەیشتوە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئێمە میراتمان لێ ناگیرێت، بۆیە وەکو پێشەکیەک بۆ داواکارییەکەی ڕوو لە ئەبو بەکر ﷺ دەکات و دەڵێ: «مَنْ يَرِثُكَ؟»، واتە: ئەگەر تۆ مردی کێ میراتت لێ دەگرێ؟ «فَقَالَ: أَهْلِي وَوَلَدِي»، واتە: ئەگەر مردم هاوسەرو و منداڵەکانم میراتم لێدەگرن، «فَقَالَتْ: مَا لِي لَا أَرِثُ أَبِي؟»، باشە ئەگەر تۆ خێزان و منداڵەکانت میراتت لێ دەگرن بۆچی من میرات لە باوکم ناگرم؟! «فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا نُورَثُ»، لەبەر ئەوەی ئەو شتانەی کە لە دوای پێغەمبەر ﷺ بەجێ مابوون لە نێوان خێزان و نزیکەکانیدا دابەشی نەکرد.

جا کاتێک فەرموودەکەی ئەبو بەکری ﷺ بیست، ئیتر زیاتر لەسەر قسەکەی بەردەوام نەبوو، ئەوەش ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە کەوا فاطیمە ﷺ ئەو فەرموودەی پێشتر نەبیستوە، چونکە ئەگەر پێشتر بیستبای داوای نەدەکرد.

کە دەڵێ: «وَلَكِنِّي أَعُولُ مَنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُولُهُ، وَأُنْفِقُ عَلَى مَنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْفِقُ عَلَيْهِ»، مەبەستی ئەوە بووە کەوا خەرجی لێ ناگرێتەوە، بەڵکو بەردەوام خەرجی ئەوانە دەکێشێت کە پێغەمبەر ﷺ خەرجی کێشاون، چونکە بێگومان ئەبو بەکر ﷺ

ئێستا جێنشینی پێغەمبەرە ﷺ بۆ ڕاییکردنی کاروباری مسوڵمانان و پێداویستیەکانیان.

٤٠١- عَنْ عَمْرِو بْنِ مُرَّةَ، عَنْ أَبِي الْبَخْتَرِيِّ، أَنَّ الْعَبَّاسَ، وَعَلِيّاً ﵄، جَاءَ إِلَى عُمَرَ يَخْتَصِمَانِ يَقُولُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَنْتَ كَذَا، أَنْتَ كَذَا، فَقَالَ عُمَرُ، لِطَلْحَةَ، وَالزُّبَيْرِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَسَعْدٍ: أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ أَسَمِعْتُمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ مَالِ نَبِيٍّ صَدَقَةٌ، إِلَّا مَا أَطْعَمَهُ، إِنَّا لَا نُورَثُ؟» وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ[1].

واتە: عەمری کوڕی مورە دەگێڕێتەوە لە ئەبو بوختەری کە گوتوویەتی: عەبباس و عەلی ﵄ چوونە خزمەت پێشەوا عومەر ﵁ شتێک هەبوو لە نێوانیاندا، هەر کامیان بە ئەوی دیکەی دەگوت: تۆ واو، تۆ وا، ئیدی پێشەوا عومەر ﵁ بە تەڵحەو زوبەیرو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی ﵃ گوت: سوێندتان دەدەم بە خوا ئایا گوێتان لێ بووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «هەموو موڵک و ماڵی پێغەمبەر صەدەقەیە، جگە لەوەی بژێوە بۆ خانەوادەکەی، ئێمە میراتـمان لێ ناگرێ»، وە لە فەرموودەکەدا چیرۆک و بەسەرهاتێک هەیە.

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «أَنَّ الْعَبَّاسَ، وَعَلِيّاً ﵄، جَاءَ إِلَى عُمَرَ يَخْتَصِمَانِ»، عەبباس مامی پێغەمبەرە ﷺ، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ئامۆزای پێغەمبەرە ﷺ، لەسەر کێشەیەک هاتن بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب، چونکە وەکو ئەبو بەکر ئەویش هەڵسابوو بە دابینکردنی خەرجی نزیکەکانی پێغەمبەر ﷺ لەو زەویەی کە پێغەمبەر ﷺ وەکو صەدەقە لە دوای خۆی بەجێی هێشتبوو، پاشان عومەر سەرپەرشتی ئەو زەوییەی بە عەبباس و عەلیدا ﵄ بۆ ئەوەی خەرجی خۆیانی پێ دابین بکەن، نەک وەکو میرات، ئیتر لەسەر ئەوە کێشەیەک کەوتە نێوانیان و ئەوانیش بۆ چارەسەری کێشەکەیان ڕوویان کردە عومەر کە جێنشین بوو، «يَقُولُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَنْتَ كَذَا، أَنْتَ كَذَا»، واتە: هەریەکەیان لەسەر شتێک کە کەوتبووە نێوانیان کێشەکەیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە، وەک بڵێی حەزیان لێبوو زەویەکەیان لە نێواندا دابەش بکرێت، بە پێی

---

(١) إسناده ضعيفٌ؛ لأنَّ أبا البختري لم يسمَعه من عليٍّ والعبَّاس، بل سمعَه من رجلٍ، وهو لا يُعرف، لكن يشهد له ما سيأتي بعد حديثَين.




شایستەی خۆیان، کە ئەو دابەشکردنەش زۆر بە میرات دەچوو، بۆیە عومەر ﷺ لە ئەسڵی شتەکە ئاگاداری کردنەوە، ئەویش ئەوەبووە کە پێغەمبەران ﷺ میراتیان لێ ناگیرێ، بۆیە گوتی: «فَقَالَ عُمَرُ، لِطَلْحَةَ، وَالزُّبَيْرِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَسَعْدٍ»، ئەوانە هەموویان لە گەورە پیاوانی هاوەڵان بوون، هەمووشیان لەو دە کەسەبوون کە لە دونیادا موژدەی بەهەشتیان پێدرابوو، «أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ»، وەک بڵێی: بە خوا سوێندتان دەدەم، «أَنْشُدُكُمْ بِاللَّهِ أَسَمِعْتُمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ مَالِ نَبِيٍّ صَدَقَةٌ، إِلَّا مَا أَطْعَمَهُ، إِنَّا لَا نُورَثُ؟»، ئەوانیش هەموویان شایەدیاندا کە بەڵێ ڕاستەو لە پێغەمبەریان ﷺ بیستوە.

٤٠٢- عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا نُورَثُ مَا تَرَكْنَا فَهُوَ صَدَقَةٌ»[1].

واتە: عائیشە ﷺ، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران) میراتگرمان نییەو میراتمان لێ ناگیرێ، هەر شتێکیش کە جێی دێڵین ئەوە دەبێتە صەدەقە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

عائیشە ﷺ کاتێک ئەوەی گوتوە کە لە میراتگرانی پێغەمبەر ﷺ بووە، ئەگەر میراتەکەی دابەش کرابا میراتی دەگرت، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ڕاستگۆیی و بە ویژدانی و ئەمانەت پارێزی عائیشە ﷺ.

٤٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقْسِمُ وَرَثَتِي دِينَاراً وَلَا دِرْهَماً، مَا تَرَكْتُ بَعْدَ نَفَقَةِ نِسَائِي وَمُؤْنَةِ عَامِلِي فَهُوَ صَدَقَةٌ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «میراتگرەکانم یەک دینارو درەم دابەش ناکەن، ئەوەی بەجێم هێشتوە پاش جیاکردنەوەی نەفەقەو بژێوی هاوسەرانم و کرێی کرێکارەکەم (کە لەسەر زەوی کاریان دەکرد)، ئەوەی دیکە (هەمووی) دەکرێتە خێر».

---

(١) أخرجه البخاري: ٤٠٣٥، ومسلمك ١٧٥٨.

(٢) أخرجه البخاري: ٢٧٧٦، ومسلم: ١٧٦٠.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

ئەوەش بە مانای فەرموودەکانی پێشووترە، پێغەمبەر ﷺ میراتی لێ ناگیرێ، واتە: ماڵ و سامانی لە نێوان میراتگرەکانیدا دابەش ناکرێ، تەنها خەرجی ماڵ و خێزانەکانی لێ دەدرێ، لەگەڵ ئەو کەسەی کە پێی هەڵدەستێت بە خزمەت کردن و خەرجی کێشانەکە.

گوتراوە کە مەبەست لە (العامل) ئەو کەسەیە کە سەرپەرشتیاری کاروباری مسوڵمانانە، لە دوای پێغەمبەر ﷺ، گوتراویشە: ئەو کەسەیە زەکات کۆدەکاتەوە، گوتراویشە: ئەو کەسەیە خزمەتی خورماو زەوییەکە دەکات، قسەیتریش گوتراوە، ئیبنو حەجەر ﷺ قسەی یەکەمی هەڵبژاردووەو گوتویەتی: ئەوەیان جێگای پشت پێ بەستنە.

٤٠٤- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عُمَرَ ﷺ فَدَخَلَ عَلَيْهِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، وَطَلْحَةُ، وَسَعْدٌ، وَجَاءَ عَلِيٌّ، وَالْعَبَّاسُ ﷺ، يَخْتَصِمَانِ، فَقَالَ لَهُمْ عُمَرُ: أَنْشُدُكُمْ بِالَّذِي بِإِذْنِهِ تَقُومُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا نُورَثُ، مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ» فَقَالُوا: اللَّهُمَّ نَعَمْ وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ[1].

واتە: مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان ﷺ دەڵێ: چوومە خزمەت عومەر ﷺ، لە هەمان کاتدا عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف و تەڵحەو سەعد هاتنە ژوورەوە، ئیدی عەلی و عەبباس ﷺ لە هەمان کاتدا هاتنە ژوورەوەو شتێک لە نێوانیان هەبوو، پێشەوا عومەر ﷺ پێی گوتن: سوێندتان دەدەم بەو خوایە کە بە مۆڵەت و فەرمانی ئەو ئاسمان و زەوی لەنگەریان گرتوەو وەستاون (واتە: وا دێتە پێش چاوتان جووڵەیان نیە)، ئایا ئێوە دەزانن و بیستووتانە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێمە (ی کۆمەڵی پێغەمبەران) هیچ میراتێکمان لە دوا جێ نامێنێ و کەس میراتمان لێ نابات، ئەوەی بە جێی دێڵین دەبێتە صەدەقە» گوتیان: ئەی خوایە (شایەدین) بەڵێ وایە، لەم فەرموودەدا بەسەرهاتێکی درێژیی هەیە.

(١) أخرجه البخاري: ٣٠٩٤، ومسلم: ١٧٥٧، والمصنّف في جامعه: ١٦١٠.



**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لە فەرموودەی پێشووتر ڕابورد کەوا عومەر عەبباس و عەلی رضي الله عنهم کردبوو بە چاودێرو سەرپەرشتیار بەسەر ئەو زەوییەی کە پێغەمبەر ﷺ بەجێی هێشتبوو، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی بکەن و خەرجی نزیکەکانی پێغەمبەری ﷺ پێ دابین بکەن، ئەبو بەکر رضي الله عنه بۆ خۆی بەو کارە هەڵدەستا، عومەریش رضي الله عنه لە سەرەتادا بۆ خۆی بەو کارە هەڵدەستا، دواتر سەرپەرشتی کردنەکەی بە عەبباس و عەلی سپارد، ئیتر ئەوانیش لەو کارەدا وردە کێشەیەکیان لێ پەیدابوو.

ئیتر ویستیان کە عومەر رضي الله عنه زەویەکە دابەش بکات لە نێوانیاندا، بەڵام عومەر رضي الله عنه بەو کارە ڕازی نەبوو، بەڵگەشی بەو فەرموودە بۆ هێنانەوە.

کە دەڵێ: «وَفِي الْحَدِيثِ قِصَّةٌ طَوِيلَةٌ»، لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا ئەو چیرۆکە باسکراوە[1].

٤٠٥- عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: «مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِينَاراً وَلَا دِرْهَمَاً وَلَا شَاةً وَلَا بَعِيراً» قَالَ: «وَأَشُكُّ فِي الْعَبْدِ وَالْأَمَةِ»[2].

واتە: عائیشە رضي الله عنها، دەڵێ: «پێغەمبەری خوا ﷺ پاش کۆچی دوایی کردنی هیچ شتێکی جێنەهێشت، لە دینارو درەم و مەڕو وشتر»، (ڕاوی) دەڵێ: «پێم وابێ گوتی: لە بەندەو کەنیزەکیش». (مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە هەرچی جێ بمێنێ نابێ بە میرات).

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

لەو فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کەوا پێغەمبەر ﷺ لە سەروەت و سامانی دونیا شتێکی لە دوای خۆی بەجێ نەهێشتوە کە شایانی باس بێت، بەڵکو دونیا زۆر لەوە کەمتر بووە کە پێغەمبەر ﷺ هەوڵی کۆکردنەوەی سامانی دونیایدا بێت، یان وەک میرات جێی بێڵێ، بەڵکو کارو گرنگیپێدانی ئەو تەنها سەرخستن وگەیاندنی دینەکەی خوای گەورە بووەو، ئەوەی لە دوای خۆی بەجێیهێشتوە تەنها زانست و

---

(١) ) أخرجه البخاري برقم: ٣٠٩٥، ومسلم برقم: ١٧٥٧، والمصنّف في جامعه: ١٦١٠.

(٢) أخرجه أحمد: ٢٥٠٥٣.

زانیاریی و تێگەیشتن بووە لە دین، جا هەر کەسێک لەو میراتە شتێکی بە دەستهێنا بێت، ئەوە باشترین بەشی پێبڕاوە.

لەوبارەوە شتێکی خۆش لە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕنەوە: کە ڕۆژێک چوو بۆ بازاڕی مەدینە، بە خەڵکەکەی گوتووە، ئای چەندە دەستەپاچەن، ئەوانیش گوتوویانە: چی بووە ئەی ئەبو هورەیرە؟ ئەویش گوتوویەتی: ئەوە میراتی پێغەمبەر ﷺ دابەش دەکرێت، کەچی ئێوەش لێرەن و ناچن بەشی خۆتان وەربگرن، گوتیان: لە کوێ دابەش دەکرێت؟ گوتی: لە مزگەوت، ئیتر خەڵکەکە هەموو بە پەلە ڕایانکرد بەرەو مزگەوت، ئەبو هورەیرەش ﷺ ڕاوەستا هەتاکو هاتنەوە، پێی گوتن: چیتان کرد چی بوو؟ گوتیان: ئەی ئەبو هورەیرە چووینە مزگەوت و چووینە ژوورەوە، بەڵام هیچ شتێکمان نەبینی دابەش بکرێت، ئەبو هورەیرە ﷺ پێی گوتن: کەستان نەبینی لە مزگەوتدا؟ گوتیان: بەڵێ، کەسمان بینی، هەندێک کەس نوێژی دەکردو هەندێکیان قورئانیان دەخوێندو هەندێکیان باسی حەڵاڵ وحەڕامیان دەکرد، ئەبو هورەیرەش ﷺ پێی گوتن: دەی هاوار بۆ ئێوە میراتی پێغەمبەر ﷺ هەر ئەوەیە[1].

---

(١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُ مَرَّ بِسُوقِ الْمَدِينَةِ، فَوَقَفَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: "يَا أَهْلَ السُّوقِ، مَا أَعْجَزَكُمْ! قَالُوا: وَمَا ذَاكَ يَا أَبَا: هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: ذَاكَ مِيرَاثُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يُقْسَمُ، وَأَنْتُمْ هَا هُنَا لا تَذْهَبُونَ فَتَأْخُذُونَ نَصِيبَكُمْ مِنْهُ؟! قَالُوا: وَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي الْمَسْجِدِ. فَخَرَجُوا سِرَاعًا إِلَى الْمَسْجِدِ، وَوَقَفَ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ لَهُمْ حَتَّى رَجَعُوا، فَقَالَ لَهُمْ: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ فَقَدْ أَتَيْنَا الْمَسْجِدَ، فَدَخَلْنَا، فَلَمْ نَرَ فِيهِ شَيْئًا يُقْسَمُ. فَقَالَ لَهُمْ أَبُو هُرَيْرَةَ ﷺ: أَمَا رَأَيْتُمْ فِي الْمَسْجِدِ أَحَدًا؟ قَالُوا: بَلَى، رَأَيْنَا قَوْمًا يُصَلُّونَ، وَقَوْمًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ، وَقَوْمًا يَتَذَاكَرُونَ الْحَلالَ وَالْحَرَامَ، فَقَالَ لَهُمْ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَيْحَكُمْ، فَذَاكَ مِيرَاثُ مُحَمَّدٍ ﷺ.

رواه الطَّبراني فِي المعجم الكبير: ٤٠٢.



# بابەت: ئەوەی هاتوە دەربارەی بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا



بَابُ: مَا جَاءَ فِي رُؤْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَنَامِ

بینین چاوگێکە بە دوو مانا دێ:

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە مرۆڤ لە کاتی بێداری بە چاو شتەکان دەبینێ.

**دووەمیان:** ئەوەیە کە مرۆڤ لە خەودا شت دەبینێ، دانەر ﷫ لێرەدا مانای دووەمی مەبەستە، بۆیە هەر لە سەرە باسەکەشدا گوتوویەتی: بینینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەودا.

دانەر ﷫ بەو بابەتە کۆتایی بە کتێبەکەی هێناوە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ و بڵێ: کەوا پەیوەندی هەیە لە نێوان ئاکارەکانی پێغەمبەرو ﷺ بینینی لە خەودا، خۆ ئەگەر کەسێک شارەزای سیفەت و ئاکاری پێغەمبەر ﷺ نەبێت، ئەوە ناتوانێ دڵنیابێ لەوەی کە ئەوەی لە خەودا بینیویەتی پێغەمبەر ﷺ بووە، یان نا، ئەوەش پێداگری کردنە لەسەر گرنگی زانستی شەرعی و گرنگی زانین و بەدواداچوون کردن بۆ سیفەتەکانی پێغەمبەرو ﷺ ئاکارەکانی، ئەگەر مسوڵمان ئەو کتێبە پڕ فەڕو خێرەی خوێندەوە: کتێبی: (الشَّمَائِل)ی پێشەوا (الترمذي)، یان هەر کتێبێکی دیکە کە جێی پشت پێ بەستن بێت، ئەوە هەمیشە بەرچاوی ڕوون دەبێت لەوبارەوە، وە پشت بە خوای گەورە لە فێڵ و تەڵەکەی شەیتان بە دوورو پارێزراو دەبێت و لەخۆی بایی نابێ بەو خەوەی بینیویەتی، چونکە خەڵکێک هەیە کە بە هەڵە چووەو تووشی وەهم و بە هەڵە چوون بووە، کە پێی وابووە پێغەمبەری ﷺ لە خەودا بینیوە لە ژێر ئەو گومانەشدا چەندین شتی بێ بنەماو هەڵبەستراوی بڵاوکردۆتەوە، کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە لەلایەن خوای گەورەوە.

٤٠٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەگێڕێتەوە: «پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس لە خەودا منی بینی، ئەوە بە دڵنیایی منی بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر شێوەو وێنەی من».

---

(١) أخرجه المصنّف في جامعه: ٢٢٧٦، وابن ماجه: ٣٩٠٠.

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي»، واتە: ئەگەر کەسێک پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە ببینێ لە خەودا کە زانراوە لە سیفەت و ئاکارەکانی، نەک بە جۆری دیکە، ئەوە پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە، چونکە شەیتان بە جۆری تر دێتە خەوی مرۆڤ و ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر شێوەی پێغەمبەر ﷺ، کە دەفەرموێ: «فَقَدْ رَآنِي»، مەبەستی ئەوە نیە کە ئەو جەستەیەی بینیوە، کەوا لە نێو گۆڕەکەیدایە، نە ئەو ڕووحەش کەوا لە بەهەشتدایە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کەوا لەسەر دیمەن و شێوەی پێغەمبەرەو ﷺ، پێغەمبەری ﷺ بینیوە، چونکە هەرگیزو هەرگیز شەیتان ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر شێوەی پێغەمبەر ﷺ، شەیتان بە شێوەی دیکە دێتە خەوی مرۆڤ و لەوانەشە پێی بڵێن: کە ئەوە پێغەمبەرە ﷺ یان ئەبو بەکرە رضي الله عنه، یان عومەرە رضي الله عنه یان کەسیتر، بەڵام درۆ دەکات.

٤٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَصَوَّرُ» أَوْ قَالَ: «لَا يَتَشَبَّهُ بِي»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس لە خەودا منی بینی ئەوەی بە دڵنیایی منی بینیوە، چونکە بێگومان شەیتان ناتوانێ بێتە سەر شێوەی من»، یان فەرمووی: «توانای خۆچوواندنی بە من نیە».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

بە هەمان فەرموودەی پێشووتری عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودە رضي الله عنه.

٤٠٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا خَلَفُ بْنُ خَلِيفَةَ، عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي»[2].

---

(١) أخرجه البخاري: ١١٠، ومسلم: ٦٠٥٦.

(٢) أخرجه أحمد: ١٥٨٨٠.

قَالَ أَبُو عِيسَى: وَأَبُو مَالِكٍ هَذَا هُوَ: سَعْدُ بْنُ طَارِقِ بْنِ أَشْيَمَ، وَطَارِقُ بْنُ أَشْيَمَ هُوَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَدْ رَوَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَحَادِيثَ، سَمِعْتُ عَلِيَّ بْنَ حُجْرٍ يَقُولُ: قَالَ خَلَفُ بْنُ خَلِيفَةَ: «رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ حُرَيْثٍ صَاحِبَ النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَا غُلَامٌ صَغِيرٌ».




واتە: قوتەیبە دەڵێ: خەلەفی کوڕی خەلیفە بۆی گێڕاینەوە لە ئەبو مالیکی ئەشجەعی، ئەویش لە باوکیەوە ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس لە خەودا منی بینی ئەوەی بە دڵنیایی منی بینیوە».

شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئەوەشیان مانای فەرموودەی پێشووتر لە خۆ دەگرێ و، وەکو دوو فەرموودەکەی ئیبنو مەسعوود و ئەبو هورەیرەیە ﷺ.

٤٠٩- عَنْ عَاصِمِ بْنِ كُلَيْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُنِي» قَالَ أَبِي: فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقُلْتُ: قَدْ رَأَيْتُهُ، فَذَكَرْتُ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ فَقُلْتُ: شَبَّهْتُهُ بِهِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: «إِنَّهُ كَانَ يُشْبِهُهُ»[1].

واتە: عاصیمی کوڕی کولەیب دەڵێ: باوکم بۆی گێڕامەوە، کە بیستوویەتی ئەبو هورەیرە ﷺ دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس منی بینی لە خەودا، ئەوە بە دڵنیایی منی بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ خۆی بێنێتە سەر وێنەی من»، باوکیشم گوتی: بۆ ئیبنو عەبباسم ﷺ باس کرد کە من بینیوومە: ئیدی بۆم باسی حەسەنی کوڕی عەلی کرد، گوتم: شێوەی بە حەسەن دەچوو، ئیبنو عەبباس ﷺ گوتی: بێگومان (زۆر ڕاستە ئەوەی بینیوتە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە)، چونکە «شێوەی لە حەسەن ﷺ دەچوو».

شەرح و ڕوونکردنەوە:

کە دەڵێ: «فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُنِي»، واتە: ناتوانێت هەرگیز خۆی بێنێتە سەر وێنەی پێغەمبەرو ﷺ خۆی بە ئەو بچوێنێت و، خۆی بەو سیفەتانە نیشاندات کە لە هاوەڵە بەڕێزەکانەوە زانراون و بە ئێمە گەیشتوە، کولەیبی باوکی عاصیم دەڵێ: «فَحَدَّثْتُ بِهِ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ، فَقُلْتُ: قَدْ رَأَيْتُهُ»، واتە: من لە خەونمدا پێغەمبەرم ﷺ بینیوە، «فَذَكَرْتُ الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ»، واتە: لە خەوەکەمدا حەسەنی کوڕی عەلی بە ئەو دەچوو، چونکە حەسەنی کوڕی عەلی بە پێغەمبەر ﷺ دەچوو، لە سیفەت و ئاکاردا.

(١) أخرجه أحمد: ٧١٦٨.

کە دەڵێ: «فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: إِنَّهُ كَانَ يُشْبِهُهُ»، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باسمان کرد هاوەڵان گرنگیان بەو بابەتە داوە، هەروەها گرنگیان بەوە داوە دڵنیابن ئایا ئەوەی لە خەودا بینیویانە پێغەمبەر ﷺ بووە یان نا؟ جا ئەگەر بەو جۆرە بیبینێ کەوا بە سیفەتی پێغەمبەر ﷺ چووە، ئەوە پێغەمبەری ﷺ بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شێوەی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر بەو سیفەتە زانراوو ناسراوانەش پێغەمبەری ﷺ نەبینی بوو، ئەوە لە خەودا پێغەمبەری ﷺ نەبینیوە هەرچەند بانگەشەی ئەوەش بکات.

٤١٠- عَنْ يَزِيدَ الْفَارِسِيِّ «وَكَانَ يَكْتُبُ الْمَصَاحِفَ» قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي الْمَنَامِ زَمَنَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: فَقُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ: إِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي النَّوْمِ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَتَشَبَّهَ بِي، فَمَنْ رَآنِي فِي النَّوْمِ فَقَدْ رَآنِي»، هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَنْعَتَ هَذَا الرَّجُلَ الَّذِي رَأَيْتَهُ فِي النَّوْمِ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَنْعَتُ لَكَ رَجُلًا بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ، جِسْمُهُ وَلَحْمُهُ أَسْمَرُ إِلَى الْبَيَاضِ، أَكْحَلُ الْعَيْنَيْنِ، حَسَنُ الضَّحِكِ، جَمِيلُ دَوَائِرِ الْوَجْهِ، مَلَأَتْ لِحْيَتُهُ مَا بَيْنَ هَذِهِ إِلَى هَذِهِ، قَدْ مَلَأَتْ نَحْرَهُ «قَالَ عَوْفٌ: وَلَا أَدْرِي مَا كَانَ مَعَ هَذَا النَّعْتِ» فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: لَوْ رَأَيْتَهُ فِي الْيَقَظَةِ مَا اسْتَطَعْتَ أَنْ تَنْعَتَهُ فَوْقَ هَذَا[1].

واتە: یەزیدی فارسی «کە موصحەفەکانی دەنووسی» دەڵێ: لە ڕۆژگاری ئیبنو عەبباسدا رضي الله عنهما لە خەونمدا پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، جا بە ئیبنو عەبباسم گوت: من پێغەمبەری خوام ﷺ لە خەودا بینیوە، جا ئیبنو عەبباسیش رضي الله عنهما گوتی: بە دڵنیایی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «شەیتان ناتوانێ خۆی بچوێنێ بە شێوەی من، بۆیە هەر کەس منی بینی لە خەودا، ئەوە بە دڵنیایی منی بینیوە»، ئایا دەتوانی وەسف و پێناسەی ئەو پیاوەم بۆ بکەی کە لە خەودا بینیووتە؟ (یەزیدیش) گوتی: بەڵێ، وەسفی ئەم پیاوەت بۆ دەکەم، مام ناوەنجی بوو، گۆشتی، یان پێستی بەلای سپیەتیدا بوو، چاوەکانی ڕەش بوون، دەمی بە پێکەنینێکی جوان بوو، شێوەو ڕووخساری

---

(١) قَالَ أَبُو عِيسَى: وَيَزِيدُ الفَارِسِيُّ هُوَ: يَزِيدُ بْنُ هُرْمُزَ، وَهُوَ أَقْدَمُ مِنْ يَزِيدَ الرَّقَاشِيِّ، وَرَوَى يَزِيدُ الفَارِسِيُّ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَحَادِيثَ، وَيَزِيدَ الرَّقَاشِيُّ لَمْ يُدْرِكِ ابْنَ عَبَّاسٍ، وَهُوَ يَزِيدُ بْنُ أَبَانَ الرَّقَاشِيُّ، وَهُوَ يَرْوِي عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ. وَيَزِيدُ الفَارِسِيُّ، وَيَزِيدُ الرَّقَاشِيُّ كِلَاهُمَا مِنْ أَهْلِ البَصْرَةِ، وَعَوْفُ بْنُ أَبِي جَمِيلَةَ هُوَ: عَوْفٌ الأَعْرَابِيُّ.

**أخرجه أحمد: ٣٤١٠، وفيه (حسن المضحك) بدل (حسن الضَّحك).**

زۆر جوان بوو، ڕیشەکەی ئێرە تا ئێرەی پڕ کردبوو، بە تەواوی گەردنی پڕکردبوو، عەوف (گێڕەرەوەی فەرموودەکە) دەڵێ: نازانم چ وەسفێکی دیکەی کردو، ئیدی ئیبنو عەبباس گوتی: (دڵنیابە) ئەگەر (بە چاوی سەرو) لە کاتی بە ئاگابوونیش تەماشات کردبایە، نەتدەتوانی لەوە زیاتر وەسف و پێناسەی بکەی.

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

ئیبنو عەبباس ﷺ کە دەڵێ: «هَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَنْعَتَ هَذَا الرَّجُلَ الَّذِي رَأَيْتَهُ فِي النَّوْمِ؟ قَالَ: نَعَمْ»، ویستویەتی لە وەسفەکەی ڕابمێنێ، جا ئەگەر باسکردنەکەی هاوڕێک بوو لەگەڵ ئەو سیفەتانەی کە لە پێغەمبەر ﷺ زانراون و ناسراون، ئەوە بێگومان پێغەمبەری ﷺ بینیوە، چونکە شەیتان ناتوانێ خۆی بە پێغەمبەر ﷺ بچوێنێ، خۆ ئەگەر بە شێوەیەکی تر، کەسێکی دیکەی بینیبێ، ئەوە دیارە کە پێغەمبەری ﷺ لە خەودا نەبینیوە، بۆیە گوتی: «أَنْعَتُ لَكَ رَجُلاً بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ»، واتە: مامناوەند بوو، نە زۆر درێژ بووە، کە بەرزییەکەی ناشیرین بێ و، نە کورتە باڵاش بوو، «جِسْمُهُ وَلَحْمُهُ أَسْمَرُ إِلَى الْبَيَاضِ»، واتە: سپیەکی تێر نەبوو، کە ڕەنگی دیکەی لەگەڵدا نەبێ، بەڵکو سوورو سپی بوو، «أَكْحَلُ الْعَيْنَيْنِ»، واتە: پێڵوەکانی کەمێک ڕەش بوون، وەکو ئەوە وابوو کەوا کلی لێدابن، بەڵام کلیشی لێنەدابوون، «حَسَنُ الضَّحِكِ، جَمِيلُ دَوَائِرِ الْوَجْهِ، مَلَأَتْ لِحْيَتُهُ مَا بَيْنَ هَذِهِ إِلَى هَذِهِ»، واتە: نێوانی گوێی ڕاستی تاکو گوێی چەپی، «قَدْ مَلَأَتْ نَحْرَهُ»، لەبەر پڕی ڕیشی، چونکە ڕیشی پێغەمبەر ﷺ پڕ بوو، بە جۆرێک کەوا هاوەڵان خوێندنەوەی قورئانی پێغەمبەریان ﷺ لەو نوێژانەدا کە بەبێ دەنگ دەخوێندرێن، بە جوڵانی ڕیشی هەستیان پێ دەکرد، لە کاتێکدا کە ئەوان لە دوای ئەو ڕیزیان دەبەست.

کە دەڵێ: «قَالَ عَوْفٌ»، واتە: ئیبنو ئەبو جەمیلە ئەو کەسەی کە لە یەزید فەرموودەکە دەگێڕێتەوە، «وَلَا أَدْرِي مَا كَانَ مَعَ هَذَا النَّعْتِ»، واتە: سیفەتەکانیتر کە باسی کردن، لەوانەیە تەنها ئەوەندەی لێی لەبەر بووبێ.

«فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: لَوْ رَأَيْتَهُ فِي الْيَقَظَةِ مَا اسْتَطَعْتَ أَنْ تَنْعَتَهُ فَوْقَ هَذَا»، واتە: ئەو شێوەی کەوا لە خەودا بینیوتەو باسی دەکەی، ئەوە ئەو پیاوە سیفەتەکانی لەگەڵ

پێغەمبەر ﷺ تێکدەکاتەوە بە تەواوی، بە جۆرێک ئەگەر بە چاوی سەریش بتبینیبا نەتدەتوانی لەوە زیاترو ڕوونتر وەسفی بکەی، «قَالَ أَبُو عِيسَى: وَيَزِيدُ الْفَارِسِيُّ»، خاوەنی خەونەکەیە، «هُوَ: يَزِيدُ بْنُ هُرْمُزَ»، هەردووکیانی بە یەک کەس داناوە، بەڵام زانایان هۆشداریان داوە کەوا یەزیدی فارسیی و یەزیدی کوڕی هورموز یەک کەس نین، لە کتێبی ئیبنو ئەبو حاتەم (الجرح والتعدیل)دا[١] هاتوە کە گوتوویەتی: گوێم لە باوکم بوو، دەیگوت: یەزیدی کوڕی هورموز یەزیدی فارسیی نیەو جیاوازەو یەکێکی ترە.

٤١١- حَدَّثَنَا أَبُو دَاوُدَ سُلَيْمَانُ بْنُ سَلْمٍ الْبَلْخِيُّ، قَالَ: حَدَّثَنَا النَّضْرُ بْنُ شُمَيْلٍ قَالَ: قَالَ عَوْفٌ الْأَعْرَابِيُّ: «أَنَا أَكْبَرُ مِنْ قَتَادَةَ».

واتە: ئەبو داوود سولەیمانی کوڕی سەلمی بەلخیی بۆی گێڕاینەوە، گوتی: نەزری کوڕی شومەیل گوتی: عەوفی ئەعرابی گوتوویەتی: «من لە قەتادە گەورەترم». (لە ڕووی تەمەنەوە).

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

لێرەدا عەونی کوڕی ئەبو جەمیلەی ئەعرابی دەناسێنێ کە لە گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێشووتردا هاتوەو، لە یەزیدی فارسی دەگێڕێتەوە، باسی ئەوە دەکات کە لە قەتادە گەورەتر بووە.

٤١٢- عَن أَبُو قَتَادَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَآنِي -يَعْنِي فِي النَّوْمِ- فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ»[٢].

واتە: ئەبو قەتادە ﷺ: دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەس منی بینی -واتە: لە خەودا- ئەوە بە ڕاستی منی بینیوە».

### شەرح و ڕوونکردنەوە:

ماناکەی وەکو فەرموودەکانی پێشووترە.

---

(١) ٢٩٤/٩.

(٢) أخرجه البخاري: ٦٩٩٦، ومسلم: ٢٢٦٧.




٤١٣- عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَخَيَّلُ بِي» وَقَالَ: «وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەس منی بینی لە خەودا، ئەوە بێگومان منی بینیوە، چونکە بە دڵنیایی شەیتان ناتوانێ بێتە سەر شێوەی من و خۆی بچوێنێ بە من»، هەروەها (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «خەونی مرۆڤی بڕوادار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

کە دەڵێ: «فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَخَيَّلُ بِي»، واتە: ناتوانێ خۆی بە من بچوێنێ، یان بێتە سەر شێوەی من، یان خۆی وەکو من لێ بکات، هەموویان یەک مانایان هەیە.

کە دەڵێ: «وَرُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ»، لەو فەرموودەیەدا گەورەیی ئەو خەونانە دەردەکەوێ کە خوای گەورە ڕێزی پێ لە بەندە ئیماندارەکەی دەگرێ، وە بەشێکن لە موژدەی خۆش.

٤١٤- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الْمُبَارَكِ ﷺ: «إِذَا ابْتُلِيتَ بِالْقَضَاءِ فَعَلَيْكَ بِالْأَثَرِ».

واتە: موحەممەدی کوڕی عەلی دەڵێ: لە باوکم بیست دەیگوت: عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک ﷺ گوتوویەتی: «هەر کات تووشی ئەوە هاتی دادوەری لە نێوان خەڵک بکەیت (بۆ کێشەیەک، یان هەر بابەتێکی دیکە) ئەوە کار بکە بەو فەرموودانە (کە لە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانەوە گێڕدراونەوە)».

**شەرح و ڕوونکردنەوە:**

واتە: ئەگەر دادوەریەکت هاتەلا، ئەوە بگەڕێ بە دوای شتێک کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕدرابێتەوە، هەروەها لە هاوەڵە بەڕێزەکان گێڕدرابێتەوە بە ڕێگایەکی دروست و دوور لە هەڵە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٩٩٤.



دانەر ﷫، لێرەدا ویستویەتی گرنگی پێگەی ئەو شتانە باس بکات کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون و، گرنگی ڕێگای نەقڵ کردنەکەش، هەروەها ئەوەش کە واجب و پێویستە کاتێک مسوڵمان دەیەوێ دینەکەی و بیرو باوەڕەکەی و پەرستنەکەی سەلامەت بێت، ئەوە پا پشت بەو گێڕانەوانە ببەستێ کە لە پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی بە ئێمە گەیشتوون، ئەو دینەی پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی هەمووی بۆ ئێمە نەقڵ کراوەو لە کتێبە باوەڕپێکراوەکاندا هەمووی تۆمار کراوە.

٤١٥- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ ﷫ قَالَ: «هَذَا الْحَدِيثُ دِينٌ، فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ»[1].

واتە: ئیبنو سیرین ﷫ لێی گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: «ئەم فەرموودانەی (پێغەمبەر ﷺ) ئایینن، کەواتە: سەرنج بدەن و تەماشا بکەن ئایا ئایینەکەتان لە کێ وەردەگرن».

## شەرح و ڕوونکردنەوە:

دانەر ﷫، بەو قسەیەی موحەممەدی کوڕی سیرین کۆتایی بە کتێبەکەی هێناوە کە گوتوویەتی: «هَذَا الْحَدِيثُ دِينٌ»، واتە: ئەو فەرموودانەی کەوا بەرزدەکرێنەوەو پاڵدەدرێنە لای پێغەمبەر ﷺ دینن، بۆیە: «فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ».

بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک ﷫ دەڵێ: ئیسنادو فەرموودە گێڕانەوە بەشێکە لە دین، خۆ ئەگەر ئیسناد نەبووایە ئەوە هەر کەسەو چی پێ خۆش بووایە دەیگوت (بە زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ)[2]، بۆیە هەر کەسێک فەرموودە دەگێڕێتەوە مەرج نیە لێی وەربگیرێ، هەتا دڵنیا دەبین مەرجەکانی لێوەرگرتنی تەواون کە (عدالة وضبط)ن.

**الإسناد:** مەبەست ئەو زنجیرە کەسەیە کەوا فەرموودەکە لە یەکتر وەردەگرن تاکو دەگاتە خاوەنی فەرموودەکە.

**العدالة:** واتە: ئەو کەسەی فەرموودە دەگێڕێتەوە دەبێ ئەوپەڕی دادپەروەرو خاوەن ڕەوشتی بەرز بێ و پێچەوانەی دادپەروەری و ڕەوشت بەرزی مامەڵەی نەکردبێ.

**الضبط:** واتە: فەرموودە چۆن وەردەگرێ، ڕێک وەکو خۆی بیگێڕێتەوەو هەڵەی تێدا

---

(١) رواه مسلم في المقدّمة: ٢٦.

(٢) رواه مسلم في المقدّمة: ٣٢.




نەکات و چۆنی گوێ لێیە ئاوا لەبەری بکات و بیگێڕێتەوە، هەر لەبەر ئەوەیشە کەوا زانایان زۆر گرنگیان بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ داوە، زانایانی پێشوو هەم زانایانی سەردەم، بۆیە هاتوون کتێبیان نوسیوە تایبەت بە فەرموودەی صەحیح و دروست، هەروەها کتێبی تایبەت بە فەرموودەی لاوازو کتێبی تایبەت بەو قسانەی کەوا بە درۆ دراونە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، کە ئەو قسە درۆیانە گێڕانەوەشیان دروست نیە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەوا خەڵکیان لێ ئاگادار بکرێت کەوا درۆو هەڵبەستراون.

لە کۆتاییدا:

دانەر ﷺ، کە هاتوە بەو دوو وتەیەی زانایانی پێشوو کۆتایی بە کتێبەکەی هێناوە، ئەوە بۆ ئاگادارکردنەوەیە کەوا ژیان و ئاکارو ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ، یان هەر شتێکی دیکەی پەیوەندیدار بە دینەوە پێویستەو فەرزە کەوا کاتێک شەن و کەوی دەکەی، یان باسی دەکەی، ئەوە پشت بە فەرموودەو وتەی ڕاست و دروست ببەستیت و ئەو فەرموودانە وەربگری کەوا سەلمێنراون کە لە پێغەمبەر ﷺ، یان لە هاوەڵە بەڕێزەکانی بیستراون کە بەرز کراونەتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، یان وەستێنراون لەسەر هاوەڵان ﷺ.



## پایان، کۆتایی، دوا وتە:

لە دوای ئەو گەشتە پڕ چێژو بە سوودەدا، لە دوای هەڵوەستە کردن و تێڕامان لە سوودەکانی زانینی ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکانی باشترین دروستکراوی خوای گەورە، لەگەڵ تێگەیشتن لە ژیان و ژیاننامەی گەورەی یەکەمین و کۆتایی مرۆڤایەتی، کە کامڵترین و تەواوترین بەندەی خوای بەرز بوو بۆ جێبەجێکردنی پەرستش بە کامڵترین شێواز، وە پاکترینی بەندەکانی خوا بوو لە ڕووی مێژوو و ژیانی دونیایدا، وە لە هەمووان ڕەوشت بەرزترو دەروون پاکترو، مامەڵە جوانتر بوو، ئەو کەسەی کە لە هەموو بەندەکان باشترو چاکتر خوای دەناسی و، بەوپەڕی ڕێک و پێکی عیبادەتی خوای گەورەی بەجێ دەگەیاند، بێگومان کەسێک ئەوانەو زیاتریش لەوانە سیفەتی بن و لە بەرزترین ڕەوشت بەرزیدابێت، ئەوە هەموو کەسێک حەز دەکات و پێی خۆشە کە بە خزمەتی خاوەن ئەو ڕەوشتە جوانانە بگات و ببینێ، بە تایبەت لە جوانترین سیفەتەکانیدا لە شکڵ و شێوەی جوانی و ڕووی گەشی و ڕووخساری پڕشنگداری و سەرجەم ئاکارو تایبەتمەندییە بەرزەکانی ﷺ، لە (صحيح مسلم)دا[1] هاتوە کە ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوەکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مِنْ أَشَدِّ أُمَّتِي لِي حُبًّا ناسٌ يَكُونونَ مِنْ بَعْدِي يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ رَآنِي بِأَهْلِهِ وَمَالِهِ}. واتە: خۆشەویستترین کەس بۆ من کەسانێکن کەوا لە دوای منەوە دێن و هەر یەکێکیان حەز دەکات کەوا ماڵ و منداڵی و خێزانی بنێتە پێناوی بینینی من. واتە: ماڵ و منداڵی پێشکەش دەکات لە پێناو بینینی پێغەمبەر ﷺ، ئەوەش لەبەر ئەو حەزو ئارەزووەی کە هەیەتی و سوورو پێداگرە لەسەر بینینی پێغەمبەر ﷺ.

گومانیشی تێدانیە کەوا مرۆڤی مسوڵمان پێویستە لەسەری هەمیشە ئەو حەزو ئارەزووەی هەبێت بۆ بینینی پێغەمبەر ﷺ، هەروەها بە خزمەت گەیشتن و لەگەڵ بوونی لە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتدا.

وە نابێ ئەوەش تەنها خۆزگە خواستن بێ، یان ڕۆچوون بێ لە شتگەلی بەتاڵ و بێ بنەمادا، وەک هەندێک لە خاوەن ڕێبازەکان تووشی بوونە، ئەوانەی کەوا بانگەشەی

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٨٣٢.

بێ سەروبەرو بێ بنەما دەکەن، کە بەرەو بیدعەو ئەفسانەو سەرلێشێواویان دەبات.

بەڵکو فەرزەو پێویستە کەوا ئەو خۆشویستن و حەزی بینینی و بە خزمەت گەیشتنە ببێتە پاڵنەرێک بۆ ئەوەی زیاتر شوێن پێ و، شوێن ڕێبازی پاکی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت و، خۆی بە ڕەوشتی ئەو برازێنێتەوەو باسی بکات و فەرموودەکانی بخوێنێتەوەو سەڵەواتی لەسەر لێبدات، هەر لەبەر ئەوەشە کاتێک یەکێک لە هاوەڵان گوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ داوات لێدەکەم کە لە بەهەشتدا هاوڕێت بم، ئەویش فەرمووی: {فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ، بِكَثْرَةِ السُّجُودِ}[1]. واتە: پابەندی فەرمانبەرداریی خوای گەورە بەو پەیوەست بە بەزۆر کڕنووش بردن بۆی، کەواتە: شتەکە تەنها خۆزگە یان خەیاڵ نیەو، ئیمان بە خۆزگە خواستن و خۆڕازاندنەوەو بە قسە نابێ، بەڵکو ئیمان ئەوەیە کە دڵ ئۆقرەی لەسەر دەگرێت و بە کردەوەش دەسەلمێنرێ.

(إبن القيم) ﷺ لە کتێبەکەیدا (جلاء الأفهام)[2] دەڵێ: (ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی زیاتر باسی خۆشەویستەکەی بکات و لە ناو دڵیدا ئامادەی بکات و، جوانی و چاکەکانی لە زیهنیدا ئامادە بکات و واتای جوان بە خۆشەویستیەکەی بدات، ئەوە خۆشەویستیەکەی دوو بەرانبەرو چەند بەرانبەر دەبێت، وە حەزی بۆ بینینی زیاتر دەبێت، وە خۆشەویستیەکەی دەست بەسەر تەواوی دڵیدا دەگرێت، خۆ ئەگەر پشتی لە باسکردنی جوانی و باشیەکانی کرد لە دڵەوە، ئەوە خۆشەویستی لە دڵدا کەم دەبێت، هیچ شتێک بۆ کەسێک کە خۆشتدەوێ لە بینینی زیاتر ئۆقرەیی و ڕۆشنایيت پێ نادات، هیچ شتێک بە ئەندازەی لەبەرچاوگرتنی چاکەو جوانیەکانی ئۆقرە بە دڵ نادات، بۆیە هەر کات دڵ بەو شتانە بەهێزکرا، ئەوە زمانیش سەناو ستایشی دەکات و باسی چاکەکانی دەکات، بۆیە زیادو کەمی ئەو بابەتە بەو خۆشەویستیەی کەوا لە دڵدایە).

یادکردنی پێغەمبەر ﷺ بە باسکردنی سیفەت و ئاکارو ڕەوشتە بەرزو بەڕێزەکانی دەبێت، هەروەها بە باسکردنی سیفەتە پەسندو سوپاسکراوەکانی و ڕەوشت و ئاداب

---

(١) أخرجه مسلم: ٤٨٩ من حديث ربيعة بن كعب ﷺ.

(٢) ص ٣٠٥.

و ڕێبازو سوننەت و ژیاننامەکەی، بۆ ئەوەی دڵەکان خۆشەویستیان بۆ ئەو زاتە مەزنە زیاد بێ و، پێداگری بەندەکان بۆ شوێنکەوتنی ڕێبازو بەرنامەکەی زیاتر بێ، وە لەسەر بەندە پێویستە کە لەو ڕووەشەوە زۆر وریا بێ و، سوور بێ لەسەر ئەوەی کەوا دەست بگرێ بەو فەرموودە صەحیحانەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوون و سەلمێنراوە کە فەرموودەی ئەون، وە پێویستە مرۆڤ پابەندی ڕێبازی هاوەڵانی خاوەن قەدرو هاوسەنگ و مامناوەندگیرو چاکەخواز بێ، ئەوەی کە لە هاوەڵان پێیدەگات ئەوە وەربگرێ و، خۆی لە زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی بە دوور بگرێ، بەڵکو لەو بوارەدا نێوەندگیرو هاوسەنگ بێ.

چونکە لە ڕاستیدا ئەو بابەتە زۆر ترسناکە بۆ بەرەو سەرلێشێوان، بۆیە ئاگاداربوون و سڵەمینەوە پێویستە لەو دوو ڕووەوە ڕەچاو بکرێ:

**یەکەم**: لە ڕووی کەمتەرخەمی و ساردو سڕی، نابێ مرۆڤ لە بەرانبەر مافی پێغەمبەردا ﷺ کەمتەرخەم و ساردو سڕ بێ، چونکە هەموو کەمتەرخەمیەک بێزراوو ناپەسندە، بۆ ئەو کەمتەرخەمیە چەند جۆرو شێوازێک هەیە:

یەکێک لە نیشانەکانی کەمتەرخەمی بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ لاوازی خۆشەویستی نێو دڵە بۆ پێغەمبەرو ﷺ ڕێبازەکەی، هەروەها پێشخستنی خۆشەویستی دونیایی هیچ و، بێ بەرهەم و هەواو ئارەزوو و، ڕابواردنە کاتییەکان بەسەر خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ، بێگومان پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ}[1]. واتە: (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، هەر یەکێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نیە هەتاکو منی لە باوکی و لە منداڵەکانی خۆشتر نەوێ).

لە (صحيح البخاري)دا[2] هاتوە: {حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ}. واتە: (هەتاکو منت لە خۆت خۆشتر نەوێ)، بۆ دەرخستنی ئەو لاوازی ئیمانە پێویستە مرۆڤ خۆی بەو ئایەتە هەڵسەنگێنێ کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ آل عمران. (-ئەی موحەممەد ﷺ -

---

(١) أخرجه البخاري: ١٤ و ١٥، ومسلم: ٤٤.

(٢) برقم: ٦٦٣٢.

بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ، کەواتە دوای من بکەون تا خواش ئێوەی خۆشبوێ، وە لە گوناهەکانتان خۆشببێ، وە خوا لێخۆشبووی میهرەبانە).

هەروەها لە نیشانەکانی کەمتەرخەمی بریتیە لە پشت کردن لە سوننەتە بەرزو بەرێزەکانی و، ڕێبازە ڕوون و ڕووناکەکەی و پەیامە بەهێزەکەی، هەروەها ڕوو وەرگێڕانە لەوانەی سەرەوە بە خۆسەرقاڵ کردن بە ڕاو بۆچوونە فشۆڵ و بەتاڵ و بێ بنەماکان و، هەواو ئارەزووە وێران و وێرانکارەکان و وێنەی ئەوانەش، کە خەڵکی لەسەر ڕێبازی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ لادەدەن.

هەروەها لە نیشانەکانی کەمتەرخەمی و ساردو سڕی، بە گەورە نەگرتن و ڕێز نەگرتن لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، بە جۆرێک فەرموودە جوان و نازدارەکانی پێغەمبەری ﷺ پێدەگات لە هەندێک کۆڕو کۆبوونەوە، بەڵام هیچ سەنگ و قورسایی و ڕێزیان بۆ دانانێ، سەریان بۆ بەرز ناکاتەوەو پێگەو شوێنیان نازانێ، بەڵکو هەر وەک قسەی خەڵکیتر بەلایدا تێپەڕ دەبێ، نەک هەر ئەوە! بەڵکو بە گوتەی: (بۆ، چۆن، بەڵام) بە شێوەی دیکەش زۆر جار ڕەخنەشیان لێدەگرێ، کەواتە: کوا بە گەورەو بەرزدانانی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە ﷺ، ناسین و پێناسەی پێغەمبەر ﷺ لە کوێدایە لە کاتێکدا کە فەرمایشتەکانی وەک قسەی خەڵکیتر ڕەچاو بکرێن؟! لە کاتێکدا کە خوای باڵادەست فەرموویەتی: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم. (وە لە هەواو هەوەسەوە قسە ناکات -کە قورئان دەخوێنێ- ﴿٣﴾ هەرچی دەیڵێ -قورئانەو- نیگا دەکرێ بۆی ﴿٤﴾).

یەکێکیتر لە کەمتەرخەمیەکان ئەوەیە: کەوا پشت بکرێ لە ژیاننامەی پڕ خێرو فەڕی پێغەمبەر ﷺ، وە پشت کردن لە هەواڵ و فەرموودە بەرزو بەڕێزەکانی، بێگومان ژیانی پێغەمبەر ﷺ پاکترین ژیان بووە بە ڕەهایی لە هەموو ڕوویەکەوە، چونکە ژیانی گەورەترین و بەڕێزترین و کامڵترین بەندەی خوایە، ژیاننامەی گەورەی هەموو وەچەی ئادەمە، چەندین کەس دەبینیت کەوا پشتیان لەو ژیان و مێژوو و فەرموودە بەرزانە کردوە، وە خۆی سەرقاڵ کردوە بە ژیان و ڕێبازی کەسانێکی بێ بەهاو بێ کێش، کە هیچ سەنگ و قورساییەکیان نیە بۆ خزمەت و سەرخستنی ئەو ئۆممەتە.



بەڵکو هەندێک کەس خۆیان سەرقاڵ کردوە بە ژیان و گوزەران و ڕێبازی کەسانێک کەوا هیچ بەهایەک لە ژیانیاندا نیە لەلای خوای گەورە، ئیتر کات و ساتی خۆی بەسەر دەبات و بەفیڕۆی دەدات لە شتێکدا کە هیچ نرخێکی ئەوتۆی نیە بۆ کات پێدان، لە کاتێکدا کە زۆر بێ ئاگایەو پشتی کردوە لە ڕێبازو ژیانی گەورەی هەموو وەچەی ئادەم کە پێغەمبەرمانە ﷺ کە بێگومان ئەو کارە ئەوپەڕی کەمتەرخەمیە دەرهەقی پێغەمبەری خوا ﷺ.

یەکێکیتر لە شتە هەرە ناشیرین و قێزەونەکان ئەوەیە کە کەسانێک بەرەو بیدعەو گومڕایی و داهێنان لە ئاییندا دەڕۆن و بەرگریشی لێدەکەن و، بەڵگەی ناڕاستیشی بۆ دێننەوە، لە بەرامبەریشدا پشت دەکەنە ئەو شەریعەتە ڕێک و تەواوەی کەوا پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی، کە بێگومان لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە صەحیحی هاتوە کەوا فەرموویەتی: {فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي}[1]. واتە: (هەر کەسێک لەو ڕێبازو شەریعەتی من هێناومە لابدات ئەوە لەسەر ڕێبازی من نیە)، وە دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ}[2]. واتە: (هەر کەسێک شتێک، کارێک، کردەوەیەک بکات کە بنچینەیەکی لە ئاییندا نەبێ، ئەوە ڕەتکراوەیەو بەسەر خاوەنەکەیدا دەدرێتەوە)، هەروەها کاتێک پێغەمبەر ﷺ وتاری دەفەرموو لە ڕۆژی هەینیدا دەیفەرموو: {أَمَّا بَعْدُ؛ لإِنَّ خَيْرَ الحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَخَيْرَ الهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ، وَشَرَّ الأُمُورِ مُحَدَّثَاتُهَا، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ}[3]. واتە: (باشترین و پڕ خێرترین فەرمایشت قورئانە، وە پڕ فەڕترین ڕێباز ڕێبازەکەی موحەممەدی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە خراپترین کارەکان شتە داهێنراوەکانن لە ئاییندا، بێگومان هەموو داهێنانێک لە ئاییندا گومڕاییە).

یەکێکیتر لە کەمتەرخەمیەکانمان بەرامبەر پێغەمبەرمان ﷺ کەمی سەڵاوات دانە لەسەر پێغەمبەر ﷺ، بە تایبەت ئەو کاتانەی کە ناوی پێغەمبەر ﷺ دەبرێ، لە (موسنەدی پێشەوا ئەحمەد)[4]دا بە صەحیحی هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) أخرجه البخاري: ٥٠٦٣، ومسلم: ١٤٠١.

(٢) أخرجه مسلم: ١٧١٨.

(٣) أخرجه مسلم: ٨٦٧.

(٤) برقم: ١٧٣٦.



{البَخِيلُ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ}. واتە: (بێگومان ڕەزیل و چرووک ئەو کەسەیە کە ناوی من دەهێنرێت لەلای، بەڵام سەڵەواتم لەسەر لێنادات)!

اللهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيم، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيم، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيم، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيم؛ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ.

بۆ پشتگیری ئەوەی گوتمان ئەو ئایەتە بەسە کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ الأحزاب. (بەڕاستی خواو فریشتەکانی صەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ئێوەش صەڵاوات و سەلامی زۆری لەسەر بدەن). صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ.

هەروەها نموونەی کەمتەرخەمی دەرهەقی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئەوەیە کە لە شان و ڕێزو شکۆی هاوەڵانی، هەروەها لە شوێنکەوتووە سەرڕاستەکانی و پێشەوایانی ڕاستی و هیدایەت و هەڵگرانی سوننەت کەم بکرێتەوە، هەروەها لە قەدرو ڕێزی ئەوانە کەم بکرێتەوە کەوا پشتیوانی لە دینی خوای گەورە دەکەن، چونکە بەڕاستی بە کەم سەیرکردن و بێ ڕێز تەماشاکردن و کەمکردنەوەی ڕێزو شکۆ بۆ ئەوانە بریتیە لە کەمتەرخەمی و نەدانی مافی گەورەیی و ڕێزی پێغەمبەر ﷺ.

داواکارین لە خوای گەورە کە دڵی هەموومان بە خۆشەویستی پێغەمبەرەکەی ﷺ ئاوەدان بکاتەوە، هەروەها ئاوەدانی بکاتەوە بە ناسین و زانینی قەدرو ڕێزی ئەو پێغەمبەرە گەورەیە ﷺو، شوێن و پێگەی بەرزو بەڕێزیان، وە داواکارین کەوا خوای گەورە پەنامان بدات لەوەی کە دەرهەقی پێغەمبەر ﷺ تووشی کەمتەرخەمی ببین لە هەر ڕوویەکەوە.

**دووەم**: لە ڕووی تێپەڕاندن و زێدەڕۆییەوە:

نابێت زێدەڕۆیی بکرێ لە هەقی پێغەمبەر ﷺ، بە جۆرێک هەندێک سیفەتی بدرێتە پاڵ، کە تەنها شایستەیە بە خوای گەورە، نابێ لە وەسف و پیاهەڵداندا سنوورەکانی مافی خوای گەورە ببەزێنرێن، چونکە بێگومان پێغەمبەر ﷺ بەو زێدەڕۆییە ڕازی نیە، زێدەڕۆیی و پیاهەڵدانی زیاد لە هەقی خۆی هەمووی ناپەسندو ڕەتکراوەیە،

پێغەمبەر ﷺ لە زۆر فەرموودەدا ئاماژەی بەوە کردووەو قەدەغەی کردوە، فەرموویەتی: {لا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَى ابْنُ مَرْيَمَ؛ فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولُوا: عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ}. واتە: (لە ستایش و پیاهەڵدانمدا زێدەڕۆیی مەکەن وەک نەصرانیەکان، چونکە بێگومان من تەنها بەندەو پێغەمبەری خوام). وە فەرموویەتی: {إِيَّاكُمْ وَالغُلُوَّ فِي الدِّينِ؛ فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الغُلُوُّ فِي الدِّينِ}[1] واتە: (خۆتان لە زێدەڕۆییی کردن لە دیندا بپارێزن، چونکە بێگومان زێدەڕۆیی بووە هۆی لەناوچوونی ئەوانەی پێش ئێوە). هەروەها کاتێک گوێی لێبوو کە کەسانێک دەڵێن: تۆ گەورەمانی کوڕی گەورەمانی، فەرمووی: {لا يَسْتَجْرِيَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ}[2]. واتە: شەیتان بەرەو ئەوەی خۆی ئەیەوێ نەتانبات.

هەر لەبەر ئەوەشە کەوا پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ڕێگای بەو هۆکارانە دەگرت کەوا سەر دەکێشن بەرەو زێدەڕۆیی و، سنوورەکانی دینی دەپاراست، خۆ هەر کاتێک زێدەڕۆیی، یان سنوور بەزاندنێکی ببیستبایە لە پیاهەڵدانی ئەوە قەدەغەی دەکردو بە دەنگ دەهات، بۆیە کاتێک گوێبیستی پیاوێک بوو کە دەیگوت: ئەوەی خوا بیەوێت و تۆ بتەوێ، پێغەمبەر ﷺ تووڕەیی نیشانداو فەرمووی: {بَلْ مَا شَاءَ اللَّهُ وَحْدَهُ}[3]. واتە: بەڵکو تەنها ئەوەیان ڕاستە کە تەنها خوا دەیەوێت و پێیخۆشە، وە گوێبیستی ژنێک بوو کە دەیگوت: پێغەمبەرێکمان لە ناودایە کەوا دەزانێ سبەینێ چی ڕوودەدات، بۆیە تووڕەبوو، فەرمووی: {مَا يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللَّهُ}[4]. واتە: تەنها خوا دەزانێ بەیانی چی دەبێت.

بۆیە زێدەڕۆیی کردن لە ستایشکردنیداو ڕۆچوون لە پیاهەڵدانیدا، کارێکی قەدەغەکراوە، نەک هەر ئەوە بەڵکو هەر کەسێک لەو بوارەدا ڕۆبچێت و سنووربەزێنی بکات کارەکەی ڕەتدەکرێتەوەو بەسەریدا دەشکێتەوە، وە تاوانی سەرپێچی کردنی دەکەوێتە سەر، چونکە مەدح و ستایش کردن هەندێک جار لە ڕێگای دروستەوەیە، بەڵام کە زێدەڕۆیی کرد، ئەوە شەیتان بەرەو مەدحکردنی نادروست و بەرەو ڕۆچوونی دەبات و لە سنوور لادەدات، هەرچەندە جاری وا هەیە

---

(١) أخرجه البخاري: ٣٤٤٥.

(٢) أخرجه أبو داود: ٤٨٠٦.

(٣) أخرجه أحمد في المسند: ١٨٣٩.

(٤) أخرجه البخاري: ٤٠٠١، وابن ماجه ١٨٩٧ من حديث الرُّبيِّع بنت مُعَوِّذ ﵂، واللَّفظ لابن ماجه.

مرۆڤ مەبەستی خراپە نیەو، دەیەوێ ئەو مەدحکردنە پاڵنەرێک بێ بۆ کاری خێر، بەڵام مەرج نیە هەر کەس ویستی کارێکی خێر بکات بە دروستی پێی بگات ئەگەر ڕێگاکەی نەزانێ، وە مەرجیش نیە هەموو جارێک کە کەسێک دەیەوێت کارێکی وا بکات کە بینای خۆشەویستی پێ بکات ئامانجی پێکابێت و سەرکەوتوو بێت، مادام جڵەوی خۆشەویستیەکەی بە جڵەوی شەرعی توند نەکات.

هەندێک کەس بە کردەیی لەو لادانە گلاون و تێکەوتوون، هەندێ کەس هاتوون لە پیاهەڵداندا هەندێک سیفەتیان داوەتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ کە تەنها بۆ خوای گەورە دەبن و تەنها شایستەی خوای پەروەردگارن، لە ڕاستیدا جارێکیان پیاهەڵدانی یەکێکم خوێندەوە کە بەو جۆرە دەست پێدەکات و ستایشی پێغەمبەر ﷺ دەکات:

هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ مُحَمَّدٌ هُوَ الظَّاهِرُ وَالبَاطِنُ مُحَمَّدٌ

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسەی ئەو پیاهەڵدانەی نووسیوە، ئەگەر سەیری سوننەتی پێغەمبەری ﷺ کردبا، ئەوە دەیبینی کە لە سوننەتدا هاتوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە هەر کات پێغەمبەر ﷺ چووبایە سەر جێگاکەی دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْء، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْء، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْء، وَأَنْتَ البَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْء، إِقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الفَقْرِ}[1]. واتە: ئەو سیفەتانە خودی پێغەمبەر ﷺ تەنها بۆ خوای گەورە بڕیاری داون و تایبەتن بە سیفەتی خوای گەورە.

یەکێکیتر لە پیاهەڵدانەکەیدا دووچاری ڕۆچوون و زێدەڕۆیی بووەو دەڵێ:

يَا أَكْرَمَ الْخَلْقِ مَالِي مَنْ أَلُوذُ بِهِ سِوَاكَ عِنْدَ حُلُولِ الحَادِثِ العَمَمِ
وَإِنَّ مِنْ جُودِكَ الدُّنْيَا وَضَرَّتْهَا وَمِنْ عُلُوْمِكَ عِلْمَ اللَّوحِ وَالقَلَمِ

ئەوەش بە ئاشکرا دیارە کە هەڵەو کەموکووڕی و زێدەڕۆیی زۆری تێدایەو قەدەغە کراوە بە دەقی فەرموودەی دروست، بۆیە ئەگەر بیگوتبایە:

يَا خَالِقَ الْخَلْقِ مَالِي مَنْ أَلُوذُ بِهِ سِوَاكَ عِنْدَ حُلُولِ الحَادِثِ العَمَمِ
وَإِنَّ مِنْ جُودِكَ الدُّنْيَا وَضَرَّتْهَا وَمِنْ عُلُوْمِكَ عِلْمَ اللَّوحِ وَالقَلَمِ

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٧١٣.



ئەگەر بەو جۆرە بیکردبایە موناجات و ستایشی پەروەردگاری پێکردبایە، ئەوە هاوڕێک دەبوو لەگەڵ بیروباوەڕی ئیمانی تێرو تەواو.

کەواتە بە هیچ جۆرێک پێویست نیە سیفەتەکانی خوای گەورە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ، دروست نیە بە هیچ شێوەیەک ئەو سیفەتانەی تایبەتن بە خوای گەورە بدرێتە پاڵ هیچ کەسێک، جا هەر کەسێک بێ هەر دروست نیە، خودی پێغەمبەر ﷺ بەو کارە ڕازی نیەو ڕەتی دەکاتەوەو، بە توندترین شێوە لەسەری تووڕە دەبێت، لە ژیانیشیدا هەر کەسێک ئەو کارەی کردبا بە تووندترین شێوە تووڕە دەبوو، بۆیە پێویستە لەسەر مسوڵمان کەوا عاتیفەو سۆزی سەرکەشی و خۆشەویستیەکەی بەرەو ستایشێکی نەبات کەوا تووشی هەڵەو تاوانی بکات بەوەی کەوا سیفەتی خوای گەورە بداتە پاڵ پێغەمبەرەکەی ﷺ.

پاشان ئەوانەی تووشی ئەو سنوور بەزاندن و لادانە بوون لۆمەی ئەوانە دەکەن کە بە کارەکەیان ڕازی نین و هاوبەشییان ناکەن، وە بە گومانی خۆیان پێیان وایە کە ئەو کەسانە کەمتەرخەمن دەرهەق بە پێغەمبەر ﷺ.

لە ڕاستیدا هەر کەسێک کە خوای گەورە دڵ و دەروونی ڕووناک بکاتەوە ئەوە هەمیشە کەسێکی هاوسەنگ و نێوەندگیر دەبێ لەو بابەتەدا:

خَيْرُ الأُمُورِ أَوْسَاطُهَا لا تَفْرِيطُهَا وَلا إِفْرَاطُهَا

واتە: باشترینی کارەکان نێوەندگیریە، نە کەمتەرخەمی تێدابێ و، نە تێپەڕاندن، ئەو کەسانەی بەرچاویان ڕوونە هەرگیز کەمتەرخەم نین دەرهەق بە پێغەمبەرەکەیان ﷺ، کە سەروەری هەموو وەچەی ئادەم و پێشەنگی هەموویانە، ماف و هەقی بەسەر هەموویانەوە هەیەو زێدەڕۆیی و کەمتەرخەمی ناکەن، چونکە زێدەڕۆیی کارێکی ترسناکەو سەردەکێشێت بەرەو لادان و گومڕایی.

لەلایەکیتر پێویستە ئەو کەسەی کەوا پێغەمبەری خوای ﷺ خۆشدەوێت و دەیەوێت بەو خۆشەویستیە زۆرەی بە چاکەو خێر بگات، ئەوە با پابەندی ڕێبازو سوننەتەکەی بێ و، ئەو خۆشەویستیەی ڕاینەکێشێ بەرەو سەرپێچی کردن و بیدعەو شتی داهێنراو کە لە شەریعەتدا قەدەغەکراوەو خۆی تاوانبار نەکات.

لە (صحیح مسلم)[1]دا هاتوە کە ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەو گوتوویەتی: {وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِه، لَيَأتِيَنَّ عَلَى أَحَدِكُم يَومٌ ولا يَرَانِي، ثُمَّ لأن يَرَانِي أَحَبُّ إِلَيهِ مِن أَهْلِهِ وَمَالِهِ مَعَهُم}. واتە: سوێند بەو زاتەی گیانی موحەممەدی بە دەستە ڕۆژێک دێ بەسەر یەکێک لە ئێوەدا کە من نابینێ، خۆ ئەگەر بمبینێ بەلایەوە خۆشترە لە خێزان و ماڵ و منداڵەکانیشی. پێشەوا نەوەوی ﷺ لەسەر ئەو فەرموودەیە دەڵێ: (مەبەستی پێغەمبەر ﷺ یان مەبەستی ئێو فەرموودەکە ئەوەیە هاوەڵان زۆر پابەندو تامەزرۆی کۆڕو مەجلیسەکانی پێغەمبەر ﷺ بوون و تامەزرۆی دیتنی بوون لە ماڵەوەو لە گەشتدا، بۆ ئەوەی خۆیان بە ڕەوشتەکانی ئەو برازێننەوەو فێری شەریعەت بن و وەریبگرن و لەبەری بکەن و بیگەیەنن بە دوای خۆیان، وە ئەوەشیان پێ ڕادەگەیەنێ کەوا پەشیمان دەبنەوە لەوەی چیان لەدەست چووە کە دەبوو زیاتر ببینن و پابەندو پەیوەستی کۆڕەکانی بن)[2].

وە دەبێ لە پشت ئەو تامەزرۆییە بۆ بینینی پێغەمبەر ﷺ، کردەوەو کارێکی باش هەبێ، لە ناسینی ڕێبازو ئاداب و ڕەوشت و مامەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بکرێتە سەرمەشق، چەندە مرۆڤ پێداگربێ لەسەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرو ﷺ، چەندە ڕازاوە بێ بە ئاداب و ڕەوشتەکانی، ئەوە هێندە نزیکتر دەبێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إنَّ مِنْ أَحَبِّكُم إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُم مِنِّي مَجْلِسَاً يَوْمَ القِيَامَةِ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاقَاً}[3]. واتە: (خۆشەویسترینتان و نزیکترینتان لە منەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەتانن کە ڕەوشتیان جوانترین و باشترینە).

جا هەرچەندە مرۆڤ پێداگر بێ لەسەر ئیمان و سوننەت و شوێنکەوتنی پێغەمبەرو ﷺ، دوور بێ لە بیدعەو هەواو ئارەزووەکانی، ئەوە زیاتر هۆکارو شایەنترە بە پشتیوانی خوای گەورە، کەوا بە بینینی پێغەمبەر ﷺ شاد بێ و، بەشی لە هاوسێیەتی و هاونشینی پێغەمبەر ﷺ هەبێت لە بەهەشتدا.

---

(١) أخرجه مسلم: ٢٣٦٤.

(٢) شرح النووي علي صحيح مسلم: ١١٨/١٥.

(٣) أخرجه الترمذي في جامعه: ٢٠١٨.





سوپاس و ستایش بۆ خوای ﷻ لەسەر یارمەتیدانی و ئاسانکارییەکانی، لە سەرەتاو لە کۆتاییدا، سوپاس و ستایش تەنها بۆ ئەو، سوپاس بۆ خوا بە ئاشکراو پەنهانی، داوا لە خوای گەورە دەکەم کەوا سوودمەندمان بکات بەوەی کە فێر بووین، وە ئەو شتەی کە فێر بووین بۆمان ببێتە بەڵگەی ڕزگار بوون نەک ببێتە بەڵگە لەسەرمان، وە دڵ و دەروونمان بە ئیمان ئاوەدان بکاتەوە، ماڵ و ژیانمان باش و باشتر بکات، بۆ سەر ڕێگای ڕاست و هیدایەت شارەزامان بکات، وە لە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەرەکەمان ﷺ سەرکەوتوومان بکات، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ حەشرمان بکات، لە ژێر ئاڵای ئەودا، وە لەگەڵ ئەودا لە بەهەشت کۆمانبکاتەوە، خوای گەورە لێمان خۆش بێ و، لە دایک و باوکمان خۆش بێ و، لە پێشەوا تیرمیذي خۆش بێ و، لە سەرجەم ماموستاو زاناکانی ئوممەتی ئیسلامی خۆش بێ لە یەکەم تا کۆتا کەس، وە لە سەرجەم مسوڵمانان و ئیمانداارانی زیندوو و مردوو خۆش بێت، هەر خۆی لێخۆشبوو و بە بەزەیی و بەرزو بەڕێزو بەخشندەیە.

وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنِ الحَمْدُللهِ رَبِّ العَالَمِيْـن، وَصلَّى اللهُ وَسَلَّمَ، وَبَارَكَ وَأَنْعَم عَلَى عَبْدِهِ وَرَسُولِهِ، نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِيـن.




# ناوەڕۆك

